ناوی کتێب: قەزا و قەدەر لە نێوان هیدایەت و گومڕاییدا

نووسینی: أحمد ملا فائق سعید

ژمارەی لاپەڕە: ٥١١ لاپەڕە

قەبارەی لاپەڕە: ١٧ X ٢٤ سم

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی

( ٢٥٨٧ ) ی ساڵی ٢٠١٩ ی زایینی پێدراوە





چاپی یەکەم

١٤٤١ هـ






کتێبخانەی صلاح الدين

هەولێر | فلکەی شێخ محمود | باڵەخانەی سید بهاء الدين

٠٦٦٢٥٤٠٢٧٦

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إِنَّ الْحَمْدَ للهِّ، نَحْمَدُهُ، وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِّ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُّ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُّ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ [آل عمران: ١٠٢].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ [النساء: ١].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾ [الأحزاب: ٧٠-٧١].

۩ قال رسول الله ﷺ: «أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كَلَامُ اللهِّ، وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ، وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ، وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ»(١).

وَبَعْدُ:

گومان لەوەدا نییە کە بەرێزترین زانست زانستی (توحید)ە، وەکوو وتراوە: «أفضل العلوم علم التوحيد، وأنفع العلوم علم الفقه». لەبەر پەیوەستی ئەو زانستە بە خواوە، وە لەناو

(١) أخرجه مسلم (٨٦٧)، والنسائي في "الكبرى" (١٧٩٩)، وابن ماجه (٤٥)، وابن حبان في "صحيحه" (١٠)، وابن خزيمة في "صحيحه" (١٧٨٥)، وأحمد في "المسند" (١٤٩٨٤)، والطبراني في "الكبير" (٨٥٣١)، والبيهقي في "الكبرى" (٥٨٠٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢٤)، والمروزي في "السنة" (٧٣)، وغيرهم، وانظر "خطبة الحاجة" للألباني.

(توحید)یشدا لەخۆگری هەرسێ بوارەکەی (توحید) بابەتی (القضاء والقدر)ە، کە یەکێکە لە شەش پایەکەی ئیمان و بابەتێکی غەیبی و شاراوەیە و لەخۆگری پەیوەندییەکانی نێوان کاری خوا و ئادەمیزادە، بۆیە پێی وتراوە: «سِرُّ اللهِّ فِي خَلْقِهِ»(١). واتە نهێنییەکانی خوایە لە بەڕێوەبردنی بوونەوەردا، وە ڕاگری هەموو عەقیدەیە، وەکوو (ابن عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «الْقَدَرُ نِظَامُ التَّوْحِيدِ، فَمَنْ وَحَّدَ اللهَّ وَكَذَّبَ بِالْقَدَرِ نَقَضَ تَكْذِيبُهُ تَوْحِيدَهُ»(٢). واتە باوەڕبوون بە قەدەر ڕێکخەری هەموو تەوحیدە، وە ئەوەی باوەڕی پێنەبێت هەڵوەشێنەرەوەی عەقیدەیەتی.

وە کاتێك قسە لەسەر ئەم بابەتە دروستبوو؛ وتیان خوا کردەوەی ئادەمیزاد نازانێت و نەینووسیوە و دروستی نەکردووە، کەواتە دەبێت ئادەمیزاد خۆی کارەکانی خۆی دروستبکات و (خالق)ی بێت و زانا بێت بەسەریدا، بۆیە (ابن عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا وتی: «هَذَا أَوَّلُ شِرْكٍ فِي الْإِسْلَامِ»(٣). ئەمە یەکەم شەریك و هاوبەش بڕیاردانە بۆ خوا.

قەدەر پەیوەستە بە توانا و دەسەڵات و زانستی خواوە (القدرة والعلم)، خوای گەورەش جَلَّ وَعَلَا دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ٣٩﴾ [فُصِّلَت: ٣٩]، وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ﴾ [البَقَرَة: ٢٥٥]. دەرك ناکرێت بەسەر کەمترین زانستی خوادا، وە باڵادەستە بەسەر هەموو شتێکدا.

سروشتی ئەم بابەتە تێکەڵە لە باسی خوا و کردارەکانی و باسی کرداری (مخلوقات) و بەڕێوەبردنیان ...، وە هەموو بابەتێکی تێکەڵیش حەقپێدانی هەموو لایەکانی و خوێندنەوەی وردەکارییەکانی ئەستەمە، مەگەر زانایەکی پشتبەستوو بە وردەکارییەکانی قورئان و سوننەت و خاوەن فەهمێکی تەواو لە نێوان قەدەری کەونی و شەرعیدا بتوانێت چمکەکانی کۆبکاتەوە و ناوەڕۆکەکانی دەرك پێبکات بەو پێوانەیەی کە خوای پەروەردگار دایبەزاندووە کە دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ﴾ [الحَدِيد: ٢٥]. هي ميزان عادلة، ... فيسوى بين المتماثلين

(١) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٢٤٩.
(٢) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٢٥٠.
(٣) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٢٥٠.

ويفرق بين المختلفين[١]. کە هاوشێوەکان یەکدەخات و جیاوازەکان جیادەکاتەوە، نەبوونی ئەم پێوەرە خاڵی هەڵەی هەموو فیرەقەکانی قەدەرە.

وە لە ڕوویەکی تریشەوە قەدەر پەیوەستە بە ناو و سیفاتەکانی خواوە، وەکوو (ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «ولما كان الكلام في هذا الباب نفيًا وإثباتًا موقوفًا على الخبر عن أسماء الله وصفاته»[٢]. واتە قسەکردن لەم بارەیەوە لە ڕووی بڕیاردان لەسەر ووردەکارییەکانی؛ لەسەر ناو و سیفاتەکانی خوا وەستاوە.

بابەتی قەدەر وەکوو هەموو بابەتەکانی تر لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ قسەی لەسەر کراوە، بەڵام بە بوونی پێغەمبەر ﷺ سەرکوت کراوە و ڕێگەی ڕەخنە و باسی عەقڵی لەسەری داخراوە، وەکوو (عبدالله بن عمرو بن العاص) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەیگێڕێتەوە دەڵێت: «... صَحَابَةِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جُلُوسٌ عِنْدَ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِهِ، ... فَذَكَرُوا آيَةً مِنْ الْقُرْآنِ فِي الْقَدَرِ فَتَمَارَوْا فِيهَا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: أَلَمْ يَقُلْ اللهُ كَذَا وَكَذَا؟ وَقَالَ بَعْضُهُمْ: أَلَمْ يَقُلْ اللهُ كَذَا وَكَذَا؟ حَتَّى ارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمْ، فَسَمِعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَلِكَ، فَخَرَجَ عَلَيْنَا يُعْرَفُ فِي وَجْهِهِ الْغَضَبُ، فَقَالَ: **"أَبِهَذَا أُمِرْتُمْ أَنْ تَضْرِبُوا كِتَابَ اللهِ بَعْضَهُ بِبَعْضٍ؟، إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ حِينَ تَنَازَعُوا فِي هَذَا الْأَمْرِ، عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ أَلَّا تَتَنَازَعُوا فِيهِ"**، وفي رواية: **"إِنَّمَا ضَلَّتْ الْأُمَمُ قَبْلَكُمْ بِاخْتِلَافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ وَضَرْبِهِمْ الْكُتُبَ بَعْضَهَا بِبَعْضٍ، إِنَّ الْقُرْآنَ لَمْ يَنْزِلْ يُكَذِّبُ بَعْضُهُ بَعْضًا، بَلْ يُصَدِّقُ بَعْضُهُ بَعْضًا، فَلَا تُكَذِّبُوا بَعْضَهُ بِبَعْضٍ، فَانْظُرُوا الَّذِي أُمِرْتُمْ بِهِ فَاعْمَلُوا بِهِ، وَالَّذِي نُهِيتُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا"**، وفي رواية: **"فَمَا عَرَفْتُمْ مِنْهُ فَاعْمَلُوا بِهِ، وَمَا جَهِلْتُمْ مِنْهُ فَرُدُّوهُ إِلَى عَالِمِهِ، فَإِنَّكُمْ لَسْتُمْ مِمَّا هَهُنَا فِي شَيْءٍ"**»[٣].

---

(١) "الرد على المنطقيين" لابن تيمية ص٣٨٢.

(٢) "شفاء العليل" لابن القيم ص٨.

(٣) رواه الترمذي (٢١٣٣)، وحسنه الألباني، وأحمد في "المسند" (٦٧٠٢)، والطبراني في "الأوسط" (١٣٠٨)، وأبو نعيم في "الحلية" (٩/ ٢١٦)، ينظر "الجامع الصحيح للسنن والمسانيد" (٣/ ٣٢٢).

واتە: چەند کەسێك لە بەردەم ماڵی پێغەمبەردا ﷺ دەمەقاڵێیان بوو لەسەر قەدەر، ئەم دەیوت: ئەوە نییە خوا وا دەفەرموێت؟ ئەوانی تریش دەیانوت: ئەی ئەوە نییە خوا وا دەفەرموێت؟ کاتێك پێغەمبەر ﷺ گوێی لەمە بوو چووە دەرەوە و تووڕە بوو، فەرمووی: ئا بەمە فەرمانتان پێکراوە؟ بۆ ئەمە منتان بۆ نێردراوە کە فەرموودەکانی خوا هەندێکی بدەن بە هەندێکیدا؟ گەلانی تر ئا بەمە سەریان لێ شێواوە، ئێوە کارتان بەم بابەتەوە چییە؟ بەڵکوو چی فەرمانتان پێ کراوە بیکەن و چی ڕێگریتان لێ کراوە مەیکەن، فەرموودەی خوا بۆ بەڕاستخستنەوەی یەکتری نێردراوە، نەك بۆ بەدرۆخستنەوەی یەکتری، ئەوەی دەیزانن لێی قسەی لەسەر بکەن و ئەوەشی لێی نازانن بیگێڕنەوە بۆ زانا و شارەزای خۆی، پەیمانتان لێ وەردەگرم کە نەگەڕێنەوە سەر ئەم دووبەرەکایەتییە لەسەری.

ڕێنموونییەکان لەم فەرموودانەدا گەڕانەوەیە بۆ لای زانای تایبەت لە باسە نهێنی و ووردەکانی قەدەردا، وەکوو خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٤٣﴾ [النحل: ٤٣]. بۆیە دەقەکان شیکەرەوە و بەڕاستخەرەوەی یەکن، ئەگەر بە پێچەوانەوە دەرچوو ئەوا ناشارەزا قسەی لەسەر کردووە.

پاشان ئەوەی پێویستە و پەیوەندی بە تۆوە هەیە جێبەجێکردنی فەرمانەکان و شەریعەتە، هەروەك ئەو کەسەی هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و وتی: «مَتَى السَّاعَةُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: "مَا أَعْدَدْتَ لَهَا"»(١). کەی قیامەت دێت؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: چیت بۆ ئامادە کردووە؟ واتە کارکردن بۆی پەیوەندی بە تۆوە هەیە، نەك کاتی هاتنی کە ئەوەیان پەیوەندی بە خواوە هەیە.

بەڵام لە کۆتایی سەردەمی هاوەڵاندا بابەتی قەدەر قسە و دەمەقاڵێی لەسەر دروستبوو لەلایەن کەس و ناوچە و کاریگەری پاشماوەی ئایین و بیروڕاکانەوە، کەسەکان زانایانی ئەم ئوممەتە نەبوون و خاوەن زانستی شەرعیش نەبوون وەکوو (مُفَسِّرْ، مُحَدِّثْ، فَقِيْهْ ...)، وە ناسراویش نەبوون بەوانەی کە لە قوتابخانەکانی هاوەڵان و تابعین قۆناغی زانستییان بڕیبێت، بەڵکوو بیروڕا و فەلسەفە و ڕەوانبێژی (أهل الكلام والفلسفة والمنطق) کار و زانستیان بووە، کە هەموویان بوارە

---

(١) رواه البخاري (٦١٧١) كِتَابُ الأَدَبِ، بَابُ عَلاَمَةِ حُبِّ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ، ومسلم (٢٦٣٩) كِتَابُ الْبِرِّ وَالصِّلَةِ وَالْآدَابِ، بَابُ الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ، والنسائي في "الكبرى" (٥٨٤٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٨)، وأحمد في "المسند" (١٢٦٩٢).

عەقڵییە ڕووتەکان و کاریگەری پاشماوەی ئایینەکانی (اليهود والنصارى والصابئية والمجوس ...) بوو، وەکوو (مسلم بن يسار) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «إِنَّ مَعْبَدًا يَقُولُ بِقَوْلِ النَّصَارَى»[(١)]. واتە (معبد الجهني) لە بارەی قەدەرەوە قسەی گاوورەکانی دەکردەوە، وە ئیمامی (الأوزاعي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «أَوَّلُ مَنْ نَطَقَ بِالْقَدَرِ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ يُقَالُ لَهُ: سَوْسَنُ، وَكَانَ نَصْرَانِيًّا ...»[(٢)]. واتە یەکەم کەسێك کە لە قەدەردا قسەی کرد (سوسن) بوو کە خەڵکی عێراق بوو، وە موسوڵمان بوو بەڵام دوایی بووەوە بە گاوور.

وە لە ناوچەکانی بەسرە و کوفە و شام و خوراسان سەریان هەڵداوە، نەك مەدینە و مەککە و حیجاز، وە ئەنجام و بەرهەمی بۆچوونەکانیشیان دوورکەوتنەوە بووە لە حەق و گومڕایی و نانەوەی دووبەرەکایەتی بووە لە نێوان موسوڵمانان و دەرچوون بووە لە دین و هەڵوەشاندنەوەی ئیمانیان بووە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، بە پێچەوانەی زانایانی ئەهلی سوننەتەوە کە هەموو قسەکانیان هۆکاری کامڵبوون و دڵنیایی و شارەزایی ئیمانی بووە و پەیوەستبوونە بە قورئان و فەرموودەوە.

هەموو قسەکانیشیان کورت و کوێر بووە و توانیویەتی لایەك بخوێنێتەوە و لایەکەی تری پشتگوێ خستووە، بۆیە خوێنەر دەتوانێت قسەکانی ئەم فیرەق بەکاربهێنێت بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو فیرەق، وەکوو (ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «يناقض بعضهم بعضا ويكسر أقوال بعضهم ببعض»[(٣)]. واتە قسەکانیان پێچەوانەی یەکترن و یەکتری دەشکێننەوە.

بۆ چوونە ناو بابەتەکانی قەزا و قەدەر بە پێویستمان زانی لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبدەینەوە و بچینە سەر ئەو بابەتە زانستییانەی کە ئەو فیرەقانەی لەسەر دروستبوون لە قەدەردا و بیروڕایان لەسەر بنیاد ناوە، وە لەو ڕێگایانەوە وەڵامی دروست بۆ ڕەخنە و پرسیارەکانی ئەمڕۆ بدرێتەوە، لەبەرئەوەی هەرچەندە قسە و پرسیار و ڕەخنە لەسەر قەدەر بکرێت لە چوارچێوەی باسی ئەوان دەرناچێت و هەر ئەو باسانەیە بە شێوازی جۆراوجۆر دووبارە دەبێتەوە و دەوترێتەوە، بە هۆکاری

(١) "السنة" لعبد الله بن أحمد (٢/ ٣٩٢) برقم (٨٥٢)، و"السنة" لأبي بكر بن الخلال (٣/ ٥٢٨) برقم (٨٦٠).

(٢) "الشريعة" للآجري (٢/ ٩٥٩) برقم (٥٥٥)، و"سير أعلام النبلاء" للذهبي (٥/ ١٠٤).

(٣) "الصواعق المرسلة" لابن القيم (٢/ ٤٥٣).

ئەوەی کە ئەوان عاقڵترین کەس و شارەزاترین کەس بوون بە ڕێگەکانی عەقڵ و فەلسەفە کە لەم بوارەدا قسەیان لەسەر کردووە، وە نووسینەکەشمان زۆرتر ئەو بوارە باس و خواستە مێژووییە لەخۆ دەگرێت، ئەگەرچی ڕەنگە بوترێت کێشەی ئەمڕۆ لە نێوان (إلحاد وإيمان)دایە نەك ئەو فیرەقانە، بەڵام بە شێوەیەکی کورت (إلحاد)ی ئەمڕۆش درێژەپێدەری ئەو سەرەتا (إلحاد)ە مێژووییەیە کە ڕوویداوە، لەبەرئەوەی هەموو هۆکار تیایدا وەرنەگرتنی دینە وەکوو خۆی، وەك زانایان دەڵێن (التعطيل الجزئي والتعطيل الكلي)، واتە بێباوەڕی تەواو و بێباوەڕی ڕێژەیی، ئەگەرچی باوەڕنەبوونەکە جیاوازی هەیە لە ناخی کەسەکاندا.

**بۆ وەڵامی زیاتر لەم بارەیەوە و هۆکارەکانی، دەڵێین:**

**١.** بیرورِا و بۆچوونەکان نامرن بە مردنی خاوەنەکانیان، خۆ ئەگەر خاوەنەکانیان و ئەو گرووپانە بەو ناو و ناونیشانە نەمابێتن؛ ئەوا خۆ بە واقعی حاڵ بیرورِا و بۆچوونەکان هەر ماون و زیندوون و کەم تا زۆر و دوور و نزیك بەش بەش و بەربڵاون و هەر گرووپ و تاقمێکی تازە کە دروست دەبێت دووبارەبوونەوەی مێژووە.

بۆیە گرووپی (شيعة) لەخۆگری بیروڕای مەجووسییەکانە، وە (تصوف)یش لەخۆگری بیروڕای (رهبانية) گاوورەکانە لەگەڵ تێکەڵ بە بنەمای هیندۆس و بووزییەکان، قورئانییەکانیش درێژەپێدەری بیروڕای خەوارجەکانن، وە (مفكرون)یش هەڵگری بەرنامەی (معتزلة)عەقلانییەکانن، وە ئەدیب و شاعیر و نووسەرەکانیش هەڵگری بیروڕای جەهمی و مورجیئەکانن لە ئیماندا، کە بوونی (خالق) لایان تەنها زانینێك و (معرفة)یەکە و بەس، واتە هەر ئەوەندە بزانی کە خوا بوونی هەیە ئەوە ئیمانە.

مەرجیش نییە کە وتت یەکێکە لەو فیرەقانە هەڵگری هەموو بیروڕاکانیان بێت، بەڵکوو لەخۆگری یەکێك یا چەند بنەمایەکی ئەو فیرەقەیە، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «لَازِمَ مَذْهَبِ الْإِنْسَانِ لَيْسَ بِمَذْهَبٍ لَهُ إِذَا لَمْ يَلْتَزِمْهُ»[(١)]. واتە خۆدانە پاڵ مەزهەبێك نابێتە مەزهەبی، گەر هەڵگری هەمووی نەبێت.

**٢.** حـەق بە بەتاڵـدا دەناسرێـتەوە ، تاوەکوو ڕێگـەی بەتاڵ شی نەکـرێتەوە ڕێگەکانی حەق

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٠/ ٢١٧).

**ناناسرێت و دەرك بە ووردەكاری حەقەكەی ناكرێت، بۆیە دەبینین لە قورئاندا باسی بەهەشت و جەهەننەم بەدوای یەكدا كراوە.**

**شاعیریش دەڵێت:**

عَرَفْتُ الشَّرَّ لَا لِلشَّرِّ لَكِنْ لِتَوَقِّيهِ      وَمَنْ لَا يَعْرِفُ الشَّرَّ مِنَ الْخَيْرِ يَقَعُ فِيهِ[(١)]

**واتە: شەڕم ناسی نەك بۆ شەڕ، بەڵكوو بۆ خۆپاراستن لێی، ئەوەی شەڕ لە خێر جیانەكاتەوە دەكەوێتە ناوی.**

(**ابن القيم**) رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت**: فَمن لم يعرف سَبِيل الْمُجْرمين وَلم تستبن لَهُ أوشك أَن يظنّ فِي بعض سبيلهم أَنَّهَا من سَبِيل الْمُؤمنِينَ، كَمَا وَقع فِي هَذِه الْأمة من أُمُور كَثِيرَة فِي بَاب الِاعْتِقَاد وَالْعلم وَالْعَمَل هِيَ من سَبِيل الْمُجْرمين ... أدخلها من لم يعرف أَنَّهَا من سبيلهم فِي سَبِيل الْمُؤمنِينَ ودعا إِلَيْهَا وكفّر من خالفها واستحل مِنْهُ مَا حرمه الله وَرَسُوله، كَمَا وَقع لأكْثر أهل الْبدع من الْجَهْمِية والقدرية والخوارج وَالرَّوَافِض وأشباههم ... وَالنَّاس فِي هَذَا الْموضع أَربع فرق: **الفرقة الأولى**: من استبان لَهُ سَبِيل الْمُؤمنِينَ وسبيل الْمُجْرمين على التَّفْصِيل علما وَعَملا وَهَؤُلَاء أعلم الْخلق ... وَالْمَقْصُود أَن الله سُبْحَانَهُ يحب أَن تعرف سَبِيل أعدائه لتجتنب تبغض، كَمَا يحب أَن تعرف سَبِيل أوليائه لِتُحَبّ وتسلك، وَفِي هَذِه الْمعرفَة من الْفَوَائِد والأسرار مَالا يُعلمهُ إِلَّا الله، كَمَا قَالَ عمر بن الْخطاب: إِنَّمَا تنقض عرى الْإِسْلَام عُرْوَة إِذا نَشأ فِي الْإِسْلَام من لم يعرف الْجَاهِلِيَّة[(٢)].

**واتە: ئەوەی ڕێگەی گومڕایان نەناسێت دەشێت بكەوێتە ناو هەندێك لە ڕێگاكانیانەوە و بە ڕێگەی ئیماندارانیان بزانێت، وەكوو لەناو موسوڵماناندا ڕوویداوە لە زۆرێك لە بابەتەكانی عەقیدە و زانست و كارەكاندا ... بە نەزانین ئەم كارە ئەنجامدراوە و وا زانراوە ڕێگە ڕاستەكەیە، لەبەرئەوە بانگەوازی بۆ كردووە و بگرە حوكمی بێبڕوایی داوە بەسەر ئەوانەی كە دژایەتییان**

---

(١) "مفتاح دار السعادة" لابن القيم (١/ ٢٩٦)، و "الدرر الكامنة" لابن حجر العسقلاني (٤/ ٣١).

(٢) "الفوائد" لابن القيم ص١٠٩ – ١١١.

کردووە، ئەوانەی کە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ حەرامیان کردووە ئەوان حەڵاڵیان کردووە بەسەریاندا، وەکوو بیدعەکارانی جەهمییە و قەدەری و خەوارج و ڕافیزەکان و هاوشێوەکانیان کە لەسەر دەستیان ئەمە ڕوویداوە.

خەڵکی لە ناسینی حەق و بەتاڵدا چوار جۆرن: جۆری یەکەمیان: کەسانێکن شارەزا و ئاشنان بەسەر ڕێگەی ئیمانداران و تاوانباراندا بە شێوەیەکی ووردەکار لەڕووی زانستیان و کردەوەکانیان، ئەمانە شارەزاترین و زاناترین کەسن لە خەڵکیدا.

وەکوو (عومەری کوڕی خەتاب) ﷺ دەڵێت: کەسێك ئیسلام بەش بەش هەڵدەوەشێنێتەوە کە هەر لە ئیسلامدا گەورە بووە و سەردەمی نەفامی و جاهیلی نەناسێت.

**٣.** بەشێك لە سێ بەشەکەی قورئان (قصص) و بەسەرهاتی گەلان و ڕووداوەکانی نێوان حەق و بەتاڵە، بۆ پەند وەرگرتن و دووبارە نەبوونەوە، هەر لە بەسەرهاتی ئیبلیس و ئادەم و نوح و گەلەکەی و ئیبراهیم و نەمروود و موسا و فیرعەون و داوود و سولەیمان و یوسف و براکانی و عیسا و أصحاب الكهف ... تا کۆتا چیرۆکەکانی قورئان، هەرجارەی بابەتێك و باسێك لەوانەی کە چاوڕۆشنی دەدەنە ئیمانداران بۆ پێویستییەکانی دین و دونیایان.

**٤.** خاوەن کتێبخانەیەکی گەورەین لە ئیسلامدا، بە هێندەی تەپۆڵکەکان نووسینمان هەیە، لەلایەن فیرەقەکان و لەلایەن ئەهلی سونئەوە، بۆ ڕوونکردنەوە و دۆزینەوەی حەق و جیاکردنەوەی ووردی لە ڕێگەکانی بەتاڵ، کە تا ئێستاش بڕوانامەی ماجستێر و دکتۆرا لە زانکۆکانی جیهانی ئیسلامی و دەرەوەی دەهێنرێت و توێژینەوەی ووردی لەسەر دەکرێت، ئەمانە هەمووی ڕێگەی زانستی زانایانی خوێنەری ئیسلامە بە کۆن و تازەوە.

بەتایبەت کە دوژمنانی ئیسلام هەموو دەم ویستوویانە لە ڕێگەی ئەو بیروڕا گومڕایانەوە لە ئیسلام بدەن و بەڵگەکانی ئەوان هەڵدەدەنەوە و بەکاری دەهێنن بۆ ڕەخنەگرتن لە ئیسلام.

هەروەکوو (مستشرقين) ڕۆژهەڵاتناسەکانی وەکوو (جولد تسيهر وواط وبروكلمان ...) کە نووسین و کتێبی (دائرة المعارف)یان دروستکردووە وەکوو (مرجع) و سەرچاوەیەك بۆ ناسینی ئیسلام.

مەبەست لە نووسینەکانیشیان شێواندنی مێژووی ئیسلامە بە باسی فیرەقەکان و بەڵگە گومڕاکارەکانیان، وەکوو ڕێگەیەك بۆ ڕزگاربوون لە دینی ئیسلام و دەسەڵاتەکانی، تاوەکوو شێوەکاری ئەورووپای پێبکەن کە لە دەسەڵات و دینی مەسیحییەت ڕزگاریان بوو.

(جولد تسيهر)یان دەڵێت: جەبرییەکان دروستکراوی (بني أمية) بوون بۆ سەپاندنی دەسەڵاتیان بە ڕێگەی دین[١]. وە دەڵێت: بیرکردنەوەیان لە قەدەردا لەسەر بنەمای جوولەکە و مەسیحییەکان و ئەفریقییەکان و فەلسەفە یۆنانییەکان وەرگرتووە.

ئەمە لە کاتێکدایە کە وەکوو مێژوو قەدەرییەکان پێش جەبرییەکان دروستبوون لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا، وە هەرچی سەری قەدەرییەکان هەیە بە دەستی ئەمەوییەکان لەناوبران بە هۆکاری بیروڕای گومڕایانەوە لە دیندا، وەك: (معبد الجهني ساڵی ٩٠ ی کۆچی و غيلان الدمشقي ساڵی ١٠٥ ی کۆچی و جعد بن درهم ساڵی ١١٨ ی کۆچی و جهم بن صفوان ساڵی ١٢٨ ی کۆچی ...)، ئەمانە وە دەیەها درۆ و هەڵبەستراو و شێواوییان بۆ مێژووی ئیسلام.

**٥**. هەڵدانەوەی مێژوو و ئاگالێبوونی ڕووداوەکان و گۆڕانکارییەکان چاوکراوەییەکی تەواو دەداتە ئیمانداران بۆ هۆکاری یەکڕیزی و پەیوەستبوون بە بەرنامەی حەقەوە و خۆپاراستن لە ڕێگەکانی گومڕایی و هۆکارەکانی، بەمەش ئیماندار پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە ڕابوردوو و ئێستای ئیسلام و مێژووەکەیەوە دەبێت و ترازان و بێئاگایی لە پێناسەی خۆی و بەرنامەی دینیدا بوونی نابێت.

**٦**. ئەوەی شوێنی سەرنجە ئەمڕۆ لە خوێندنگا و کۆلێژە ئیسلامییەکانی جیهانی ئیسلامی بەرنامەیەکی لادراو لە بەرنامەی حەق بوونی هەیە، کە نەوەکانیان و کادرە دینییەکانیان لە هەموو ئاستێکدا پەروەردە دەکەن لەسەری، ئەویش عەقیدەی ئەشعەری و ماتۆریدییە بە تێکەڵ لەگەڵ بنەماکانی (معتزلة)دا، لەگەڵ (فقه)ێکی مەزهەبی و فەرموودەی پڕ لە (ضعيف وموضوع) و تەفسیر بە ڕا و بۆچوونی عەقڵی ... بە هەموو ئەمانە ئیسلامێکی شێواو دەدەن بەدەستەوە کە مایەی لەرزۆکی و کاڵ و کرژی و بێئاگایی خاوەنەکانیانە لەسەر ئیسلامێکی دروست.

---

(١) "مفهوم القدر في دراسات المستشرقين" لمحسن بن علي سويسي ص٥٤، و "جولد تسيهر" ص١٠١، و "العقيدة والشريعة" لمحمد الغزالي، و "المستشرقون والإسلام" لعرفان عبد الحميد، و "تصور المستشرقين" محبوب كردي، و "الفرق الإسلامية في بلاد الشام والعصر الأموي" لحسين عطوان ص٢٤.

٧. لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە بۆخۆی بابەتەکانی دین لە سەرەتاوە تا کۆتایی تاقیکردنەوەیە، وە ئیمانداریش لەژێر باری ئەو تاقیکردنەوانەدایە، تاوەکوو بزانرێت تا چ ڕادەیەك دەتوانێت ئەو هیدایەتە وەکوو خۆی وەربگرێت و پارێزراو بێت لە حەز و ئارەزوو و پێخۆشبوونەکانی و شوێنکەوتەی عەقڵی و بیروڕاکان، وە لە بەرامبەریشدا بەو ئاستەش هیدایەتی خوایی و هۆکارەکانی بۆ دەڕەخسێت.

وە هەموو جۆرە ئاماژەکانی قورئانیش لەسەر ئەو بابەتانەیە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿لَا تُقَدِّمُوا۟ بَیْنَ یَدَیِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ [الحجرات : ١]، ﴿سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ [البقرة : ٢٨٥]، ﴿لِیَبْلُوَكُمْ أَیُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ [الملك : ٢]، ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا یُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ یُحَكِّمُوكَ فِیمَا شَجَرَ بَیْنَهُمْ﴾ [النساء : ٦٥]، ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَیْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ﴾ [المائدة : ٤٨]، ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا﴾ [الأنعام : ١١٥].

ئەمانە و چەندەها هۆکاری تر پێویست بەوە دەکات کە نووسین و توێژینەوەکان لە هەموو بوارێکی ئیسلامیدا لە ئاستێکی زانستی بەرزدا بن، کە خوێنەر بە ئێستا و ڕابوردووی خۆی ئاشنا بکات و ڕێگەی ڕاست و دروست و حەقیش بخاتە ڕوو، لەبەرئەوەی هەرچەندە قسە و باس هەبێت؛ لە چوارچێوەیەکی دیاریکراو دەرناچێت و زۆر جاریش هەڵی ناگرێت.

موسوڵمانیش تاوەکوو ئاشنا نەبێت بە ڕێگەی حەق و ڕاست و دروستی خوایی و خاوەن زانست و مەعریفەیەکی باش نەبێت لە بوارەکانی دیندا؛ هیچی لێ ڕەچاو ناکرێت بۆ بانگەوازی و کاری دینی، بێجگە لە کەسێکی نەخۆش نەبێت کە بیەوێت تیمارکەری نەخۆشییەکان بێت.

وە گومانیش لەوەدا نییە کە ئیسلام سەرچاوەکەی قورئان و فەرموودەیە و پەیوەستبوون پێوەی هۆکاری هیدایەتی تەواوە، بەتایبەت بە جۆری تێگەیشتنی هاوەڵان و شوێنکەوتووان و زانایانی پێهەڵگری ئەوان.

وە گومانیش نییە عەقڵ و بیروڕا و بۆچوونەکانی ئادەمیزاد کورت و ناتەواو و کاڵ و کرژن، ئەی نابینی لەوەتەی دونیا هەیە بیروڕا هەیە و ئاڵۆزی و جیاوازییەکانی ناو ئادەمیزادیش هەر وەکوو خۆیانن و بگرە زیاتریشن لە هەموو بوارەکاندا، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَیْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِیهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِیرًا ﴿٨٢﴾﴾ [النساء : ٨٢]. خۆ ئەگەر بەتایبەت لە بابەتەغەیبییە دینییەکانیشدا بێت ئەوە زیاتر مایەی ئاڵۆزی و ڕێ لێ ونبوونە.

ئەم نووسینەش هۆکارێکە بۆ خزمەتی ئەم بابەتە لـە ڕووە شەرعی و زانستییەکەیەوە، بە ئاواتی ئەوەی توانیبێتمان حەقی خۆی پێبدەین و کەلـێنێك لـە کتێبخانەی ئیسلامی پێ پڕبکەینەوە و ئەرکێکمان لـەسەر شانی خوێنەر کەم کردبێتەوە لـە بەدواداچوونی ئەم بابەتەدا، ئەگەرچی کەم و کورتی سیمای ئادەمیزادە و ئەوەی پێکابێتمان هەمووی پشتیوانی و بەخشندەیی پەروەردگارە و ئەوەشی نەمانپێکابێت لای حەق ویست دەبێت ببەخشرێت بە پێکاندن و چاکەکانی.

پەنا ئەگرین بە خوا لـە هەموو هەڵە و گومڕاییەك و سوپاس و ستاییش بۆ پەروەردگار لـەسەر یارمەتیدانی و داواکارم شوێنی ڕەزامەندی و وەرگرتنی پەروەردگار بێت و ببێتە توێشووی دوارِۆژمان.

وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ دَائِمًا وَأَبَدًا

وَالصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ تَسْلِيْمًا كَثِيْرًا





أحمد ملا فائق سعيد

١ / ذو الحجة / ١٤٤٠ هـ

٢ / ٨ / ٢٠١٩ م - الجمعة

سلێمانی




# بەندی یەکەم

## بەشی یەکەم:

١. **پێناسەی قەزا و قەدەر.**
٢. **جیاوازی نێوان وشەی ( القضاء والقدر ).**
٣. **بەڵگەکانی باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر:**
 - بەڵگەی قورئان.
 - بەڵگەی فەرموودە.
 - وتەی هاوەڵان و زانایان.
 - کۆدەنگی زانایان (الإجماع).
 - بەڵگەی (الفطرة والعقل والحس).

٤. **پلەوپایەی قەدەر لە ئیماندا.**
٥. **پایەکانی قەدەر.**
٦. **بەشەکانی قەدەر.**
٧. **جۆرەکانی ئیرادەی خوایی ( القدر الكوني والقدر الشرعي ).**







## بەشی دووەم:

- بابەتە هەستیارەکانی قەدەر.

١. کاری ئادەمیزاد ( أفعال العباد ).
٢. بێگەردی پەروەردگار لە ستەم ( تنزيه الله عن الظلم ).
٣. دانایی و هۆکارەکان لە کارەکانی پەروەردگاردا ( الحكمة والتعليل في أفعال الله تعالى ).
٤. بە چاك و خراپ زانین لە پێزانینی عەقڵەوە ( التحسين والتقبيح العقليين ).
٥. توانا و داواکارییەك لە سنووری جێبەجێکردندا نەبێت ( الإستطاعة والتكليف بما لا يطاق ).
٦. ڕێنموونی و گومڕایی ( الهداية والضلال ).
٧. کار و هۆکارەکان ( الأسباب والمسببات ).




# بـەشـی یـەکـەم

## پێناسەی قەزا و قەدەر

## معنى القضاء والقدر

**لە زمانەوانیدا:**

**(القضاء)** واتە: إِحْكَامُ أَمْرٍ وَإِتْقَانِهِ وَإِنْفَاذِهِ لِجِهَتِهِ[1].

**تۆکمەیی کار و وردبینی و جێبەجێکاری، خوای گەورە جَلَّ وَعَلَا دەفەرموێت:** ﴿فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ﴾ [فُصِّلَتْ : ١٢]. **واتە:** أَحْكَمَ خَلْقَهُنَّ[2]: **ئاسمانەکانی دروستکردووە بە تۆکمەکاری و تەواو.**

**(القدر)** واتە: مَبْلَغُ الشَّيْءِ وَكُنْهِهِ وَنِهَايَتِهِ[3].

**سنوور و ناوەڕۆك و کۆتایی شتێك.**

**وەکوو ڕوونکرایەوە پەیوەندییەکی تەواو هەبوو لە نێوان واتای زمانەوانی (القضاء والقدر)دا، واتە: وردەکاری و سنوورداری و جێبەجێکاری لە کاردا.**

**پێناسەی شەرعی:**

**(القضاء)** واتە: تقدير الله تعالى للأشياء في القِدَم، وعلمه سبحانه أنها ستقع في أوقات معلومة عنده، وعلى صفات مخصوصة، وكتابته لذلك، ومشيئته له، ووقوعها على حسب ما قدرها وخلقه لها[4].

---

(١) "معجم مقاييس اللغة" لابن فارس (٥/ ٩٩)، و "لسان العرب" (٥/ ٢٧٨)، و "تاج العروس" (١٠/ ٢٩٦).

(٢) "معجم مقاييس اللغة" لابن فارس (٥/ ٩٩)، و "لسان العرب" (٥/ ٢٧٨)، و "تاج العروس" (١٠/ ٢٩٦).

(٣) "الصحاح" للجوهري (٢/ ٢٨٦)، و "معجم مقاييس اللغة" لابن فارس (٥/ ٦٢).

(٤) "القضاء والقدر" للدكتور عبد الرحمن بن صالح المحمود ص٣٩ – نقلاً، و "العقيدة الواسطية" لابن تيمية ص٢١، و "شفاء العليل" لابن القيم ص٢٩.

داناني خوايي هەر لە ئەزەلەوە بۆ كارەكان، وە زانستي خوا بەوەى كە ڕوودەدات لەكاتي دياريكراوى خۆيدا، بەو سيفاتە تايبەتييە نوسراوانەى خۆى، لەگەڵ ويستي بە ڕوودانى ئەو كارانە، بەو شێوەيەى كە دروستى كردووە و بۆى داناوە.

## جياوازى نێوان وشەى (القضاء و القدر)

**زانايان دوو ڕاى جياوازيان هەيە[1]:**

ڕاى يەكەم: جياوازى نيیە لە نێوان ئەو دوو وشەيەدا، هەريەكەيان بە واتاى ئەويتريان دێت، لەگەڵ ئەمەشدا هيچ بەڵگەيەكى شەرعى نيیە لەسەر جياوازى نێوانيان.

ڕاى دووەم: دەڵێن جياوازييان هەيە، بەڵام كۆدەنگيش نين لەسەر جياوازى نێوانيان.

**هەندێكيان دەڵێن:**

**(القضاء):** بڕيارە گشتييەكانە، بەشێوەى كورت لەسەر شتەكان لە ئەزەلدا.

**(القدر):** بڕيارە لەسەر هێنانەدى وردەكارييەكان، بەگوێرەى حوكمە گشتييە بڕياردراوەكان لە ئەزەلدا.

**بەم پێناسەيە:** وشەى (القضاء) گشتگيرتر و لەخۆگرترە تا وشەى (القدر).

**وە ڕايەكى تر بە پێچەوانەوە:**

**(القضاء):** (التفصيل) وردەكارى.

**(الـقـدر):** (التقدير) دارشتن، ئەم ڕايە پێچەوانەى ڕاى پێشووە.

**وە ڕايەكى تر:**

**(القضاء):** «هُوَ إِرَادَةُ الله الْأَزَلِيَّةُ الْمُتَعَلِّقَةُ بِالْأَشْيَاءِ ...». ويستى ئەزەلى خواييە پەيوەست بە شتەكان، بەگوێرەى بوون و دروستكردنيان.

---

(١) "القضاء والقدر" للدكتور عبد الرحمن بن صالح المحمود ص٤٠، و "القضاء والقدر" لمحمد إبراهيم الحمد ص٣٦، "الإيمان بالقدر" للصلابي ص١٢.

**(القدر):** «إِيْجَادُ اللهِ الأَشْيَاء عَلَى مَقَادِيْرِ الْمَحْدُوْدَةِ ...»[١]. هێنانەدی خواییە بۆ شتەکان، بەگوێرەی ڕێژە دیاریکراو و پەیوەستبووەکان پێیانەوە.

(ابن حزم) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: ... مَعْنَى الْقَضَاءُ وَالْقَدَرُ حُكْمُ اللهِ تَعَالَى فِي شَيْءٍ ... (الْقَدَرُ) بِكَوْنِهِ وَتَرْتِيْبِهِ عَلَى صِفَةِ كَذَا وَإِلَى وَقتِ كَذَا[٢].

واتای (القضاء) حوکمی خوایە لەسەر شتێك، وە (القدر) دروستبوونی و ڕێکخستنی ئەو حوکمەیە لەسەر شێوازێك و کاتێکی دیاریکراو.

کورتەی قسە ئەوەیە کە جیاوازی نییە لە نێوانیاندا، بەڵکوو تەواوکاری واتای یەکترن، وەکوو ئیمامی (الخطابي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: وجماع القول في هذا الباب أنهما أمران لا ينفك أحدهما عن الآخر، لأن أحدهما بمنزلة الأساس والآخر بمنزلة البناء، فمن رام الفصل بينهما فقد رام هدم البناء ونقضه[٣].

**کۆکەرەوەی قسە لەم بارەیەوە:** ئەم دوو وشەیە لێکنەترازاوی یەکترن، لەبەرئەوەی یەکێکیان بە پلەی بناغە دێت و ئەویتریان بە پلەی بینا و دروستکردن دێت لەسەری، ئەوەی جیاوازی بخاتە نێوانیانەوە ئەوا دەبێتە هۆکاری ڕووخاندنی بیناکە و هەڵکەندنی بناغەکەی.

  

(١) هذا قول الأشاعرة وبعض أهل السنة، ينظر "الدين الخالص" لصديق حسن خان (٣/ ١٥٤)، و "الدرر السنية" (١/ ٢٥٥)، و "القضاء والقدر" للدكتور عبد الرحمن بن صالح المحمود ص٤٤.

(٢) "الفصل في الملل والأهواء والنحل" لابن حزم (٣/ ٣١).

(٣) "معالم السنن" للخطابي (٤/ ٣٢٣).

# بەڵگەکانی باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر

## أدلة الإيمان بالقضاء والقدر

## یەکەم: بەڵگەکانی قورئان

١. قوله تعالى: ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ۝٣٨﴾ [الأحزاب: ٣٨].

واته: فەرمانی دانراوی خوایی دێتە دی، هیچ ڕێگرییەك و لادانێکی بۆ نییە، ئەوەی ویستی لێبێت دەبێت، ئەوەشی ویستی لێ نەبێت نابێت، فەرمانەکانی خوا بڕیارێکی لەسەردراو و هاتنەدییەکی بێ ڕێگرییە[1].

٢. قوله تعالى: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ۝٤٩﴾ [القمر: ٤٩].

واته: ئەوەی دروستمان کردووە بە دانان و بڕیار و نووسینمان لە (اللوح المحفوظ)دا بووە[2].

٣. قوله تعالى: ﴿وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ ۝٨﴾ [الرعد: ٨].

واته: هەموو شتەکان لای پەروەردگار بە ڕێژەی دیاریکراوە، وەکوو ڕۆزی و تەمەن کە پێش و پاش و کەم و زیاد ناکات[3].

**چەندەها ئایەتی ترمان هەیە بە هەمان مانا و مەبەست، کە قەدەر دانان و دیاریکردن و ڕێژەی دیاریکراوە، وەکوو:**

٤. قوله تعالى: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ۝٢﴾ [الفرقان: ٢].

٥. قوله تعالى: ﴿مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ۝١٩﴾ [عبس: ١٩].

٦. قوله تعالى: ﴿إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ ۝٢٢ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَٰدِرُونَ ۝٢٣﴾ [المرسلات: ٢٢، ٢٣].

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٦/ ٤٢٧)، و"تفسير البغوي" (٣/ ٦٤٥).

(٢) "تفسير البغوي" (٤/ ٣٢٨).

(٣) "تفسير ابن كثير" (٤/ ٤٣٦)، و"تفسير السعدي" ص٤١٤.

٧. قوله تعالى: ﴿وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ۝٣﴾ [الأعلى: ٣].

٨. قوله تعالى: ﴿لِيَقْضِيَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا﴾ [الأنفال: ٤٤].

٩. قوله تعالى: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ۝٢١﴾ [الحجر: ٢١].

## دووەم: بەڵگەکانی فەرموودە

١. حَدِيْثُ جبْرِيْل عَلَيْهِ الْسَّلَام: قَالَ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «... **الْإِيْمَانُ أَنْ تُؤْمِنَ بِالله، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ**»[(١)].

واتە: ئیمان ئەوەیە کە باوەڕت هەبێت بە خوا و فریشتەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی، وە باوەڕت هەبێت بە قەدەر خێر و شەڕی.

٢. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «**لَا يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُؤْمِنَ بِالقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ، حَتَّى يَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَهُ، وَأَنَّ مَا أَخْطَأَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَهُ**»[(٢)].

واتە: ئیمان ناهێنێت کەسێك تاوەکوو باوەڕی نەبێت بە خێر و شەڕی قەدەر کە لەلایەن خواوەیە، وە تاوەکوو دڵنیا نەبێت لەوەی ئەو شتەی کە تووشی بووە؛ بە هەڵە تووشی نەبووە، وە ئەوەی تووشی نەبووە؛ دانراوە کە تووشی نەبێت.

٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «... **وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ، فَلَا تَقُلْ لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ قَدَرُ الله وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ لَوْ**

(١) رواه مسلم (٨) كِتَابُ الْإِيمَانَ، بَابُ معرفة الْإِيمَانِ، وَالْإِسْلَامِ، والقَدَرِ وَعَلَامَةِ السَّاعَةِ، وأبو داود (٤٦٩٥)، وأحمد في "المسند" (٣٦٧)، والطبراني في "الكبير" (١٣٥٨١)، والطيالسي في "مسنده" (٢١)، والبيهقي في "الشعب" (١٧٧)، وفي "القضاء والقدر" (١٨١)، والآجري في "الشريعة" (٢٠٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (٨/ ٢٠٢).

(٢) رواه الترمذي (٢١٤٤) بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِيمَانِ بِالقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ، والبيهقي في "الشعب" (٢١٠)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٤/ ٧٥٠)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٤٣٩)، و "صحيح الجامع الصغير" (٧٥٨٣).

تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ»[(١)].

واته: ئەگەر هەرشتێکت تووش بوو مەڵێ گەر من ئەوەم بکردایە وا دەبوو، یان وا دەبوو، بەڵکوو بڵێ: دانانی خواییە، ویستی لە چی بێت ئەوە دەکات، وشەی (ئەگەر) دەرگای کار بۆ شەیتان دەکاتەوە.

٤. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَاقٌّ، وَلَا مُدْمِنُ خَمْرٍ، وَلَا مُكَذِّبٌ بِقَدَرٍ»[(٢)].

واته: ناچێته بەهەشتەوە کەسێك کە خراپ بێت لەگەڵ دایك و باوکیدا، وە عەرەقخۆری بەردەوام، وە کەسێك باوەڕی نەبێت بە قەدەر.

٥. عَنْ ثَوْبَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «إِذَا ذُكِرَ أَصْحَابِي فَأَمْسِكُوا، وَإِذَا ذُكِرَتِ النُّجُومُ فَأَمْسِكُوا، وَإِذَا ذُكِرَ الْقَدَرُ فَأَمْسِكُوا»[(٣)].

واته: گەر باسی هاوەڵانم کرا ڕایگرن، وە گەر باسی ئەستێرە کرا ڕایگرن، وە گەر باسی قەزا و قەدەر کرا ڕایگرن.

---

(١) رواه مسلم (٢٦٦٤) كتاب الْقَدَرِ، بَابٌ فِي الْأَمْرِ بِالْقُوَّةِ وَتَرْكِ الْعَجْزِ وَالِاسْتِعَانَةِ بِاللهِ وَتَفْوِيضِ الْمَقَادِيرِ لِلَّهِ، والنسائي في "الكبرى" (١٠٣٨٦)، وابن ماجه (٧٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٥٧٢٢)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٢٥١)، والبيهقي في "الشعب" (١٩١)، وفي "القضاء والقدر" (٢١٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٣٥٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٠٢٨).

(٢) رواه أحمد في "المسند" (٢٧٤٨٤)، وقال شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره دون قوله: (ولا مكذب بقدر)، ورواه البزار في "مسنده" (٤١٠٦)، والطبراني في "الشاميين" (٢٢١٢)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٤٢٩)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٣٢١)، وابن بطة في "الإبانة" (٣/ ٢٢٣)، والفريابي في "القدر" (٢٠١)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٦٧٥).

(٣) رواه الطبراني في "الكبير" (١٤٢٧)، وعبدالرزاق في "الأمالي" (٥١)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢١٠) عن ابن مسعود، وأبو نعيم في "الحلية" (٤/ ١٠٨)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٤٤٤) عن ابن مسعود، وابن عبد البر في "الجامع" (١٤٨١)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٣٤)، و "صحيح الجامع الصغير" (٥٤٥).

## سێیەم: وتەی هـاوەڵان و زانـایـان

١. قَالَ عَلِيُّ بْنُ أَبِيْ طَالِب رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: «إِنَّ أَحَدَكُمْ لَنْ يَخْلُصَ الْإِيَمانُ إِلَى قَلْبِهِ حَتَّى يَسْتَقِرَّ يَقِينًا غَيْرَ ظَنٍّ أَنَّهُ مَا أَصَابَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَهُ وَمَا أَخْطَأَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَهُ، وَيُقِرَّ بِالْقَدَرِ كُلِّهِ»(١).

واتە: یەك كەستان ئیمان لە دڵیدا جێگیر نابێت، تا بەبێ هیچ گومانێك باوەڕی وانەبێت كە ئەوەی تووشی بووە؛ بە هەڵە تووشی نەبووە (واتە بە قەدەری خوا دانراوە كە تووشی ببێت)، وە ئەوەی كە تووشی نەبووە؛ بۆ ئەو نەنووسراوە، وە دەبێت باوەڕیشی بە هەموو قەدەر هەبێت.

٢. قَالَ ابْنُ مَسْعُوْد رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: «لَا وَاللهِ لَا يَطْعَمُ رَجُلٌ طَعْمَ الْإِيمَانِ حَتَّى يُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ، ...»(٢).

واتە: سوێند بە خوا كەسێك تام و چێژی ئیمان ناچەشێت، تاوەكوو باوەڕی بە قەدەر نەبێت.

٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: «الْقَدَرُ نِظَامُ التَّوْحِيدِ، فَمَنْ وَحَّدَ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ وَآمَنَ بِالْقَدَرِ فَهِيَ الْعُرْوَةُ الْوُثْقَى الَّتِي لَا انْفِصَامَ لَهَا، وَمَنْ وَحَّدَ اللهَ تَعَالَى وَكَذَّبَ بِالْقَدَرِ نَقْضَ التَّوْحِيدَ»(٣).

واتە: قەدەر ڕێكخەر و ڕاگری (توحید)ە، ئەوەی بە تاك و تەنیا خوا بناسێت و باوەڕی بە قەدەر هەبێت؛ ئەوە شادەماری دینی گرتووە، وە ئەوەی (توحید)ی هەبێت و باوەڕی بە قەدەر نەبێت؛ ئەوا (توحید) و باوەڕەكەشی هەڵوەشاندووەتەوە.

---

(١) رواه البيهقي في "القضاء والقدر" (٤٦٧)، وابن بطة في "الإبانة" (١٤٥٩)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٢١٤)، والشاذلي في "كنز العمال" (١٥٥٧).

(٢) رواه الطبراني في "الكبير" (٨٧٨٩)، وابن بطة في "الإبانة" (١٦٠٠)، والآجري في "الشريعة" (٤٢٥)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٢١٨)، والفريابي في "القدر" (١٩٧).

(٣) رواه الطبراني في "الأوسط" (٣٥٧٣)، وابن بطة في "الإبانة" (١٦١٩)، والآجري في "الشريعة" (٤٥٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٢٢٤)، والفريابي في "القدر" (٢٠٥)، وعبدالله بن أحمد في "السنة" (٢/٤٢٢).

٤. قَالَ الْحَسَنُ الْبَصْرِيُّ رَحِمَهُ اللَّهُ: «مَنْ كَذَّبَ بِالْقَدَرِ فَقَدْ كَذَّبَ بِالإِسْلَامِ»[(١)].

واتە: ئەوەی باوەڕی بە قەدەر نەبێت؛ باوەڕی بە ئیسلام نییە.

٥. عَنْ يَحْيَى بْنِ يَعْمَرَ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ: إِنَّا نُسَافِرُ فَنَلْقَى قَوْمًا يَقُولُونَ: لَا قَدَرَ، قَالَ: «إِذَا لَقِيتَ أُولَئِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ مِنْهُمْ بَرِيءٌ، وَهُمْ مِنْهُ بَرَاءٌ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ»[(٢)].

واتە: (يحيى بن يعمر) دەڵێت: بە (عبدالله ی کوڕی عمر)م وت: ئێمە سەفەر دەکەین، بە کەسانێك دەگەین دەڵێن: قەدەر نییە (واتە باوەڕمان بەوە نییە پێشوەخت بۆمان نووسرابێت، بەڵکوو دوای کردەوەکانمان دەنووسرێت)، ئەویش وتی: گەر بەوانە گەیشتیت، هەواڵیان بدەرێ کە (عبدالله ی کوڕی عمر) لێیان بەرییە، ئەوانیش لە من بەرین. سێ جار ئەمەی وت.

٦. (عُبَادَةَ بْنُ الصَّامِت) وەسیەتی بۆ کوڕەکەی کرد و وتی: «يَا بُنَيَّ اتَّقِ اللهَ، وَلَنْ تَتَّقِيَ اللهَ حَتَّى تُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ، وَلَنْ تُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ حَتَّى تُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ، وَتَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَمَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ»[(٣)].

واتە: کوڕی خۆم، لە خوا بترسە، وە خواپەرستیشت تەواو نییە تاوەکوو باوەڕت بە قەدەر نەبێت، وە باوەڕیشت بە قەدەر نییە تاوەکوو باوەڕ بە خێر و شەڕی نەکەیت، وە بزانیت ئەوەی کە تووشت دەبێت بە هەڵە نەبووە، وە ئەوەی کە تووشت نابێت دانراوە کە تووشت نەبێت.

٧. قَالَ أَبُو الدَّرْدَاءَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: «ذُرْوَةُ الْإِيمَانِ أَرْبَعٌ: الصَّبْرُ لِلْحُكْمِ، وَالرِّضَا بِالْقَدَرِ، وَالْإِخْلَاصُ لِلتَّوَكُّلِ، وَالِاسْتِسْلَامُ لِلرَّبِّ»[(٤)].

---

(١) رواه الآجري في "الشريعة" ص٢١٧، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٤/ ٦٨٢).

(٢) رواه اللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٤/ ٧٤٤) برقم (١٢٣١).

(٣) رواه الطبراني في "الأوسط" (٦٣١٨)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٨٧٥)، وابن بطة في "الإبانة" (١٤٤٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٧٤٥) برقم (١٢٣٣)، والفريابي في "القدر" (٧٢)، والآجري في "الشريعة" (١٨٠).

(٤) رواه اللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٤/ ٧٤٩) برقم (١٢٣٨).

واتە: چلەپۆپەی ئیمان چوار شتە: ئارامگرتن لەسەر حوكمی خوا و ڕازیبوون بە قەدەر و نیەتپاكی لە پشتبەستن بە خوا و خۆدانە دەستی خوا.

٨. قَالَ الْإِمَامُ أَحْمَدُ رَحِمَهُ اللهُ: «الْقَدَرُ قُدْرَةُ اللهِ تَعَالَى»[١].

واتە: قەدەر توانا و دەسەڵاتی خوایە.

٩. قَالَ الْعُلَمَاءُ رَحِمَهُمُ اللَّهُ: «الْقَدَرُ سِرُّ اللهِ فِي خَلْقِهِ»[٢].

واتە: قەدەری خوایی، نهێنی خوایە لە دروستكراوەكانیدا.

## چوارەم: كۆدەنگی زانایان (الإجماع)

١. قَالَ النَّوَوِيُّ رَحِمَهُ اللهُ: وَقَدْ تَظَاهَرَتِ الْأَدِلَّةُ الْقَطْعِيَّاتُ مِنَ الْكِتَابِ وِالسُّنَّةِ وَإِجْمَاعِ الصَّحَابَةِ وَأَهْلِ الْحَلِّ وَالْعَقْدِ مِنَ السَّلَفِ وَالْخَلَفِ عَلَى إِثْبَاتِ قَدَرِ اللهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى[٣].

واتە: ڕوون و ئاشكرایە بەڵگە یەكلاكەرەوەكان لە قورئان و فەرموودە و كۆدەنگی هاوەڵان و كەسانی ناودارانی كاربەڕێكاری ئەم ئوممەتە لە پێشووان و پاشكۆیان، لەسەر باوەڕبوونە بە قەدەر.

٢. قَالَ ابْنُ تَيْمِيَّةَ رَحِمَهُ اللهُ: مِمَّا اتَّفَقَ عَلَيْهِ سَلَفُ الْأُمَّةِ وَأَئِمَّتُهَا مَعَ إِيمَانِهِمْ بِالْقَضَاءِ وَالْقَدَرِ، وَأَنَّ اللهَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ، وَأَنَّهُ مَا شَاءَ كَانَ وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ، وَأَنَّهُ يُضِلُّ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ، وَأَنَّ الْعِبَادَ لَهُمْ مَشِيئَةٌ وَقُدْرَةٌ ...[٤].

واتە: ئەوەی كۆدەنگی پێشووانی ئەم ئوممەتەی لەسەرە لەگەڵ ئیمامە ناودارەكانیان، باوەڕبوونە بە قەدەر، كە خوای گەورە دروستكاری هەموو بوونێكە و ئەوەی ویستی لێبێت دەبێت

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٠٨)، و "شفاء العليل" لابن القيم ص٢٨، و "طريق الهجرتين" لابن القيم ص٩٢.

(٢) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي (١/ ٣٢٠).

(٣) "شرح النووي على مسلم" (١/ ١٥٥).

(٤) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٤٥٩).

و ئەوەی ویستی لێنەبێت نابێت، وە گومڕایی و هیدایەت بەدەست ئەوە و بەندەكانیشی خاوەن ویست و توانای خۆیانن بۆ كردەوەكانیان ... .

٣. قَالَ ابْنُ حَجَر رَحِمَهُ اللهُ: وَمَذْهَبُ السَّلَفِ قَاطِبَةً أَنَّ الْأُمُورَ كُلَّهَا بِتَقْدِيرِ اللهِ تَعَالَى(١).

واتە: بەرنامەی پێشووانی ساڵح لەسەر ئەوەیە كە هەموو كارەكان بە دارِشتن و دانانی خواییە.

## پێنجەم: بەڵگەی (الفطرة والعقل والحس)

بە بەڵگەی ناخی دەروونی ئادەمیزاد (الفطرة) باوەڕبوون و خۆدانە دەست قەدەری خوایی بوونی هەیە، هەروەكوو بێباوەڕانی قوڕەیش دەیانوت: ﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا﴾ [الأنعام: ١٤٨]. گەر قەدەری خوا نەبوایە ئەوا ئێمە هاوبەشمان بڕیار نەئەدا، نە خۆمان و نە باو و باپیرانمان.

لە ناخی ئادەمیزاددا ئەوە چێنراوە كە هەموو بوونەوەر و بوونەكان دروستكار و بەڕێكار و هەڵسووڕێنەریان هەیە، بۆیە لە كاتی زۆر تەنگانە و ناخۆشییەكاندا ڕاستەوخۆ هاوار بۆ ئەو دەبەن، وەكوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا رَكِبُواْ فِي ٱلۡفُلۡكِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ إِذَا هُمۡ يُشۡرِكُونَ ۝٦٥﴾ [العنكبوت: ٦٥]، وە دەفەرموێت: ﴿جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ [يونس: ٢٢]. هەموو ئەم ئایەتانە باس لە كات و تەنگانەكانی ئادەمیزاد دەكات كە بە دەستی خوایە، وە ئەو توانای گۆڕانكاری و لادانی ناخۆشییەكانی هەیە بەسەر ئادەمیزادەوە.

(أَحْمَد بْنُ يَحْيَى ثَعْلَب) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: لَا أَعْلَمُ عَرَبِيًّا قَدَرِيًّا، قِيلَ لَهُ: يَقَعُ فِي قُلُوبِ الْعَرَبِ الْقَوْلُ بِالْقَدَرِ؟ قَالَ: مُعَاذَ اللهِ مَا فِي الْعَرَبِ إِلَّا مُثْبِتُ الْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ، أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ وَالْإِسْلَامِ(٢).

---

(١) "فتح الباري" لابن حجر (١١/٤٧٨).

(٢) "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (٣/ ٥٩٣) برقم (٩٤١).

واتە: عەرەبێکم نەدیوە باوەڕی بە قەدەر نەبێت، پێیان وت: لەناو دڵی عەرەبدا باوەڕنەبوون بە قەدەر هەبوو، وتی: پەنا ئەگرم بە خوا، ئەوەی کە لەناو عەرەبدا هەبوو باوەڕبوون بوو بە قەدەر لایەنی خێر و شەڕی، لە ئیسلام و پێش ئیسلامیشدا.

بەڵگەی عەقڵێش (العقل) شاهیدحاڵی ئەوەیە کە ئەم بوونەوەرانە بەو وورد و ڕێکخستن و پەیوەندییە وورد و تەواوکەرەی یەکترییەوە بە ڕێکەوت دروست نەبووە، گەر نا چۆن بەو شێوەیە دەمێنێتەوە و پێش دەکەوێت؟!

گەر عەقڵ بڕیاری ئەوە بدات کە خوای پەروەردگار دروستکاری بوونەوەرە؛ دەبێت ئەو بڕیارەش بدات کە لە بوونەوەرەکانیدا شتێك نییە بێ ویست و دانانی ئەو، وەکوو خۆی دەفەرموێت: ﴿لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ﴾ [الأعراف: ٥٤].

وە بە هەستکردنیش (الحس) وەکوو بینین و بیستن دەزانین کە قەدەرە باسکراوەکانی قورئان و فەرموودە بەردەوام لە هاتنەدیدایە، بۆیە باوەڕبوون بە قەدەر ڕاست و دروستە.

وە هەستدەکرێت کە باوەڕبوون بە قەدەر قورساییەکانی ژیان سووك دەکات و ئیمانداڕێك تا لەو بوارەدا کامڵتر بێت، ژیانێکی کامەرانتر و بە ئارامتر و ژیرانەتری لێ بەدیدەکرێت.

  

# پلەوپایەی قەدەر لە ئیماندا

## منزلة القدر في الإيمان

باوەڕبوون بە قەدەر یەکێکە لە پایەکانی ئیمان، کە بەبێ ئەو ئیمان تەواو نییە و خاوەنەکەی بەدەستی ناهێنێت.

وەك لە فەرموودەکەی (جبریل)دا ﷺ هاتووە کە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد: «قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الْإِيمَانِ، قَالَ: "أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ"»[1].

وە لە قورئاندا بە شێوەی هەواڵدان هاتووە، لەپاش باسکردنی دەسەڵاتی خوایی و خاوەنیەتی بوونەوەر، کە ئەمانە بۆخۆی لە چوارچێوەی باوەڕبوون بە خوا جَلَّجَلَالُهُ کۆدەبێتەوە، وەکوو خوای گەورە جَلَّوَعَلَا دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾﴾ [الفرقان: ٢]، وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾ [القمر: ٤٩]، وە دەفەرموێت: ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾﴾ [الأحزاب: ٣٨].

**گرنگی ئەم ڕوکنەی ئیمان لەناو ڕوکنەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە:**

**یەکەم:** قەدەر پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە باوەڕبوون بە خواوە جَلَّجَلَالُهُ گرێداوە، واتە لە ڕێگەی قەدەرەوە زیاتر شارەزایی لەسەر ناو و سیفاتە کامڵەکانی خوای پەروەردگار بەدەست دەهێنرێت، وەکوو سیفەتی (العلم، الإرادة، القدرة، والخلق ...) زانست و ویست و توانا و دروستکردنی خوای پەروەردگار، لەبەرئەوەی قەدەر لەسەر ئەمانە بنیاد نراوە، کە خوای گەورە بیسەر و بینەر و ئاگادار و خەبیر و بە لوتفە بەسەر بەندەکانیەوە، کەواتە تەواوکاری ناسینی تەواو و ڕاست و دروستی خوایە جَلَّجَلَالُهُ.

بۆیە وتراوە (القدر: قدرة الله)، (القدر نظام التوحيد)، قەدەر: باوەڕبوونە بە توانا و دەسەڵاتی

---

(١) رواه مسلم (٨)، وسبق تخريجه ص٢٥.

خوایی، قەدەر ڕێکخەر و ڕاگری باوەڕبوونە بە تاك و تەنیایی پەروەردگار.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ هۆکاری ئەوەی کە بە سەربەخۆ باسی قەدەر نەهاتووە لە قورئاندا وەکوو بەشەکانی تر، وەکوو چۆن لە فەرموودەدا هاتووە، لەبەر پەیوەندی تەواو و ڕاستەوخۆ و لێکنەپچڕاوی قەدەر بە (توحيد الربوبية والأسماء والصفات)ەوە.

دووەم: قەدەر پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی قووڵی بە ژیانی ئادەمیزادەوە بەستووە، بە شێوەیەك هیچ بوون و جووڵەیەك نییە کە لە قەدەردا نەبێت، وە لە هەموو کاتێکدا باوەڕبوون بە قەدەر و ڕازیبوون پێی، یاخود ئارامگرتن لەسەری و بیرخستنەوەی خۆت لەو بوارەدا کارێکی ئیمانی و عەقیدەیی ڕۆژانەیە.

بۆیە ئەوەندەی قەدەر لەناو ڕوکنەکاندا پێویستییەکی ئاشکرا و بەرجەستەیە، ئەوەندە ڕوکنەکانی تری وەکوو (الملائكة وكتبه ورسله ...) بەو ئەندازەیە بوارێکی ئیمانی کردەوەیی نییە، بۆیە بەردەوام باسی (القضاء والقدر) لە ژیاندا بوونی هەیە، ئەمە لە کاتێکدایە کە لە قورئاندا بە ڕیزبەندی لەگەڵ ڕوکنەکانی تر ناوی نەهاتووە، کە بەڵگەیە بۆ زۆر ڕوون و ئاشکرایی قەدەر کە کرۆکی ئیمانە و کاری خواییە و خوای گەورەش بەجیا لە خۆی ڕیزبەندی نەکردووە بۆ پەیوەستکردنی باوەڕبوون بە خوا و کارەکانی وەك تەواوکاری یەکتر، ئەمە شێوازی (توحيد) و باسی خوایە لە بانگەوازی پێغەمبەراندا بۆ ناسینی خوا جَلَّجَلَالُهُ.

(ابن القيم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: ... معرفة المعبود سبحانه بأسمائه وصفاته وأفعاله، إذ على هذه المعرفة تنبني مطالب الرسالة جميعها[(١)].

واتە: هەموو شەریعەت و یاسا و داواکارییەکانی بەرنامەی خوا لەسەر ناو و سیفاتەکانی بنیاد نراوە، واتە هەر یاسا و شەرعێکی خوا لەژێر ناو و سیفاتێکی خوادا جێگەی دەبێتەوە و پەیوەستە پێوەی.

وە هەروەها کامڵترین ڕێگەی ناسینی خوا بە ڕێگەی ناسینی خۆیەتییە، واتە ناو و سیفاتەکانی، نەك دروستکراوەکانی.

(١) "الصواعق المرسلة" لابن القيم (١/ ١٥٠).

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت**: ولهذه المْعرفَة بَابَانِ واسعان: بَاب التفكّر والتأمّل فِي آيَات الْقُرْآن كلهَا والفهم الْخَاص عَن الله وَرَسُوله، وَالْبَاب الثَّانِي التفكّر فِي آيَاته المشهودة، وَتَأمل حكمته فِيهَا وَقدرته ولطفه وإحسانه وعدله ... فَقِيها فِي الحكم الديني الشَّرْعِيّ وَالْحكم الكوني القدري[1].

**واتە: بۆ ناسینی خوا جَلَّجَلَالُهُ دوو دەرگای فراوان هەیە، دەرگای تێڕوانین و بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی قورئان و تێگەیشتنی تایبەت لە خوا و پێغەمبەرەکەی، دەرگای دووەم بیرکردنەوە و تێڕوانینە لە دەسەڵاتەکانی لەناو دروستکراوەکانیدا، لە بەتوانایی و حیکمەت و سۆز و چاکە و دادوەری لەناویاندا ... کەسێك بەم دوو ڕێگەیە ئاشنابێت و بیگرێتە بەر؛ ئەوە شارەزا دەبێت لە هەردوو یاسا و قەدەرەکەی پەروەردگار (القدر الكوني والقدر الشرعي).**

**ئەوەی ناتەواوی ئەمڕۆیە لە زانستی موسوڵمانانداا خوێندنەوەی ئەم دوو قەدەرەیە لە کەسێکدا، یاخود لە یاسایەکی شەرعیدا، لە کاتێکدا پێویستە یاسا و عوزرەکانی بە گوێرەی قەدەرە کەونییەکە بخوێنینەوە و ئەوکات یاسا شەرعییەکان جێبەجێ بکەین بەسەریدا، ئەوکاتەش حوکم یاخود هەڵسەنگاندنە شەرعییەکە شوێنی خۆی دەگرێت.**

**سێیەم: قەدەر هەڵسەنگاندنێکی حەقیقییە لەسەر ڕاست و دروستی ئیمان و خاڵی تاقیکردنەوەی بەهێزە بۆ ئاشنایی و سنووری پەیوەندی بەندەکانە لەگەڵ خوای خۆیاندا، وە ڕێژەی دڵنیایی و ڕاستگۆیی و پشتبەستنە (توکل ويقين ...)ە بەوەوە، بۆیە خاوەن ئیمانی تەواو کاملترین کەسە لە قەدەردا، وە کامەرانترین کەسە لە ژیانی دونیادا.**

  

(١) "الفوائد" لابن القيم ص١٧٠.

# پـــایــەکــانی قــەدەر

## أركان القدر

ڕوکن و پایەکانی قەدەر لـەسەر چوار بنەما بنیاد نراوە، تێگەیشتنی ئەم پایانە قۆناغ بە قۆناغی هۆکارێکە بۆ تێگەیشتنی قەدەر بە شێوەی تەواوی خۆی، هەندێکیان گرێدراوە و پەیوەندییان بە هەندێکی تریانەوە هەیە، گەر هەرکەسێك باوەڕی تەواوی بە هەر چواریان هەبێت؛ ئەوا ئیمانی بە قەدەر تەواوە، وە گەر یەکێکیانی ناتەواو بوو؛ ئەوا کەلێن و ناتەواوی بەو گوێرەیە دەکەوێتە ئیمانی، وە هۆکاری کاملبوونی لـە قەدەردا بڕیارە لـەسەر یەك بە یەکی قۆناغەکانی.

### پایەکانی قەدەر چوارن:

### پایەی یەکەم: زانستی پەروەردگار (العلم).

لـەم قۆناغەدا پێویستە ئیماندار باوەڕی بە عیلـم و زانستی خوای پەروەردگار هەبێت بەسەر هەموو شتێکدا بە شێوەی درشت و وورد، گەر پەیوەندی بە کارەکانی خوا خۆیەوە بێت، یاخود کردەوەی بەندەکانی، لـەوەی بووە لـەمەوپێش، وە ئەوەی کە ئێستا هەیە، وە ئەوەشی کە لـەمەودوا دەبێت، یاخود ئەوەی کە نەبووە و گەر ببێت چۆن دەبێت لـە (الموجود، المعدوم، الممكن، المستحيل) بوونەکان یا نەبوونەکان، یاخود ئەوانەی قابیلی بوونن، یا ئەوانەی کە قابیلی بوون نین.

باوەڕبوون بەوەی کە گەردیلەیەك ون نییە لـە زانستی خوا جَلَّ وَعَلَا لە ئاسمان و زەویدا، ڕزق و ڕۆزی و تەمەن و قسە و کردار و جوولـەکانیان و دواڕۆژیان؛ هەمووی خوا زانا و شارەزایە بەسەریاندا.

### بەڵگەکانی ئەم پایەیە لە قورئان و فەرموودەدا:

❁ بەڵگە قورئانییەکان:

١. قال الله تعالى: ﴿لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عِلۡمَۢا ١٢﴾ [الطَّلَاقِ: ١٢].

پاش باسی دروستکردنی بوونەوەرەکان، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: هەمووی لـە پێناوی ئەوەدایە کە بەندەکان بزانن تـوانا و زانستی خوا (العـلم والقدرة) هەموو شتێکی گرتووەتەوە ، وە

مەبەست لە دروستکردنی بوونەوەرەکان و فەرمانەکانی؛ ناسینی خوا و بەندایەتیکردنیەتی(١).

٢. قال الله تعالى: ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۖ﴾ [الحشر: ٢٢].

هەواڵ دەدات لەسەر ئەوەی کە خوایەکە و بێجگە لەو خوایەکی تر بە حەق نییە، خاوەنی زانین و زانستە بەسەر هەموو بوونەوەران و ئەوانەی کە هەن و ئاشکران، کە ئێمە پێیان دەزانین، وە ئەوانەشی کە لە ئێمە شاراواتەوە، وە هیچ شاراوەیەك نییە لای ئەو، نە لە ئاسمان و نە لە زەویدا، بە وورد و درشتییەوە(٢).

٣. قال الله تعالى: ﴿عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِۖ لَا يَعۡزُبُ عَنۡهُ مِثۡقَالُ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَآ أَصۡغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرُ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٣﴾ [سبأ: ٣].

بۆ دڵنیایی هاتنی ڕۆژی دوایی؛ دڵنیایی دەدات بەسەر ئەوەی کە هیچ شتێك لە زانستی خوادا شاراوە نییە، هەر لە گەردیلەیەکەوە تاوەکوو گەورەتر لە ئاسمانەکان و زەوییەکان، هەرهەمووی تۆمار کراوە بە زانستی ووردەوە لە (اللوح المحفوظ)دا(٣).

٤. قال الله تعالى: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٥٩﴾ [الأنعام: ٥٩].

ئەم ئایەتە گەورەترین ئایەتە لەسەر ووردەکاری زانستی خوا بەسەر شتەکاندا، ئەوەی لە وشکانییەکاندایە لە گیانلەبەران و درەخت ... وە ئەوەشی کە لە دەریاکاندایە، وە گەڵای دارێك ناوەرێت خوای گەورە ئاگادارە بەسەریدا، وە هیچ دانەوێڵەیەك نییە لە ناخی زەویدا کە دەڕوێت، وە هەرچییەك لە تەڕ و وشك هەیە هەموویان تۆمارکراون لە (اللوح المحفوظ)دا و خوا زانایە بەسەر بوونیاندا کە چی دەبن و چۆن دەبن(٤).

---

(١) "تفسير السعدي" ص٨٧٢.

(٢) "تفسير ابن كثير" (٨/ ٧٩).

(٣) "تفسير السعدي" ص٦٧٤.

(٤) "تفسير السعدي" ص٢٥٩.

٥ . قال الله تعالى: ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿١٢٥﴾﴾ [النحل : ١٢٥].

**خوای پەروەردگاری تۆ زانایە بە هۆکاری گومڕایی و کار و کردەوەکانیان لەسەری، هەر ئەو زانایە بەسەر ئەوانەی کە هیدایەت وەردەگرن و شایستەیی ئەوەیان تیادایە، وە هەموویان لە بەرامبەردا پاداشت و سزا دەکات**[١].

٦ . قال الله تعالى: ﴿أَوَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ الْعَالَمِينَ ﴿١٠﴾﴾ [العنكبوت : ١٠].

**ئەوە خوای پەروەردگار زانا نییە بەوەی کە لە دڵیاندایە و ئەوانەی کە لە ناخیاندا شاراوەیە؟! ئەگەرچی لە ڕووکەشیشدا دەیشارنەوە و خۆدەگونجێنن لەگەڵ بەرامبەردا**[٢].

٧ . قال الله تعالى: ﴿وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَيْءٍ عَدَدًا ﴿٢٨﴾﴾ [الجن : ٢٨].

**خوای پەروەردگار زانا و ئاگادارە بە هەموو ئەوانەی کە لایان هەیە، وە زاناشە بەسەر ژمارەی شتەکاندا و هیچ شتێك شاراوە نییە لای**[٣].

**بەڵگە فەرموودەییەکان:**

١ . عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ أَوْلاَدِ الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ: **«اللهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ»**[٤].

**واتە: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە منداڵی بێباوەڕان، فەرمووی: خوا زانایە بەو کارانەی کە دەیانکرد ئەگەر لە ژیاندا بوونایە.**

(١) "تفسير السعدي" ص٤٥٢، و"تفسير الطبري" (١٧/ ٣٢١).

(٢) "تفسير ابن كثير" (٦/ ٢٦٥).

(٣) "تفسير الطبري" (٢٣/ ٦٧٤).

(٤) رواه البخاري (٦٥٩٧)، ومسلم (٢٦٦٠)، وأبو داود (٤٧١١)، والنسائي في "الكبرى" (٢٠٨٩)، وأحمد في "المسند" (١٨٤٥)، والطبراني في "الكبير" (١٢٤٤٨)، والطيالسي في "مسنده" (٢٧٤٦)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٦١١)، والآجري في "الشريعة" (٤٠١)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٠٩٠)، والفريابي في "القدر" (١٦٨) عن أبي هريرة.

٢. قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ نَفْسٍ إِلَّا وَقَدْ عُلِمَ مَنْزِلُهَا مِنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ»[(١)].

واتە: هەر نەفسێك لە ئێوە لە زانستی خوادا هەیە و دەزانێت شوێنی لە بەهەشتە یا لە دۆزەخ.

٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ الله ﷺ قَالَ: «يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلائِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلائِكَةٌ بِالنَّهَارِ، وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلاةِ الفَجْرِ وَصَلاةِ العَصْرِ، ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ، فَيَسْأَلُهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ: كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي؟ فَيَقُولُونَ: تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ، وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ»[(٢)].

واتە: بەدوای یەكدا مەلائیكەكانی شەو و ڕۆژ لەگەڵتاندا دەبن لەپاش نوێژی بەیانی و عەسر، وە ئەوانەی كە شەو لەگەڵتاندا بوون كاتێك دەگەڕێنەوە خوا پرسیاری ئێوەیان لێدەكات كە چۆن بەندەكانی منتان بەجێهێشتووە؟ لەگەڵ ئەوەشدا شارەزا و زانایە بەسەریاندا ... .

٤. لە دووعای ئیستیخارەدا: عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعَلِّمُنَا الِاسْتِخَارَةَ فِي الأُمُورِ كُلِّهَا، كَالسُّورَةِ مِنَ القُرْآنِ: «... وَتَعْلَمُ وَلاَ أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلَّامُ الغُيُوبِ، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ ...»[(٣)].

واتە: خوای پەروەردگار تۆ زانایت بەسەریدا، من نەزانم، تۆ زانای بەسەر شاراوە و نادیارەكاندا.

---

(١) رواه البخاري (٤٩٤٧)، ومسلم (٢٦٤٧)، والترمذي (٢١٣٦)، والنسائي في "الكبرى" (١١٦١٥)، وابن ماجه (٧٨)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٣٥)، وأحمد في "المسند" (٦٢١)، والبزار في "المسند" (٥٨٣)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٤٤)، والآجري في "الشريعة" (٣٢٧)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٠٦٣).

(٢) رواه البخاري (٥٥٥)، ومسلم (٦٣٢)، والنسائي في "الكبرى" (٤٥٩)، وابن حبان في "صحيحه" (١٧٣٦)، ومالك في "الموطأ" (٥٩٠)، وأحمد في "المسند" (٧٤٩١)، والبزار في "المسند" (٨٢٥٢)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٣٣٠)، والطبراني في "الشاميين" (٣٢٧٥)، والبيهقي في "الشعب" (٢٥٧٧)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٨٠).

(٣) رواه البخاري (٦٣٨٢)، وأبو داود (١٥٣٨)، والترمذي (٤٨٠)، والنسائي في "الكبرى" (٥٥٥١)، وابن ماجه (١٣٨٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٨٨٧)، وأحمد في "المسند" (١٤٧٠٧)، والبزار في "المسند" (١٥٢٨)، والطبراني في "الكبير" (١٠٠١٢)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٩٤٠٢)، والبيهقي في "الشعب" (٢٠٢) عن أبي سعيد الخدري، وابن أبي عاصم في "السنة" (٤٢١)، والبغوي في "شرح السنة" (١٠١٦).

٥. قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: «خَمْسٌ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا اللهُ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾ ﴾ [لقمان: ٣٤] »[١].

**واتە: پێنج کار هەیە زانینی بەس لای خوای پەروەردگار هەیە ... .**

٦. قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: «... **عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ** ...»[٢].

**واتە: ئەی خوای خاوەن زانست و زانین بەسەر دیار و نادیارەکاندا ... .**

**بەڵگەی عەقڵی لەسەر زانستی خوا (الأدلة العقلية على علم الله):**

١. (**ابن أبي العز** رَحِمَهُ اللهُ) **دەڵێت**: أَنَّهُ يَسْتَحِيلُ إِيجَادُهُ الْأَشْيَاءَ مَعَ الْجَهْلِ، ... فَكَانَ الْإِيجَادُ مُسْتَلْزِمًا لِلْإِرَادَةِ، وَالْإِرَادَةُ مُسْتَلْزِمَةً لِلْعِلْمِ، فَالْإِيجَادُ مُسْتَلْزِمٌ لِلْعِلْمِ، وَلِأَنَّ الْمَخْلُوقَاتِ فِيهَا مِنَ الْأَحْكَامِ وَالْإِتْقَانِ مَا يَسْتَلْزِمُ عِلْمَ الْفَاعِلِ لَهَا[٣].

**واتە: ئەستەمە هێنانەدی شتەکان بە نەزانینەوە ... لەبەرئەوەی دروستکردن پێویستی بە ویست و مەبەستی پێشوەختە هەیە، وە مەبەست و ویستیش پێویستی بە زانست هەیە لەسەری، بۆیە دروستکردن و هێنانەدی بوونەکان بە زانستی تەواوەوە نەبێت ناکرێت، کەواتە دەبێت پەروەردگار خاوەنی زانستی تەواو بێت، بەتایبەت ئەم بوونەوەرانە، کە دروستکراوەکان بەوپەڕی تەواو و تۆکمەییەوە دروستکراون، کە بۆخۆی بەڵگەنەویستە لەسەر پێویستی زانستی تەواو بەسەریاندا.**

---

(١) رواه البخاري (٤٧٧٨) عن ابن عمر، وأحمد في "المسند" (٢٢٩٨٦) واللفظ له، وقال شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره، والبزار في "المسند" (٤٤٠٩)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٩١٤)، و "صحيح الجامع الصغير" (٣٢٥٥).

(٢) رواه البخاري في "الأدب المفرد" (١٢٠٢)، وأبو داود (٥٠٦٧)، والترمذي (٣٣٩٢)، والنسائي في "الكبرى" (٧٦٤٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٩٦٢)، وأحمد في "المسند" (٥١)، والدارمي في "سننه" (٢٧٣١)، والحاكم في "المستدرك" (١٨٩٢) وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، والبزار في "المسند" (٩٦٦٦)، وأبو يعلى في "مسنده" (٧٧)، والطبراني في "الشاميين" (٨٤٩)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٦٥٢٣)، والبيهقي في "الدعوات الكبير" (٢٩).

(٣) "شرح الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٩٩.

٢. (ابن أبي العز) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: نَحْنُ نَعْلَمُ بِالضَّرُورَةِ أَنَّ الْخَالِقَ أَكْمَلُ مِنَ الْمَخْلُوقِ، وَأَنَّ الْوَاجِبَ أَكْمَلُ مِنَ الْمُمْكِنِ ...[١].

**واتە: بە زانستێکی پێویستی دەزانین کە دەبێت دروستکار خاوەنی هەموو تەواوییەك و کاملتر بێت لە دروستکراو، بۆیە ئەوەی کە دەبێت "بە پێویست بوونی ببێت" (واجب الوجود) واتە (خالق)؛ کاملترە لەوەی کە "دەشێت و قابیلی بوونە" واتە (مخلوق)، بەم یاسایە دەبێت پەروەردگار بە شێوەی پێویستی تەواو (واجب) خاوەنی زانستی تەواو بێت.**

٣. (ابن أبي العز) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: كُلُّ عِلْمٍ فِي الْمُمْكِنَاتِ، الَّتِي هِيَ الْمَخْلُوقَاتُ فَهُوَ مِنْهُ، وَمِنَ الْمُمْتَنَعِ أَنْ يَكُونَ فَاعِلُ الْكَمَالِ وَمُبْدِعُهُ عَارِيًا مِنْهُ بَلْ هُوَ أَحَقُّ بِهِ ... بَلْ كُلُّ مَا ثَبَتَ لِلْمَخْلُوقِ مِنْ كَمَالٍ فَالْخَالِقُ بِهِ أَحَقُّ، وَكُلُّ نَقْصٍ تَنَزَّهَ عَنْهُ مَخْلُوقٌ مَا فَتَنْزِيهُ الْخَالِقِ عَنْهُ أَوْلَى[٢].

**واتە: هەموو زانستێك کە لای دروستکراوەکانە لەلایەن خواوە پێیان بەخشراوە کە دروستکاریانە، لەبەرئەوە ڕێگری لەوە دەکرێت کە دروستکاری کاملییەکان و هێنەرەدییان خۆی بێبەش بێت لێی، بەڵکوو خۆی لەپێشتر و شایستەترە بە کاملتر تیایدا.**

**هەرچییەك کە دانراوە بۆ کاملبوونی دروستکراوەکان؛ پەروەردگاریان لەپێشتر و شایستەترە بۆی، وە هەموو ناتەواوییەك کە دروستکراوەکان دەیانەوێت تیایاندا نەبێت؛ پەروەردگار لەپێشترە کە تیای نەبێت و بۆی بڕیار نەدرێت و بێگەرد بکرێت لێی.**

**بەم یاسایەش دەبێت پەروەردگاری مەزن خاوەنی تەواوترین و کاملترین زانست بێت بەسەر هێنانەدی و دروستکردنی هەموو بوونەوەرەکاندا، وە بەسەر پێش و پاش و ناوەڕۆك و چۆنیەتی وردەکارییەکانی بوونیاندا، بۆیە خوای گەورە پرسیار دەکات و دەفەرموێت:** ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴿١٤﴾﴾ [الملك: ١٤]. **ئەوەی بوونەوەرەکانی دروستکردووە بە تەواوی و ڕێك و پێکی ئایا زانا نییە بەسەریاندا؟ وە هەر خۆشی بەسۆزە لەگەڵیان و وردەکارە[٣].**

**ئەم عیلم و زانستەی خوا بە ئاشکرا دەبینرێت لە هەواڵەکانی ڕابوردوودا کە هاتوونەتەدی، وە لە یاسا شەرعییەکانی خوادا کە خاوەنی عیلم و زانستی تەواوە.**

(١) (٢) "شرح الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٩٩.
(٣) "تفسير السعدي" ص٨٧٦.

**پایەی دووەم: نووسین (الكتابة).**

پایەی دووەمی قەدەر باوەڕبوونە بەوەی کە خوای پەروەردگار لە (اللوح المحفوظ)دا ووردەکاری هەموو دروستکراوەکانی بە وورد و درشتەوە تۆمار کردووە، بەبێ پەڕینی هیچ شتێك تیایدا، بە پەنجا هەزار ساڵ پێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی، لە شتێکدا کە ناوی دەبات بە (اللوح المحفوظ، أم الكتاب، الذكر، الإمام المبين، الكتاب المبين).

**بەڵگەکانی ئەم پایەیە لە قورئان و فەرموودەدا:**

**❁ بەڵگە قورئانییەکان:**

١. قال الله تعالى: ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾﴾ [الأنعام: ٣٨].

لە (اللوح المحفوظ)دا هیچ شتێکمان پشتگوێ نەخستووە و بێئاگا نین لێی، هەموویان بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە و کۆدەبنەوە لە دواڕۆژدا[1].

٢. قال الله تعالى: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَابٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾﴾ [الحج: ٧٠].

لە تەواوی زانستی پەروەردگار زانایەتییەتی بەسەر شتەکاندا پێش بوونیان و دانانیان و هێنانەدییان لە ئاسمان و زەویدا، هەموو ئەمانە لای خۆی نووسیویەتی و زانایە بەسەریاندا و کارێکی ئاسانە بۆی[2].

٣. قال الله تعالى: ﴿وَمَا مِنْ غَائِبَةٍ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿٧٥﴾﴾ [النمل: ٧٥].

هەرشتێك نەهاتبێتەدی و شاراوە و نادیار بێت لە جیهانی سەروو و خوارەوە، تۆمار کراوە لە (اللوح المحفوظ)دا[3].

٤. ناوەکانی (اللوح المحفوظ): قال الله تعالى: ﴿بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ ﴿٢٢﴾﴾ [البروج: ٢١، ٢٢]، ﴿وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿١٢﴾﴾ [يس: ١٢]، ﴿وَالطُّورِ ﴿١﴾ وَكِتَابٍ مَّسْطُورٍ ﴿٢﴾ فِي رَقٍّ

---

(١) "تفسير السعدي" ص٢٥٥.

(٢) "تفسير ابن كثير" (٥/ ٤٥٢).

(٣) "تفسير السعدي" ص٢٥٥.

مَّنشُورٍ ﴿٣﴾ [الطور: ١-٣]، ﴿وَإِنَّهُۥ فِيٓ أُمِّ ٱلۡكِتَٰبِ لَدَيۡنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ [الزخرف: ٤]، ﴿وَلَقَدۡ كَتَبۡنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعۡدِ ٱلذِّكۡرِ أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴿١٠٥﴾ [الأنبياء: ١٠٥].

٥. قال الله تعالى: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآ﴾ [الحديد: ٢٢].

هەموو جۆرە ڕووداوێك كە تووشی دروستكراوەكان دەبێت لە خێر و لە شەڕ، هەمووی لە (اللوح المحفوظ)دا بە گەورە و بچووكەوە نووسراوە، پێش ئەوەی دروستیان بكەین[١].

**بەڵگە فەرموودەییەكان:**

١. عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله ﷺ يَقُولُ: «كَتَبَ اللهُ مَقَادِيرَ الْخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، قَالَ: وَعَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ»[٢].

واتە: خوای پەروەدگار ڕێژە و دیاریكردنی بوونەوەرەكانی نووسیوە بە پەنجا هەزار ساڵ پێش ئەوەی ئاسمانەكان و زەوی دروست بكات، ئەو كاتە عەرشەكەی لەسەر ئاو بوو، مەبەست پێی كاتی نووسینیەتی، نەك زانستی بۆیان، بەڵكوو زانستی بۆیان ئەوە هەر بووە و ئەزەلییە، سەرەتای نییە[٣].

٢. عَنْ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا خَلَقَ اللهُ الْقَلَمَ، فَقَالَ لَهُ: اكْتُبْ، قَالَ: رَبِّ وَمَاذَا أَكْتُبُ؟ قَالَ: اكْتُبْ مَقَادِيرَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ»[٤].

---

(١) "تفسير السعدي" ص٨٤٢.

(٢) رواه مسلم (٢٦٥٣)، والترمذي (٢١٥٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٦١٣٨)، وأحمد في "المسند" (٦٥٧٩)، والحاكم في "المستدرك" (٥)، والبزار في "المسند" (٢٤٥٦)، والطبراني في "الكبير" (٨٠)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٥)، وابن بطة في "الإبانة" (١٣٤٥)، والآجري في "الشريعة" (٣٤١)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٠٢٦)، والبغوي في "شرح السنة" (٦٧)، والفريابي في "القدر" (٨٥).

(٣) "شرح النووي على مسلم" (١٦/ ٢٠٣).

(٤) رواه أبو داود (٤٧٠٠)، والترمذي (٣٣١٩)، وأحمد في "المسند" (٢٢٧٠٧)، والبزار في "المسند" (٢٦٨٧)، والطيالسي =

واتە: یەکەم شتێك لەدوای عەرشەوە کە خوای گەورە دروستی کرد قەڵەم بوو[١]، کاتێك دروستی کرد فەرمووی: بنووسە، وتی: خوای من چی بنووسم؟ فەرمووی: بنووسە ڕێژە و بوونی هەموو ئەو شتانەی کە دەبێت تا ڕۆژی دوایی.

**پایەی سێیەم: مەبەست و ویستەکان (الإرادة والمشيئة).**

لەم پایەیەدا پێویستە ئیماندار باوەڕی بە ویستی ڕەهای پەروەردگار هەبێت بەسەر دروستکراوەکانیدا، کە هەموو بوون و هاتنەدییەکان بە ویستی ئەو دەبێت، وە هیچ ویست و ئیرادەیەك نییە پێشی بکەوێت، بەڵکوو هەموویان لەناو ویست و ئیرادەی ئەودان، هەر ئەو دروستی کردوون و هەر ئەویش ئەیانبات بەرێوە، خوا و خاوەنیانە.

**بەڵگەکانی ئەم پایەیە لە قورئان و فەرموودەدا:**

**❁ بەڵگە قورئانییەکان:**

١. قال الله تعالى: ﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِي ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ ۖ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾﴾ [آل عمران: ٢٦].

ئەی (محمد) ﷺ خوای خۆت پایەدار بکە، بەوەی بڵێ ئەی خوای دروستکراوەکان، موڵك و دەسەڵات دەبەخشیت بەوەی کە ویستت لێیەتی، وە ئەوانەی ویستت لێبێت لێیان دەسێنیتەوە، ئەوەی ویستت لێبێت پایەداری دەکەیت، وە ئەوەیشی کە ویستت لێیە زەلیلی دەکەیت، هەموو خێرەکان بە دەستی تۆیە، هەر تۆی بەسەر هەموو بوونێکدا باڵادەستیت (دەڵێن ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەسەر داواکاری پێغەمبەر ﷺ، کە دەسەڵاتی فارس و ڕۆمەکان بخاتە ژێر دەستی گەلەکەی، ئەوەبوو هاتە دی)[٢].

٢. قال الله تعالى: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ﴾ [القصص: ٦٨].

---

= في "مسنده" (٥٧٨)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٨٧٥)، وابن بطة في "الإبانة" (١٣٦٣)، والآجري في "الشريعة" (١٨١)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٣٥٧)، وأبو نعيم في "الحلية" (٥/ ٢٤٨)، والفريابي في "القدر" (٤٢٥)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٢٠١٧).

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص١٧.

(٢) "تفسير الطبري" (٦/ ٣٠٠)، و"تفسير ابن كثير" (٢/ ٢٩).

هەواڵی خواییە لەسەر ئەوەی تەنیایە لە هەڵبژاردن و بەڕێوەبردنی دروستکراوەکاندا، بەشدار و پشتگیرییەك نییە بۆی[(١)].

٣. قال الله تعالى: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾﴾ [التكوير: ٢٩].

هیچ ویست و ئیرادەیەك نییە لە یارمەتیدانی هیدایەت و گومڕایی و خێر و شەڕ، بێجگە لە ویستی پەروەردگاری هەموو جیهان نەبێت[(٢)].

٤. قال الله تعالى: ﴿إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾﴾ [هود: ١٠٧]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿١٤﴾﴾ [الحج: ١٤].

خوای پەروەردگار لەپاش باسی بەهەشت و جەهەننەم، باس لەوە دەکات کە ئەوەی ئەو دەیەوێت دێتە دی[(٣)].

٥. قال الله تعالى: ﴿إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾﴾ [يس: ٨٢].

ئەگەر خوای پەروەردگار ویستی پەیوەست بوو بە کارێك؛ ئەوا بە کەمترین وشە کە وشەی ببە (كُنْ)ە دێتە دی، وە بە نزیکترین کات دێتە دی، بەبێ هیچ هۆکار و پێویستییەك، بەڵکوو ڕاستەوخۆ دێتە دی (فَيَكُون)[(٤)].

### بەڵگە فەرموودەییەکان:

١. قَالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ، وَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ وَاللهُ يُعْطِي، وَلَنْ تَزَالَ هَذِهِ الأُمَّةُ قَائِمَةً عَلَى أَمْرِ اللهِ، لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ، حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللهِ»[(٥)].

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٦/ ٢٥١).

(٢) "تفسير البغوي" (٥/ ٢١٨).

(٣) "تيسير الكريم الرحمن" للسعدي ٥٣٥.

(٤) "التحرير والتنوير" لابن عاشور (٣٣/ ٧٩).

(٥) رواه البخاري (٧١)، ومسلم (١٠٣٧)، والطبراني في "الكبير" (٧٥٥)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (١٦٨٣)، والبيهقي في "المدخل" (٣٥١)، وابن عبد البر في "الجامع" (٨٤)، والبغوي في "شرح السنة" (١٣١).

واتە: ئەو کەسەی کە خوای گەورە ویستی خێری پێبێت؛ شارەزای دەکات لە دیندا، لە ڕاستیدا من تەنها دابەشکارم، خوا دەیبەخشێت، بەردەوام ئەم گەلە لەسەر جێبەجێکردن و بەڕێوەبردنی فەرمانەکانی خوان، هیچ دژایەتیکارێکیان زیانیان پێ ناگەیەنن، تاوەکوو فەرمانی خوا جَلَّجَلَالُهُ دێتە دی.

٢. عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ قُلُوبَ بَنِي آدَمَ كُلَّهَا بَيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ، كَقَلْبٍ وَاحِدٍ، يُصَرِّفُهُ حَيْثُ يَشَاءُ»[١].

واتە: هەموو دڵی ئادەمیزاد لە نێوان دوو پەنجەی پەروەردگاردان، وەکوو یەك دڵ، هەڵیان دەسووڕێنێت بە ویستی خۆی.

٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «... وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ، فَلَا تَقُلْ لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ قَدَرُ اللهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ»[٢].

واتە: ئەگەر هەرشتێکت تووش بوو مەڵێ گەر من ئەوەم بکردایە وا دەبوو، وە وا دەبوو، بەڵکوو بڵێ: دانانی خواییە، چی ویستی لێبێت ئەوە دەبێت، وشەی (ئەگەر) دەرگای کار بۆ شەیتان دەکاتەوە.

٤. دەقی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ زۆرە لەسەر ویست و ئیرادەی خوایی لەسەر کارەکان:

- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِالْأَمِيرِ خَيْرًا جَعَلَ لَهُ وَزِيرَ صِدْقٍ، إِنْ نَسِيَ ذَكَّرَهُ، وَإِنْ ذَكَرَ أَعَانَهُ، وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهِ غَيْرَ ذَلِكَ جَعَلَ لَهُ وَزِيرَ سُوءٍ، إِنْ نَسِيَ لَمْ يُذَكِّرْهُ، وَإِنْ ذَكَرَ لَمْ يُعِنْهُ»[٣]. واتە گەر خوا ویستی خێری بە کاربەدەستێك بێت؛ وەزیرێکی

---

(١) رواه مسلم (٢٦٥٤)، والنسائي في "الكبرى" (٧٦٩٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٩٠٢)، وأحمد في "المسند" (٦٥٦٩)، والبزار في "المسند" (٢٦٤٠)، والطبراني في "الكبير" (٧٩)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٣١٣)، وابن بطة في "الإبانة" (٢٠٣)، والآجري في "الشريعة" (٧٢٧)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٧١٠).

(٢) رواه مسلم (٢٦٦٤)، وسبق تخريجه ص٢٦.

(٣) رواه أبو داود (٢٩٣٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٤٩٤)، وأحمد في "المسند" (٢٤٤١٤) وصححه الأرنؤوط، =

ڕاستگۆی دەکاتە هاوەڵ.

- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِذَا أَرَادَ اللهُ بِعَبْدِهِ الخَيْرَ عَجَّلَ لَهُ العُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا، وَإِذَا أَرَادَ اللهُ بِعَبْدِهِ الشَّرَّ أَمْسَكَ عَنْهُ بِذَنْبِهِ حَتَّى يُوَافِيَ بِهِ يَوْمَ القِيَامَةِ»[(١)]. واتە ئەگەر خوا ویستی خێری بە بەندەیەکی بوو؛ هەر لە دونیادا پاکی دەکاتەوە.

- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِذَا أَرَادَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ بِأَهْلِ بَيْتٍ خَيْرًا، أَدْخَلَ عَلَيْهِمُ الرِّفْقَ»[(٢)]. واتە ئەگەر خوا ویستی خێری بە خێزانێك هەبێت؛ لەسەرخۆیی و لێبوردەیی دەخاتە ناویانەوە.

- عَنْ أَبِي عَزَّةَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَرَادَ اللهُ قَبْضَ عَبْدٍ بِأَرْضٍ جَعَلَ لَهُ بِهَا حَاجَةً»[(٣)]. واتە ئەگەر خوا ویستی مردنی کەسێکی هەبێت لە شوێنێکدا؛ پێویستی دەخاتە ئەو شوێنەوە.

- عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ إِذَا أَرَادَ رَحْمَةَ أُمَّةٍ مِنْ عِبَادِهِ، قَبَضَ نَبِيَّهَا قَبْلَهَا، فَجَعَلَهُ لَهَا فَرَطًا وَسَلَفًا بَيْنَ يَدَيْهَا، وَإِذَا أَرَادَ هَلَكَةَ أُمَّةٍ، عَذَّبَهَا وَنَبِيُّهَا حَيٌّ،

---

= والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٣٢٠)، وفي "الأسماء والصفات" (٣١٤)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٤٨٩)، و"صحيح الجامع الصغير" (٣٠٢).

(١) رواه الترمذي (٢٣٩٦)، والحاكم في "المستدرك" (٨٧٩٩) وسكت عنه الذهبي، وأبو يعلى في "مسنده" (٤٢٥٤)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٠٥٠)، والبيهقي في "الأسماء والصفات" (٣١٦)، والبغوي في "شرح السنة" (١٤٣٥)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٢٢٠)، و"صحيح الجامع الصغير" (٣٠٨).

(٢) رواه أحمد في "المسند" (٢٤٤٢٧) وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، والبيهقي في "الشعب" (٦١٤٠)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٢١٩)، و"صحيح الجامع الصغير" (٣٠٣).

(٣) رواه البخاري في "الأدب المفرد" (١٢٨٢)، والترمذي (٢١٤٦) عَنْ مَطَرِ بْنِ عُكَامِسٍ، وابن حبان في "صحيحه" (٦١٥١)، وأحمد في "المسند" (٢١٩٨٣) عَنْ مَطَرِ بْنِ عُكَامِسٍ، وقال شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره، والحاكم في "المستدرك" (١٢٧) وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ، والبزار في "المسند" (١٨٨٩) عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ، وأبو يعلى في "مسنده" (٩٢٧)، والطبراني في "الكبير" (٧٠٦)، والطيالسي في "مسنده" (١٤٢٢)، والبيهقي في "الشعب" (٩٤٢٤)، وأبو نعيم في "الحلية" (٨/ ٣٧٤)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٢٢١)، و"صحيح الجامع الصغير" (٣١١)، و"المشكاة" (١١٠).

فَأَهْلَكَهَا وَهُوَ يَنْظُرُ، فَأَقَرَّ عَيْنَهُ بِهَلَكَتِهَا حِينَ كَذَّبُوهُ وَعَصَوْا أَمْرَهُ»(١). واتە ئەگەر خوا ویستی بەزەیی هاتنەوەی هەبێت بە گەلێکدا، ئەوا مردنی پێغەمبەرەکەیان پێشدەخات، وە ئەگەر ویستی تیاچوونی گەلێکی هەبێت، ئەوا تیاچوونی گەلەکە پێش مردنی پێغەمبەرەکەیان دەخات، بۆ تۆڵەلێکردنەوەیان.

## پایەی چوارەم: دروستکردن (الخلق).

لەم پایەیەدا باوەڕدار دەبێت باوەڕی بەوە بێت کە هەرچی لە بووندا هەیە هەموویان بە خۆیان و سیفەت و جووڵەیانەوە، خوای پەروەردگار لە نەبوونەوە هێناونیەتە دی، هیچ شتێك نییە پەروەردگار داهێنەر و دروستکاری نەبێت، لەوانە تەنانەت کار و کردەوەی بەندەکانی و جووڵەیان، هەروەکوو چۆن خۆیانی دروستکردووە؛ کار و کردەوەکانیشی دروست کردوون، هەموو جووڵەکارێك و جووڵەکەی و هەموو وەستاوێك و وەستانەکەی خوا دروستکاریانە و دروستکاری خاوەنەکانیشیانە.

## بەڵگەکانی ئەم پایەیە لە قورئان و فەرموودەدا:

❁ بەڵگە قورئانییەکان:

١. قال الله تعالى: ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ٦٢﴾ [الزمر: ٦٢].

خوای پەروەردگار داهێنەر و خاوەن و کاربەڕێوەبەری هەموو بوونەوەرەکانە و هەمووی لەژێر دەسەڵات و ڕێکخستنی ئەودان(٢).

٢. قال الله تعالى: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ وَمَا تَعۡمَلُونَ ٩٦﴾ [الصافات: ٩٦].

خوای پەروەردگار دروستکاری خۆتان و کارەکانتانە(٣).

٣. قال الله تعالى: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ وَيَأۡتِ بِخَلۡقٖ

---

(١) رواه مسلم (٢٢٨٨)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٦٤٧)، والبزار في "المسند" (٣١٧٧)، والطبراني في "الأوسط" (٤٣٠٦)، والبيهقي في "الأسماء والصفات" (٣١٧).

(٢) "تفسير ابن كثير" (٧/ ١١١).

(٣) "تفسير القرطبي" (١٥/ ٩٦).

جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ [إبراهيم: ١٩].

نابینیت ئەی (محمد) ﷺ کە خوای پەروەردگار ئاسمان و زەوی دروستکردووە بەبێ یارمەتیدەر و پشت و پەنا، گەر ویستی لێبێت لاتان دەبات و کەسانی تر دێنێت[(١)].

٤. قال الله تعالى: ﴿أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ [الصافات: ٩٦].

ئەوەی کە بەتوانایە بەسەر دروستکردنی ئاسمان و زەویدا، هەر ئەویشە بەتوانایە بەسەر دروستکردنەوەی ئادەمیزاددا لەپاش مردنی[(٢)].

🕋 بەڵگە فەرموودەییەکان:

١. عَنْ حُذَيْفَةَ رضي الله عنه، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ اللهَ يَصْنَعُ كُلَّ صَانِعٍ وَصَنْعَتَهُ»، وَتَلَا بَعْضُهُمْ عِنْدَ ذَلِكَ: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ [الصافات: ٩٦]، فَأَخْبَرَ أَنَّ الصِّنَاعَاتِ وَأَهْلَهَا مَخْلُوقَةٌ[(٣)].

واتە: خوای پەروەردگار دروستکاری هەموو پیشەگەر و پیشەکەشیەتی.

٢. عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ خَلْفَ الصَّلاَةِ: «... اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ»[(٤)].

واتە: خوای پەروەردگار ئەوەی پێی ببەخشیت ڕێگری لێناکرێت، وە پێدان نییە بە کەسێك کە پێی نەدەیت، وە لای تۆ خاوەن دەسەڵاتان هیچ سوودێك لە دەسەڵاتیان نابەن.

---

(١) "تفسير الطبري" (١٦/ ٥٥٦).

(٢) "التفسير الوسيط" للطنطاوي (١٢/ ٩٨).

(٣) رواه البخاري في "خلق أفعال العباد" ص٤٦، والبيهقي في "الاعتقاد" ص١٤٤، وفي "القضاء والقدر" (١٣٣)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٣٥٧)، وابن بطة في "الإبانة" (٣/ ١٦٣)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٦٣٧).

(٤) رواه البخاري (٦٦١٥)، ومسلم (٥٩٣)، وأبو داود (١٥٠٥)، والنسائي في "الكبرى" (١٢٦٥)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٠٠٦)، وأحمد في "المسند" (١٨١٣٩)، والدارمي في "سننه" (١٣٨٩)، والطبراني في "الكبير" (٨٩٨)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٣٢٢٤)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٠٩٦)، والبيهقي في "الشعب" (٤٦٢٧)، وأبو نعيم في "الحلية" (٥/ ١٧٦)، والفريابي في "القدر" (١٨٥).

٣. كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «اللهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ، وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ، وَالْبُخْلِ، وَالْهَرَمِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، اللهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا، ...»(١).

واتە: خوای پەروەردگار پەنا دەگرم بە تۆ لە ڕووخانی دەروونی و تەمەڵی و ترسنۆکی و ڕەزیلی و پیری و پەککەوتەیی، پەنا دەگرم بە تۆ لە سزای گۆڕ، وە خواپەرستی ببەخشیتە نەفسم و پاکی بکەیتەوە، تۆ باشترین پاکڕاگری و هەر تۆ خاوەن و بەڕێکاری نەفسی منی.

مەبەست لەم بەڵگانە سەلماندنی دروستکردن و بەڕێکردن و داهێنەری هەموو جۆرەکانی بوون و بوونەوەرانە، بە هەموو جووڵە و وەستان و ئاڵوگۆڕێك و ڕێکخستنێکیانەوە، کە هەمووی لە دەستی خوای باڵادەست و داهێنەریانە.

لە کۆتایی پایەکانی قەدەردا دەرکەوت کە هیچ شتێك نییە لە زانین و زانستی پەروەردگار دەرچێت، وە هەموو بوونێك بە وورد و درشتەوە لای خوای داهێنەری بوونەوەرەکان تۆمار کراوە، وە هیچ شتێك لەبیرچوون و ونبوونی بەسەردا نایەت، وە هەموو ئەم بوونەوەرانە لەژێر چاودێری و ویست و ئیرادەی خوای باڵادەستایە و هیچ جووڵە و وەستان و ئیرادە و ویستێك نییە لە مەبەست و ویستەکانی ئەو دەرچێت، وە پاشان هەموو بوونەوەرە دروستکراوەکان خاوەن و دروستکار و هێنەرەدییان هەر ئەو خوایەیە جَلَّجَلَالُهُ، کە زانست و تۆمارکردنیان و بەڕێوەبردنیان بە ویستی ئەو دەیانهێنێتە دی، لە نەبوونەوە بۆ بوون، وە بەڕێوەبەریانە بە دروستکردنی خۆیان و کار و کردەوە و پێویستییەکانیان.

کەواتە هەر چوار پایەکانی قەدەر زنجیرەیەکی تەواوکاری یەك بوون و یەکتریان دەبەستەوە بەیەکەوە، بە زانستەکەی بوونیانی نووسیوە، پاشان بە ئیرادە و ویستی خۆی هێناونیەتە دی و دروستی کردوون.

کەوابوو هەموو بوونێك خوای پەروەردگار زانایە بەسەریدا و بوون و هەموو پێویستییەکی

(١) رواه مسلم (٢٧٢٢)، والنسائي في "الكبرى" (٧٨١٥)، وأحمد في "المسند" (١٩٣٠٨)، والبزار في "المسند" (٤٣٠٧)، والطبراني في "الكبير" (٥٠٨٥)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٩١٢٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١١٨٢)، والبغوي في "شرح السنة" (١٣٥٨).

بۆ تۆمار كردووە، وە بەگوێرەی ئەو نووسینەشی بۆی؛ كارەكانی دەرِەخسێنێت و دەیهێنێتە دی، لە كۆتاییدا هیچ شتێك نییە لە (قضاء وقدر)ی خوا دەرچێت.

* زانست و عیلمی پەروەردگار سەرەتا و كۆتایی نییە، وە بە رِێگەی فێربوون و بەدەستهێنان نەهاتووەتە دی و هیچ لەبیرچوونێك و لێتێكچوونێك تیایدا روونادات، وە كەم و كورتی و دەركپێنەكردنی تێدا نییە، وە زانایە بەسەر ئاشكرا و نهێنییەكاندا، وەكوو دەفەرموێت: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ﴾ [الأنعام: ٥٩]، ﴿قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى فِى كِتَٰبٍ ۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّى وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾﴾ [طه: ٥٢]، ﴿أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٧٨﴾﴾ [التوبة: ٧٨]، ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ [الحشر: ٢٢]، ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِى وَمَا نُعْلِنُ ۗ وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٣٨﴾﴾ [إبراهيم: ٣٨].

* نووسینی خوا جَلَّجَلَالُهُ هەمووی حەقە و دادپەروەرییە لەسەر دروستكراوەكانی: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا﴾ [الأنعام: ١١٥]. وەكوو دەفەرموێت: ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَا﴾ [التوبة: ٥١]، ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا﴾ [آل عمران: ١٤٥]، ﴿وَرَحْمَتِى وَسِعَتْ كُلَّ شَىْءٍ ۚ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾﴾ [الأعراف: ١٥٦].

واتە: هیچ كارێك نایەت بەسەر ئادەمیزاددا بێجگە لەوەی كە خوا نووسیبێتی لەسەریان، وە هیچ نەفسێك نامرێت بەبێ ئیزن و نووسینی ئەو نەبێت، وە بەزەیی خوا فراوانە و بەشی خوا نووسراوە بۆ خواناسان.

وە (أبو هريرة) رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەیگێرِێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیفەرموو: «إِنَّ اللهَ كَتَبَ كِتَابًا قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ الخَلْقَ: إِنَّ رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي، فَهُوَ مَكْتُوبٌ عِنْدَهُ فَوْقَ العَرْشِ»[1].

واتە: خوای گەورە پێش ئەوەی دروستكراوەكان دروست بكات نووسینێكی بۆ نووسیون لەسەر عەرشە، كە بەزەیی و رِەحمەتی پێش توورِەبوونی كەوتووە بۆیان.

(١) رواه البخاري (٧٥٥٤)، والنسائي في "الكبرى" (٧٧٠٤)، وأحمد في "المسند" (٧٥٠٠)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٤٣٢)، والطبراني في "الشاميين" (٣٢٧٠)، والبغوي في "شرح السنة" (٤١٧٨).

* ویست و ئیرادەکەشی پڕ لە حیکمەت و دانایی و بەخشینە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٨﴾ [الحجرات: ٨]، ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ٨﴾ [الشورى: ٨]، ﴿ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ٤﴾ [الجمعة: ٤].

* دروستکراوەکانیشی بە شێوەی یەکسانی و جۆری پێویستییەکانیان دروستی کردوون، وەکوو دەفەرموێت: ﴿هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ [فاطر: ٣]، ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ٢﴾ [الأعلى: ٢]، ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا﴾ [البقرة: ٢٩].

کەواتە قەزا و قەدەر پەیوەستە بە (توحيد الربوبية)وە، بەڵام بە ڕێگەی ناسین و ئاشنابوونی خوا جَلَّجَلَالُهُ لە (توحيد الأسماء والصفات) شارەزاتر و دڵنیاتر دەبیت لەسەر پایەکانی قەدەر، وە ئیمانپێهێنانی قەدەر و کارکردن و ملکەچبوون بۆ فەرمانەکانی خوا؛ پەیوەندی بە (توحيد الألوهية)وە هەیە، کەواتە قەدەر هەرسێ جۆرەکەی (توحيد) گرێدەدات بەیەکەوە، بۆیە باوەڕنەبوون بە قەدەر هەڵوەشێنەرەوەی (توحيد)ە، وەك (ابن عباس) رَضِيَٱللَّهُعَنْهُمَا دەڵێت: «الْقَدَرُ نِظَامُ التَّوْحِيدِ»[1].



(١) رواه الطبراني في "الأوسط" (٣٥٧٣)، وابن بطة في "الإبانة" (١٦١٩)، وسبق تخريجه ص٢٧.

# بــەشــەکانی دارِشتنی قــەدەر

## أقسام التـقـدير

دابەشکردنی قەدەر لە ڕوانگەی گەڕاندنەوەی بۆ لای خوا جَلَّجَلَالُهُ و ئەو قۆناغانەی کە پیایاندا تێدەپەڕێت، پێنج قۆناغ و دابەشکردنە:

**قۆناغی یەکەم:** قەدەری یەکەم یاخود قەدەری گشتی (التقدير العام أو الأزلي أو الكتابة الأولى) .

ئەم جۆرەیان دارِشتن و قەدەری یەکەمی خواییە بۆ گشت بوونەوەرەکان، کاتێك کە قەڵەمی دروستکرد و فەرمانی پێدا بە نووسین بە پەنجا هەزار ساڵ پێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی، وە ئەم جۆرەی قەدەر جێگۆڕکێ و گۆڕانکاری بەسەردا نایەت (رُفِعَتِ الأَقْلامُ وَجَفَّتْ الصُّحُفُ).

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾﴾ [الحج : ٧٠].

ئەوە نازانیت بەوەی کە خوا زانایە بەسەر ئەوەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە و هیچی لێ شاراوە نییە لە ناوەڕۆك و ڕووکەشی کارەکان، وە لە (اللوح المحفوظ)دا نووسراوەتەوە کاتێك قەڵەمی دروستکرد، فەرمووی بنووسە بەوەی کە دەبێت تا ڕۆژی دوایی، ئەمە لای خوا ئاسانە[1].

(عبدالله بن عمرو بن العاص) رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: «كَتَبَ اللهُ مَقَادِيرَ الْخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، قَالَ: وَعَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ»[2].

واتە: خوای پەروەردگار ووردەکاری بوونەوەرەکانی نووسیوە بە پەنجا هەزار ساڵ پێش دروستبوونی ئاسمان و زەوی.

وە (ابن عباس) رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا، دەڵێت: ڕۆژێك لە پشت پێغەمبەری خواوە ﷺ بووم، فەرمووی: «يَا غُلَامُ إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ، احْفَظِ اللهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظِ اللهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، إِذَا سَأَلْتَ

(١) "تيسير الكريم الرحمن" للسعدي ص٥٤٥.

(٢) رواه مسلم (٢٦٥٣)، وسبق تخريجه ص٤٢.

فَاسْأَلِ اللهَّ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللهَّ، وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُّ لَكَ، وَلَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُّ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الأَقْلَامُ وَجَفَّتْ الصُّحُفُ»(١).

**واتە: ... هیچ سوودمەندییەك و زیانێكت پێناگات مەگەر ئەوەی خوا نووسیویەتی لەسەرت.**

وَعَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي بَقِيعِ الغَرْقَدِ فِي جَنَازَةٍ، فَقَالَ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ الجَنَّةِ، وَمَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ»، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهَّ أَفَلاَ نَتَّكِلُ؟ فَقَالَ: «اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ»، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾﴾ [الحجر: ٥ - ١٠](٢).

**واتە: هەموو كەسێك شوێنی بۆ دیاری كراوە لە بەهەشت و دۆزەخدا ... وە هۆكارەكانی گەیاندنیشی بۆ ئاسان كردووە.**

**قۆناغی دووەم:** دانانی قەدەر لەسەر ئادەمیزاد، كاتێك وادە و پەیمانیان لێ وەردەگرێت (التقدير الميثاقي أو التقدير البشري أو كتابة الميثاق)(٣).

**ئەو جۆرە قەدەرەیە كە خوای گەورە وادە و پەیمانی لە هەموو ئادەمیزاد وەرگرتووە لەسەر ئەوەی كە خوایانە و دەبێت بیپەرستن، وە خۆیانی كردووە بە شایەت بەسەر نەفسی خۆیانەوە.**

(١) رواه الترمذي (٢٥١٦) وقال: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وأحمد في "المسند" (٢٦٦٩) وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي، وقال أحمد شاكر: إسناده صحيح، وأبو يعلى في "مسنده" (٢٥٥٦)، والطبراني في "الدعاء" (٤٢)، والبيهقي في "الشعب" (١٩٢)، وفي "القضاء والقدر" (٢٨٧)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٣١٥)، وابن بطة في "الإبانة" (١٥٠٥)، والفريابي في "القدر" (١٥٣)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٥٣٠٢)، و"صحيح الجامع الصغير" (٧٩٥٧).

(٢) رواه البخاري (٤٩٤٥)، ومسلم (٢٦٤٧)، والترمذي (٢١٣٦)، والنسائي في "الكبرى" (١١٦١٥)، وابن ماجه (٧٨)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٣٤)، والبزار في "المسند" (٥٨٣)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦١٠)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٤٢)، وابن بطة في "الإبانة" (١٣١٥)، والفريابي في "القدر" (٤٢).

(٣) الشَيْخ (ابن باز) ﷺ **دەڵێت:** (التقدير البشري داخل في التقدير العام؛ ولهذا أعرض عنه أبو العباس ابن تيمية في العقيدة الواسطية، وأكثر أهل العلم فيها أعلم). نقلاً من "الإيمان بالقضاء والقدر" لمحمد بن ابراهيم الحمد ص٧٩.

**واتە: ئەم قەدەرە لەناو قەدەری ئەزەلیدایە، بۆیە (ابن تيمية) ﷺ و زۆری زانایان باسیان نەكردووە.**

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ١٧٢﴾ [الأعراف: ١٧٢].

(ابن عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمووی: «أَخَذَ اللهُ الْمِيثَاقَ مِنْ ظَهْرِ آدَمَ بِنَعْمَانَ - يَعْنِي عَرَفَةَ - فَأَخْرَجَ مِنْ صُلْبِهِ كُلَّ ذُرِّيَّةٍ ذَرَأَهَا، فَنَثَرَهُمْ بَيْنَ يَدَيْهِ كَالذَّرِّ، ثُمَّ كَلَّمَهُمْ قِبَلًا، قَالَ: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ١٧٢ أَوْ تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ ۖ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ ١٧٣﴾ [الأعراف: ١٧٢، ١٧٣][(١)].

ئەم قەدەرە پێش ئەوەی ئادەمیزاد لەسەر زەویدا دروستبکات ڕوویداوە، خوای پەروەردگار ئادەمیزادی هێنایە بوون لە پشتی ئادەم عَلَيْهِ السَّلَامُ لەسەر کێوی عەرەفە، بە ئەندازەی مێروولە و پاشان ڕووبەڕوو وادە و پەیمانی باوەڕبوون و پەرستنی لێ وەرگرتن و فەرمووی: ئەوە من خوای ئێوە نیم و شایستەی پەرستن نیم؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: بەڵام لە دواڕۆژدا نەڵێن ئێمە بێئاگا بووین لەم وادە و پەیمانە.

ئەم شایەتیدانە شایەتی خواپەرستییە و هاوبەش بۆ بڕیارنەدانیەتی، کە فیترەت و ناخی پاکی ئادەمیزاد تیایدا چێنراوە: ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ﴾ [الروم: ٣٠]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم وادە و پەیمانە بە ڕێگەی پێغەمبەران عَلَيْهِمُ السَّلَامُ بیریان خراوەتەوە، بەدەر لەوەی عەقڵ و فیترەتی ئادەمیزاد شایەتە لەسەری.

**قۆناغی سێیەم:** قەدەری تەمەنی ئادەمیزاد (التقدير العمري).

لە کاتی دروستبوونی ئادەمیزاد لە سکی دایکیدا، هەموو ئەوانەی بۆ دەنووسرێت لە بوون

---

(١) رواه والنسائي في "الكبرى" (١١١٢٧)، وأحمد في "المسند" (٢٤٥٥) وقال شعيب الأرنؤوط: رجاله ثقات رجال الشيخين، والحاكم في "المستدرك" (٧٥) وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٣٨٨٩)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٦٥)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢٠٢)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٦٢٣)، و"صحيح الجامع الصغير" (١٧٠١).

بەوەی نێر بێت یا مێ، وە تەمەن و کار و کردەوەی لە چاکی و خراپی و ئەوەی دێتە ڕێی تا کۆتایی تەمەنی.

عَنْ عَبْدِ الله بْنِ مَسْعُودٍ ﵁، قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ الله ﷺ وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ: «إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلِكَ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلِكَ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يُرْسَلُ الْمَلَكُ فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ، وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: بِكَتْبِ رِزْقِهِ، وَأَجَلِهِ، وَعَمَلِهِ، وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ»[(١)].

واتە: ئادەمیزاد لە دوای چوار مانگییەوە لە سکی دایکیدا چوار کاری سەرەکی بۆ دەنووسرێت، ئەوانیش: ڕۆزی و ئەجەلی و کاری و چاکی و خراپی.

ئەم جۆرە قەدەرە ووردەکاری ناو نووسینی (اللوح المحفوظ)ە و دەگوازرێتەوە بۆ ئەم کەسە دیاریکراوە.

**قۆناغی چوارەم:** قەدەری ساڵانە (التقدير الحولي).

لە شەوی (ليلة القدر)دا هەموو ساڵێك بەرنامە و قەدەری ساڵی داهاتوو دیاری دەکرێت، لە ژیان و مردن و ڕۆزی و باران و تەنانەت ناوی حاجییانیش، ئەم ساڵانەیە لە (اللوح المحفوظ)دا دەگوازرێتەوە بۆ لاپەڕەکانی دەستی (ملائكة) لەسەر ڕووداوەکانی ساڵانە[(٢)].

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ٣ فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ ٤ أَمۡرٗا مِّنۡ عِندِنَآۚ إِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ ٥﴾ [الدخان: ٣، ٥]، ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ١ ... تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ٤ سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ٥﴾ [القدر].

---

(١) رواه البخاري (٣٢٠٨)، ومسلم (٢٦٤٣)، وأبو داود (٤٧٠٨)، والترمذي (٢١٣٧)، والنسائي في "الكبرى" (١١١٨٢)، وابن ماجه (٧٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٦١٧٤)، وأحمد في "المسند" (٣٦٢٤)، والبزار في "المسند" (١٥٥١)، والبيهقي في "الشعب" (١٨٤)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٧٥)، وابن بطة في "الإبانة" (١٣٩٧)، والآجري في "الشريعة" (٣٥٨)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٠٤٢)، وأبو نعيم في "الحلية" (٧/ ٣٦٤).

(٢) ئەمە قسەی (ابن عباس، ابن عمر، الحسن البصري، سعيد بن جبير)ە، ينظر "تفسير ابن كثير" (٤/ ١٤٠)، و "فتح القدير" للشوكاني (٤/ ٥٧٢)، و "زاد المسير" لابن الجوزي (٧/ ٣٣٨)، و "أعلام السنة المنشورة" ص١٢٩ - ١٣٣.

واتە: ئێمە قورئانمان لە شەوێکی پیرۆزدا ناردووەتە خوارەوە، کە ئەو شەوەش شەوی (ليلة القدر)ە و هەموو بوون کردارەکانی تێدا یەکلاکراوەتەوە بۆ ئەو ساڵە.

**قۆناغی پێنجەم:** قەدەری ڕۆژانە (التقدير اليومي).

هاتنەدی ووردەکاری ئەو قەدەرانەیە کە پێشوەختە بۆی دانراوە لە کات و ساتی دیاریکراوی خۆیدا.

خوای پەروەردگار دەفەرمویت: ﴿يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴿٢٩﴾﴾ [الرحمن: ٢٩]. کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە، پرسیاریان لێکرد لە ئایەتی ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾ بەڕێوەبردن چییە؟ فەرمووی: «مِنْ شَأْنِهِ أَنْ يَغْفِرَ ذَنْبًا، وَيُفَرِّجَ كَرْبًا، وَيَرْفَعَ قَوْمًا، وَيَخْفِضَ آخَرِينَ»[1]. لێخۆشبوونی کەسێك و بەڵا لادانێك و بەرزکردنەوەی کەسێك و نزمکردنەوەی کەسێکی تر، واتە بەڕێوەبردنی (مخلوقات) بە هەموو گۆڕانکارییەکانەوە.

وە ئەم قەدەرانەی ڕۆژانەش ووردەکاری قەدەری ساڵانەیە، وە قەدەری ساڵانەش ووردەکاری قەدەری تەمەنییە لەکاتی دروستبوونی (نطفة)دا، وە قەدەری تەمەنیش ووردەکاری قەدەری ڕۆژی وەرگرتنی وادە و پەیمانە (يوم الميثاق)، ئەمیش ووردەکاری قەدەری ئەزەلییە کە قەڵەم نووسیویەتی لە (اللوح المحفوظ)دا، وە ئەمیش لە زانستی پەروەردگاردا هەر هەبووە.

ئەم جۆرە قەدەرانەی کە باسکران هیچی پاداشت و سزای لەسەر نییە، بەڵکوو هەمووی لە چوارچێوەی هەواڵدان و زانست و عیلمی خوادایە بۆ بوونەوەرەکان و بوون و دروستکراوەکانی بەوەی کە خوایانە و خاوەنیانە.

  

---

(١) رواه البخاري (٦/ ١٤٤) كِتَابُ تَفْسِيرِ القُرْآنِ، بَابُ قَوْلِهِ: ﴿بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾﴾ [القمر: ٤٦]، وابن ماجه (٢٠٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٨٩)، والبزار في "المسند" (٤١٣٧)، والطبراني في "الأوسط" (٣١٤٠)، والبيهقي في "الشعب" (١٠٦٦)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٣٠١)، وأبو نعيم في "الحلية" (٥/ ٢٥٢)، وصححه الألباني في "التعليقات الحسان" (٦٨٨)، و "الظلال" (٣٠١).

# جۆرەکانی ویست و ئیرادەی خوایی

## أنواع الإرادة الربانية

**ویست و ئیرادەی خوا جَلَّجَلَالُهُ لە قورئاندا دوو جۆرە:**

**١. قەدەرە کەونـیـیەکان:** الإرادةالكونية(القدرية) .

**٢. قەدەرە شەرعییەکان:** الإرادةالشرعية(الدينية) .

### یەکەم: قەدەرە کەونییەکان (الإرادة الكونية)

ئەم جۆرە ئیرادەیە بۆ بەڕێوەبردنی هەموو بوون و بوونەوەرەکانی کەونە، بە هەموو جۆر و جیاوازییەکانی کە هەیە تیایاندا، لـە خێر و شەڕ و ئیمان و بێباوەڕی و خواپەرستی و تاوان و چاك و خراپ و تەواو و ناتەواو و خۆشەویست و ناخۆشەویست و شوێنی ڕازیبوون و ناڕازی ...، ئەوەی کە لـە بوونەوەردا بوونی هەیە.

وشەی (الإرادة والمشيئة) هاوتای یەکن، خوای پەروەردگار لـە قورئاندا ئەم دوو زاراوەیە بەکاردەهێنێت بۆ قەدەری کەونی بەڕێوەبردنی دروستکراوەکانی بوونەوەر.

وە وشەی قەدەری کەونی (القدر الكوني) یەك وشەی بە گشتی بۆ بەکاردەهێنرێت کە (المشيئة)یە لـە بەکارهێنانی قورئان و فەرموودەدا، وەکوو (ابن القيم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: فلفظ المشيئة كوني[1].

**بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قەدەری کەونی ئەم دوو کارە جیاوازە لەخۆ دەگرێت:**

یەکەم: قەدەری کەونی دەشێت بوون و کارێك هەبێت کە خوا ئیرادە و ویستی لـەسەر بێت، بەڵام پێی خۆش نەبێت و پێی ڕازی نەبێت.

دووەم: قەدەری کەونی دەشێت بوون و کارێك هەبێت کە خوا ئیرادە و ویستی لـەسەر بێت، لـەگەڵ ئەوەشدا پێی خۆش بێت و پێشی ڕازی بێت.

---

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص٤٨.

### ❁ بەڵگەکانی قەدەری کەونی:

١. قال الله تعالى: ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٨٢﴾ [يس: ٨٢].

هەر فەرمانێك ویستی خوای لەسەر بێت، پێی دەڵێت ببە، دەبێت.

٢. قال الله تعالى: ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقۡتَتَلُواْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ ٢٥٣﴾ [البقرة: ٢٥٣].

خوا ویستی لەسەر بوایە شەڕ نەدەبوو، بەڵام ئەوەی کە دەیەوێت دەبێت.

٣. قال الله تعالى: ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًا﴾ [يونس: ٩٩].

گەر خوا ویستی لەسەر بێت هەموو ئەوەی کە لەسەر زەوییە باوەڕ بێنێت؛ دەبێت.

٤. قال الله تعالى: ﴿وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ﴾ [الرعد: ١١].

گەر خوا ویستی لەناوبردنی بە گەلێك هەبێت؛ ڕەتبوونەوەی نییە.

٥. قال الله تعالى: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ﴾ [الأنعام: ١٢٥].

ئەوەی خوا ویستی لێبێت دڵی دەکاتەوە و سنگ فراوانی دەکات بۆ ئیسلام.

٦. قال الله تعالى: ﴿وَلَا يَنفَعُكُمۡ نُصۡحِيٓ إِنۡ أَرَدتُّ أَنۡ أَنصَحَ لَكُمۡ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغۡوِيَكُمۡ﴾ [هود: ٣٤].

گەر خوا بیەوێت گومڕاتان بکات؛ ئامۆژگارییەکانم سوودی نابێت.

**پرسیار:** بەچیدا بزانین ئەم ئایەتانە باس لە قەدەری کەونی دەکەن؟

**وەڵام:** بەوەدا دەزانین کە هەمووی مامەڵەی خوایە لەگەڵ دروستکراوەکانیدا و بەڕێوەبردنی کاریانە و پەیوەندی بە یاسا و بەرنامە و دارشتنی شەرعی خواییەوە نییە بۆ ئادەمیزاد.

**پرسیار:** چۆن خوای گەورە ئیرادەی لەسەر شتێك هەیە، لەکاتێکدا پێی خۆش نییە و پێشی ڕازی نییە؟ وە چۆن ویست و ناڕازیبوونی پێکەوە کۆدەبنەوە؟

**وەڵام:** ئیرادە و ویستەکانی دوو جۆرن[١]:

---

(١) "شرح العقيدة الطحاوية" (١/ ٣٢٧)، و "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ٣٣٢)، و "درء التعارض العقل والنقل" (٨/ ٤٦٥)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢/ ٣٧)، و "إغاثة اللهفان" لابن القيم ص٤٣.

١. ویست و ئیرادەیەکی خوایی بۆ خۆی (المراد لنفسه).

٢. ویست و ئیرادەیەکی خوایی بۆ بێجگە لە خۆی (المراد لغيره).

**بەشی یەکەم: ویست و ئیرادەیەك بۆ خۆی بێت:** ئەوە پێی خۆشە و پێی ڕازییە، وەکوو: (دروستبوونی پێغەمبەران، کارە خواپەرستییەکان و خێر و چاکەکان ...)، ئەمە ئیرادەی هێنانەدی و دروستکردنیانە (إرادة الغايات والمقاصد)، ئەمانەی بەتایبەت بۆ مەبەستی خۆی دروستکردووە.

**بەشی دووەم: ویست و ئیرادەیەك بۆ بێجگە لە خۆی بێت:** وەکوو: (دروستبوونی ئیبلیس و شەیتانەکان و تاوان و شەڕەکان و تاوانباران لە بێبڕوایان و دووڕووان ...)، ئەم ئیرادەیە هۆکارێکە بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانی (مراد له من حيث إيصاله إلى مراده).

واتە بەشی یەکەم: هەر خۆی بۆخۆی مەبەست و ئیرادەی خوا لە دروستکردن و هێنانەدییان بۆ پەرستنی خۆی و جێبەجێکردنی فەرمانەکانیەتی لە بووندا و گوێڕایەڵیکردنیەتی.

بەڵام بەشی دووەم: ئەو شتانە هەمووی هۆکارێکن، بەبێ ئەو هۆکارانە مەبەست و ئیرادەکانی خوا جَلَّجَلَالُهُ لە بووندا نایەنە دی، ڕێگەیەکە بۆ گەیشتن بە مەبەستەکان، وەکوو خواردنی دەرمانێکی تاڵ بۆ چارەسەری نەخۆشییەك، یاخود بڕینەوەی پارچەیەك لاشەی تووشبوو بە نەخۆشییەکی ترسناك، یا بڕینی ڕێگەیەکی ترسناك و ناخۆش بۆ گەیشتن بە ئاواتێکی گەورە، ئەم هۆکارانە هەموویان هێنەرەدی سوودمەندییە گەورەکانی ژیانن.

گەر شەیتان و بێبڕوا و تاوان و تاوانباران نەبێت؛ چۆن ئیمانداران تاقی بکرێنەوە و پاداشت و پلەوپایە و ڕەزامەندی خوایی بەدەست بێنن؟ وە لەلایەکی تریشەوە چۆن تاوانباران ڕێگەی جۆرەکانی شەڕ بگرنەبەر و کار و کردەوە و نیەتە پێشوەختەکانیان بێتە دی و سزا و تۆڵەکانیان لەسەر جێبەجێ بکرێت؟

**ئەم دوو جۆرە ئیرادەیەش حیکمەت و هۆکار تیایاندا ئەم خاڵانەیە:**

١. دەرکەوتنی توانا و باڵادەستی پەروەردگار لە دروستکردنی کارە بەرامبەر و دژبەیەکەکاندا.

٢. دەرکەوتن و کارکردنی ناو و سیفاتە سزاییەکان و تۆڵە سێنەرەوەکانی خوا جَلَّجَلَالُهُ، وەکوو: (القهار، المتكبر، الجبار، شديد العقاب، العزيز، القوي ... )، ئەگەر هەموو لەسەر ڕەوشت

و ئاکاری (ملائکة) بوونایە؛ ئەم ناو و سیفاتانەی خوا کاریان نەدەکرد، وە خوا لە سیفاتە حەقە تەواوەکاندا ناتەواو دەبوو، ئەوەش شاییستە نییە بە خواوە.

٣. دەرکەوتن و کارکردنی ئەو ناوانەی کە لەخۆگری لێبووردن و لێخۆشبوون و ئارامگری و ئازادکردنی بەندەکانە، وەکوو: (الغفور، الودود، الستیر، الحليم ...).

٤. دەرکەوتن و کارکردنی زانست و حیکمەت و خەبیری و ووردەکاری کارەکانی خوا جَلَّجَلَالُهُ، کە هەموو شتێك لە شوێنی خۆیدا دادەنێت.

٥. هاتنەدی جۆرەها عیبادەت و پەرستنی خوایی، گەر (ئیبلیس و بێباوەڕ و تاوان ...) نەبوونایە؛ ئەوا عیبادەتی جیهاد و ئارامگرتن و دژایەتیکردنی هەواوئارەزوو و پەناگرتن بە خوا ... نەدەبوو، ئەمانە و چەندەها جۆری تر لە حیکمەت و ووردەکاری؛ بوونی ئەو دوو جۆرە ئیرادەیەیە لە کارەکانی خوادا جَلَّجَلَالُهُ.

### دووەم: قەدەرە شەرعییەکان (الإرادة الشرعية)

ئیرادەیەکی خواییە بۆ فەرمانە دینییە شەرعییەکان، کە لەپێناویدا پێغەمبەرانی ناردووە و کتێبەکانی ناردووەتە خوارەوە، ئەم جۆرە ئیرادە و ویستەش وشەی (المحبة والرضا) پێی خۆشە و پێی ڕازییەی لە قورئان و فەرمووددا بۆ بەکاردەهێنرێت.

بۆیە ئەوەی فەرمانی قورئان وفەرموودەیە، هەمووی خوای پەروەردگار پێی خۆشە و پێی ڕازییە و ویست و ئیرادەیشی لەسەرە، لەم ئیرادەیەدا شتێك یاخود کارێك نییە لە شەرعی خوادا کە پێی ڕازی نەبێت و پێی خۆش نەبێت.

#### ❁ بەڵگەکانی قەدەری شەرعی:

١. قال الله تعالى: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ﴾ [البَقَرَة: ١٨٥].

خوای پەروەردگار کارئاسانی دەوێت پێتان، کارگرانی ناوێت پێتان.

٢. قال الله تعالى: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمۡۚ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفًا ٢٨﴾ [النِّسَاء: ٢٨].

خوا دەیەوێت لەسەرتان سووك بکات، ئادەمیزاد لاواز دروستکراوە.

٣. قال الله تعالى: ﴿وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ﴾ [النساء: ٢٧].

خوا ویستی لێخۆشبوونی پێتانە.

٤. قال الله تعالى: ﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ﴾ [الزمر: ٧].

خوا ڕازی نییە بە بێباوەڕی بۆ بەندەکانی، وە گەر سوپاسگوزاری بن لێتان ڕازییە.

٥. قال الله تعالى: ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾﴾ [البقرة: ٢٠٥]، ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٧﴾﴾ [آل عمران: ٥٧]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ ﴿٥٨﴾﴾ [الأنفال: ٥٨]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾﴾ [لقمان: ١٨]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾﴾ [البقرة: ١٩٠]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ ﴿٣٨﴾﴾ [الحج: ٣٨]، ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٥﴾﴾ [الروم: ٤٥].

خوای گەورە ستەم و خیانەت و خۆبەگەورەزانین و سنووربەزێن و بێبڕوایی خۆشناوێت.

## جیاوازی نێوان هەردوو قەدەرەکە

بۆ زیاتر ڕوونبوونەوە و تێگەیشتنی ئەم دوو قەدەر و ئیرادەیە و جیاوازی نێوانیان، پێویستمان بە ڕوونکردنەوەی زیاتر هەیە بە ڕێگەی ئەم خاڵانەی خوارەوە:

١. لە ئیرادە و قەدەری کەونیدا بوون و کارێك هەیە کە خوا پێیخۆشە و پێی ڕازییە، وە کاریش هەیە پێی خۆش نییە و پێشی ڕازی نییە، بەڵام لە قەدەری شەرعیدا هەموو فەرمان و کارەکان خوا پێی خۆشە و پێیڕازییە.

٢. لە قەدەری کەونیدا هەموو کار و فەرمانەکان دێتە دی، بەڵام لە قەدەری شەرعی ئیسلامدا مەرج نییە، دەشێت بێتە دی و دەشێت نەیەتە دی، وەکوو ئیمانهێنان و بێباوەڕی.

٣. قەدەرە کەونییەکان دەشێت مەبەست تیایاندا بێجگە لە خوا بێت، (وەکوو دروستبوونی ئیبلیس و تاوان و خراپەکان)، بۆ هاتنەدی ئەوانەی کە لای خوا خۆشەویستە (وەکوو تەوبە و داوای لێخۆشبوون)، بەڵام قەدەرە شەرعییەکان مەبەست تیایاندا بۆ خوای پەروەردگار خۆیەتی، (وەکوو پەرستن و عیبادەتەکان).

٤. قەدەری کەونی پەیوەندی بە (توحيد الربوبية والأسماء والصفات)ەوە هەیە، قەدەری شەرعی پەیوەندی بە (توحيد الألوهية)وە هەیە.

٥. وشەی (المحبة والرضا) تایبەتە بە قەدەری شەرعییەوە، بەڵام وشەی (المشيئة) پەیوەستە بە قەدەری کەونییەوە.

٦. کار لەسەر قەدەری شەرعی دەکرێت، وە لێپرسینەوە و پاداشت و سزای لەسەرە، بەڵام کارکردن لەسەر قەدەری کەونی نییە و ناکرێت، وە لێپرسینەوە و پاداشت و سزاشی لەسەر نییە.

٧. هەرچییەك کە لە قەدەری شەرعیدا هەیە لە توانای ئادەمیزاددایە، بەڵام لە قەدەری کەونیدا مەرج نییە هەمووی لە توانایدا بێت.

٨. دەشێت لە قەدەری شەرعیدا فەرمان هەبێت و ویستی جێبەجێکردن نەبێت، وەك: فەرمان بە سەربڕینی (اسماعيل) ﷺ و فەرزکردنی پەنجا نوێژ ...، بەڵام لە قەدەری کەونیدا (كن فيكون)ە و دێتە دی.

٩. ئیماندار لە قەدەری شەرعیدا لە (المحبة والرضا)دایە و لە قەدەری کەونیشدا لە (الإرادة والمشيئة)دایە، واتە لە جۆری چاکی هەردوو قەدەرەکەدایە، بەڵام بێبڕوا لە قەدەری کەونیدا هەیە و لە قەدەری شەرعیدا نییە (يريده ولا يحبه ولا يرضاه).

١٠. بە شێوەیەکی گشتی بە قەدەری شەرعی دەوترێت (الأمر والشرع)، وە بە قەدەری کەونی دەوترێت (القضاء والقدر).

## دروستکراوەکان لە نێوانی هەردوو قەدەرەکەدا[١]

**هەموو بوونەوەرەکان لە نێوانی ئەم دوو جۆرە ئیرادە و قەزا و قەدەرەدا دەبنە چوار بەشەوە:**

**یەکەم:** ئەوانەی هەردوو ئیرادەکە لەخۆ دەگرن: وەکوو کار و کردەوە چاکەکان لە ڕووە قەدەرە شەرعییە دینییەکەوە، خوای گەورە فەرمانی پێکردووە و پێی خۆشە و پێی ڕازییە، وە لە ڕووە قەدەرە کەونییەکەوە ئیرادەی بووە کە ببێت، بۆیە بووە، وە گەر کەونی نەبوایە شەرعی

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٨٩)، و "الإيمان بالقضاء والقدر" لمحمد بن إبراهيم الحمد ص٨٤، و "الإيمان بالقدر" للصلابي ص٦٣، و "القضاء والقدر" للأشقر ص١٠٨.

نەدەبوو، واتە قەدەری شەرعی لەسەر کەونی بنیاد نراوە، چەند خوا پێی خۆشبێت و پێی ڕازیبێت؛ گەر کەونی نەبێت نایەتە دی[١].

**دووەم:** ئەوانەی کە بەس ئیرادەی شەرعی لەخۆ دەگرن: وەکوو فەرمانەکانی خوا بە ئیمان و چاکە و خواپەرستی، بەڵام کە بێبڕواکان باوەڕی پێناهێنن و تاوانباران جێبەجێکاری نین؛ قەدەرە شەرعییەکە گرتوونیەتیەوە، ئیمان و چاکە قەدەری شەرعییە، خوا پێی خۆشە و پێی ڕازییە، ئەگەر بێتەدی یاخود نەیەتەدی.

**سێیەم:** ئەوانەی کە بەس ئیرادەی کەونی لەخۆ دەگرن: لەوانەی خوا فەرمانی پێ نەکردووە و پێی خۆش نییە و پێشی ڕازی نییە، وەکوو بێبڕوایی و تاوان ... وە (المباحات)یش، بەڵام دروستی کردووە و ویستی لەسەرە کە ببێت.

**چوارەم:** ئەوانەی کە هەردوو ئیرادەکە لەخۆ ناگرن: وەکوو بێبڕوایی و تاوانەکان و (المباحات)، خوای گەورە لە شەرعدا فەرمانی پێ نەکردوون، وە لە کەونیشدا پێی خۆش نییە ببێت یا دروستیشی کردبێت.

ئەم دابەشکردنەی چوارەم لەڕووی دابەشکردنێکی زمانەوانییەوەیە، گەر نا لە ڕووە حەقیقییەکەیەوە هیچی لە قەدەری کەونی و شەرعی دەرناچێت.

کامەرانترینی بەندەکانی خوا ئەوانەن کە لە هەردوو ئیرادەکەدا هەبن، وە خراپترین کەسیشیان ئەوانەن کە لە کەونا بوونن، لە شەرعدا نەبوونن.

ئەم جیانەکردنەوەیە لە نێوان هەردوو قەدەرەکەدا بووەتە هۆی گومڕایی تێکڕای گرووپە دینییەکان لە (جبرية وقدرية ...)، لەبەر تێڕوانینیان بە یەك چاو و خوێندنەوەی یەك لای، یا قەدەری کەونییان خوێندووەتەوە بەبێ شەرعی، یان بە پێچەوانەوە، بووەتە هۆکاری ئەوەی خوێندنەوە و بڕیاری هەڵەیان بۆ (القضاء والقدر) هەبێت لە دیندا.

بەڵام ئەهلی سوننەت بە خوێندنەوەی ووردیان بۆ ئەم دوو قەدەرە و جیاوازییەکانی نێوانیان لە نێوان (المشيئة والمحبة)؛ خاوەن بەرنامە و کامڵترین بوون لە (القضاء والقدر)دا و بەدەستهێنەری هیدایەت و لەخۆگری دەقەکان بوون، بە هەردوو چاوی قەدەری کەونی و شەرعی خوێندنەوەیان هەبووە بۆ بابەتی قەدەر، بەڵام فیرەقەکان بە یەك چاو بینەر بوون و خێل ئاسا بوون[٢].

---

(١) "القضاء والقدر عند السلف" لعلي الوصيفي ص٦٥. (٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٩٨).

## نموونه قورئانییەكان لەسەر ئەو دوو جۆرە قەدەرە

هەروەكوو چۆن قەدەر بوو بە دوو بەشەوە، كەونی و شەرعی: ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ﴾ [الأعراف : ٥٤]، وشەی (الخلق) واتە دروستكراوەكان، مەبەست پێی قەدەری كەونییە، وە (الأمر) واتە فەرمانەكان، كە مەبەست پێی قەدەرە شەرعییەكانە[(١)]، دارِشتنەكانی قورئانیش لە بواری قەدەردا بەم شێوەیە پێكهاتووە لەم وشانە كە هەردوو جۆرەكانی قەدەر دەگرێتەوە: (الكتابة، الأمر، الإذن، الجعل، الكلمات، البعث، الإرسال، التحريم، الإيتاء، الكره، الإنشاء ...)، جۆرێك لە قەدەرێكی كەونی دەگرێتەوە كە پەیوەستە بە كار و دروستكراوەكانی خواوە جَلَّجَلَالُهُ، وە جۆرێك لە قەدەرێكی شەرعی دەگرێتەوە كە پەیوەستە بە فەرمانی خواو و شەرعەكەیەوە، ئەگەر بەم شێوازانە تێفكرین و تێگەیشتن بكرێت تیایدا؛ هەموو ئالۆزی و لێتێكچوونێك دەرِەوێتەوە[(٢)].

### ❁ چەند نموونەیەكی قورئانی[(٣)]:

### ١. وشەی (الكتابة):

بۆ قەدەری كەونی، قَالَ تَعَالَى: ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ﴾ [المجادلة : ٢١].

خوای پەروەردگار نووسیویەتی و فەرمانی داوە بە سەركەوتنی خۆی و پێغەمبەرانی[(٤)].

بۆ قەدەری شەرعی، قَالَ تَعَالَى: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ﴾ [البقرة : ١٨٣].

لەسەرتان نووسراوە رِۆژووگرتن (واتە واجب كراوە).

### ٢. وشەی (الأمر):

بۆ قەدەری كەونی، قَالَ تَعَالَى: ﴿وَمَآ أَمْرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٌ كَلَمْحٍۭ بِٱلْبَصَرِ ﴿٥٠﴾﴾ [القمر : ٥٠].

فەرمانمان یەك جارە، پێویست بە دووبارەكردنەوە ناكات، وەكوو چاوتروووكاندنێك وایە[(٥)].

---

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص٢٨٠.

(٢) (٣) "شفاء العليل" لابن القيم ص٦٩٣.

(٤) "تفسير السعدي" ص٨٤٨.

(٥) "تفسير ابن كثير" (٧/ ٤٨٩).

بۆ قەدەری شەرعی، قَالَتَعَالَىٰ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ﴾ [النَّحۡل: ٩٠].

خوای پەروەردگار فەرمانی بە دادوەری و چاکە کردووە.

**٣. وشەی (الإذن):**

بۆ قەدەری کەونی، قَالَتَعَالَىٰ: ﴿وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنۡ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ [البَقَرَة: ١٠٢].

ساحیر و شەیتانەکان بەبێ ئیزنی خوا زیان بە کەس ناگەیەنن.

بۆ قەدەری شەرعی، قَالَتَعَالَىٰ: ﴿أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ﴾ [الشُّورَىٰ: ٢١].

یاسا و بەرنامەیەکیان دانا کە خوا ئیزنی نەداون پێی.

**٤. وشەی (الجعل):**

بۆ قەدەری کەونی، قَالَتَعَالَىٰ: ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا﴾ [النَّحۡل: ٧٢].

خوای پەروەردگار خێزانی لە خۆتان بۆ دروستکردوون.

بۆ قەدەری شەرعی، قَالَتَعَالَىٰ: ﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٖ وَلَا سَآئِبَةٖ وَلَا وَصِيلَةٖ وَلَا حَامٖ﴾ [المَائِدَة: ١٠٣].

خوای گەورە ئەم یاسای (سائبة، وصیلة، حام)ەی دانەڕشتووە، کە یاسا و ڕێسایەکی موشریکەکان بوو بۆ ئەنجامدانی کار و کردەوە بۆ خوا.

**٥. وشەی (الكلمات):**

بۆ قەدەری کەونی، قَالَتَعَالَىٰ: ﴿كَذَٰلِكَ حَقَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ فَسَقُوٓاْ أَنَّهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٣٣﴾ [يُونُس: ٣٣].

قەدەرەکانی خوا هاتە دی بەسەر تاوانباراندا کە ئیمان ناهێنن.

بۆ قەدەری شەرعی، قَالَتَعَالَىٰ: ﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبۡلِغۡهُ مَأۡمَنَهُۥ﴾ [التَّوۡبَة: ٦].

ئەگەر بێبڕوایەك پەنای پێ گرتیت پەنای بدە، تاوەکوو فەرموودەکانی خوا دەبیستێت.

**٦. وشەی (البعث):**

بۆ قەدەری کەونی، قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ﴾ [الإسراء: ٥].

چەند دەسەڵاتدارێکی خۆمان ناردە سەریان.

بۆ قەدەری شەرعی، قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ [البقرة: ٢١٣].

پێغەمبەرانمان بۆ ناردوون.

**٧. وشەی (الإرسال):**

بۆ قەدەری کەونی، قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ﴾ [الأعراف: ٥٧].

هەر ئەو خوایەیە باو بۆرانی بۆ ناردن.

بۆ قەدەری شەرعی، قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ﴾ [الفتح: ٢٨].

هەر ئەو خوایەیە کە پێغەمبەرانی بە ڕێنموونیکار بۆ ناردوون.

**٨. وشەی (التحریم):**

بۆ قەدەری کەونی، قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ﴾ [القصص: ١٢].

شیرخواردنمان لەسەر (موسی) حەرام کرد لە ئافرەتانی تر بە منداڵی.

بۆ قەدەری شەرعی، قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا﴾ [المائدة: ٩٦].

حەراممان کردووە ڕاوکردن کاتێك کە بەرگی ئیحرامتان لەبەربوو.

**٩. وشەی (الکره):**

بۆ قەدەری کەونی، قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَـٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ﴾ [التوبة: ٤٦].

خوای پەروەردگار چوون بۆ جیهادی لە دڵتاندا قورس کرد.

بۆ قەدەری شەرعی، قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا ﴿٣٨﴾﴾ [الإسراء: ٣٨].

هەموو ئەو تاوانانە لای خوا حەرامە.

بەهۆی جیاوازی نێوان قەدەری کەونی و شەرعی، جیاوازی نێوان ئەو دوو وشانە دەردەکەوێت لەڕووی مانا و باس و داڕشتنەکانیانەوە.

**تێبینی:** هەندێك جار ئەو وشانە بە گوێرەی داڕشتن و ماناکانیان؛ هەردوو جۆری قەدەر لەخۆدەگرێت، وەکوو:

**وشەی (الحكم):** قَالَ تَعَالَى: ﴿وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾﴾ [الكهف: ٢٦]، لە ڕووی قەدەری کەونییەوە داوای دەسەڵاتی دینی دەکات لە دونیادا، وە لە ڕووی قەدەری شەرعیشەوە شەریعەت و یاساکانی بۆ کارپێکردن و حوکمڕانی ناردووە.

**وشەی (الجعل):** قَالَ تَعَالَى: ﴿جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ قِيَـٰمًا لِّلنَّاسِ﴾ [المائدة: ٩٧]، کەعبەی داناوە بە قەدەری کەونی، وە بە قەدەری شەرعیش کردوویەتی بە قیبلە و شوێنی حەج و نوێژ و سنووری حەرەمیشی بۆ دیاری کردووە.

**وشەی (الكلمات):** قَالَ تَعَالَى: ﴿وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَـٰتِ رَبِّهَا﴾ [التحريم: ١٢]، کتێبەکانی یاسا شەرعییەکانیەتی کە فەرمانی پێ کردووە، وە بەو وشانەش فەرمانی بە دروستکردن و هێنانەدی داوە.

**وشەی (يؤتي):** قَالَ تَعَالَى: ﴿يُؤْتِى ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ﴾ [البقرة: ٢٦٩]، کەونییە وەکوو دابەشکردنی حیکمەت بەسەر بەندەکانیدا، وە شەرعیشە وەکوو (الأوامر والنواهي)یەکان.

لەم دوو جۆرە قەدەرەدا هەڵوێستی پێغەمبەران عليهم السلام و شوێنکەوتووانیان جێبەجێکردنی فەرمانە شەرعییەکانە و باوەڕبوونە بە قەدەرە کەونییەکان، بەڵام ڕێگەی بێبڕوایان و تاوانباران فەرمان شکاندن و جێبەجێ نەکردنی قەدەری شەرعییە و قەدەری کەونیش دەکەنە پاساو و بەڵگە بۆ ڕێگە هەڵەکانیان و تاوانەکانیان[1].

  

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص٧٠٢.

# بــەشــی دووەم

## بابەتە هەستیارەکانی قەدەر و
## ڕا جیاوازەکان لەسەری
## المواضع الخلافية في القدر

لە قەزا و قەدەردا کۆمەڵێك بابەتی هەستیارمان هەیە، کە بەهەڵە تێگەیشتنیان هۆکاری لادان و بڕیار و بیرۆکەی هەڵە بوون، بۆیە پێویستە ئەو بابەتانە ڕوونکردنەوەیان لەسەر بدرێت، تا ببێتە هۆکاری ناسینی بەرنامەی فیرەقەکان و خاڵی گومڕاییان لە قەدەردا، وە لە بەرامبەریشدا ئاشنابوون بەسەر بەرنامەی قورئان و فەرموودە لەو بوارەدا و شیکاری زانایانی ئەهلی سوننەت و ڕوونکردنەوەیان لەسەری.

## بــابەتی یــەکــەم
### کاری ئادەمیزاد ( أفعال العباد )

بێگومانین لەوەی کە خوای پەروەردگار دروستکار و داهێنەری هەموو بوونەوەرەکانە، وە هەموو ناو و سیفات و کار و زاتێکی کامڵ و تەواو و بێ کەم و کورتی شایستە بە خۆیەتی، لەوانە هەڵبژاردن و ئازادی و ئاڵوگۆڕی تەواو لە کارەکانیدا موڵکی خۆیەتی و هەر بۆ خۆیەتی.

بێجگە لە پەروەدگار هەموو دروستکراوەکان لە هەموو جۆرەکان بێ دەسەڵات و ناسەربەخۆن، بێجگە لە ئازادییەکی سنووردار نەبێت کە پێی بەخشیون، ئەویش لە چوارچێوەی ئەو هۆکار و کارانەدا کە بۆی دروستکردوون، هەر لە جیهانی بێگیانەکانەوە تا تەواوترین بوونەوەریان.

وەکوو خوای پەروەردگار بە ئاسمانەکان و زەوی دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ١١﴾ [فصلت: ١١]. واتە ئەی ئاسمانەکان و زەوی، جێبەجێکاری تەواوی فەرمانەکانم بن بەوەی کە پێم داون، بە ویستی خۆتان بێت یا بە زۆرەملێ بێت، وتیان لەسەرمانە ئەوەی کە فەرمانت پێکردووین بە ملکەچی و جێبەجێکاری،

ویستێکمان نییە جیاوازی ویستی تۆ بێت[١].

مەبەست لێرەدا بوونی دوو جۆر سیفەتە، بەزۆر پێکردن و هەڵبژاردەیی خۆیی، تەنانەت لەو ژیان و ئیرادە کەمەی کە لە بێگیانەکاندا هەیە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ﴾ [الكهف: ٧٧]. دیوارەکە دەیویست برووخێت[٢]، وە دەفەرموێت: ﴿تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِنۡهُ وَتَنشَقُّ ٱلۡأَرۡضُ وَتَخِرُّ ٱلۡجِبَالُ هَدًّا ۝٩٠ أَن دَعَوۡاْ لِلرَّحۡمَٰنِ وَلَدٗا ۝٩١﴾ [مريم: ٩٠، ٩١]. خەریکە ئاسمانەکان پارچەپارچە دەبن و زەویش لەتلەت دەبێت و شاخەکان دەڕووخێن، کاتێك بڕیاری منداڵ دەدەن بۆ خوا[٣]، وە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَهۡبِطُ مِنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِ﴾ [البقرة: ٧٤]. لە بەردەکاندا هەن لە ترسی خوا دەکەونە خوارەوە.

(ابن كثير) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: وَقَدْ زَعَمَ بَعْضُهُمْ أَنَّ هَذَا مِنْ بَابِ الْمَجَازِ؛ وَهُوَ إِسْنَادُ الْخُشُوعِ إِلَى الْحِجَارَةِ، كَمَا أُسْنِدَتِ الْإِرَادَةُ إِلَى الْجِدَارِ فِي قَوْلِهِ: ﴿يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ﴾، قَالَ الرَّازِيُّ وَالْقُرْطُبِيُّ وَغَيْرُهُمَا مِنَ الْأَئِمَّةِ: وَلَا حَاجَةَ إِلَى هَذَا، فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى يَخْلُقُ فِيهَا هَذِهِ الصِّفَةَ[٤].

واتە: هەندێك دەڵێن ئەمە (استعارة ومجاز)ە، واتە شێوە نەخشاندنێکە بۆیان، بەڵام ئیمامی (ڕازی و قورتوبی) و زانایانی تر دەڵێن: پێویست بەو شێوە تەفسیرە ناکات، بەڵکوو خوای پەروەردگار ئەو سیفەتانەیان تیادا دروست دەکات.

(الشنقيطي) رَحِمَهُ اللهُ لە تەفسیری ئایەتی ﴿جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥ﴾ دەڵێت: هَذِهِ الْآيَةُ الْكَرِيمَةُ مِنْ أَكْبَرِ الْأَدِلَّةِ الَّتِي يَسْتَدِلُّ بِهَا الْقَائِلُونَ: بِأَنَّ الْمَجَازَ فِي الْقُرْآنِ زَاعِمِينَ أَنَّ إِرَادَةَ الْجِدَارِ الِانْقِضَاضَ لَا يُمْكِنُ أَنْ تَكُونَ حَقِيقَةً، وَإِنَّمَا هِيَ مَجَازٌ، وَقَدْ دَلَّتْ آيَاتٌ مِنْ كِتَابِ اللهِ عَلَى أَنَّهُ لَا مَانِعَ مِنْ كَوْنِ إِرَادَةِ الْجِدَارِ حَقِيقَةً؛ لِأَنَّ اللهَ تَعَالَى يَعْلَمُ لِلْجَمَادَاتِ إِرَادَاتٍ وَأَفْعَالًا وَأَقْوَالًا

(١) "تفسير الوسيط" للطنطاوي (١٢/ ٣٣٢)، و "تفسير السعدي" ص٧٤٥.
(٢) "تفسير الوسيط" للطنطاوي (٨/ ٥٥٨).
(٣) "فتح القدير" للشوكاني (٣/ ٤١٥).
(٤) "تفسير ابن كثير" (١/ ٣٠٥).

لَا يُدْرِكُهَا الْخَلْقُ كَمَا صَرَّحَ تَعَالَى بِأَنَّهُ يَعْلَمُ مِنْ ذَلِكَ مَا لَا يَعْلَمُهُ خَلْقُهُ فِي قَوْلِهِ جَلَّ وَعَلَا: ﴿وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ [الإسراء: ٤٤]، فَصَرَّحَ بِأَنَّنَا لَا نَفْقَهُ تَسْبِيحَهُمْ، وَتَسْبِيحُهُمْ وَاقِعٌ عَنْ إِرَادَةٍ لَهُمْ يَعْلَمُهَا هُوَ جَلَّ وَعَلَا وَنَحْنُ لَا نَعْلَمُهَا، وَأَمْثَالُ ذَلِكَ كَثِيرَةٌ فِي الْقُرْآنِ وَالسُّنَّةِ.

فَمِنَ الْآيَاتِ الدَّالَّةِ عَلَى ذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ﴾ [البقرة: ٧٤] الْآيَةَ، فَتَصْرِيحُهُ تَعَالَى بِأَنَّ بَعْضَ الْحِجَارَةِ يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللهِ دَلِيلٌ وَاضِحٌ فِي ذَلِكَ؛ لِأَنَّ تِلْكَ الْخَشْيَةَ بِإِدْرَاكٍ يَعْلَمُهُ اللهُ وَنَحْنُ لَا نَعْلَمُهُ، وَقَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ﴾ [الأحزاب: ٧٢] الْآيَةَ، فَتَصْرِيحُهُ جَلَّ وَعَلَا بِأَنَّ السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَالْجِبَالَ أَبَتْ وَأَشْفَقَتْ، أَيْ: خَافَتْ، دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ ذَلِكَ وَاقِعٌ بِإِرَادَةٍ وَإِدْرَاكٍ يَعْلَمُهُ هُوَ جَلَّ وَعَلَا وَنَحْنُ لَا نَعْلَمُهُ(١).

**واتە: ئەم ئایەتە گەورەترین بەڵگەی دەستی ئەوانەیە کە دەڵێن (مجاز) لە قورئاندا هەیە، بەوەی کە دەڵێن ویستی ڕووخاندن لە دیواردا حەقیقی نییە و شێوەکارییە (مجاز)ە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ڕێگرییەك نییە کە بە شێوەی باس و ڕاستی خۆی بێت کە خوا تیایاندا دروستی کردووە لە ویست و کار و قسەیەك کە ئێمە دەرکی پێناکەین، وەك چۆن هەموو شتەکان تەسبیحاتی خوا دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا ﴿لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ تێگەیشتنمان بۆی نییە، نموونەی ئەمانە زۆرە لە قورئاندا، هەر لە دەرچوونی ئاو لە بەرد و کەوتنەخوارەوەی لە ترسی خوا، وە هەڵنەگرتنی فەرمانەکانی خوا و ترسیان لێی ﴿فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا﴾، ئەمانە هەمووی بوونیان هەیە بە ویست و دەرکپێکردنێك کە خوا پێی بەخشیون و پێی دەزانێت و ئێمە پێی نازانین.**

(١) "أضواء البيان" للشنقيطي (٣/ ٣٣٩).

بەهەرحاڵ گەر ئاسمانەکان و زەوی ﴿ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا﴾ [فصلت: ١١]. (ویست و ئیرادە) و (بەزۆرپێکردن)یان تیادا بێت؛ لەو سنوورەدایە کە بۆیان دیاریکراوە، وە ئاشکرایە جیهانێکی (مسیر) و بێ دەسەڵات و جێبەجێکارن، ئەوەندەی کە خاوەنی ئیرادە و کار بن.

کەوابوو ئادەمیزادیش بە هەمان شێوە و لەپێشترە بە بوون و خاوەنی ئەو دوو سیفەتە، لە (هەڵبژاردن) و (بەزۆر پێکردن)، وەکوو خوای پەروەردگار لەم ئایەتانەدا ئاماژە بە پێبەخشینی ئەو دوو سیفەتە دەکات بە ئادەمیزاد کە خاوەنیەتی، دەفەرموێت:

١. ﴿وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ٧ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ٨﴾ [الشمس: ٧، ٨].
خوای گەورە ئادەمیزادی چاورۆشن کردووە لەوەی کە دەیکات و لەوەی کە نایکات، لە خێر و شەڕ و خواپەرستی و تاوان[(١)].

٢. ﴿وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ ١٠﴾ [البلد: ١٠].
بۆ ئادەمیزاد ڕوونکراوەتەوە ڕێگەی شەڕ و خێر، وە ئامادەکاریمان تیایدا دروستکردووە بۆ هەڵبژاردن[(٢)].

٣. ﴿فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ﴾ [الكهف: ٢٩].
ئەم ئایەتە بۆ هەڕەشەیە، ئەگەرچی هەڵبژاردنی داوەتە دەست خۆیان، واتە هەڵبژاردنیان بۆ هەیە، بەڵام ڕێگەی هەڵەیان لێ قبووڵ ناکەین[(٣)].

٤. ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَ﴾ [آل عمران: ١٥٢].
تیاتاندایە دونیای دەوێت و هەشتانە ڕۆژی کۆتایی[(٤)].

٥. ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومٗا مَّدۡحُورٗا ١٨ وَمَنۡ أَرَادَ ٱلۡأٓخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعۡيُهُم مَّشۡكُورٗا ١٩﴾ [الإسراء: ١٨، ١٩].

---

(١) "تفسير الطبري" (٢٤/ ٤٥٤).
(٢) "المنتخب في تفسير القرآن الكريم" ص٩٠٨.
(٣) "أضواء البيان" للشنقيطي (٣/ ٢٦٦).
(٤) "تفسير ابن كثير" (٢/ ١٣٤).

ئەوەی دونیای دەوێت پێی دەبەخشین بە ویستی خۆمان، وە ئەوەی دوارِۆژی دەوێت ئەوە پاداشتی دەدرێتەوە[١].

٦. ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْأَخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِي حَرْثِهِۦۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ﴾ [الشورى : ٢٠].

ئەوەی دوارِۆژی دەوێت بۆی زیاد دەکرێت، وە ئەوەی دونیای بوێت پێی دەدەین.

٧. ﴿إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ۝٣﴾ [الإنسان : ٣].
ئێمە ڕێگەمان ڕوون کردووەتەوە، یا سوپاسگوزاری یا بێباوەڕی[٢].

ئەم دەقانە بوونە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئادەمیزاد خاوەن بژاردە و سەربەخۆ و (مُخَيَّر)ە لە کاردا، لەگەڵ ئەوەشدا (مُسَيَّر)ە و خاوەن ئیرادە و دەسەڵات نییە لە هەندێك ڕووەوە، وەك (هاتنە دونیا و جۆری دایك و باوكی و شوێنی لەدایکبوون و تەمەنی منداڵی و گەنجی و پیری و تەمەن و شێوەی ڕەنگ و لاشە و کارکردنی دڵ و مێشك و ئەندامەکانی لاشەی ...)، ئەمانە هەمووی قەدەری کەونین و ئادەمیزاد بێدەسەڵاتە لە ئاستیاندا، بەڵام لە ڕووی پێدانی ژیری و عەقڵ و کارکردن بە ویست و بژاردەی خۆی و هەوڵدان بۆ پێویستییەکانی ژیانی و هێنانەدی ئاواتەکانی و بەدواداچوون و بەدەستهێنانی یەك بە یەکی سوودمەندییەکانی ...، ئەمانە هەمووی بەڵگەن بۆ ئەوەی بژاردە و سەربەخۆیی لە کاردا ئادەمیزاد خاوەنیەتی، ئەمەش دەچێتە ژێر باری یاساکانی قەدەری شەرعییەوە.

ئەم دوو بابەتە لە ئادەمیزاددا (مُسَيَّر ومُخَيَّر) شوێنی ڕای جیاواز و خوێندنەوەی جۆراوجۆرە و تەنانەت تاقم و فیرەقی سەربەخۆی لەسەر دروستبووە، وەکوو (الجبرية)کان کە لەسەر (مُسَيَّر)، وە (القدرية)کان لەسەر (مُخَيَّر) دروست بوون، هەریەکەی بە هۆکاری خوێندنەوەی لایەك لە دەقەکان بۆ قەزاوقەدەر و پەراوێزخستنی لایەکەی تری.

تا ئێستاش هەرکەسێك لەم بابەتەدا بدوێت؛ بە لایەك لەو دوو لایەنە دەدوێت، گەر لەناو بازنەی دیندا بێت یا لە دەرەوەی، گەر بە بەڵگەکانی قورئان بێت یا بە تێڕوانینە عەقڵییەکان، ئەمە

(١) "تفسير ابن كثير" (٥/ ٦٢).
(٢) "تفسير ابن كثير" (٨/ ٣٢٢).

واقعێکی ناو ئادەمیزادە و هەر چەندبارە دەبێتەوە، بۆیە پێویستە بەم پرسیارە بچینە شیکاری بەڵگەکان و ڕاستکردنەوەی تێڕوانینە عەقڵییەکان، بۆ دەرکەوتنی بەرنامەی حەقی ئەهلی سوننەت، بەگوێرەی تێگەیشتنی قورئان و فەرموودەکان، بە شیکاری پێشینە ساڵحەکانی ئیسلام و بەرنامەیان (المنهج السلف الصالح)، وە لەلایەکی ترەوە بۆ ڕوونبوونەوەی گومڕایی و لادانی فیرەقە عەقڵییەکان.

## پرسیار: ئایا ئادەمیزاد خاوەن بژاردە و ئیرادەی خۆیەتی یان نا؟

ئەم پرسیارە زۆر جار بەم شێوەیە دەکرێت: "ئایا ئادەمیزاد خاوەن بژاردە و ئیرادەی خۆیانن یان بەزۆرپێکراون؟ (مُسَيِّر)ن یان (مُخَيَّر)؟" ، بەڵام بە شێوازی سەردێڕەکە زانستیترە، لەبەرئەوەی بە ڕەهایی (مطلق) ناتوانرێت وەڵام بدرێتەوە، بە هۆکاری ئەوەی وەکوو باسمان کرد ژیانی تێکەڵە لە هەردووکیاندا، لە چەند ڕوویەکەوە خاوەن بژاردە و ئیرادە نییە، وە لە چەند ڕوویەکیشەوە پێبەخشراوی بژاردە و ئیرادەیە.

بەڵام بۆ زیاتر تێگەیشتن و ڕەوینەوەی گومان و هەڵەکان لەسەر دەقەکانی قورئان و فەرموودە لەسەر ئەم دوو لایەنە، پێویست دەکات ئەو دەقانەی کە باس لە بەزۆر پێکراوی و بێ ئیرادەیی (مُسَيِّر) دەکات بخەینە ڕوو، وە شیکاری زانایانی لەسەر دیاری بکەین، وە هەروەها ئەو دەقانەیش کە باس لە بژاردە و خاوەن کاری (مُخيّر واختيار) دەکات بخرێتە ڕوو، گومانە هەڵە عەقڵییەکان لەسەر هەردوولا بڕەوێنرێتەوە و تێگەیشتنی ڕاست و دروست ڕوونبێتەوە، ئەم شێوەیە نزیکترین جۆری یەکلاکەرەوە و تێگەیشتنی زانستی شەرعی و عەقڵی ووردە.

### یەکەم: ئەو ئایەت و فەرمووودانەی کە باس لە بێ ئیرادەیی و بێ دەسەڵاتی (مُسَيِّر)ی ئادەمیزاد دەکات.

ئەو دەقانەی کە ڕووکەشیان بەزۆرەملێیی و بێ دەسەڵاتی تیایدا دەخوێنرێتەوە؛ لە چوارچێوەی ئەم چوار بابەتەدایە:

١. ئەو دەقانە پەیوەستن بە باس لە ویست و ئیرادەی ڕەهای خوا (المشيئة الإلهية المطلقة) بە گشتی، کە هەموو بوونەوەرەکان لەژێر ئەو ویست و ئیرادە کەونییەی خوادا دەژین و هەڵسوکەوت دەکەن، وە لە چوارچێوەی ویستی ئەودا توانای کاریان هەیە.

**٢**. ئەو دەقانەیە کە باس لە (تقدير) نووسین و دارِشتن و تۆمارکاری بۆ بوون و چۆنیەتی هەموو بوونەوەرەکان دەکات بۆ هاتنەبوونیان و ڕاست و دروستییان.

**٣**. ئەو دەقانەیە کە باس لە (الخلق) دروستکاری و هێنانەدی خوایی بۆ هەموو بوونەوەرەکان دەکات، کە ئەو دروستی کردوون و خاوەن و خوایانە و بێجگە لەو هەمووی دروستکراو و ژێردەستەی بالآی ئەون.

**٤**. ئەو دەقانەیە کە باس لە (الثواب والعقاب) پاداشت و سزا دەکات، بە هۆکاری کار و پێشینەی خۆیانەوە لە خێر و شەڕ و هاتنەدی ئەنجام و ووردەکارییەکانی ئەو دوو ڕێگایە بەو شێوەیەی کە خوا بۆی داناوە.

هەموو ئەو دەقانەی کە باس لەم بابەتە دەکەن دەکەونە ناو قەدەری کەونی دروستکراوەوە (القدر الكوني الخلقي)، کە هیچ داواکارییەکی لەسەر بنیاد نەنراوە (مناط التكليف)، واتە لە دیندا فەرمان و ڕێگرییەکی لەسەر نییە و لێپرسینەوە و سزا و پاداشتی دوارِۆژی لەسەر بنیاد نەنراوە، ئەمە هەر وەکوو بوارێکی عەقیدەیی دەبێت باوەڕمان پێی هەبێت و یەقینی لەسەر بنیاد بنێین کە خوای پەروەردگار داهێنەر و دروستکار و بەڕێوەبەر و هەڵسووڕێنەری هەموو بوونەوەرەکانە، وە هەرچییەك ویستی لێبێت دەبێت و ئەوەی ویستی لێنەبێت نابێت: ﴿لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ﴾، بەس فەرمانی ئەو جێبەجێکارە و فەرمانی ﴿كُن فَيَكُونُ﴾ ناشکێت تیایاندا ﴿يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ﴾، وە هەموو بوونەوەرەکان لەناو دروستکراو و ئیرادەی ئەودان.

ئەم جۆرە قەدەرە (المُسَيِّر والجَبر) پەیوەندی بە جۆری تەوحیدی (الربوبية والأسماء والصفات)ەوە هەیە.

وە ئەم جۆرە قەدەرە هەرچوار پایەکانی قەدەر لەخۆ دەگرێت، یەکەمیان کە (المشيئة والإرادة)یە، دووەمیان (العلم) و (الكتابة)یە، وە سێیەمیشیان (الخلق)ە، واتە ڕەنگدانەوەی ویستی خوایی تێیدا بە شێوەیەکی گشتی، پاشان ڕەنگدانەوەی باس و خواسی زانست و نووسینی خوایی بەسەر دروستکراوەکانیدا و پاشان دروستکردن و هێنانەدی و بەڕێوەبردن و کۆتایی (مخلوقات).

ئەم جۆرە قەدەرە گەر ڕەچاو بکرێت و خوێندنەوەی بۆ بکرێت لەگەڵ قەدەری شەرعی دینیدا؛ کامڵترین و تەواوترین جۆری ئەنجامدانی کار و فەرمانە شەرعییەکان دێتە دی، دوور لە

زیادەڕەوی و کەمڕەوی، بە لێکدانی هەردووکیان کاریگەری تەواوی هەیە لەسەر بەدیهێنانی یەقینێکی ئیمانی تەواو.

## خاڵەکانی دارِشتنی دەقەکانی
## بێ ئیرادەیی و بێ دەسەلاتی (مُسَيِّر)ی ئادەمیزاد

**١. ئەو دەقانەن باس لە ئیرادە و ویستی خوا** جَلَّجَلَالُهُ **بە ڕەهایی دەکەن (الإرادة المطلقة):**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾﴾ [التكوير: ٢٩].

هیچ ویستێك نەدراوەتە دەست ئێوە، بەڵکوو هەموو ویستەکانتان پاشکۆی ویستی خوایە، ئەو ویستەی خواش یارمەتیدان و کار بۆئاسانییە[(١)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿٥٥﴾ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ [المدثر: ٥٥،٥٦].

بیرخستنەوەی ئەم قورئانە و پەندلێوەرگرتنی بە ویستی خوایە، لەبەرئەوەی کەس توانای بەسەر ئەمەدا نییە، بێجگە لە ویستی خوا و توانای ئەو نەبێت[(٢)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾ [البقرة: ١٠٥].

خوای پەروەردگار بیری گاوور و جوولەکەی دەخاتەوە، بەوەی (محمد)ی ﷺ کردە پێغەمبەر، وە یارمەتی ئیمانداری دا بۆ باوەڕهێنان پێی، تەنها خوایە بەهرەکانی بە ئاوات نایەتە دی، بەڵکوو بە ویستی خۆی کەسەکان تایبەتمەند دەکات بە بەزەیی و نیعمەتەکانی[(٣)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا﴾ [يونس: ٩٩].

ئەی (محمد) ﷺ گەر خوای تۆ ویستی لێبێت هەموو سەرزەوی ئیمانیان پێت دەهێنا، بەڵام ئەمە ویستی من نییە، لەبەرئەوەیە هەندێك ئیمانت پێ ناهێنن[(٤)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ﴾ [هود: ١١٨،١١٩].

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٨/ ٣٤٠)، و "تفسير البغوي" (٥/ ٢١٨).
(٢) "تفسير الطبري" (٢٤/ ٤٤).
(٣) "تفسير الطبري" (٢/ ٤٧١).
(٤) "تفسير الطبري" (١٥/ ٢١١).

گەر خوا ویستی لێبێت هەموو خەڵکان دەکاتە ئیماندار، بەڵام بەردەوام لە ڕاجیاوازیدان مەگەر کەسانێك خوا بە بەزەیی خۆی هیدایەتیان بدات.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٦﴾ [آل عمران: ٢٦].

ئەی پەروەردگار هەموو ئەوانەی کە هەن موڵکی تۆن، تۆ دەیبەخشیت و هەر تۆشی بە ویستی خۆت نایبەخشیت، وە هەر تۆیت ئەوەی کە ویستت لێیە دەبێت و ئەوەی ویستت لێ نییە نابێت[(١)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرۡحَمُ مَن يَشَآءُۖ وَإِلَيۡهِ تُقۡلَبُونَ ٢١﴾ [العنكبوت: ٢١].

هەر تۆی بە تەنیا خاوەنی یاسا و حوکمە پێچەوانەکانی، لە پاداشتی خواناسان و سزای تاوانباران، گەڕانەوەیان بۆ دوارۆژە کە جێبەجێکاری یاساکانتە[(٢)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿أَنَّ ٱللَّهَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُ﴾ [الزمر: ٥٢]، وقال تعالى: ﴿وَٱللَّهُ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ٣٨﴾ [النور: ٣٨].

خوای پەروەردگار ڕۆزی دەبەخشێتە بەندەکانی، چاك بن یان خراپ، وە لێیان دەگرێتەوە، چاك بن یان خراپ، بە ویستی خۆی بەبێ جیاوازی نێوانیان، بەس کردەوەی چاك و ئیمانە کە تایبەتی دەکات بە هەندێك لە بەندەکانی[(٣)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ١٠٧﴾ [هود: ١٠٧]، وقال تعالى: ﴿قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُ﴾ [آل عمران: ٧٣].

پەروەردگار ئەوەی بیەوێت و دانایی لەسەر بێت دەیکات، کەسێك نییە ڕێگر بێت تیایدا[(٤)].

هەر خوایە چاکەبەخشە بە بەندەکانی، ئەو خوایەی هۆکارەکانی بەدەست دێنێت و فراوانە بەهرەکانی، بۆ ئەوانەی کە شایستەی چاکەکانن و پێیان ببەخشرێت بە ویستی خۆی[(٥)].

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٢/ ٢٩).
(٢) "تفسير السعدي" ص٦٢٨.
(٣) "تفسير السعدي" ص٥٦٩، ٧٢٧.
(٤) "تفسير السعدي" ص٣٨٩.
(٥) "تفسير السعدي" ص١٣٤.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ﴾ [فَاطِر: ٨].

ئەوەی خوا ویستی لێبێت گومڕای دەکات، وە ئەوەی ویستی لێبێت هیدایەتی دەدات، بەو هۆکارانەی کە بۆی ڕەخساندووە، کە نهێنی پڕ دانایی خۆیەتی[(١)].

۩ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى، فَقَالَ مُوسَى: يَا آدَمُ أَنْتَ أَبُونَا خَيَّبْتَنَا وَأَخْرَجْتَنَا مِنَ الْجَنَّةِ، فَقَالَ لَهُ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى، اصْطَفَاكَ اللهُ بِكَلَامِهِ، وَخَطَّ لَكَ بِيَدِهِ، أَتَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدَّرَهُ اللهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى"»[(٢)].

(ئادەم و موسی) ﷺ بەڵگەکاریيان بەسەر یەکەوە کرد، (موسی) ﷺ وتی: ئەی ئادەم تۆ باوکمانی، بوویتە هۆکاری زەرەرۆمەندی و ناخۆشییەکانمان و دەرکردنمان لە بەهەشت، (ئادەم) ﷺ پێی وت: تۆ (موسی)یت ﷺ، کە خوا تۆی هەڵبژارد بە وتوویژ لەگەڵیدا، وە تەوراتی بۆ نووسیتەوە، ئەوە سەرزەنشتم دەکەیت لەسەر شتێك کە خوا لەسەری نووسیوم بە چل ساڵ پێش ئەوەی دروستم بکات؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئادەم) بەڵگەی بەهێز بوو بەسەر (موسی)دا.

۩ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ، ...»[(٣)].

خوای پەروەردگار ویستی خێری بە هەرکەسێك بێت؛ شارەزا و تێگەیشتووی دەکات لە دیندا.

(١) "التحرير والتنوير" لابن عاشور (٢٢/ ٢٦٥).

(٢) رواه البخاري (٣٤٠٩)، ومسلم (٢٦٥٢) واللفظ له، وأبو داود (٤٧٠١)، والترمذي (٢١٣٤)، والنسائي في "الكبرى" (١١٠٦٥)، وابن ماجه (٨٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٦١٧٩)، وأحمد في "المسند" (٧٥٨٨)، والدارمي في "الرد على الجهمية" (٢٩٣)، والبزار في "المسند" (٧٨٨٨)، والطبراني في "مسند الشاميين" (٣٠٦٠)، وابن خزيمة في "التوحيد" (١/ ١٢٠)، وابن بطة في "الإبانة" (١٣٨٠)، وأبو يعلى في "مسنده" (١٥٢١)، والبيهقي في "الشعب" (١٨١)، وفي "القضاء والقدر" (١٦)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٤٠)، والآجري في "الشريعة" (٣٥٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٦٩٣)، وأبو نعيم في "الحلية" (٣/ ٣٥٦)، والبغوي في "شرح السنة" (٦٨).

(٣) رواه البخاري (٧١)، ومسلم (١٠٣٧)، والطبراني في "الكبير" (٧٥٥)، وفي "الأوسط" (٨٧٦٦)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (١٦٨٣)، والبيهقي في "المدخل" (٣٥١)، والبغوي في "شرح السنة" (١٣١).

**هەموو ئەم دەقانە باس لە ویست و ئیرادەی ڕەهای خوای پەروەردگار** جَلَّجَلَالُهُ **دەكات بەسەر هەموو بوونەوەرەكاندا، هەر ئەو بەدیهێنەر و دروستكاری بوونەوەرەكان و ویست و ئیرادەكانیانە، گەر ویستی لێبێت؛ ویست و ئیرادەكانیان كار دەكات، بەو توانا و شێوەیەی كە بۆی ڕەخساندوون، وە گەر ویستی لێبێت هەموو ئەو هۆكار و تواناییەیان دەوەستێنێت و لەكاری دەخات و نایەتە دی.**

**بۆیە بە شێوەی ڕەهایی ویست و ئیرادە ناخرێتە پاڵ بوونەوەرەكان، لەوانەش ئادەمیزاد، لەبەرئەوەی ئەو ڕەهاییە مافی ئەو نییە و خاوەنداریێتی و شایستەی نییە، هەروەكوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت:** ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْيۡءٍ إِنِّي فَاعِلٞ ذَٰلِكَ غَدًا ٢٣ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ ﴾ [الكهف: ٢٣، ٢٤]. **بۆ كارێكی داهاتووی نەكراو بە ڕەهایی مەڵێ من بەیانی ئەو كارە دەكەم، بێجگە لە خستنە ناو ویست و ئیرادەی ڕەهای خواوە، لەبەر نەتوانین و سەربەخۆ نەبوونی.**

**گەر تێڕوانین بكەین لە ویست و ئیرادەكانمان؛ دەبینین سنووردارن بە توانا و هۆكارەكانی خۆت و چواردەورتەوە، كە هەرچەندێك بكەیت لە ئاستیدا دەستەوەستانیت، وە باسی ئەم ویست و ئیرادەیە بەم شێوە ڕەهاییە واتای ئەوە نییە كە ویست و ئیرادە لە تۆ دەستێنێتەوە و خاوەنداریێتیت بۆی نییە، بەڵكوو ئەوە شتێكی حاشا هەڵنەگرە كە لە تۆدا بوونی هەیە و كاری پێدەكەیت.**

**وە كاتێك كە دەفەرموێت:** ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ [التكوير: ٢٩]، ﴿فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ٥٥ وَمَا يَذۡكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ [المدثر: ٥٥، ٥٦]:

**(ابن تيمية)** رَحِمَهُ ٱللَّهُ **دەڵێت:** أَخْبَرَ أَنَّ مَشِيئَتَهُمْ مَوْقُوفَةٌ عَلَى مَشِيئَتِهِ، وَمَعَ هَذَا فَلَا يُوجِبُ ذَلِكَ وُجُودَ الْفِعْلِ مِنْهُمْ؛ إذْ أَكْثَرُ مَا فِيهِ أَنَّهُ جَعَلَهُمْ شَائِينَ وَلَا يَقَعُ الْفِعْلُ مِنْهُمْ حَتَّى يَشَاؤُهُ مِنْهُمْ، كَمَا فِي قَوْله تَعَالَى: ﴿ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ٥٥ وَمَا يَذۡكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ وَمَعَ هَذَا فَلَا بُدَّ مِنْ إرَادَةِ الْفِعْلِ مِنْهُمْ، حَتَّى يُرِيدَ مِنْ نَفْسِهِ إعَانَتَهُمْ وَتَوْفِيقَهُمْ[١].

**واتە: خوای پەروەردگار هەواڵی داوە بەوەی كە ویستی ئادەمیزاد لەسەر ویستی خوا وەستاوە، واتای ئەوە نییە كارەكان دێنە دی بەو وتنە، بەڵكوو لەوە زیاتر بوونی نییە لایان كە**

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٦/ ٨١).

خاوەن ئیرادە و ویست بن و کار و کردارەکان نایەنە دی تا خوا ویستی لەسەر نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا ویست و ئیرادەی کار پێویستییە تیایاندا، تاوەکوو خوا جَلَّجَلَالُهُ بیەوێت یارمەتیدەریان بێت.

وە دەڵێت: وقَوْله تَعَالَى ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ لَا يَدُلُّ عَلَى أَنَّ الْعَبْدَ لَيْسَ بِفَاعِلٍ لِفِعْلِهِ الِاخْتِيَارِيِّ وَلَا أَنَّهُ لَيْسَ بِقَادِرٍ عَلَيْهِ وَلَا أَنَّهُ لَيْسَ بِمُرِيدٍ؛ ... فَإِنَّهُ تَعَالَى قَالَ: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ﴾ فَأَثْبَتَ لِلْعَبْدِ مَشِيئَةً وَفِعْلًا، ثُمَّ قَالَ: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ فَبَيَّنَ أَنَّ مَشِيئَةَ الْعَبْدِ مُعَلَّقَةٌ بِمَشِيئَةِ اللهِ ... وَقَوْلُهُ: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ﴾ نَفْيٌ لِمَشِيئَتِهِمْ فِي الْمُسْتَقْبَلِ، وَكَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ تَعْلِيقٌ لَهَا بِمَشِيئَةِ الرَّبِّ فِي الْمُسْتَقْبَلِ، فَإِنَّ حَرْفَ (أَنْ) تُخَلِّصُ الْفِعْلَ الْمُضَارِعَ لِلِاسْتِقْبَالِ فَالْمَعْنَى: إلَّا أَنْ يَشَاءَ بَعْدَ ذَلِكَ وَالْأَمْرُ مُتَقَدِّمٌ عَلَى ذَلِكَ ... وَقَدْ اتَّفَقَ السَّلَفُ وَالْفُقَهَاءُ عَلَى أَنَّ مَنْ حَلَفَ فَقَالَ: لَأُصَلِّيَنَّ غَدًا إنْ شَاءَ اللهُ ... لَا يَحْنَثُ وَلَوْ كَانَتْ الْمَشِيئَةُ هِيَ الْأَمْرَ لَحَنِثَ ...[(١)].

واتە: کە خوا جَلَّجَلَالُهُ دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ واتای ئەوە ناگەیەنێت کە بەندەکانی خاوەن کاری هەڵبژێردراو یان خاوەن توانا یان خاوەن ئیرادە نین، بەڵکوو پێشەکی دەفەرموێت ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ﴾ واتە گەر یەکێك لە ئێوە ویستی لێبێت، خوای پەروەردگار بڕیاری کار و ئیرادە بۆ بەندەکانی دەدات، پاشان دەفەرموێت ویستی داهاتووتان خاوەنی نین گەر خوا ویستی لێنەبێت، وە تەنانەت پیتی (أن) لەگەڵ (فعل المضارع) دەربڕینی کاری ئێستایە بۆ داهاتوو، بۆیە زانایان دەڵێن: گەر کەسێك سوێندێك بخوات و بڵێت (إن شاء الله)، گەر سوێندەکەشی بکەوێت پێویست بە (کفارة) ناکات، لەبەر زاڵبوونی ویستی خوا بەسەر ویستی خۆیدا.

بەم شێوەیەش بۆمان دەرکەوت کە ئیرادەکان و ویستەکانی ئادەمیزاد سەربەخۆ نین، بۆیە بە ڕەهایی (مطلق) خوای گەورە خاوەنیەتی و هەر ئەو بەخشەر و هێنەرەدییەتی، ئادەمیزاد بە ناتەواوی خۆی ناشێت زاڵبێت بەسەر سیفاتە تەواوەکانی خوادا و سەربەخۆ بێت.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٤٨٨، ٤٨٩).

هەروەك (علي بن أبي طالب) ﷺ لە وەڵامی كەسێكدا وتی: «أَخَلَقَكَ اللهُ لِمَا شَاءَ أَوْ لِمَا شِئْتَ؟ قَالَ: بَلْ لِمَا شَاءَ، قَالَ: أَخْبِرْنِي أَفَتَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَمَا شَاءَ أَوْ كَمَا شِئْتَ؟ قَالَ: لَا بَلْ كَمَا شَاءَ، قَالَ أَخْبِرْنِي أَخْلَقَكَ اللهُ كَمَا شَاءَ أَوْ كَمَا شِئْتَ؟ قَالَ: لَا بَلْ كَمَا شَاءَ قَالَ: فَلَيْسَ لَكَ مِنَ الْمَشِيئَةِ شَيْءٌ»(١).

واتە: ئەوە خوا جَلَّجَلَالُهُ تۆی دروستكردووە بۆ ئەوەی كە خۆی دەیەوێت یا بۆ ئەوەی كە خۆت دەتەوێت؟ وتی: بۆ ئەوەی كە خۆی دەیەوێت، وتی: خوا تۆ دەگێڕێتەوە بۆ ڕۆژی دوایی بە ویستی خۆی یا بە ویستی خۆت؟ وتی: بە ویستی خۆی، وتی: ئەوە خوا تۆی دروستكردووە وەكوو چۆن خۆی دەیەوێت یا وەكوو چۆن خۆت دەتەوێت؟ وتی: وەكوو چۆن خۆی دەیەوێت، وتی: كەواتە لەو ویست و ئیرادانە خاوەنی هیچ شتێك نیت.

هەروەكوو چۆن (ملائكة)كان خاوەن ئیرادە و بژاردە نین، خوا پێی نەبەخشیون، وە هەروەها بێگیانەكان لە دار و بەرد و ڕووەك و هەسارەكان، وە گیانلەبەران ...، بەو شێوەیەش ئادەمیزاد لەو بوارانەدا وەكوو ئەوان وان و لەژێر ئیرادە و ویستی ڕەهای پەروەردگاریانن، ئەگەرچی خاوەن عەقڵ و ئیرادە و تواناشن لە ئاستێكی سنووردارادا.

هەرچی لەو جۆرە دەقانە و هاوشێوەكانی هەیە؛ مەبەست لێی نەبوونی دەسەڵات و بژاردە و ئیرادەی دیاریكراوی ئادەمیزاد نییە كە گوایە خاوەنی نەبێت، بەڵكوو مەبەست بەو جۆرە دەربڕین و (خِطاب)انە دەربڕینی خوایەتی و خاوەنیەتییە بۆ هەموو سیفات و ناو و زات و كارێكی تەواو و كاملی خۆی، وە دەربڕینی بێدەسەڵاتی و بەندەیەتی و هەموو سیفەتێكی ناتەواوی بوونەوەرانە.

ئەم دەقانە پەیوەندییان بە (توحيد الربوبية والأسماء والصفات)ەوە هەیە، كە خوا جَلَّجَلَالُهُ بەڕێوەبەر و خاوەن و دروستكاری هەموو بوونەوەرەكانە، لەبەرئەوە خاوەنی هەموو سیفەت و ناوێكی باڵادەست و تەواو و بێ كەموكورتی خواییە، وە گەر وانەبێت ئەوا سیفەتەكانی خوایەتی ناتەواو دەبێت.

وە ئەم (المشيئة)یە، بەتایبەت بەكارهێنانی ئەم وشەیە مەبەست پێی (القدر الكوني)یە، پەیوەندی بە (القدر الشرعي)یەوە نییە.

---

(١) رواه ابن بطة في "الإبانة" (١٥٨٣)، والآجري في "الشريعة" (٤٢٢).

وە ئەم (المشيئة)یە پاداشت و سزای لەسەر نییە و هیچ داواکارییەك (التكليف)ی لەسەر داوا نەکراوە، ئەگەرچی بە جۆرێك لە جۆرەکان ئاماژەیە بۆ پاشماوە و هۆکار و کاریگەری کارەکانی ڕێگەی چاك و خراپ.

ئەم جۆرە قەدەرە یاخود ئیرادەیە پەیوەندی بە کارەکانی خواوە هەیە (أفعال الله تعالى)، کە چوونە ژێر باری تێگەیشتن لێی ئەستەمە، بۆیە لێکدانەوەی کارەکانیشی وەکوو ناو و سیفاتەکانی خوا وایە کە داواکاری تیایدا تێگەیشتنی واتا و مەبەستەکانیەتی و باوەڕبوونە پێی، بەبێ چوونە ناو چۆنیەتی (التكييف) و شیکاری تیایدا: «اِلاسْتِوَاءُ مَعْلُومٌ، وَالْكَيْفُ مَجْهُولٌ، وَالْإِيمَانُ بِهِ وَاجِبٌ، وَالسُّؤَالُ عَنْهُ بِدْعَةٌ»[1].

وە لەلایەکی تریشەوە پەیوەندی بە زانست (علم)ی خواوە هەیە، ئەوەش لە کاتێکدایە کە دەرککردن بە ووردەکاری زانستی خوا بۆ بەڕێوەبردنی دروستکراوەکانی ئەستەم و (مستحيل)ە و بابەتێکی غەیبییە و وەکوو هەموو بابەتە غەیبییەکان باوەڕپێهێنان و وەرگرتنە و ئادەمیزاد توانای دەرکپێکردنی نییە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ﴾.

**٢. ئەو دەقانەن کە باس لە نووسین و دانان دەکەن (التقدير):**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾ [القمر: ٤٩].

**هەموو دروستکراوەکان لە سەرەتایانەوە تا کۆتاییان دەگرێتەوە، کە خوا دروستی کردوون بە دانانێکی پڕ لە ووردی و زانستی خوایی، لە کاتێکی پێشوەختەی دیاریکراودا[2].**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾﴾ [الأحزاب: ٣٨].

**ئەو نووسینانەی کە خوا دایڕشتووە لەسەر بوونەوەرەکان دێتە دی بەبێ هیچ گۆڕانکارییەك و لادان و ئەستەمێك لە ڕێیدا[3].**

(١) رواه الدارمي في "الرد على الجهمية" (١٠٤)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص١١٦، وفي "الأسماء والصفات" (٨٦٧)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٦٦٤)، وأبو نعيم في "الحلية" (٦/ ٣٢٥)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ١٧١)، والذهبي في "العرش" (١/ ١١٨).

(٢) "تفسير السعدي" ص٨٢٧.

(٣) "تفسير ابن كثير" (٦/ ٤٢٧).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾﴾ [الفرقان: ٢].

خوای پەروەردگار دروستکاری هەموو بوونەوەرەکانە، بە دانانی هەموو ئەوانەی گونجاو و شایستە و پێویستین بۆیان، بە دانایی و حیکمەتی خۆی[١].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾﴾ [الأعلى: ٢، ٣].

خوای پەروەردگار دروستکراوەکانی بە ڕێکی و تەواوی و جوانترین شێوە هێناوەتە دی، هەموو ئامادەکارییەك و دانان و ڕێنیشاندەری هەموو پێویستییەکانی بۆ ڕەخساندووە[٢].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا﴾ [التوبة: ٥١].

ئەی (محمد) ﷺ بڵێ هیچ کارێکمان بەسەر نایەت بێجگە لەوانەی کە خوا لە (اللوح المحفوظ)دا لەسەرمانی نووسیوە[٣].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢١﴾﴾ [الحجر: ٢١].

هەرچی ڕزق و ڕۆزی و قەدەرەکان هەیە لای ئێمەیە، وە بە ویستی خۆی و بەگوێرەی حیکمەت و بەزەیی فراوانی دیاریکراوی خۆی دەینێرێتە خوارەوە[٤].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ﴾ [الشورى: ٢٧].

گەر بێت و پەروەردگار دەرگای ڕزقی فراوان لە بەندەکانی بکاتەوە؛ ئەوا دەبێتە هۆکاری ستەمکارییان بەسەر یەکەوە، بەڵام بەگوێرەی پێویستی و شیاوییان بەسەریاندا دەیبەخشێت[٥].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱلَّذِى نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ۚ كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١١﴾﴾ [الزخرف: ١١].

بەگوێرەی پێویستیتان باران دەبارێنین، کە نەبێتە تۆفان یا وشکەساڵی، بەشێوەیەك زەوییە وشکەکان پاراو بکات و بیانژێنێتەوە، وە هەر بەو شێوەیەش زیندووتان دەکاتەوە[٦].

---

(١) "تفسير السعدي" ص٥٧٧.
(٢) "تفسير السعدي" ص٩٢٠.
(٣) "تفسير البغوي" (٢/٣٥٦).
(٤) "تفسير السعدي" ص٤٣٠.
(٥) "تفسير ابن كثير" (٧/٢٠٦).
(٦) "تفسير الطبري" (٨/٣٤٠).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴿١٩﴾﴾ [عَبَسَ: ١٩].

خوا دروستی کردوون لە ئاوێکی بێ قەدر و پاشان بە ڕێك و دروستی هێناونیەتە دی، بە ڕووکەش و ناوەڕۆکەوە[(١)].

۩ قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: «... وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ لَكَ، ...»[(٢)].

بزانە ئەگەر هەرچی خەڵك هەیە کۆببێتەوە لەسەر ئەوەی سوودێکت پێبگەیەنن؛ لە توانایاندا نییە، بێجگە لەوانەی کە خوا بۆتانی نووسیوە.

۩ قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: «... فَتَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَأَنَّ مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ، ...»[(٣)].

بزانە ئەوەی کە تووشت دەبێت؛ بە هەڵە نەبووە، وە ئەوەی کە تووشت نەبووە؛ لەسەرت نەنووسراوە.

۩ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: «... وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ، فَلَا تَقُلْ لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ قَدَرُ الله وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ»[(٤)].

گەر هەر کارێکت تووش بوو مەڵێ گەر من ئەوە و ئەوەم بکردایە، بڵێ ئەوەی کە خوا نووسیویەتی و ویستی لێبێت دێتە دی، وشەی (ئەگەر) دەرگای کاری شەیتان دەکاتەوە.

ئەم جۆرە دەقانە هەمووی باس لە نووسین و دارشتن و دیاریکردنی ووردی خوایی دەکەن بۆ هێنانەدی و بەڕێوەبردنی بوونەوەران، بۆ دڵنیابوونی ئەوەی کە خوای پەروەردگار خاوەنی سیفەتە

---

(١) "تفسير السعدي" ص٩١٨.

(٢) رواه الترمذي (٢٥١٦) وقال: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وسبق تخريجه ص٥٣.

(٣) رواه أبو داود (٤٦٩٩)، وابن ماجه (٧٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٢٧)، وأحمد في "المسند" (٢١٥٨٩)، والطبراني في "الكبير" (٤٩٤٠)، والبيهقي في "الشعب" (١٧٩)، وفي "السنن الكبرى" (٢٠٨٧٤)، وابن بطة في "الإبانة" (١٤٤٣)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٠٩٣)، والفريابي في "القدر" (١٩٠)، وصححه الألباني في "المشكاة" (١١٥)، و "صحيح الجامع الصغير" (٥٢٤٤).

(٤) رواه مسلم (٢٦٦٤)، وسبق تخريجه ص٢٦.

تەواو و بێ کەم و کورتییەکانە و هەر خۆی (علیم، خبیر، لطیف، حکیم ..)ە بە دروستکراوەکانی و هەمووی لەژێر زانست و چاودێری و بەرنامەڕێژی ووردی پڕ لە دانایی ئەودان.

هەموو کارەکانی خوا جَلَّجَلَالُهُ بەم شێوازەیە، گەرچی هەرچییەکی بوێت بە (کن فیکون) دێتە دی، بەڵام بەندەکانی پەروەردە دەکات لەسەر بەرنامە و کارکردن و دڵنیایان دەکاتەوە کە هیچ کار و دروستکراوێکی خوا بە کتوپڕی و خۆڕسکی (صدفة، طبیعة)ی خۆی دروست نەبووە و نابێت، وەك دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَـٰعِبِينَ ﴿١٦﴾﴾ [الأنبياء: ١٦].

وە دەفەرموێت: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَـٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾﴾ [المؤمنون: ١١٥].

واتە ئەوە وا گومان دەبەن کە ئێمە ئێوەمان دروستکردووە بەبێ مەبەست و ئیرادە و حیکمەتێك؟ وە ناگەڕێنەوە بۆ لامان لە ڕۆژی دواییدا؟![1].

وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَـٰطِلًا﴾ [ص: ٢٧].

خوای گەورە هەواڵ دەدات بەوەی کە دروستکراوەکانی بە گاڵتە و بێهوودە دروست نەکردووە، بەڵکوو بۆ پەرستن و باوەڕپێهێنان دروستی کردوون، وە ئەوە گومانی بێبڕواکانە[2].

وە دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ [السجدة: ٤].

واتە ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی کە لەنێوانیاندا هەیە دروستیکردووە لە ماوەی شەش ڕۆژدا[3].

وە دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ مِن فَوْقِهَا وَبَـٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا فِىٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ ﴿١٠﴾﴾ [فصلت: ٩، ١٠].

سەرسوڕمان و دژایەتی دەردەبڕێت لە بێبڕوایی بێباوەڕان کە هاوبەش بڕیار دەدەن بۆ خوا و ئەو هەموو پەرستنەی بۆ ئەنجام دەدەن و دەیانخەنە ئاست و هاوشێوەی ئەو خوایەی کە زەوی لە ماوەی دوو ڕۆژدا دروستکردووە و نەخشاندوویەتی بەو شێوەیەی کە شاییستە بێت بۆ ژیان[4].

(١) "تفسير ابن كثير" (٥/ ٥٠٠).
(٢) "تفسير ابن كثير" (٧/ ٦٣).
(٣) "تفسير ابن كثير" (٦/ ٣٥٩).
(٤) "تفسير السعدي" ص٧٤٥.

وە دەفەرمویێت: ﴿إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثۡنَا عَشَرَ شَهۡرٗا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوۡمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٞ﴾ [التوبة: ٣٦].

واتە ژمارەی مانگەکان لای خوا دوانزە مانگە لەو ڕۆژەوەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە، وە لەو مانگانەش چواریان (محرم) و حەرامە تاوانکردن تیایاندا، ئەوانیش (رَجَب، ذُو القَعْدَة، ذُو الحِجَّة، مُحَرَّم)ن.

بە ژمارەی مانگەکان عیبادەتی ڕۆژوو و حەج و جەژنەکان ... هەژمار دەکرێت، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِۖ قُلۡ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلۡحَجِّ﴾ [البقرة: ١٨٩]، وە بە ژمارەی ڕۆژەکانی مانگیش ساڵ پێکدێت و کاتەکانی نوێژ دیاریدەکرێت[(١)].

وە دەفەرمویێت: ﴿وَإِنَّ يَوۡمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلۡفِ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ ٤٧﴾ [الحج: ٤٧].

واتە خوای گەورە پەلە ناکات، ڕێژە و ماوەی هەزار ساڵی بەندەکانی وەکوو یەك ڕۆژ وایە لای ئەو بۆ حوکمکردن لە نێوانیاندا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت: «يَدْخُلُ فُقَرَاءُ الْمُسْلِمِينَ الجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَائِهِمْ بِنِصْفِ يَوْمٍ وَهُوَ خَمْسُمِائَةِ عَامٍ»[(٢)].

ئەمانە نموونەیەکن لە دارشتن و نووسین و دانانی خوایی بۆ دروستکراوەکانی و کارەکانیان، بە دیقەتێکی پڕ وورد و دانایی، لەلایەن خوای پەروەردگاریانەوە.

**٣. ئەو دەقانەن کە باس لە دروستکاری و هێنانەدی خوا دەکەن بۆ بوونەوەران (الخلق):**

❁ قال تعالى: ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ فَٱعۡبُدُوهُ﴾ [الأنعام: ١٠٢].

---

(١) "تفسير البغوي" (٢/ ٣٤٥).

(٢) "تفسير ابن كثير" (٥/ ٤٣٩، ٤٤٠)، والحديث رواه الترمذي (٢٣٥٤)، والنسائي في "الكبرى" (١١٢٨٥)، وابن ماجه (٤١٢٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٧٦)، وأحمد في "المسند" (٨٥٢١)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن، والبزار في "المسند" (٧٩٣١)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٠١٨)، والطبراني في "الأوسط" (٨٨٦٥)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٤٣٩٢)، وأبو نعيم في "الحلية" (٨/ ٣٠٦)، وابن عبد البر في "الجامع" (١٣٥٢)، وصححه الألباني في "التعليقات الحسان" (٦٧٤)، و"صحيح الجامع الصغير" (٨٠٧٦).

ئەو خوایەیە کە ئەوەی ویستی لەسەرە دروستی کردووە، وە شایستەی پەرستنە و هاوبەشی بۆ بڕیار نادرێت لە هەموو جۆرەکانی پەرستندا(١).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّٰرُ ١٦﴾ [الرعد: ١٦].

ئەی (محمد) ﷺ بە موشریکەکان بڵێ گەر خواکانتان توانای دروستکردنیان نییە؛ ئەوا خوای پەروەردگار دروستکاری ئێوە و بتەکانتانە، هەر ئەوە کە تەنیایە و هاوبەشی نییە، وە شایستەی پەرستن و خوایەتییە(٢).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ٦٢﴾ [الزمر: ٦٢].

ئەم جۆرە بەڵگانە لە قورئاندا زۆرن، کە دەبنە بەڵگە لەسەر ئەوەی هەموو شتەکان بێجگە لە خوا؛ دروستکراون، ئەمە ڕەتدانەوەی فەیلەسووفەکانە کە دەڵێن جیهان کۆن و ئەزەلییە، بەڵکوو خوا دروستکاری بوونەوەرەکانیشە و سەرپەرشتیکاریانە و زانا و باڵادەستە بەسەریاندا، بە دانایی و ڕێککارییەکی وورد و شایستە لە شوێنی خۆیدا(٣).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ٥٤﴾ [الأعراف: ٥٤].

خوا خاوەنی دروستکراوەکانە و هەر فەرمانی ئەویش تیایاندا بەڕێوە دەچێت، بۆیە دوای ئەم ئایەتە داوای ئەوە دەکات کە دووعا و داواکارییەکان تەنها بۆ ئەو بێت(٤).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ٩٦﴾ [الصافات: ٩٦].

(إبراهيم) عليه السلام بە بتپەرستەکانی وت: خوای پەروەردگار دروستکاری خۆتان و کارەکانتانە، یاخود دروستکاری "بتەکانتان و ئەو شتانەشە کە لێی دروست دەکەن"، بەڵام واتای پیتی (ما) بە (الذي الموصولة) تەواوترە، لەبەرئەوەی: فَذَمَّهُمْ وَأَنْكَرَ عَلَيْهِمْ عِبَادَةَ مَا يَنْحِتُونَهُ مِنَ الْأَصْنَامِ، ثُمَّ ذَكَرَ أَنَّ اللهَ خَلَقَ الْعَابِدَ وَالْمَعْبُودَ وَالْمَنْحُوت، وَهُوَ سُبْحَانَهُ الَّذِي يَسْتَحِقُّ أَنْ يُعْبَدَ(٥).

واتە: خوای پەروەردگار لۆمەیان دەکات و دژایەتی پەرستنی بتەکان دەکات و پاشان باس لەوە دەکات کە خوا دروستکاری خۆیان و پەرستراوەکانیانە، ئایا چۆن دروستکراو دروستکراو

(١) "تفسير السعدي" ص٢٦٨.
(٢) "تفسير الطبري" (١٦/ ٤٠٨).
(٣) "تفسير السعدي" ص٧٢٨.
(٤) "تفسير السعدي" ص٢٩١.
(٥) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ٢٦٠).

**دەپەرستێت؟! کەواتە هەر خوا شایستەی پەرستنە.**

(**ابن القيم**) رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** ولو كانت مصدرية لكان الكلام إلى أن يكون حجة لهم أقرب من أن يكون حجة عليهم، إذ يكون المعنى ﴿أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ﴾ والله خلق عبادتكم لها، فأي معنى في هذا وأي حجة عليهم[1].

**واتە: ئەگەر ئەو (ما)یە بە (مصدرية) مانا بکرێت؛ ئەوا دەبێتە بەڵگە بۆ بتپەرستان، نەك بەڵگەکاری لەسەریان، ئەوکاتە واتای بەم شێوەیە دەبێت: (ئەوە ئەوانە دەپەرستن کە دەیتاشن، خوا خۆتان و عیبادەتەکانتانی بۆ بتەکان دروستکردووە)، ئەوکات دەیانوت مادام خوا "عیبادەتکردنی ئێمەی بۆ بتەکان" دروستکردووە؛ کەواتە هەڵە نین.**

**وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت:** ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ﴾ [الفرقان: ٣].

**واتە: ئەو بتانەی کە دەیانپەرستن بێجگە لە خوا؛ دروستکار نین، بەڵکوو دروستکراون[2].**

**پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت:** «إِنَّ اللَّهَ يَصْنَعُ كُلَّ صَانِعٍ وَصَنْعَتَهُ»[3].

**واتە: خوای گەورە دروستکاری هەموو خاوەن پیشەیەك و پیشەکەشیەتی.**

**ئیمامی (البخاري)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** إذا كان الله خالقًا للصناعات، لزم أن يكون هو الخالق، للتأليف الذي أحدثوه فيها، وإنما صارت الصناعات وتكونت بهذا التأليف هو فعل العبد، فأفعال العبد مخلوقة[4].

---

(١) "بدائع الفوائد" لابن القيم (١/ ١٤٣)، و "شفاء العليل" ص١٠٠.

(٢) "تفسير الطبري" (١٩/ ٢٣٧).

(٣) رواه البخاري في "خلق أفعال العباد" ص٤٦، والحاكم في "المستدرك" (٨٥)، وقال الذهبي: على شرط مسلم، والبزار في "المسند" (٢٨٣٧)، والبيهقي في "الشعب" (١٨٧)، وفي "القضاء والقدر" (١٣٣)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٣٥٧)، وابن بطة في "الإبانة" (٣/ ١٦٣)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٩٤٢، ٩٤٣)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٦٣٧)، و "صحيح الجامع الصغير" (١٧٧٧).

(٤) "خلق أفعال العباد" للبخاري ص٣٩، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٢١).

واتە: ئەگەر خوا دروستکاری پیشەکان بێت؛ ئەوا پێویستە دروستکاری ئەو ڕێکخستنانەش بێت کە پێی دروستدەکەن، لەبەرئەوەی ئەو کار و کردارانەی کە پیشەکەی پێ دروستکراوە کاری بەندەکانە، وە کاری بەندەکانیش دروستکراون لەلایەن خواوە.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ﴾ [الأنفال: ١٧].

لە شەڕی بەدردا پێغەمبەر ﷺ پاش دووعا و پاڕانەوەیەکی زۆر، لە شوێنەکەی هاتە دەرەوە و مشتێك خۆڵی هەڵگرت، هەڵیدا بەسەر بێبڕواکاندا، کەسێکیان نەما نەچێتە چاو و دەمیەوە، بەو هۆکارەوە هێز و هێرشکردنیان شکا و هەڵهاتن، ئەوکاتە خوای گەورە بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو: بە هێز و توانای تۆ نەبوو گەیاندنی ئەو خۆڵە بۆ چاو و دەمی بێبڕوایان، بەڵکوو ئێمە بە توانای خۆمان گەیاندمان پێیان، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ خۆڵەکەی هەڵدا[1].

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ ۚ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴿٧٨﴾﴾ [النساء: ٧٨].

دووڕووەکان و جوولەکەکانی مەدینە کاتێك بەروبوومی باش و ڕۆزی باشیان هەبووایە، دەیان وت: ئەمە لەلایەن خواوەیە، وە گەر وشکەساڵییان بەسەردا بهاتایە و بەروبوومیان کەم بوایەتەوە، دەیان وت ئەمە بە هۆی هاتنی (محمد) و هاوەڵانیەوەیەتی، هۆکاری شەڕن، خوای گەورە جَلَّجَلَالُهُ فەرمووی: ئەی (محمد) ﷺ پێیان بڵێ هەموو خۆشی و ناخۆشییەکانتان لەلایەن خواوەیە، دروستکردنیان و دانانی هۆکارەکانیان و هێنانەدییان[2].

ئەهلی سوننەت باوەڕیان وایە کە خوای گەورە جَلَّجَلَالُهُ دروستکاری هەموو بوونەوەرەکانە، خۆیان و سیفاتەکانیان، لە درێژی و کورتی و ...، وە دروستکاری حاڵیانە لە زانین و نەزانی و نەخۆشی و لەشساغی، وە قسە و کرداریان، وە کردەوەی بەندەکانی دروستکراوی خۆیەتی و کاری بەندەکانیەتی، کاری خوا جَلَّجَلَالُهُ دروستکردنی خۆیان و هەموو حاڵ و بارودۆخێکیانە، وە کاری بەندەکانیشی کارکردنە لەسەر ئەو حاڵەت و توانا و سیفەتانە، هەروەکوو چۆن هاتوچۆ و سووڕاندنی ڕۆژ دروستکراوی خوایە و لەگەڵ ئەوەشدا دەدرێتە پاڵ ڕۆژ؛ هەر بەو شێوەیەش بەندەکانیشی کارەکانیان کاری خۆیانە و ڕێگریش نییە لەوەی کە بدرێتە پاڵ خوا.

---

(١) "تفسير السعدي" ص٣١٧.

(٢) "تفسير ابن كثير" (٢/ ٣٦١، ٣٦٢).

هەموو ئەو بەڵگانەی پێشوو باس لە دروستکاری خوا دەکات، هیچی باسی ئەوە ناگەیەنێت کە بەندەکان خاوەن هیچ کار و کردارێك نین، گەر کەسێك ئامێرێك دروست بکات و بەرهەمێکی پێ دروستبکرێت؛ خاوەنەکەی دەتوانێت بلێت ئەم بەرهەمە من دروستم کردووە، وە دەشتوانرێت بوترێت ئامێرەکە دروستی کردووە، خاوەنەکەی لەڕووی داهێنانیەوە و ئامێرەکەش لەڕووی کارکردنیەوە.

بە جیاکردنەوەی ئەوەی خوا دروستیکردووە و ئەوەی کە بۆی دروستکراوە (خلق الله وما هو مخلوق له)[1]، واتە خوا خۆتی دروستکردووە و پێویستییەکانی کارکردنیشی بۆ دروستکردوویت؛ زۆری گومانەکان دەڕەوێنەوە.

گەر وانەبێت؛ هەرچی کاری بەندەکانی هەیە لە ستەم و درۆ و تاوان و خراپەکان، دەبێت کاری خوا بێت، لەگەڵ ئەوەشدا بەندەکانی بەو کارانە هەستاون، هەروەك چۆن خوا جَلَّجَلَالُهُ لە سیفەتەکانی ڕەنگ و بۆن و تام و شێوەکان و جوولە و ڕێژەکان لە دروستکراوەکانیدا دروستی کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە وەسفی خوای پێناکرێت و نادرێتە پاڵی، وە هەروەها کردەوەکانیش بە هەمان شێوەیە.

**٤. ئەو دەقانەن کە باس لە پاداشت و سزا و هۆکار و پاشماوەکانیان دەکەن (الثواب والعقاب):**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجٗا﴾ [الأنعام: ١٢٥].

نیشانەکانی کامەرانی ئادەمیزاد کردنەوەی دڵیەتی بۆ ئیسلام و ڕووناککردنەوەی سنگیەتی بۆ ئیمان، تاوەکوو دڵنیابوونی ئیمانی بەدەست دێت، ئەمانە نیشانەی ئەوەیە کە خوا ویستوویەتی هیدایەتی بدات، وە گەر ویستیشی لە گومڕایی کەسێك بێت؛ سنگی توند دەکات بەرامبەر زانست و ئیمان و یەقین و دڵی نوقم دەکات لە حەز و ئارەزوو و گومانەکان، تا هیچ خێرێکی پێنەگات[2].

(١) "القدر" لابن تيمية ص١٢٣.

(٢) "تفسير السعدي" ص٢٧٢.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَآتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَاهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ الْقَوْلُ مِنِّي لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٣﴾ ﴾ [السجدة: ١٣].

واتە گەر ویستمان لێبێت هیدایەتی هەموو خەڵکی دەدەین و کۆیان دەکەینەوە لەسەر هیدایەت، بەڵام حیکمەت و داناییمان ڕێگرە لەم کارە و بە هۆکاری کردەوەکانیانەوە دەبێت حوکمەکانی من بێتە دی بەسەریاندا[١].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ۖ فَمِنْهُمْ مَنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُمْ مَنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ ﴾ [النحل: ٣٦].

واتە بۆ هەموو گەلانێکی پێشوو پێغەمبەرانمان ناردووە کە خوا جَلَّجَلَالُهُ بە تاك و تەنیایی بپەرستن و دووركەونەوە لەوانەی کە گومڕایان دەکات، هەر لەوان هەبوو هیدایەتیان وەرگرت و کاریان بە فەرمانەکانی کرد، وە هەشیانبوو گومڕا بوون[٢].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنْذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنْذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ خَتَمَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ۖ وَعَلَىٰ أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٧﴾ ﴾ [البقرة: ٦، ٧].

واتە بێبڕوایان گەر ئاگاداریان بکەیتەوە یان نا ئیمان ناهێنن، خوای گەورە مۆری داوە بەسەر دڵ و بیستن و بینینیاندا[٣].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ۖ وَمَا أَصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ ﴾ [النساء: ٧٩].

واتە هەر نیعمەتێکی دین و دونیات دەستکەوتبێت لەلایەن خواوەیە، وە هەر ناخۆشییەکی دین و دونیات بەسەردا هاتبێت؛ بە هۆکاری خۆت و تاوانەکانتەوەیە[٤].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ ﴿٣٠﴾ ﴾ [الشورى: ٣٠].

هەر بەڵایەکتان بەسەردا هاتبێت بە هۆکاری تاوانی خۆتانەوەیە، هێشتا لێبوردن زیاترە تا تۆڵە[٥].

---

(١) "تفسير السعدي" ص٦٥٤.
(٢) "تفسير الطبري" (١٧/ ٢٠١).
(٣) "تفسير ابن كثير" (١/ ١٧٣).
(٤) "تفسير السعدي" ص١٨٨.
(٥) "تفسير الطبري" (٢١/ ٥٣٨).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ٥﴾ [الصَّف: ٥].

کاتێك گەلەکەی (موسا) ﷺ لایان دا لە حەق، وەکوو سزا خوا دڵی وەرگێڕان، لەبەرئەوەی شایستەی خێر نین و کەسانێك بەردەوام کاریان خراپەکاری بێت هیدایەت نادرێن[(١)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ١١٥﴾ [النِّسَاء: ١١٥].

ئەوەی دژایەتی پێغەمبەر ﷺ بکات و پێچەوانەی بێت لەپاش ڕوونبوونەوەی بەڵگەکان و هەڵگری ڕێگەی شوێنکەوتووانی نەبێت؛ دەیخەینە سەر ئەو ڕێگەیەی کە هەڵی بژاردووە کە مایەی سەرشۆڕی و بێبەشبوونە لە کاری خێر و پاشان تووشی سزای دۆزەخ و خراپترین شوێن دەبێت[(٢)].

**ئەم جۆرە دەقانەی پێشوو لە هەموو جۆرەکانی، بەڵگە و خوێندنەوەن بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە:**

١. **(القدر الكوني)**: هەموو دەقەکان ئاماژەن بۆ قەدەری کەونی و ویست و ئیرادەی گشتی پەروەردگار لەسەر دروستکردن و بەڕێوەبردنی بوونەوەرەکان، لە هێنانەدییانەوە لە نەبوونەوە بۆ بوون، وە لە بوونیشیاندا بەخشەری هیدایەت وگومڕایی و بەڕێوەبەری کاریانە.

٢. هەموو ئەو دەقانە بەڵگەن لەسەر **(التوحيد الربوبية والأسماء والصفات)** لەڕووی عەقیدەییەوە کە خوا جَلَّ وَعَلَا بە تاك و تەنیایی خۆی (خالق) و خاوەن و هەڵسووڕێنەری هەموو بوون و دروستکراوەکانیەتی.

وە هەر ئەو خاوەنی هەموو ناو و سیفات و زات و کارێکی پڕ ڕازاوە و تەواو و بێ کەم و کورتییە، (خالق)ی خێر و کاری پڕ حیکمەتە و لە شوێنی خۆیدایە.

٣. بەڵگەن لەسەر **(أفعال الله تعالى)**: ئەم دەقانە هەموویان باس لە کار و کرداری خوا دەکات بۆ (مخلوقات)ی، کە زوڵم و ستەمیان لێناکات و دروستکاری شەڕ نییە و پاداشت و

---

(١) "تفسير السعدي" ص٨٥٨.

(٢) "تفسير السعدي" ص٢٠٢.

سزاکانی بەگوێرەی توانا و مەبەست و کرداری خاوەنەکانیەتی، وە مامەڵەی لەگەڵ بەندەکانی لەسەر بنەمای هەوڵدان و بەدواداچوونی خۆیانە، لەلایەکی تریشەوە بە زانست و حیکمەتی خۆی بەخشینەکانی دەداتە بەندەکانی و دەرك بەو وردەکارییە ناکرێت، وەکوو خۆی دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ﴾.

٤. ئەم دەقانە هیچ جۆرە داواکاری و فەرمانێك (التكليف)ی لەسەر بنیاد نەنراوە، واتە لێپرسینەوە ناکرێت لەسەر ئەوەی کە بۆ بێبڕوا و تاوان و شەیتان و خراپەکاران ... هەبوون لە بووندا، وە پاداشت و سزاشی لەسەر بنیاد نەنراوە، نە کاری لەسەر دەکرێت، وە نە لێپرسینەوەش.

٥. ئەم دەقانە ئەوە دەگەیەنێت کە باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر (الإيمان بالقدر) بەو شێوەیەیە کە گشت بوونەوەرەکان و دەسەڵات و بوونیان لەژێر دەسەڵات و توانای پەروەردگاریاندایە، هەر ئەو خوا و خاوەنیان و کاربەڕێکاریانە و ئیمان و متمانە هەر بۆ خوایە و لەسەر ئەوە.

٦. ئەم دەقانە هیچی باس لەوە ناکات کە بەزۆر و بێ هیچ دەسەڵاتێك کار بە بەندەکانی دەکات، یاخود هیچ بژاردە و ئیرادە و ویست و توانایەك بوونی نییە لە بەندەکانیدا، بەڵکوو بەڵگەی بەهێزە بۆ باوەڕبوون بە خوا جَلَّ وَعَلَا و چوونە ژێر باری بەندایەتی و جێبەجێکاری فەرمانەکانی، هەر ئەو شایستەی خوایەتی بێ هاوبەشە و تاك و تەنیاییە.

تێبینی: هەموو ئەم جۆرە دەقانە فیرەقی (الجبرية) دەیکەنە بەڵگە بۆ بەرنامەی خۆیان، کە هەموو کردارەکان کاری خوایە و بەندەکان هیچیان بەدەست نییە و هیچ توانا و کردارێك لای بەندەکان بوونی نییە، وە بەمەش دەیانەوێت خوا بێگەرد بکەن بەوەی کە دەڵێن: گەر وا نەبێت دەسەڵاتی خوا بوونی نابێت.

## دووەم: ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە باس لە بژاردە و خاوەن ویست (الإختيار)ی ئادەمیزاد دەکات.

ئەو دەقانەی کە ویست و ئیرادە و بژاردەیی ئادەمیزادی تیادا دەردەکەوێت، لەم باسانەدا خۆی دەبینێتەوە بەشێوەیەکی گشتی:

١. خاوەن ئیرادەی ئازاد لە ئادەمیزاددا بۆ کارەکانی (الإرادة الإنسانية الحرة).

٢. بوونی دژایەتی دەروونی لە نێوان خێر و شەڕدا (التقوی والهوی).

٣. باس لە توانای ئادەمیزاد دەکات لەسەر کار و کردەوەکانی (إثبات الكسب للإنسان).

٤. باس لە پاداشتی کردەوەکان دەکات (الجزاء على الأعمال).

٥. هەوڵدان بۆ بژاردەکردن و سەرخستنی گومڕایی بەسەر هیدایەتی خواییدا و دونیا بەسەر دوارۆژدا (إيثار الضلال على الهدى والإيمان على الكفر والدنيا على الآخرة).

٦. سەلماندنی بوونی پێخۆشبوون و ڕازیبوون لە ئادەمیزاددا و کارکردن لەسەری (الرضا والحب).

لەم دەقانە و هاوشێوەکانیدا ئەوە بەدیدەکرێت کە ئادەمیزاد خاوەن ئیرادە و ویست و بژاردەی ڕاستەقینەی خۆیەتی و هیچ زۆرلێکردنێك و بەزۆرەملێکردنێك لەپشتیەوە نییە، بەڵکوو بە حەز و ئاوات و هێنانەدی خۆی پێویستییەکانی دەجووڵێتەوە، هەموو کردارەکان دروستکراوی دەستی خۆیەتی.

تێبینی: ئەم جۆرە دەقانە فیرەقی (القدرية)کان دەیکەنە بەڵگە بۆ تێڕوانین و بەرنامەی خۆیان، دەڵێن کردارەکان لە دروستکردن و کردار (الخلق والفعل) لەلایەن ئادەمیزادەوەیە و پەیوەندی بە خواوە جَلَّوَعَلَا نییە، گەر وانەبێت؛ دەبێت پاداشت و سزا بوونی نەبێت.

## خاڵەکانی داڕشتنی دەقەکانی

## خاوەن ئیرادە و بژاردە و ویست ( مخير )ی ئادەمیزاد

### ١. ئەو دەقانەن کە باس لە خاوەنی ئیرادەی ئازاد دەکەن لە ئادەمیزاددا ( الإرادة الحرة ):

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْـَٔاخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ۚ وَسَنَجْزِى ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾﴾ [آل عمران: ١٤٥].

هەرکەسێك کاری بۆ دونیا بێت و مەبەستی ڕۆژی دوایی نەبێت؛ ئەوەندەی کە بۆی دانراوە پێی دەبەخشرێت و بەشی لە ڕۆژی دواییدا نییە، ئەوەیشی مەبەستی پاداشتی ڕۆژی دوایی بێت؛ پێی دەبەخشرێت و لە دونیاشدا بەشی دەدرێت[1].

---

(١) "تفسير الطبري" (٧/ ٢٦٠).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَا﴾ [القصص: ٧٧].

ئەوەی کە خوا پێی بەخشیویت بەکاری بێنە لە سوودمەندییەکانی ڕۆژی دواییتدا بە ڕێگەی هەموو جۆرەکانی عیبادەت، وە بەشی دونیاشت لەبیر مەکە لەوەی کە خوا بۆی حەلاڵ کردووی لە شتەکانی دونیادا، لەبەرئەوەی خوا مافی هەیە بەسەرتەوە، وە هەروەها خۆت و خێزانیشت..[1].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلۡأٓخِرَةِ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴿٢٠﴾﴾ [الشورى: ٢٠].

ئەوەی مەبەستی ڕۆژی دوایی بێت یارمەتی دەدەین و زۆرتریشی پێدەبەخشین، وە ئەوەیشی کە مەبەستی دونیایە؛ لە دونیادا پێی دەبەخشین، بەڵام دواڕۆژی لێ حەرامە[2].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَيۡءٖ سَبَبٗا ﴿٨٤﴾ فَأَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾﴾ [الكهف: ٨٤، ٨٥].

خوای گەورە هەموو هۆکارەکانی دەسەڵاتی بەخشی بە (ذي القرنين)، تا بەکاری بێنێت لە شوێنی خۆیدا[3].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يَوۡمَ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾﴾ [النازعات: ٣٥].

لە ڕۆژی دواییدا هەموو کۆششەکانی ئادەمیزاد کە لە دونیادا کردوویەتی ئامادە دەبێت بۆی[4].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿مَنۡ عَمِلَ سَيِّئَةٗ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَاۖ وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ﴾ [غافر: ٤٠].

هەرکەسێك تاوانێك بکات، بە هاوشێوەی خۆی سزا دەدرێت، وە ئەوەی کاری چاکە بکات لە پیاو و ئافرەت؛ ئەوە ئیماندارە و بە بەهەشت شاد دەبێت[5].

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٦/ ٢٥٣).

(٢) "تفسير ابن كثير" (٧/ ١٩٨).

(٣) "تفسير السعدي" ص٤٨٥.

(٤) "تفسير السعدي" ص٩١٠.

(٥) "تفسير الطبري" (٢١/ ٣٩٠).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾ [النجم: ٣٩].

هەموو كەسێك كاری خۆی هەیە لە چاكە و لە خراپە، كاری كەسێكی تری بۆ نییە، وە تاوانی هیچ كەسێك كەسێكی تر هەڵی ناگرێت[(١)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ [الكهف: ٢٩].

ئیمان و گرتنەبەری ڕێگاكەی و سیفەتەكانی چاكە و خراپە لە یەكتر جیاكراوەتەوە، هیچ نەماوەتەوە بێجگە لە گرتنەبەری دوو ڕێگا نەبێت، ئەوەی ویستی لەسەرە با ئیمان بێنێت و ئەوەشی ویستی لەسەرە با بێبڕوا بێت، بەڵام ئەوەی كە هیدایەتی وەرگرت ئەوە یارمەتیدراوە بۆ ڕاستی، وە گەر بێبڕوا بوو؛ ئەوا بەڵگەكاری لەسەر كراوە و هیچ پاساوێكی بۆ نەماوە[(٢)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾﴾ [المدثر: ٣٧].

پێغەمبەر ﷺ ئاگاداركەرەوەی ئادەمیزادە بۆ كەسێك بیەوێت كار بە ڕەزامەندی و نزیكبوونەوەی خوا بكات، وە بۆ كەسێك كە بیەوێت كار بە تاوان و نزیكبوونەوە لە دۆزەخ بكات[(٣)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾﴾ [التكوير: ٢٨].

پاش ڕوونكردنەوەی ڕێگەی هیدایەت و گومڕایی، هەریەك لە ئێوە خاوەن ویستە لە هەڵبژاردندا[(٤)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿١٩﴾﴾ [المزمل: ١٩].

ئەمە ڕێگەی ڕاستە بۆ كەسێك كە بیگرێتە بەر بۆ لای خوای خۆی[(٥)].

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «... احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ بِاللهِ وَلَا تَعْجَزْ، ...»**[(٦)].

---

(١) "تفسير السعدي" ص٨٢١.
(٢) "تفسير السعدي" ص٤٧٥.
(٣) "تفسير السعدي" ص٨٩٧.
(٤) "تفسير السعدي" ص٩١٢.
(٥) "تفسير ابن كثير" (٨/ ٢٥٧).
(٦) رواه مسلم (٢٦٦٤)، والنسائي في "الكبرى" (١٠٣٨٢)، وابن ماجه (٧٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٥٧٢١)، وأحمد في "المسند" (٨٧٩١)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٢٥١)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٥٩)، والبيهقي في "الشعب" (١٩١)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٣٥٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٠٢٨).

واتە: هەوڵ و کۆششی خۆت بدە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە تیایدا سوودمەندیت، وەکوو گرتنەبەری هۆکارەکان، بەڵام پشتیوانت با خوا بێت لەناو دڵتا و خۆپارێز بە لە تەمەڵی لاشە و ڕووخاندنی دەروونی.

**٢. ئەو دەقانەن باس لە دژایەتی دەروونی دەکەن لەنێوان خێر و شەڕدا (التقوى والهوى):**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۞ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ۞ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۞ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۞﴾ [الشمس: ٧ - ١٠].

خوای گەورە جَلَّ وَعَلَا سوێند دەخوات بە نەفسی ئادەمیزاد چەندە بە پاکی و ڕێك و تەواو دروستی کردووە، وە توانا و ڕوونکردنەوەی ڕێگەی چاکە و خراپەی پێبەخشیوە، ئەوەی نەفسی پاك دەکاتەوە بە عیبادەتی خوا ئەوە ڕزگاربووە، وە ئەو کەسەشی کە پیسی کردووە بە تاوان ئەوە زەرەرۆمەندە[(١)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ۞﴾ [البلد: ١٠].

بۆ ئادەمیزادمان والآ کردووە ڕێگەی خێر و شەڕ و هیدایەت و گومڕایی[(٢)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ﴾ [القصص: ٥٠].

کەسێك لەوە گومڕاتر نییە کە شوێنکەوتەی ئارەزووەکانی و شەیتانە بەبێ هیدایەتی خوایی[(٣)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ۞﴾ [الإنسان: ٣].

ئێمە ئادەمیزادمان چاوڕۆشن کردووە بۆ ڕێگەی حەق و بەتاڵ و خێر و شەڕ ... ئەوکات یا ئیماندار دەبێت یا بێبڕوا[(٤)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ [ص: ٢٦].

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٨/ ٤١١)، و "تفسير السعدي" ص٩٢٦.

(٢) "تفسير السعدي" ص٩٢٤.

(٣) "تفسير الوسيط" للطنطاوي (١٠/ ٤١٨).

(٤) "تفسير البغوي" (٥/ ١٨٩).

ئەی (داود) ﷺ ئێمە تۆمان کردە کاربەڕێوەبەر، لەبەرئەوە بە حەق کار بکە لە نێوان بەندەکانی خوادا و شوێنکەوتەی حەزەکانت نەبێت بەسەر حەقدا لە نێوان خەڵکدا[١].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَا﴾ [الروم: ٣٠].

بە ڕاهاتن لەسەر پاکی و کارکردن بە حەق، خوا جَلَّ وَعَلَا ئادەمیزادی دروستکردووە[٢].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَأَمَّا مَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ ۝٤٠ فَإِنَّ ٱلۡجَنَّةَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ۝٤١﴾ [النازعات: ٤٠، ٤١].

ئەوەی لە شوێنی خۆی بترسێت لای خوا (واتە لێپرسینەوە و لێپێچینەوەی خوا) و دژایەتی ناخی بکات؛ ئەوە بەهەشت جێگەیەتی[٣].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِ كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٖ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ [آل عمران: ١٦٢].

وەکوو یەك نییە کەسێك مەبەستی ڕازیبوونی خوا بێت و کەسێك هەڵگری ڕێی تاوان بێت، ئەم دووانە لە حوکمی خوادا وەکوو یەك نین[٤].

**٣. ئەو دەقانەن کە باس لە توانای ئادەمیزاد دەکەن لەسەر کار و کردەوەکانی (إثبات الكسب للإنسان):**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡ﴾ [البقرة: ٢٨٦].

خوا داوا لە هیچ کەسێك ناکات لە سەروو تواناکانیەوە، ئەوەی خێر و چاکەی کردووە هەر بۆ خۆیەتی، وە ئەوەی شەڕی ئەنجام داوە لەسەری نووسراوە[٥].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَتَقَدَّمَ أَوۡ يَتَأَخَّرَ ۝٣٧ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ رَهِينَةٌ ۝٣٨ إِلَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡيَمِينِ ۝٣٩﴾ [المدثر: ٣٧ - ٣٩].

هەرکەسێك لە ئێوە دەتوانێت کار بکات بەوەی کە لە خوا نزیکی دەکاتەوە و ڕازی دەبێت

---

(١) "تفسير الطبري" (٢١/ ١٨٩).
(٢) "تفسير السعدي" ص٦٤٠.
(٣) "تفسير البغوي" (٥/ ٢٠٨).
(٤) "تفسير السعدي" ص١٥٥.
(٥) "تفسير ابن كثير" (١/ ٧٣٧).

لێی، یاخود لە خوا دووردەکەوێتەوە بە هۆکاری تاوانەکانی، هەموو نەفسێك کۆت و زنجیرە بە کردەوەکانیەوە(١).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ۝٨١﴾ [البَقَرَة : ٨١].

ئەوەی تاوانی کردبێت و خراپەکانی دەوری دابێت؛ ئەوە کەسانی دۆزەخین و بەردەوام دەمێننەوە تیایدا(٢).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ﴾ [النِّسَاءِ : ١١١].

هەرکەسێك تاوانێك ئەنجام بدات هەر خۆی پێ تاوانبار دەبێت(٣).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لِيَجْزِىَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ﴾ [إبْرَاهِيم : ٥١].

خوای گەورە پاداشت و سزا بە دادپەروەری خۆی دەگێڕێتەوە بۆ هەموو نەفسێك لەسەر کردەوەکانی(٤).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَـٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ﴾ [الأحزَاب : ٥].

هەر هەڵەیەکتان کردبێت بە تاوان لەسەرتان نانووسرێت، بێجگە لەوەی کە بە ئەنقەست و بە دڵ کردبێتتان(٥).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿مَّنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّـٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ۝٤٦﴾ [فُصِّلَت : ٤٦].

هەرکەسێك کاری چاك بکات سوودەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نەفسی خۆی، وە ئەوەی تاوانی کردبێت خۆی باجی دەدات و خوا ستەم لە بەندەکانی ناکات(٦).

---

(١) "تفسير السعدي" ص٨٩٧.

(٢) "تفسير السعدي" ص٥٧.

(٣) "تفسير القرطبي" (٥/ ٣٨٠).

(٤) "تفسير السعدي" ص٤٢٨.

(٥) "تفسير السعدي" ص٦٥٨.

(٦) "تفسير ابن كثير" (٧/ ١٨٥).

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ اللهَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ، وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ»[١].

خوای گەورە لەسەر موسوڵمانان هەڵە و لەبیرچوون و بەزۆرپێکردن بە تاوان نانووسێت.

**٤. ئەو دەقانەن باس لە پاداشتی کردەوەکانی ئادەمیزاد دەکەن (الجزاء على الأعمال):**

قال تعالى: ﴿أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ خَالِدِينَ فِيهَا جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾﴾ [الأحقاف: ١٤].

ئەوانەی دەڵێن باوەڕمان بە خوا هەیە و لەسەری بەردەوامن؛ دانیشتووی بەردەوامی بەهەشتن لە پاداشتی کردەوەکانیاندا[٢].

قال تعالى: ﴿وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾﴾ [التوبة: ٩٥].

لە سزای ئەو کارانەی دووڕووەکان کردوویانە؛ شوێنیان دۆزەخە بەهۆی تاوان و هەڵەکانیانەوە[٣].

قال تعالى: ﴿ذَٰلِكَ جَزَاءُ أَعْدَاءِ اللَّهِ النَّارُ ۖ لَهُمْ فِيهَا دَارُ الْخُلْدِ ۖ جَزَاءً بِمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٢٨﴾﴾ [فصلت: ٢٨].

سزای دوژمنانی خوا لەسەر دژایەتیکردن و بێباوەڕی بە ئایەتەکانی؛ دۆزەخی نەبڕاوە و بەردەوامە[٤].

قال تعالى: ﴿هَلْ جَزَاءُ الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ ﴿٦٠﴾﴾ [الرحمن: ٦٠].

ئایا پاداشتی ئەوەی کە بە چاکی لە عیبادەتی خوادا بووە و سوودمەندی بەندەکانی خوای ویستووە؛ سەرکەوتن و مانەوەی ژیانی خۆش و بەردەوام شایستەی نییە؟[٥].

---

(١) رواه ابن ماجه (٢٠٤٥)، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، وابن حبان في "صحيحه" (٧٢١٩)، والدارقطني في "السنن" (٤٣٥١)، والحاكم في "المستدرك" (٢٨٠١)، وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، ووافقه الذهبي، والطبراني في "الكبير" (١١٢٧٤)، و "الأوسط" (٨٢٧٣)، و "الصغير" (٧٦٥)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٤٦٤٩)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٥٠٩٤)، و "الصغير" (٢٦٨٩)، وأبو نعيم في "الحلية" (٦/ ٣٥٢)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٦٢٩٣)، و "صحيح الجامع الصغير" (١٧٣١).

(٢) "تفسير الطبري" (٢٢/ ١١١).

(٣) "تفسير ابن كثير" (٤/ ٢٠١).

(٤) "تفسير السعدي" ص٧٤٨.

(٥) "تفسير السعدي" ص٨٣١.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِمَا كَفَرُواْۖ وَهَلۡ نُجَٰزِيٓ إِلَّا ٱلۡكَفُورَ ١٧﴾ [سَبَإ: ١٧].
نیعمەتەکانی (سبأ)مان گۆڕی بە خراپ، بە هۆکاری بێبڕوایی و تاوانیانەوە، ئایا سزامان بەس بۆ ئەو جۆرانە نییە؟[١].

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ بِٱلۡحُسۡنَى ٣١﴾ [النَّجۡم: ٣١].
خوا جَلَّوَعَلَا خاوەن ئاسمان و زەوییە، دادپەروەرە لەگەڵ بەندەکانی، هەریەکە بە کرداری خۆی پاداشتیان دەداتەوە، ئەگەر خێر بێت یا شەڕ[٢].

**٥. ئەو دەقانەن کە باس لە بژاردەی گومڕایی بەسەر هیدایەت و دونیا بەسەر دواڕۆژدا دەکەن (إيثار الضلال على الهدى والإيمان على الكفر والدنيا على الآخرة):**

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ١٠٨﴾ [البَقَرَة: ١٠٨].
ئەوەی بێبڕوایی بگۆڕێتەوە و هەڵیبژێرێت بەسەر ئیماندا؛ ئەوە لەسەر ڕێگای ڕاست لایداوە بۆ نەزانین و گومڕایی[٣].

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ٣٧ وَءَاثَرَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ٣٨ فَإِنَّ ٱلۡجَحِيمَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ٣٩ وَأَمَّا مَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ ٤٠ فَإِنَّ ٱلۡجَنَّةَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ٤١﴾ [النَّازِعَات: ٣٧ - ٤١].
ئەوەی زیادەڕەوی بکات بە تاوانە گەورەکان و ڕێزی دونیا بدات بەسەر ڕۆژی دواییدا؛ ئەوە شوێنی مانەوەی دۆزەخە، وە گەر کەسێك ترسی خوای لە دڵیدا زاڵکرد بەسەر هەوا و ئارەزووەکانیدا و شوێنکەوتەی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بوو؛ ئەوا لانە و شوێنی بەهەشتە[٤].

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ١٦ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ١٧﴾ [الأَعۡلَىٰ: ١٦، ١٧].
بەڵکوو ئێوە ئەی خەڵکان پلەوپایەی دونیا دەدەن بەسەر ڕۆژی کۆتاییدا، وە لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژی دوایی پڕ خێر و مانەوەی هەتا هەتاییە بۆتان[٥].

---

(١) "تفسير السعدي" ص٦٧٧.
(٢) "تفسير ابن كثير" (٧/ ٤٦٠).
(٣) "تفسير ابن كثير" (١/ ٣٨٢).
(٤) "تفسير السعدي" ص٩١٠.
(٥) "تفسير الطبري" (٢٤/ ٣٧٣).

❁ قال تعالى: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴿١٦﴾ ﴾ [البقرة: ١٦].

ئەو دوورڕووانەی کە هەستاون بە کڕینی گومڕایی و گۆڕینەوەیان بەسەر ئیمان و هیدایەتدا؛ ئەوا سوودمەند و هیدایەتدراو نەبوون لەم بازرگانیەدا[١].

❁ قال تعالى: ﴿ ٱلَّذِينَ يَسۡتَحِبُّونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلِۢ بَعِيدٖ ﴿٣﴾ ﴾ [إبراهيم: ٣].

ئەوانەی کە ژیانی دونیا بژاردە دەکەن بەسەر ڕۆژی کۆتاییدا، وە ڕێگرن لە وەرگرتنی دینی خوا، وە ڕێگەی خوا بە مەبەستی خۆیدا نابەن؛ ئەوانە لە گومڕاییەکی دووردان[٢].

❁ قال تعالى: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٧٧﴾ ﴾ [آل عمران: ١٧٧].

ئەوانەی بێبڕوایی بژاردە دەکەن بەسەر ئیمانداریدا، ئەوا خوا و پێغەمبەرەکەی و موسوڵمانان زیان ناکەن، بەڵکوو خۆیان زەرەرۆمەندن، لە کۆتاییشدا سزای سەختیان هەیە[٣].

❁ قال تعالى: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ ﴾ [فصلت: ١٧].

گەلی (ثمود) ڕێگەی هیدایەتمان بۆ ڕوونکردنەوە، بەڵام بێبڕواییان هەڵبژارد بەسەر ئیماندا[٤].

**٦. ئەو دەقانەن کە باس لە پێخۆشبوون و ڕازیبوون لە ئادەمیزاد و کارکردن دەکەن لەسەری (الرضا والحب):**

❁ قال تعالى: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨﴾ ﴾ [التكوير: ٧، ٨].

ئەوانەی بڕوایان بە گەڕانەوە نییە بۆ لای ئێمە و لە تۆڵەی ئێمە ناترسن و چاوەڕێی پاداشتیش

(١) "تفسير البغوي" (١/ ٩٠).
(٢) "تفسير البغوي" (٣/ ٣٠).
(٣) "تفسير الوسيط" للطنطاوي (٢/ ٣٤٨).
(٤) "تفسير البغوي" (٤/ ١٢٩).

نین و دونیایان هەڵبژاردووە و دڵیان پەیوەستکردووە پێوەی؛ ئەوانە لانە و سزایان دۆزەخە[(١)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمۡ يَوۡمٗا ثَقِيلٗا ٢٧ ﴾ [الإنسان: ٢٧].

ئەی (محمد) ﷺ ئەوانەی باوەڕ بە تۆ ناهێنن لەپاش ڕوونبوونەوەی بەڵگەکان؛ دونیایان بەسەر ڕۆژی دواییدا بژاردە کردووە و ئەو ڕۆژە قورس و سەختەیان پشتگوێ خستووە ...[(٢)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡ ﴾ [الحديد: ٢٣].

تاوەکوو ئێوە خەمبار نەبن لەسەر ئەوەی کە لە دونیا لەدەستتان چووە، وە خۆشحاڵ نەبن بەوەی کە دەستتان کەوتووە[(٣)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ لَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡرَحُونَ بِمَآ أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحۡمَدُواْ بِمَا لَمۡ يَفۡعَلُواْ فَلَا تَحۡسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٖ مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ﴾ [آل عمران: ١٨٨].

ئەوانەی کە خۆشحاڵن بەوەی کە لە دونیا پێیان دراوە و لەگەڵ ئەوەشدا پێیان خۆشە ناوببرێن بە چاکە خواز و کردەوە چاك لەکاتێکدا کە نەیانکردبێت؛ وا گومان مەبە کە ڕزگاربوو بن لە سزای خوا[(٤)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا ٢٠﴾ [الفجر: ٢٠]، ﴿وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلۡخَيۡرِ لَشَدِيدٌ ٨﴾ [العاديات: ٨].

ئێوەی ئادەمیزاد خۆشەویستییەکی زۆرتان هەیە بۆ پارە و ماڵ، بە حەرام و حەڵاڵ[(٥)]، وە ئادەمیزاد ماڵ و سەروەتی زۆر لا خۆشەویستە و پێشخەرە بەسەر مافەکانی خوا و خەڵکیدا[(٦)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَسۡتَحِبُّونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾ [إبراهيم: ٣].

ئەوانەی کە خۆشەویستی دونیا پێشدەخەن و بژاردەیانە بەسەر ڕۆژی دواییدا ...[(٧)].

(١) "تفسير البغوي" (٢/ ٤١٢).
(٢) "تفسير السعدي" ص٩٠٣.
(٣) "تفسير البغوي" (٥/ ٣٢).
(٤) "تفسير السعدي" ص١٦٠.
(٥) "تفسير السعدي" ص٩٢٣.
(٦) "تفسير السعدي" ص٩٣٢.
(٧) "تفسير ابن كثير" (٤/ ٤٧٧).

بەگوێرەی ئەم دوو جۆرە دەقانە ڕوون بووەوە کە دوو جۆر خوێندنەوە هەیە بۆ هەموو بوونەوەرەکان، بەتایبەت ئادەمیزاد، دەقەکانی یەکەم هەمووی پەیوەندی بە پەروەردگاری حەقەوە (الربوبية)ەوە هەیە کە خاوەنی هەموو سیفاتە بالاّ و کاملّەکانە، لە دروستکردن و هێنانەدی بوونەوەرەکان و بەڕێوەبردنیان، کە بەشێوەیەکی ڕەها (مطلق) خاوەنیەتی و ئیرادە و هەڵسووڕان هەر بۆ ئەوە و هیچ بوونەوەرێك خاوەن سەربەخۆیی ڕەها نییە، گەر نا دەبێتە (خالق)، وە ئاشکراشە کە دوو دابەشکردنی سەرەکیمان هەیە: (الخالق والمخلوق)، (مخلوق) نابێتە (خالق)، وە دروستکار و هێنەرەدی هەموو بوون دەبێت بە شێوەیەکی (واجب) خاوەنی هەموو تەواوییەك بێت و سیفاتە ڕەهاکان مولّکی ئەو بێت، وە دروستکراوەکان (مخلوق) دەبێت خاوەن سیفاتی ناتەواو بن و بەردەوام پێویستدار بن و نەگەنە سیفاتە کاملّەکان، ئەمە بۆ خۆی سیفەتی براوەی خۆیانە.

هەموو ئەو دەقانەی یەکەم باس لە بەڕێوەبردنی خوایی دەکات بۆ دروستکراوەکانی، کە هەر ئەو خاوەنیانە و کار و کردەوەیان بەدەست ئەوە و لە فەرمانی ئەو دەرناچێت، لەبەرئەوەی خاوەنی هەموو سیفاتێکی تەواو و بێ کەم و کورتییە، ئەمە لێرەدا سەلمێنەری (توحيد الربوبية والأسماء والصفات)ە.

وە ئەم بوارەش هیچ داواکارییەك (التكليف)ی لەسەر دانەنراوە، وە هیچ لێپرسینەوە و پاداشت و سزایەکی دوارۆژی لەسەر نییە، تاوەکوو بکرێتە شوێنی باس و ڕەخنە و پاساو هێنانەوە و هۆکاری دەربازبوون و مافدان بە خۆی بۆ نەچوونە ژێر جێبەجێکاری فەرمانەکانی دین و پەیوەستبوون پێوەی، کە دڵنیاین چینی بێبڕوا و تاوانبار و ئیمان لاواز لەم بازنەیەدا دەخولێنەوە، گەر نا بۆ چینی ئیماندار و پەیوەست بوو بە دین ئەم جۆرە باسەیان نییە.

وە جۆری دووەمی دەقەکان هەمووی باس لە ئازادی و بژاردە و حەز و ویستەکانی ئادەمیزاد دەکات، لەگەڵ ئەو پلەوپایە ئیمانی و دینییەی کە بە هەوڵدان و کەسب و دژایەتی شەو و ڕۆژی نەفسی و شەیتان و چواردەوری؛ کەسی خواناس بەدەستی هێناوە و پێی گەیشتووە.

ئەمانە هەمووی ئەوانەیە کە خوا دەیەوێت لێمان، نەك دەیەوێت پێمان؛ ئەوەی کە دەیەوێت پێمان قەدەری کەونییە، وە بە هۆکاری قەدەری کەونی قەدەری شەرعی دێتە دی، بۆیە قەدەر بە قەدەر چارەسەر دەکرێت، دەبێت باوەڕمان بە هەواڵەکانی قەدەر بێت و جێبەجێکاری فەرمانەکانی شەرعیش بین (نؤمن بالقدر والشرع، ونصدق الخبر وطاعة الأمر).

کەواتە پێویستە لەم بوارەدا هەموو هۆکارەکان بگرینە بەر و کاری لەسەر بکەین بەبێ ئاوڕدانەوەی دڵی و پشتبەستن لەسەر هۆکارەکان، وەکوو ساڵحان دەڵێن: اضْطِرَابٌ بِلَا سُكُونٍ، وَسُكُونٌ بِلَا اضْطِرَابٍ[١].

واتە: هەوڵدان و خستنەکاری ئەندامەکانی لاشە بەبێ (توکل) و پشتبەستنی دڵی پێی، وە پشتبەستن و (توکل)ی دڵی بە خوا بەبێ ئاوڕدانەوە بۆ هۆکارەکان.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ بِاللهِ وَلَا تَعْجَزْ، ..»[٢].

واتە: کۆششکار بە لەسەر سوودمەندییەکانت و پشتبەستوو بە بە خوا و تەمەڵ و دەروون ڕووخاو مەبە.

(ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: الِالْتِفَاتُ إِلَى الْأَسْبَابِ شِرْكٌ فِي التَّوْحِيدِ، وَمَحْوُ الْأَسْبَابِ أَنْ تَكُونَ أَسْبَابًا نَقْصٌ فِي الْعَقْلِ، وَالْإِعْرَاضُ عَنْ الْأَسْبَابِ بِالْكُلِّيَّةِ قَدْحٌ فِي الشَّرْعِ[٣].

واتە: ئاوڕدانەوەی دڵی بۆ هۆکارەکان هاوبەش بڕیاردانە لە عەقیدەدا، وە نەگرتنەبەری هۆکارەکان ناتەواوییە لە عەقڵدا، وە پشتکردنە هۆکارەکان بە تەواوی ڕەخنەکارییە لە شەرع، نیوەی دین پشتبەستنە بە خوا (التوکل)، وە نیوەکەی تریشی داواکردنی یارمەتییە (الاستعانة)، نەگرتنەبەری هۆکارەکانیش لەگەڵ توانای تەواو بەسەریاندا تاقیکردنەوەی خواییە، بۆئەوەی بزانرێت تا چ ڕادەیەك هۆکارەکان دەگرێتە بەر بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوا.

ئیماندار لەم بوارەدا ئارامگرە لەسەر بەڵاکان و بەردەوام داواکاری لێخۆشبوونە لەسەر تاوانەکان، وە ئیماندار ڕازی بووە بە هەموو قەدەرەکان، لەبەرئەوەی: ما منعك إلا ليعطيك ولا ابتلاك إلا ليعافيك ولا أمرضك إلا ليشفيك ولا أصابك إلا ليحييك[٤]. بۆیە پێی نەداویت تاوەکوو پێت ببەخشێ، وە بۆیە بەڵاداری کردوویت تاوەکوو ڕزگارت بکات، وە بۆیە نەخۆشی خستوویت تاوەکوو شیفات بدات، وە بۆیە تووشی کردوویت تاوەکوو بتژیێنێتەوە.

(ابن القیم) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: الْعَبْدُ يَسِيرُ بَيْنَ مُشَاهَدَةِ الْمِنَّةِ، وَمُطَالَعَةُ عَيْبِ النَّفْسِ[٥].

---

(١) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١١٦).
(٢) رواه مسلم (٢٦٦٤)، والنسائي في "الكبرى" (١٠٣٨٢)، وسبق تخريجه ص٢٦.
(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٦٩).
(٤) "شفاء الضرر بفهم التوكل والقضاء والقدر" لأبو فيصل البدراني ص٣٥.
(٥) "مدارج السالكين" (١/ ٢٣٦).

واتە: ژیانی خواناسان لە نێوان بینین و بیرخستنەوەی نیعمەتەکانی خوادایە بە بەردەوامی، لەگەڵ پیاچوونەوەی ناتەواوی و کەمتەرخەمی عەبدایەتییان بۆ خوا.

بزانە کە هەموو کارەکانی پەروەردگار پڕ لە حیکمەت و دانایی و دادپەروەرییە و لە شوێنی خۆیدایە، بە هیچ شێوەیەك ستەم و ناشایستەیی تێدا نییە بەرامبەر بەندەکانی.

وە هەروەها هەموو یاسا و شەرعەکەشی پڕ لە دادوەری و پلەوپایەیە بەبێ زیادەڕەوی و کەمڕەوی، بەرییە لە درۆ و ستەم، بەڵکوو ڕاست و دادپەروەرە، وەکوو خۆی دەفەرموێت: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾ [الأنعام: ١١٥]، وە هەمووشی لە بەرژەوەندی بەندەکانیایەتی، دەستێکی دادپەروەرییە (العدل)، وە دەستێکیشی بەخشندەییە (الفضل)(١).

ئەم جۆرە دەقانەی دووەم باس لە قەدەری شەرعین و مەبەست لە یاسا و حوکمی داواکاری ئەم قەدەرەیە لە بەندەکانی، وە داواکاری جێبەجێکردن (التكليف)ی لەسەر بنیاد نراوە و لێپرسینەوە و پاداشت و سزا لەسەر ئەم قەدەرە دانراوە، وە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران عليهم السلام و پەیامەکانی هەر بۆ ئەمە بووە.

بەندەکان چۆن لە قەدەری کەونیدا هیچ جۆرە دەسەڵاتێکیان نییە؛ بەو شێوەیەش لەم قەدەرەدا هیچ جۆرە دەرچوونێکیان نییە، لە (توحيد الربوبية والألوهية)دا هاوبەش بۆ خودا بڕیار نادرێت و نابێت، بۆیە بەرنامەی ئەهلی سوننەت ئیمانهێنانە بە (القدر) و کارکردنە بە (الشرع) و دەرنەچوونە لە هیچیان، هەروەکوو چۆن لە نێوان (الخوف والرجاء)دایە، بەو شێوەیەش لە نێوان (الإخلاص والمتابعة)دایە، وە بەهەمان شێوەش کارەکانی لە نێوان دونیا و ئاخیرەتدایە، سروشتی هەموو شتەکانیش بەم شێوەیەیە.

لەم بابەتەدا بۆمان ڕوونبووەوە کە ئادەمیزاد خاوەنی ناخی پاك (الفطرة) و عەقڵ و ئیرادە و بژاردەی خۆیەتی، بۆیە بڕیاردان بەوەی کە بەزۆرپێکردن و نەبوونی بژاردە و ئیرادەی سەربەخۆ بۆ ئادەمیزاد هەڵەیە و پاساو دروستکردنە.

  

(١) "صحيح البخاري" الحديث رقم (٧٤١١) كِتَابُ التَّوْحِيدِ، بَابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾.

# بــابەتــی دووەم

## بـێگـەردی پەروەردگــار لە ســتەم

## (تنزيه الله تعالى عن الظُلم)

گومان لەوەدا نییە کە خوای پەروەردگار ستەم ناکات و حەرامی کردووە لەسەر خۆی و سزا و لێپێچینەوەی توندیشی داناوە بۆ بەندەکانی لەسەر ئەنجامدانی، بۆیە گەر لەسەر بەندەکانی حەرامی کردبێت ئەوا بۆ خۆی بە هەندەی گەردیلەیەك بوونی نییە، بۆیە ئادەمیزاد لەمەدا دڵنیایە و زۆر متمانەی هەیە و تەنانەت پێراکێشانی لەم بوارەدا هەیە تا دەگاتە ئاستی پاڵدانەوە لەسەر سەرپێچییەکانی، ئەمەش لە بواری عەقیدەدا پێی دەوترێت (الرجاء)، کە ئەمەش دەبێت لە ئاستی ترسدا (الخوف) هاوسەنگ بێت.

**ئەو دەقانەی کە باس لە نەبوونی ستەم دەکەن بۆ خوا وەك:**

١. قَالَ تَعَالَى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾ [النساء: ٤٠].

٢. قَالَ تَعَالَى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ ٱلنَّاسَ شَيْـًٔا﴾ [يونس: ٤٤].

٣. قَالَ تَعَالَى: ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧١﴾﴾ [الإسراء: ٧١].

٤. قَالَ تَعَالَى: ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾﴾ [النساء: ١٢٤].

٥. قَالَ تَعَالَى: ﴿لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا﴾ [الزمر: ٥٣].

٦. قَالَ تَعَالَى: ﴿وَإِنِّى لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ [طه: ٨٢].

**پێناسەی ستەم (الظلم) لای ئەهلی سوننەت:** أَنَّ الظُّلْمَ وَضْعُ الشَّيْء فِي غَيْرِ مَوْضِعِهِ، وَالْعَدْلُ وَضْعُ كُل شَيْء فِي مَوْضِعِهِ، وَهُوَ سُبْحَانَهُ حَكَمٌ عَدْلٌ يَضَعُ الْأَشْيَاء موَاضعهَا، وَلَا يضع شَيْئا إِلَّا فِي مَوْضِعه الَّذِي يُنَاسِبه وتقتضيه الْحِكْمَة وَالْعدْل وَلَا يفرق بَين متماثلين[1].

**واتە:** ستەم دانانی کارێکە کە لە شوێنی خۆیدا نەبێت، هەروەك چۆن دادپەروەری دانانی

(١) "جامع الرسائل" لابن تيمية (١/ ١٢٣).

کارێکە لە شوێنی خۆیدا، پەروەردگار یاسادانەرێکی دادپەروەرە، بە جۆرێك کارەکان لە شوێنی خۆیدا دادەنێت؛ کە مایەی پڕ لە حیکمەت و گونجاوی و دادوەری و دانایی بێت، بۆیە پەروەردگار جیاوازی ناخاتە نێوان دوو هاوشێوەوە، هەروەك چۆن دوو جیاواز لە یەکتر لە ئاست یەکدا کۆناکاتەوە.

تەنانەت دژایەتی ئەوانە دەکات و ڕەخنەیان لێدەگرێت کە بەو شێوەیە بڕیار دەدەن و کار دەکەن، وەك لە چەندەها شوێندا ئاماژەی پێدەکات و دەفەرموێت: ﴿أَفَنَجۡعَلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ كَٱلۡمُجۡرِمِينَ ٣٥﴾ [القلم : ٣٥]، وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُ ١٩ وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ٢٠﴾ [فاطر : ١٩، ٢٠]، وە دەفەرموێت: ﴿أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلۡمُفۡسِدِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلۡمُتَّقِينَ كَٱلۡفُجَّارِ ٢٨﴾ [ص : ٢٨].

واتە: ئایا باوەڕداران و تاوانباران وەکوو یەکن؟ یاخود کەسی نابینا و بینەر؟ یاخود ڕووناکی و تاریکی؟ ئایا وادەزانن ئێمە باوەڕدارانی خاوەن چاکە وەکوو خراپەکاران ڕیزبەند دەکەین؟ یاخود خواناسان و تاوانباران؟ ئەمانە هیچیان لە ئاستی یەکدا نین.

بۆیە بەرنامەکەشی هەموو کردارەکان بە ئاست و پێوانەی خۆی پێوانە دەکات، وەکوو دەفەرموێت: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ﴾ [الحديد : ٢٥]، وە دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَ﴾ [الشورى : ١٧].

واتە: خوای پەروەردگار بەرنامەکانی ناردووەتە خوارەوە بە حەق، وە بە دانانی پێوانەیەکی دادپەروەر لە شێوەیەکی کێشانەی دروستدا، بە پاڵپشتی عەقڵێکی بەهێز بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو کارانەی کە دەیانەوێت بڕیاری لەسەر بدەن.

تەنانەت یاسا و حوکمە شەرعییەکانیش ڕەنگدانەوەی ئەو دادپەروەرییە پڕ لە دانایی و وردەکارییەن بۆ بنەبڕکردنی ستەم و گەڕاندنەوەی مافەکان بەو پێوانە هاوسەنگەی کە مافەکانی خوا و خەڵکی و خودی کەسەکەی تیادا دێتە دی، وەك لەم دەقانەی قورئاندا ئاماژە بە چەند یاسایەك دەکات:

❁ قال تعالى: ﴿وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَا﴾ [الشورى : ٤٠].

سزای خراپە خراپەیە بە هاووێنەی خۆی.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ﴾ [النحل: ١٢٦].

گەر تۆڵەتان کردەوە بە هاوشێوەی خۆی تۆڵە بکەنەوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ﴾ [المائدة: ٤٥].

یاسامان بەسەریاندا دانا کە تۆڵە سەندنەوەکان کەس بە کەس و چاو بە چاو و گوێ بە گوێ و دان بە دان و بژاردنیش لە برینداریدا.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾﴾ [القصص: ٨٤].

پاداشتی چاکە بە باشتر لە خۆیەتی، وە سزای خراپەش تەنها لەسەر ئەو کەسانەیە کە ئەنجامیان داوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾﴾ [النحل: ٩٠]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ﴾ [النساء: ٥٨]، ﴿وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾﴾ [الشعراء: ١٨٢].

خوا فەرمان بە دادوەری و چاکە دەکات و ڕێگری لە خراپە و ستەم دەکات، وە فەرمان دەدات بە گەڕاندنەوەی ئەمانەتەکان بۆ خاوەنەکانیان و دادپەروەری لە حوکمدانی نێوان خەڵکدا بە پێوانەیەکی پڕ لە دادوەری.

هەموو ئەم ئایەتانە ئاماژەیە بۆ دادوەری و کێشانەی کار و حوکمەکان بە هاوسەنگی، بۆ هێنانەدی و دانانی مافەکان لە شوێنی خۆیاندا.

لەبەرئەوەیە کە هەڕەشەی تۆڵەسەندنەوەش لە ستەمکاران دەکات و کۆتاییان بە سزا سەندنەوە لێیان دەهێنێت، وەکوو دەفەرموێت: ﴿إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾﴾ [السجدة: ٢٢]. واتە: ئێمە تۆڵە لە ستەمکاران دەکەینەوە، وە دەفەرموێت: ﴿وَٱلظَّـٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا ﴿٣١﴾﴾

[الإنسان : ٣١]. واتە: سزای پڕ ئازار بۆ ستەمکاران دانراوە، وە دەفەرموێت: ﴿فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُوا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٥﴾﴾ [الأنعام : ٤٥]. واتە: کۆتایی پێهێنان و بنەبڕی گەلانی ستەمکارانی کردووە و ستاییشی خۆشی دەکات لەسەری، وە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّالِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ ﴿٥٢﴾﴾ [غافر : ٥٢]. واتە: ڕۆژێك دەبێت کە هیچ لە پاساوەکانی ستەمکاران سوودی نابێت و نەفرەتلێکراو دەبن و شوێنیان پڕ لە سزا دەبێت.

لە سەروو هەموو ئەمانەوە پەروەردگار خاوەنی هەموو سیفاتە کاملەکان و خاوەن دادپەروەری و بەزەییە بەسەر بەندەکانیەوە، وەکوو (ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللَّهُ دەلێت: فَفِي قَوْلِهِ (سُبْحَانَكَ) تَبْرِئَتُهُ مِنَ الظُّلْمِ وَإِثْبَاتُ الْعَظَمَةِ الْمُوجِبَةِ لَهُ بَرَاءَتَهُ مِنَ الظُّلْمِ، فَإِنَّ الظَّالِمَ إِنَّمَا يَظْلِمُ لِحَاجَتِهِ إِلَى الظُّلْمِ أَوْ لِجَهْلِهِ، وَاللهُ غَنِيٌّ عَنْ كُلِّ شَيْءٍ، عَلِيمٌ بِكُلِّ شَيْءٍ، وَهُوَ غَنِيٌّ بِنَفْسِهِ، وَكُلُّ مَا سِوَاهُ فَقِيرٌ إِلَيْهِ، وَهَذَا كَمَالُ الْعَظَمَةِ[1].

واتە: لە وشەی (سبحانك) کە بە واتای پاك و بێگەردی پەروەردگار دێت؛ بەریکردنیەتی لە ستەم و دانانی هەموو گەورەییەکە بۆی، وە ستەمکردنیش لەبەر پێویستی یاخود نەزانین دەکرێت، بەڵام پەروەردگار پێویستی بە هیچ شتێك نییە و زاناشە بەسەر هەموو شتێکدا و هەموو بوونێك پێویستی بەوە، ئەمە تەواوی باڵادەستییە.

وە دەلێت[2]: وَفِي الصَّحِيحَيْنِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: «يَمِينُ اللهِ مَلْأَى، لَا يَغِيضُهَا نَفَقَةٌ سَحَّاءُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ، أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْفَقَ مُنْذُ خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، فَإِنَّهُ لَمْ يَغِضْ مَا فِي يَمِينِهِ، وَالْقِسْطُ بِيَدِهِ الْأُخْرَى يَقْبِضُ، وَيَبْسُطُ»[3]. فَبَيَّنَ أَنَّهُ سُبْحَانَهُ يُحْسِنُ، وَيَعْدِلُ، وَلَا يَخْرُجُ

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٠/ ٢٥٠).

(٢) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (١/ ١٣٩)، و"مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٨/ ١٤٠).

(٣) رواه البخاري (٧٤١٩)، ومسلم (٩٩٣)، والترمذي (٣٠٤٥)، والنسائي في "الكبرى" (٧٦٨٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٢٥)، وأحمد في "المسند" (٨١٤٠)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٣٤٣)، والطبراني في "الشاميين" (٣٢٨٨)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٧٨٠)، وابن بطة في "الإبانة" (٢٢٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٧٠٠)، والبغوي في "شرح السنة" (١٦٥٦).

فِعْلُهُ عَنِ الْعَدْلِ، وَالْإِحْسَانِ، وَلِهَذَا قِيلَ: كُلُّ نِعْمَةٍ مِنْهُ فَضْلٌ، وَكُلُّ نِقْمَةٍ مِنْهُ عَدْلٌ، ... كَمَا فِي الْحَدِيثِ الصَّحِيحِ الْإِلَهِيِّ: «**يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: يَا عِبَادِي، إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي، وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا، فَلَا تَظَالَمُوا**»[(١)].

**واتە: خوای پەروەردگار دەستی ڕاستی پڕ لە بەخشینە، بە شەو و بە ڕۆژ لێی کەم ناکات، ئەی نابینن چی بەخشیوە لەو کاتەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە! دادپەروەریش لە دەستەکەی تریدایە «الْمِيزَانُ يَرْفَعُ وَيَخْفِضُ»[(٢)]، بەرزی دەکاتەوە و دایدەنەوێنێت، واتە دەستێکی خوای پەروەردگار (فضل)ە، وە دەستەکەی تری (عدل)ە، کارەکانی لە چاکە و دادپەروەری دەرناچێت، وە دەڵێن: هەموو نیعمەتێك بەخشندەیی ئەوە، وە هەموو تۆڵەیەك دادوەری ئەوە.**

**لەبەرئەوە پەروەردگار بێگەرد و بەرییە لە ستەم و پێشی ڕازی نییە و لە نێوان بەندەکانیشیدا حەرامی کردووە، وەکوو دەفەرموێت:** ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾﴾ [فُصِّلَت: ٤٦]. **واتە: پەروەردگار ستەمکار نییە بەسەر بەندەکانیدا، وە دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾ [النِّسَاء: ٤٠]. **واتە: پەروەردگار بە هەندەی گەردیلەیەك ستەم ناکات، وە دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ ٱلنَّاسَ شَيْـًٔا وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٤﴾﴾ [يُونُس: ٤٤]. **واتە: پەروەردگار بە هیچ شێوەیەك ستەم لە بەندەکان ناکات، بەڵکوو بەندەکان خۆیان ستەم لە خۆیان دەکەن، وە دەفەرموێت:** ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾﴾ [الأَنْعَام: ١٦٠]. **واتە: ئەوەی چاکەیەك بکات بە دە هێندەی خۆی پاداشتی هەیە، وە ئەوەی خراپەیەك بکات تەنها بە شێوەی خۆی تۆڵەی لێدەکرێتەوە و ستەمیان لێناکرێت، وە دەفەرموێت:** ﴿وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾﴾ [النِّسَاء: ٧٧]، ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾﴾ [النِّسَاء: ١٢٤]، **وە دەفەرموێت:**

---

(١) رواه البخاري في "الأدب المفرد" (٤٩٠)، ومسلم (٢٥٧٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٦١٩)، وأحمد في "المسند" (٢١٤٢٠)، والبزار في "المسند" (٤٠٥٣)، والطبراني في "الشاميين" (٣٣٨)، والطيالسي في "مسنده" (٤٦٥)، والبيهقي في "الشعب" (٦٦٨٦)، وفي "القضاء والقدر" (٣٨٠)، والبغوي في "شرح السنة" (١٢٩١).

(٢) رواه البخاري (٧٤١١)، والترمذي (٣٠٤٥)، والنسائي في "الكبرى" (١١١٧٥)، وابن ماجه (١٩٧)، وأحمد في "المسند" (١٠٥٠٠)، وابن بطة في "الإبانة" (٢٢٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٧٠٠).

﴿وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْـًٔا ٦٠﴾ [مريم: ٦٠]. واتە: بە هێندەی ئەو توێکڵە تەنکەی کە بە چواردەوری ناوکە خورماوەیە، یاخود بە هێندەی ئەو خاڵەی کە بەسەر پشتی ناوکە خورماوەیە، خوا ستەم لە بەندەکان ناکات، وە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا ١١٢﴾ [طه: ١١٢]. واتە: خاوەن کرداری چاك باوەڕدارە و بە هیچ شێوەیەك ترسی ستەملێکردن (الظلم)ی نییە، بە شێوەیەك کە تاوانی کەسێکی تری بدرێت بەسەردا، یاخود لە چاکە و کار و کردەوەکانی کەمبکرێتەوە[1].

وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ ٣١﴾ [غافر: ٣١]. واتە: خوای پەروەردگار ویستی ستەمی نییە بۆ ئادەمیزاد، وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ٤٩﴾ [الكهف: ٤٩]. واتە: خوای پەروەردگاری تۆ ستەم لە تاکە کەسێك ناکات.

**پێناسەی (أهل السنة) بۆ نەکردنی ئەم ستەمەی پەروەردگار کە بڕیار لەسەر قەدەغەکردنی بۆ خۆی دەدات و ڕازی نابێت پێی و بێگەردی و بەریبوونی خۆی دەسەلمێنێت لەسەری، بەم شێوەیە:**

وَأهل السّنة أثبتوا مَا أثْبته لنَفسِهِ لَهُ الْملك وَالْحَمْد، فَهُوَ على كل شَيْء قدير، وَمَا شَاءَ كَانَ، وَمَا لم يَشَأْ لم يكن، وَهُوَ خَالق كل شَيْء، وَهُوَ عَادل فِي كل مَا خلقه، وَاضع للأشياء موَاضعهَا، وَهُوَ قَادر على أَن يظلم، لكنه سُبْحَانَهُ منزه عَن ذَلِك، لَا يَفْعَله لِأَنَّهُ السَّلَام القدوس الْمُسْتَحق للتنزيه عَن السوء[2].

واتە: ئەهلی سوننەت بڕیاری ئەوە دەدەن کە خوای پەروەردگار بڕیاری داوە بۆخۆی لەوەی خاوەن هەموو بوونەوەرەکانە، سوپاس و ستاییش شایستە بەوە، باڵادەستە بەسەر هەموو شتێکدا، ئەوەی ویستی لێبێت دەبێت، ئەوەی ویستی لێنەبێت نابێت، دادپەروەرە لەوەی دروستی کردووە و هەموو کارەکان لە شوێنی خۆیدا دادەنێت، بۆیە دەتوانێت ستەم بکات، بەڵام بێگەردە لە ستەمکردن و نایکات.

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٠/ ٨٧).
(٢) "جامع الرسائل" لابن تيمية (١/ ١٢٣).

لەبەرئەوە کارەکانی پڕە لە دانایی و دادپەروەری و بەزەیی (الحكمة والعدل والرحمة)، وە سوپاس و ستاییش و خاوەنێتی بوونەوەرەکان شاییستە بە خۆیەتی (الملك والحمد)، وە هیچ کارێکی بێ هۆکار و سوودمەندی (العلة والمصلحة) نییە، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: أَن كل مَا يَفْعَله الرب ويخلقه فوجوده خير من عَدمه ... كَمَا ذكرنَا فِيمَا يَأْمر بِهِ أَن فعله خير من تَركه وَأَنه خير من أَفعَال غَيره يشْتَغل بهَا عَنهُ[1].

واتە: هەموو کارێکی پەروەردگار لە دروستکردن و هێنانەدییەکانی؛ بوونی خێرترە لە نەبوونی، هەروەکوو چۆن ئەو کارانەی کە فەرمانی پێ کردووە کردنی خێرترە تاوەکوو نەکردنی، وە سەرقاڵبوون بە فەرمانەکانی خواوە خێرترە تاوەکوو کردنی کاری بێجگە لە خوا و فەرمانەکانی، هەروەکوو بۆ نوێژی جومعە دەفەرموێت: ﴿فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٩﴾ [الجمعة: ٩]. واتە: بەرەو یادی خوا بڕۆن، باشترە لە کڕین و فرۆشتن، ئەوە خێری بۆ ئێوە تێدایە گەر بزانن.

باوەڕی ئەهلی سوننەت وایە کە کارەکانی پەروەردگار تەنها ویست و ئیرادە نییە بەبێ حیکمەت و هۆکار و سوودمەندی، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: كُلُّ مَا خَلَقَهُ اللهُ فَلَهُ فِيهِ حِكْمَةٌ، كَمَا قَالَ: ﴿صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍۚ﴾ [النمل: ٨٨]، وَقَالَ: ﴿ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥۖ﴾ [السجدة: ٧]. وَهُوَ سُبْحَانَهُ غَنِيٌّ عَنْ الْعَالَمِينَ. "فَالْحِكْمَةُ" تَتَضَمَّنُ شَيْئَيْنِ:

أَحَدُهُمَا: حِكْمَةٌ تَعُودُ إلَيْهِ يُحِبُّهَا وَيَرْضَاهَا.

وَالثَّانِي إلَى عِبَادِهِ هِيَ نِعْمَةٌ عَلَيْهِمْ يَفْرَحُونَ بِهَا وَيَلْتَذُّونَ بِهَا؛ وَهَذَا فِي الْمَأْمُورَاتِ وَفِي الْمَخْلُوقَاتِ. أَمَّا فِي "الْمَأْمُورَاتِ" فَإِنَّ الطَّاعَةَ هُوَ يُحِبُّهَا وَيَرْضَاهَا؛ ... وَالطَّاعَةُ عَاقِبَتُهَا سَعَادَةُ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ؛ وَذَلِكَ مِمَّا يَفْرَحُ بِهِ الْعَبْدُ الْمُطِيعُ؛ ... قَالَ تَعَالَى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ ٤﴾ [الصف: ٤]، فَهُوَ يُحِبُّ ذَلِكَ؛ فَفِيهِ حِكْمَةٌ عَائِدَةٌ إلَى اللَّهِ تَعَالَى وَفِيهِ رَحْمَةٌ لِلْعِبَادِ؛ وَهِيَ مَا يَصِلُ إلَيْهِمْ مِنْ النِّعْمَةِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ؛

(١) "جامع الرسائل" لابن تيمية (١/ ١٣٦).

هَكَذَا سَائِرُ مَا أَمَرَ بِهِ؛ وَكَذَلِكَ مَا خَلَقَهُ خَلَقَهُ لِحِكْمَةِ تَعُودُ إلَيْهِ يُحِبُّهَا وَخَلَقَهُ لِرَحْمَةِ بِالْعِبَادِ يَنْتَفِعُونَ بِهَا(١).

واته: هەموو ئەوانەی کە خوای پەروەردگار دروستی کردوون پڕن لە دانایی و حیکمەت، وەکوو خۆی دەفەرموێت: ﴿صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍ﴾ [النمل : ٨٨]. واته: دروستکراوەکانی پەروەردگار هەموویان بە کامڵی و ووردبینی پڕ بە دانایی دروستکراون، یاخود دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ﴾ [السجدة : ٧]. واته: ئەو پەروەردگارەی کە هەموو دروستکراوەکانی بە شێوەیەکی تەواو و ڕێکوپێك دروستکردووە کە شایستە بەو شێوەیە بێت، حیکمەتیش لە دروستکراوەکانیدا دوو بابەتە:

**یەکەم:** حیکمەتێك دەگەڕێتەوە بۆ خۆی، کە پێی خۆشە و پێی ڕازییە.

**دووەم:** حیکمەتێك دەگەڕێتەوە بۆ بەندەکانی، کە مایەی خۆشحاڵی و کامەرانی دونیا و ڕۆژی دواییانە.

وەك لە فەرمانەکانیدا و هەروەها لەوانەیشی کە دروستی کردوون ئەم حیکمەتانە دەردەکەوێت، وەکوو دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ ٤﴾ [الصف : ٤]. واته: پەروەردگار پێی خۆشە لەپێناویدا کۆشش بکرێت، وە لەلایەکی تریشەوە ئەم کارە (واته ئەم کۆششکردنە) هۆکاری بەزەیی و نیعمەتەکانی دونیا و دواڕۆژە بۆ بەندەکان.

بۆیە (ابن تیمیة) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: وَمَا خَلَقَ الْخَلْقَ بَاطِلًا وَلَا فَعَلَ شَيْئًا عَبَثًا بَلْ هُوَ الْحَكِيمُ فِي أَفْعَالِهِ وَأَقْوَالِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى(٢).

واته: خوای پەروەردگار هیچ لە دروستکراوەکانی بە بەتاڵ دروست نەکردووە، وە هیچ کام لە کارەکانی گاڵتەکاری نییە، هەر ئەوە کە دانایە لە هەموو کار و فەرموودەکانیدا، بۆیە پاك و بێگەردی شایستە بەوە.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٥ – ٣٧).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٩٧).

وەکوو دەفەرموێت: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾﴾ [المؤمنون : ١١٥]. واتە: ئەوە وا گومان دەبەن کە ئێوەمان بە گاڵتە دروستکردووە بەبێ هیچ فەرمان و ڕێگرییەك و ناگەڕێنەوە بۆ لامان؟![1]. وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ﴿١٦﴾﴾ [الأنبياء : ١٦]. واتە: ئاسمان و زەوی و ئەوانەی کە لە نێوانیاندایە بۆ گاڵتە دروستمان نەکردوون.

بەڵام ئەو حیکمەت و وردەکاریانەی کە لە کار و فەرمانەکانی پەروەردگاردا هەیە زۆری کەسەکان نایزانن و دەرکی پێناکەن، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: لَكِنْ تَفْصِيلُ حِكْمَةِ الرَّبِّ مِمَّا يَعْجِزُ كَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ عَنْ مَعْرِفَتِهَا، وَمِنْهَا مَا يَعْجِزُ عَنْ مَعْرِفَتِهِ جَمِيعُ الْخَلْقِ حَتَّى الْمَلَائِكَةُ؛ وَلِهَذَا قَالَتْ الْمَلَائِكَةُ لَمَّا قَالَ اللهُ تَعَالَى لَهُمْ: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ﴾ [البقرة : ٣٠]؛ قَالَ: ﴿إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ [البقرة : ٣٠][2].

واتە: وردەکاری و دانایی و وردبینییەکانی پەروەردگار زۆری کەسەکان نایزانن، وە هەشیانە هیچ کام لە بوونەوەران نایزانن، تەنانەت فریشتە (الملائكة)کانیش نایزانن، هەروەکوو کاتێك کە خوای پەروەردگار هەواڵیدا بەوەی سەرزەوی ئاوەدان دەکەمەوە، (ملائكة)کانیش وتیان: کەسانێکی تێدا دروست دەکەیت کە خراپەکاری و خوێنڕێژی تێدا ئەنجام دەدەن؟ پەروەردگاریش فەرمووی: ئەوەی کە من دەیزانم ئێوە نایزانن، تەنانەت ئەوانیش نەیاندەزانی مەبەست لە دروستکردنی ئادەمیزاد چییە.

ئەم حیکمەتانەش هیچی پەروەردگار پێویستی نییە، وەکوو خۆی دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ الْغَنِيُّ وَأَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ﴾ [محمد : ٣٨]، وە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ إِنْ تَكْفُرُوا أَنْتُمْ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٨﴾﴾ [إبراهيم : ٨]، وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ ﴿٦﴾﴾ [العنكبوت

(١) "تفسير السعدي" ص٥٦٠.
(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٥١٤).

:٦]، وە دەفەرمویێت: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٩٧﴾ [آل عمران: ٩٧]، وە دەفەرمویێت: ﴿وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٢٧﴾ [الروم: ٢٧].

واته: هەموو بەندەکان خاوەن پێویستین و هەژارن، بەڵام پەروەردگار باڵادەست و بێ نیازە لە بەندەکانی، وە گەر هەموو سەرزەوی بێباوەڕ بن خوای پەروەردگار بێ پێویستە پێیان و شایستەی وەسف و ستاییشە، وە نموونەی باڵا و بێ هاوتایی و کاملێ و بێ وێنەیی لە ئاسمان و زەوی شایستە بە خوای پەروەردگاری بەتوانا و دانایە.

وە لە فەرموودەیەکی قودسیشدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: «يَا عِبَادِي إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي، وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا، فَلَا تَظَالَمُوا، ... يَا عِبَادِي إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي فَتَضُرُّونِي وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي، فَتَنْفَعُونِي، يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئًا، يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا، ... يَا عِبَادِي إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا، فَلْيَحْمَدِ اللهَ وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ، فَلَا يَلُومَنَّ إِلَّا نَفْسَهُ»(١).

واته: خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ئەی بەندەکانم من ستەمم لەسەر نەفسی خۆم حەرامکردووە، وە لە نێوانیشتاندا حەرامم کردووە، ستەمکار مەبن، ئەی بەندەکانم ئێوە ناگەنە ئاستێکی زیانگەیاندن کە زیان بە من بگەیەنن، وە ناگەنە ئاستێکی سوودمەندی تا بتوانن سوود بە من بگەیەنن، ئەی بەندەکانم گەر لە یەکەم کەستانەوە تا کۆتایی کەستان لە ئادەمیزاد و جنەکان وەکوو کەسێکی زۆر خواناس لە خۆتان بن؛ هیچ لە دەسەڵاتی من زیاد ناکات، ئەی بەندەکانم گەر لە یەکەم کەستانەوە تا کۆتایی کەستان لە ئادەمیزاد و جنەکان وەکوو کەسێکی زۆر تاوانبار لە خۆتان بن؛ هیچ لە دەسەڵاتی من کەم ناکات، ئەی بەندەکانم ئەوە کار و کردەوەکانتانە بۆتان هەژمار و پاداشت دەکەم، گەر پاداشتی چاکە بوو با سوپاس و ستاییشی خوای لەسەر بکات، وە گەر بەو شێوەیە نەبوو با تەنها سەرزەنشتی خۆی بکات.

(١) رواه مسلم (٢٥٧٧) كِتَابُ الْبِرِّ وَالصِّلَةِ وَالْآدَابِ، بَابُ تَحْرِيمِ الظُّلْمِ، وسبق تخريجه ص١١١.

بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا﴾ [الأنبياء: ٤٧]. واتە: ئێمە کێشانەی دادپەروەری لە ڕۆژی کۆتاییدا دادەنێین، هیچ نەفسێك لە ئیماندار و بێبڕوا ستەمی لێ ناکرێت[١]، وە دەفەرموێت: ﴿كَتَبَ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾ [الأنعام: ١٢]. واتە: خوای پەروەردگار واجبی کردووە کە سۆز و بەزەیی بەکاربێنێت بۆ بەندەکانی، وەکوو چاکە و بەخشندەییەکی خۆی[٢].

پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: «لَمَّا قَضَى اللهُ الخَلْقَ كَتَبَ فِي كِتَابِهِ فَهُوَ عِنْدَهُ فَوْقَ العَرْشِ، إِنَّ رَحْمَتِي غَلَبَتْ غَضَبِي»[٣]، وە دەفەرموێت: «كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ بِيَدِهِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ الْخَلْقَ: رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي»[٤].

واتە: خوای پەروەردگار پێش ئەوەی بوونەوەرەکان دروست بکات، لە کتێبێکدا کە لەلای خۆیەتی لە سەروو عەرشەوە دایناوە و تیایدا نووسیویەتی: بەزەیی من زاڵە و پێشکەوتووە بەسەر تووڕەبوونمدا.

(١) "تفسير السعدي" ص٥٢٤.

(٢) "تفسير ابن كثير" (٣/ ٢٤٢).

(٣) رواه البخاري (٣١٩٤)، ومسلم (٢٧٥١)، والنسائي في "الكبرى" (٧٧٠٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٦١٤٤)، وأحمد في "المسند" (٨١٢٧)، والطبراني في "الشاميين" (٢٣٩٠)، والبيهقي في "الأسماء والصفات" (٦٢٢)، وابن بطة في "الإبانة" (١٢٩)، والآجري في "الشريعة" (٦٥٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (٧/ ٨٧)، والبغوي في "شرح السنة" (٤١٧٧).

(٤) رواه الترمذي (٣٥٤٣)، وابن ماجه (١٨٩) واللفظ له، وصححه الأرنؤوط، ورواه ابن حبان في "صحيحه" (٦١٤٣)، وأحمد في "المسند" (٩٥٩٧)، والبزار في "المسند" (٨٣٧١)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٤١٩٩)، والبيهقي في "الأسماء والصفات" (٦٢٣)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٦٢٩)، و "صحيح الجامع الصغير" (٤٤٧٥).

## تـێـڕوانـینـی فـیـرەقەكـان لەسـەر ستـەم و پێناسەی بۆ خـوا

تێڕوانینی فیرەقەكان لەسەر ستەم (الظلم) و پێناسە و دیاریكردنی و بڕیاردانی بۆ خوای پەروەردگار بەم شێوەیەیە:

١. **جەبەرییەكان (الجبرية):**

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** الجبرية الَّذين ينفون أَن يكون للْعَبد فعل أَو كسب أَو اخْتِيَار الْبَتَّةَ[1].

واتە: (جەبەرییەكان) ئەوانەن كە دەڵێن هیچ كارێك لە بژاردە و ویستی ئادەمیزاددا نییە، بەڵكوو هەموو كار و كردەوەیەكی پێدەكرێت بەبێ توانا و دەسەڵاتی خۆی.

ئەم گرووپەش لە پێناسە و بەرنامەدا فیرقەی (الأشاعرة والجهمية)كانیش لەخۆ دەگرێت، كە لە پێناسەی ستەم (الظلم) و بێگەردكردنی پەروەردگار لە ستەم دەڵێن: مقَالَة الْجَهْمِية والأشاعرة: فَقَالَت طَائِفَة: الظُّلم لَيْسَ بممكن الْوُجُود، بل كل مُمكن إِذا قدر وجوده مِنْهُ فَإِنَّهُ عدل، وَالظُّلم هُوَ الْمُمْتَنع مثل الْجمع بَين الضدين ... فَإِن الظُّلم إِمَّا التَّصَرُّف فِي ملك الْغَيْر وكل مَا سواهُ ملكه، وَإِمَّا مُخَالفَة الْآمِر الَّذِي تجب طَاعَته، وَلَيْسَ فَوق الله تَعَالَى آمُر تجب عَلَيْهِ طَاعَته ... وَهَذَا قَول الْمُجبرَة مثل جهم وَمن اتبعهُ، وَهُوَ قَول الْأَشْعَرِيّ وَأَمْثَاله من أهل الْكَلَام، وَقَول من وافقهم من الْفُقَهَاء وَأهل الحَدِيث والصوفية ... وَهَذَا قَول كثير من أَصْحَاب مَالك وَالشَّافِعِيّ وَأحمد، كَالْقَاضِي أبي يعلى وَأَتْبَاعه، وَأبي الْمَعَالِي الْجُوَيْنِيّ وَأَتْبَاعه، وَأبي الْوَلِيد الْبَاجِيّ وَأَتْبَاعه وَغَيرهم[2].

واتە: ئەم گرووپە و هاوڕاكانیان لە ئەشعەری و ئەهلی تەسەوف و زۆری شوێنكەوتەی مەزهەبی شافعی و مالك و أحمد، وەكوو (أبو يعلى القاضي والجويني والباجي) لە پێناسەی ستەم و

(١) "مفتاح دار السعادة" لابن القيم (٢/ ٢٤٣).

(٢) "جامع الرسائل" لابن تيمية (١/ ١٢١ – ١٢٣)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٨/ ١٣٩).

بێگەردکردنی پەروەردگار لێی و ئایا خوای پەروەردگار دەتوانێت ستەم بکات یاخود نا، دەڵێن: ستەم بوونی نییە بۆ خوا، بەڵکوو هەرچییەکی بڕیار داوە کە ببێت و ئەوەشی کە بووە هەمووی دادپەروەرییە، ستەمکردن لەوەوە بوونی نییە و ناتوانێت بیکات، وە بڕیاردان لەسەر توانای ستەمکردن بۆ خوا وەکوو کۆکردنەوەی دوو دژبەیەکە، وەك چۆن بوون و نەبوون کۆنابێتەوە بەیەکەوە.

**بۆیە پێناسەی ستەم (الظلم) لای جەبەرییەکان:** کارکردنە لە موڵك و دەسەڵاتێك کە هی خۆت نەبێت، بەڵام خوا هەموو شتێك موڵکی خۆیەتی، یاخود شکاندنی فەرمانی فەرمانڕەوایەکە کە دەبێت فەرمانی جێبەجێبکرێت، بەڵام لە سەروو خواوە هیچ فەرمانڕەوایەك و فەرمانێك نییە، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ لە بەرپەرچدانەوەیاندا دەڵێت: فَقَدْ يَتَصَرَّفُ الْإِنْسَانُ فِي مِلْكِ غَيْرِهِ بِحَقٍّ وَلَا يَكُونُ ظَالِمًا، وَقَدْ يَتَصَرَّفُ فِي مِلْكِهِ بِغَيْرِ حَقٍّ فَيَكُونُ ظَالِمًا[1].

واتە: مەرج نییە ستەمکردن ئەوە بێت کە کار لە موڵکی بێجگە لە خۆتدا بکەیت، بەڵکوو ئادەمیزاد دەشێت کار لە موڵکی بێجگە لە خۆیدا بکات بە حەق و دروستی و ئەوکات ستەمکار نابێت، وە دەشێت کار لە موڵکی خۆشیدا بکات بە ناحەق و ئەوکات ستەمکار دەبێت.

بەرهەمی ئەم تێڕوانینەشیان گەیشت بەوەی کە وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: فهم معطلة فِي الْأَفْعَال ... فَإِنَّهُم يعطلون فعل العَبْد ... وَأما الرب فَيَقُولُونَ خلق مَا خلق لَا لحكمة أصلًا، فعطلوا حكمته وَقَالَ إِنَّه يجوز أَن يعذب جَمِيع الْخلق بِلَا ذَنْب فعطلوا عدله[2].

واتە: کاری ئادەمیزادیان لەکارخست، لەبەرئەوەی وتیان ویست و بژاردە بەدەست خۆیان نییە، بەڵکوو بەزۆر پێیان دەکرێت، بۆیە خاوەنی هیچ کارێك نین، وە خواش هەرچییەکی دروستکردووە هەمووی بە ویست و ئیرادەی خۆی بووە، بەبێ هیچ هۆکار و حیکمەت و ڕەچاوکردنێك لە دروستکردنیدا، بۆیە هۆکار و حیکمەت (العلة والحكمة) لە کاری خواشدا نەما، بەم هۆکارەشەوە بڕیاری ئەوەیان دا کە دەشێت خوا بەبێ تاوان خەڵك سزا بدات.

بۆیە (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: وَهَؤُلَاءِ يَقُولُونَ: إِنَّهُ لَوْ عَذَّبَ الْمُطِيعِينَ، وَنَعَّمَ الْعُصَاةَ لَمْ

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٨/ ١٤٥).

(٢) "جامع الرسائل" لابن تيمية (١/ ١٢٨).

يَكُنْ ظَالِمًا، وَقَالُوا: الظُّلْمُ التَّصَرُّفُ فِيمَا لَيْسَ لَهُ[(١)].

وە (ابن القيم)یش رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَالْتزم هَؤُلَاءِ عَن هَذَا القَوْل لَوَازِم بَاطِلَة، كَقَوْلِهِم أَن الله تَعَالَى يجوز عَلَيْهِ أَن يعذب أنبياءه وَرُسُله وَمَلَائِكَته وأولياءه وَأهل طَاعَته، ويخلدهم فِي الْعَذَاب أليم، وَيكرم أعداءه من الْكفَّار وَالْمُشْرِكين وَالشَّيَاطِين، ويخصهم بجنته وكرامته وَكِلَاهُمَا عدل وَجَائِز عَلَيْهِ[(٢)].

واتە: بە هۆکاری پێناسەیان بۆ ستەم کە کارکردنە لە شتێکدا کە خاوەنی نەبیت؛ وە هەموو شتێکیش موڵکی خوایە و خاوەنیەتی و بۆی هەیە هەموو کارێکی تیادا ئەنجام بدات (کەواتە کە هەموو شتێك موڵکی خوا بوو هەر جۆرە کارکردنێکی خوایی تیایدا نابێتە ستەم)، بە ویست و ئیرادەی گشتی خۆی بەبێ ڕەچاوکردنی سوودمەندییان، یاخود هۆکار و حیکمەتێك کە بگەڕێتەوە بۆ خۆی و بەندەکانی، لەبەرئەوەی پێشوەختە بڕیاری ئەوەیان دابوو کە ئیختیار لە دەستی ئادەمیزاددا نییە و بەو هۆکارەشەوە فەرمانەکانی خوا هیچێك لە سوودمەندی و هۆکاری پێویست لەخۆ ناگرێت بۆ ئادەمیزاد، بەڵکوو وشەی ویست و ئیرادەی (مطلق) واتای ئەوە دەگەیەنێت کە چاکە و خراپە لەخۆناگرێت، بە هۆکاری ئەو بڕیارانەشەوە ئەوە دروست دەکات کە دەشێت و ستەمیش نییە خوا پێغەمبەران و خواناسان و مەلائیکەکان سزا بدات بە هەتا هەتایی، وە تاوانباران و بێبڕوایانیش بخاتە بەهەشتەوە بە هەتا هەتایی.

کۆتا قسەکانیان لەکارخستنی ئیختیاری ئادەمیزاد بوو، پاشان نەبوونی چاکە و خراپە لە کارەکانیدا، وە نەمانی هیچ حیکمەت و هۆکارێکی سوودمەند لە فەرمانەکانی خوادا، لە ئەنجامدا دادوەری و بەزەیی و حیکمەت (العدالة، الرحمة، الحكمة) لە خوادا نەما بۆ بەندەکانی.

وە (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: هَؤُلَاء أثبتوا لَهُ ملكًا بِلَا حَمْد[(٣)].

واتە: ئەمانە بڕیاری هەموو دروستکراو و بوونێکیان بۆ خوا دا کە هیچ سوپاس و ستاییشێکی لەسەر نەکرێت، بەوەی لە ئەنجامی بەزۆر پێکردن کەواتە سوپاس و ستاییش نامێنێت.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٨/ ١٤٥).

(٢) "مفتاح دار السعادة" لابن القيم (٢/ ١٠٧)، وە (ابن حزم)یش رَحِمَهُ اللَّهُ هەمان بۆچوونی هەیە لە "الفصل في الملل والأهواء والنحل" (٣/ ٦٠).

(٣) "جامع الرسائل" لابن تيمية (١/ ١٢٩).

ئەمانە ویستیان بەو بڕیارانە ستەم (الظلم) لە خوا دووربخەنەوە، وە وتیان: فَإِنَّ الظُّلْمَ مِنَ الْأُمُورِ الْمُمْتَنِعَةِ لِذَاتِهَا فِي حَقِّهِ وَهُوَ غَيْرُ مَقْدُورٍ لَهُ[١].

واتە: ستەم لە خوادا بوونی نییە و توانای بەسەریدا نییە.

بەڵام بە پێچەوانەوە بڕیاری هەموو ستەمێکیان خستە پاڵ خوا، وە وەسفیان کرد بە: الْمُسْتَحِيلِ لِذَاتِهِ الَّذِي لَا يُتَصَوَّرُ وُجُودُهُ، وَمَعْلُومٌ أَنَّ هَذَا التَّنْزِيهَ يَشْتَرِكُ فِيهِ كُلُّ أَحَدٍ[٢].

بە کارێك کە ئەستەمە بوونی ببێت، کە ناتوانێت ستەم بکات و خۆشی بێگەرد بکات لە ستەمکردن، بگرە ئەمە لە بەندەکانیشیدا هەیە کە ناتوانێت هەندێك جار ستەم بکات، یاخود لە توانایدا نەبێت و بڕیاریش بدات ستەمم نەکردووە، خوایان هێنایە ڕیزی بەندەکانیەوە.

بۆیە (ابن تیمیة) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: ولهذا قال جمهور النّاس عن هؤلاء إنّهم لا يُنزّهون الربّ عن السّفه والظلم، بل يصفونه بالأفعال التي يُوصف بها المجانين والسفهاء؛ فإنّ المجنون والسفيه قد يُعطي مالاً عظيماً لمن ليس هو له بأهل. وقد يُعاقب عقوبة عظيمة لمن هو أهل للإكرام والإحسان[٣].

واتە: تەنانەت خەڵکی گشتی دەڵێن: ئەمانە پەروەردگار بێگەرد ناکەن لە ناتەواوی و سەقەتی و ستەم، بەڵکوو وەسفی دەکەن بە وەسفێك کە شێت و بێ عەقڵەکانی پێ وەسف دەکرێت، هەروەکوو چۆن شێت و بێ عەقڵەکانماڵێکی زۆر دەدەنە کەسێك کە شایستە نییە، یاخود سزایەکی گەورە لە کەسانێك دەستێنن کە شایستەی هەموو ڕێز و چاکەیەکن.

### گرنگترین ئەو دەقانەی کە جەبەرییەکان دەیکەنە بەڵگە بۆ بیروڕاکانیان ئەمانەن:

❁ بەڵگەی یەکەمیان: قال الله تعالى: ﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾﴾ [الأنبياء: ٢٣].

واتە: پرسیار ناکرێت لە کارەکانی پەروەردگار، بەڵکوو ئێوە پرسیارتان لێدەکرێت.

---

(١) "مختصر صواعق المرسلة" ص٢٣٣.

(٢) "مختصر صواعق المرسلة" ص٢٣٤.

(٣) "النبوات" لابن تيمية (١/ ٤٧٣).

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَكلما سئلوا عَن شَيْء أجابوا بِـ(لَا يسأل عَمَّا يفعل)، وَهَذَا من أصدق الْكَلَام، وَلَيْسَ المُرَاد بِهِ نفي حكمته تَعَالَى وعواقب أفعاله الحميدة وغاياتها المُطْلُوبَة مِنْهَا، وَإِنَّمَا المُرَاد بالآية إِفْرَاده بالألهية والربوبية، وَإنَّهُ لكَمَال حكمته لَا معقب لحكمه، وَلَا يعْتَرض عَلَيْهِ بالسؤال، لأنه لَا يفعل شَيْئًا سدى وَلَا خلق شَيْئا عَبَثا[١].

**واتە: هەرچی پرسیاریان لێبکرێت بەو ئایەتە ﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ﴾ وەڵام دەدەنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا مەبەست پێی نەخوێندنەوەی حیکمەت و مەبەستە پێویستییەکان و کۆتایی کارە چاکەکان نییە، بەڵکوو مەبەست بەو ئایەتە دەربڕینی تاك و تەنیایی خوایەتییە لە بەڕێوەبردن و پەرستندا کە تەنها بۆ ئەوە، لەبەر تەواوی دانایی خوا هیچ یاسا و پرسیارێك پێشگری بە کارەکانی ناکات، بە هۆکاری ئەوەی هیچ کارێك بێهوودە ناکات و هیچ شتێکیشی بە گاڵتە دروست نەکردووە.**

۩ بەڵگەی دووەمیان: قَوْلُهُ ﷺ: «لَوْ أَنَّ اللَّهَ عَذَّبَ أَهْلَ سَمَاوَاتِهِ وَأَهْلَ أَرْضِهِ عَذَّبَهُمْ وَهُوَ غَيْرُ ظَالِمٍ لَهُمْ، وَلَوْ رَحِمَهُمْ كَانَتْ رَحْمَتُهُ خَيْرًا لَهُمْ مِنْ أَعْمَالِهِمْ ...»[٢].

**واتە: گەر خوای پەروەردگار سزای هەموو ئەوانە بدات کە لە ئاسمانەکان و زەویدان؛ ستەمی لێنەکردوون، وە گەر بەزەیی پیایانا بێتەوە؛ ئەوا بەزەییەکەی خوا باشترە لە کردەوەکانیان.**

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وليس المراد به لو عذبهم لتصرف في ملكه ... كما يظنه كثير من الناس، ... والحديث إنما سيق للمدح وبيان عظم حق الله على عباده، وأنه لو عذبهم لعذبهم بحقه عليهم ولم يكن بغير استحقاق، فإن حقه سبحانه عليهم أضعاف أضعاف ما أتوا. ولهذا قال بعده: «وَلَوْ رَحِمَهُمْ كَانَتْ رَحْمَتُهُ خَيْرًا لَهُمْ مِنْ أَعْمَالِهِمْ»، يعنى أن رحمته لهم ليست على قدر

---

(١) "مفتاح دار السعادة" لابن القيم (١/ ٢٧٤).

(٢) رواه أبو داود (٤٦٩٩)، وابن ماجه (٧٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٢٧)، وأحمد في "المسند" (٢١٥٨٩)، والطبراني في "الكبير" (٤٩٤٠)، والطيالسي في "مسنده" (٦٩٠)، والبيهقي في "الشعب" (١٧٩)، و "القضاء والقدر" (٢٠٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢٤٥)، وابن بطة في "الإبانة" (١٤٤٣)، والآجري في "الشريعة" (٣٧١)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٠٩٣)، والفريابي في "القدر" (١٩٠)، وصححه الألباني في "المشكاة" (١١٥)، و "صحيح وضعيف سنن أبي داود" (٤٦٩٩).

أعمالهم، إذ أعمالهم لا تستقل باقتضاء الرحمة، وحقوق عبوديته وشكره التي يستحقها عليهم لم يقوموا بها، فلو عذبهم والحالة هذه لكان تعذيباً لحقه، وهو غير ظالم لهم فيه. ولا سيما فإن أعمالهم لا توازي القليل من نعمه عليهم، فتبقى نعمه الكثيرة لا مقابل لها من شكرهم، فإذا عذبهم على ترك شكرهم وأداءِ حقه الذي ينبغي له سبحانه عذبهم ولم يكن ظالماً لهم[(١)].

**واتە: مەبەست بەمە ئەوە نییە کەوا گەر سزایان بدات ئەوا کاری لە دەسەڵات و موڵکی خۆیدا کردووە، کە زۆری خەڵك بەم شێوەیە گومانی پێدەبەن، بەڵکوو ئەم فەرموودەیە باس لە وەسف و مافی خوا دەکات بەسەر بەندەکانیەوە، کە گەر سزایان بدات ئەوا سزایان لەسەر مافی خۆی دەدات بەسەر بەندەکانیەوە، نەك بەبێ تاوان، بەڵکوو مافی خوا بەسەر بەندەکانیەوە چەندەها قاتە کە بە کردەوەکانیان پڕ نابێتەوە، بۆیە دوایی دەفەرموێت گەر بەزەیی پیایانا بێتەوە ئەوا بەزەییەکە باشترە بۆیان تا کردەوەکانیان، واتە کردەوەکانیان لە ئاستی بەزەیی خوادا نییە، مافی بەندایەتی و سوپاسگوزاری لەسەر نیعمەتەکانی خوا ناهێننە دی، کەواتە لەم کاتەدا گەر سزا بدرێن ئەوا ستەم نییە لێیان، بەدەر لەوەی کە کارەکانیان لە ئاستی کەمترین نیعمەتەکانی خوادا نییە، چ جای ئەو هەموو نیعمەتە زۆرەی کە لە ئاستیدا سوپاسگوزاری خوا ناکرێت، کەواتە لە نەکردنی سوپاسگوزاری و جێبەجێنەکردنی مافەکانی خوا لەسەریان گەر سزا بدرێن ئەوا ستەم نییە لێیان.**

**بۆیە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خواش ﷺ هەمان باس هەڵدەگرێت کە دەفەرموێت:** «**لَنْ يُدْخِلَ أَحَدًا مِنْكُمْ عَمَلُهُ الْجَنَّةَ**» قَالُوا: وَلَا أَنْتَ؟ يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ: «**وَلَا أَنَا، إِلَّا أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ اللهُ مِنْهُ بِفَضْلٍ وَرَحْمَةٍ**»، وفي لفظ: «**لَنْ يُنْجِيَ أَحَدَكُمْ عَمَلُهُ**»[(٢)].

---

(١) "طريق الهجرتين" لابن القيم ص٢٨٦.

(٢) رواه البخاري (٥٦٧٣، ٦٤٦٣)، ومسلم (٢٨١٦)، وابن ماجه (٤٢٠١)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٤٨)، وأحمد في "المسند" (٧٤٧٩)، والدارمي في "سننه" (٢٧٧٥)، والبزار في "المسند" (٣١٢١)، وأبو يعلى في "مسنده" (١٧٧٥)، والطبراني في "الكبير" (٤٩٣)، والطيالسي في "مسنده" (٢٤٤١)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٥٨٤٠)، والبيهقي في "الشعب" (٧٥٠)، وفي "القضاء والقدر" (٤٠١)، وابن بطة في "الإبانة" (١٠٥١)، وأبو نعيم في "الحلية" (٧/ ١٢٩)، والبغوي في "شرح السنة" (٤١٩٢).

واتە: هیچ کەس بە کردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشتەوە و ڕزگاری نابێت، وتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەڵێ، مەگەر خوای گەورە نوقمی بەزەیی و پلەوپایە و فەزڵی خۆیم بکات.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: فنفى بِهَذَا الحَدِيث مَا قد تتوهمه النُّفُوس من أَن الْجَزَاء من الله عَزَّوَجَلَّ على سَبِيل الْمُعَاوضَة والمقابلة ... وَكثير من النَّاس قد يتَوَهَّم مَا يشبه هَذَا، وَهَذَا غلط من وُجُوه:

أَحدهَا: أَن الله تَعَالَى لَيْسَ مُحْتَاجا إِلَى عمل الْعباد كَمَا يَحْتَاج الْمَخْلُوق إِلَى عمل من يستأجره ... والعباد إِنَّمَا يعْملُونَ لأَنْفُسِهِمْ، كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ﴾ [البَقَرَة: ٢٨٦]، وَقَالَ: ﴿إِن تَكْفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَۖ وَإِن تَشْكُرُواْ يَرْضَهُ لَكُمْ﴾ [الزُّمَر: ٧].

الثَّانِي: أَن الله هُوَ الَّذِي من على الْعَامِل بِأَن خلقه أَولا وأحياه ورزقه، ثمَّ بِأَن أرسل إِلَيْهِ الرُّسُل، وَأنزل إِلَيْهِ الْكتب، ثمَّ بِأَن يسر لَهُ الْعَمَل وحبب إِلَيْهِ الْإِيمَان وزينه فِي قلبه، وَكره إِلَيْهِ الْكفْر والفسوق والعصيان.

الْوَجْه الثَّالِث: أَن عمل العَبْد لَو بلغ مَا بلغ لَيْسَ هُوَ مِمَّا يكون ثَوَاب الله مُقَابلا لَهُ ومعادلا حَتَّى يكون عوضا.

الرَّابِع: أَن العَبْد قد ينعم ويمتع فِي الدُّنْيَا بِمَا أنعم الله بِهِ عَلَيْهِ مِمَّا يسْتَحق بإزائه أَضْعَاف ذَلِك الْعَمَل إِذا طلبت المعادلة والمقابلة، وَإِذا كَانَ كَذَلِك لم يبالغوا فِي الاِجْتِهَاد مُبَالغَة من يضرّهُ الاِجْتِهَاد ... وَزَالَ عَنْهُم الْعجب وشهدوا إِحْسَان الله بِالْعَمَلِ.

الْخَامِس: أَن الْعباد لَا بُد لَهُم من سيئات، وَلَا بُد فِي حياتهم من تَقْصِير، فلولا عَفْو الله لَهُم عَن السَّيِّئَات وتقبله أحسن مَا عمِلُوا؛ لما استحقوا ثَوابًا، وَلِهَذَا قَالَ ﷺ: «مَنْ نُوقِشَ الْحِسَابَ

عُذِّبَ»[(١)] ... فَلَو ناقشه على عمله لما اسْتحق بِهِ الْجَزَاء، قَالَ الله تَعَالَى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنۡهُمۡ أَحۡسَنَ مَا عَمِلُواْ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمۡ فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَنَّةِۖ﴾ [الأحقاف: ١٦][(٢)].

واتە: ئەو فەرموودەیە ئەوە دەرەوێنێتەوە کە خەڵکان وا دەزانن پاداشتەکان لە بەرامبەر کردەوەکانیاندایە، لەبەر ئەم هۆکارانە:

**یەکەم:** خوا پێویستی بە کردەوەی بەندەکان نییە تا بەهۆی کارەکانیانەوە پاداشتیان باتەوە، وەکوو چۆن خۆیان پێویستیان بە یەکتر هەیە، بەڵکوو بەندەکان کار بۆ خۆیان دەکەن.

**دووەم:** خوا خۆی بۆخۆی خاوەنی هەموو نیعمەت و منەتەکانە لە هێنانەدی و ژیان و ڕۆزی و ناردنی پێغەمبەران و بەرنامەکەی و لەگەڵ کاربۆئاسانکردن بۆ چوونە ناو کاری خێر لە ئیمان و خۆشەویستی بۆی و بێزاندنی بێبڕوایی و تاوان.

**سێیەم:** هەرچەندە کردەوەی بەندەکەی زۆر و بەها بێت ناگاتە پاداشتەکانی خوا، تا بڵێین پاداشت لەبریتی کردەوەکانیەتی.

**چوارەم:** بەندەکانی ئەوەندە نیعمەتە زۆرەکانی خوایان بەسەرەوەیە بە چەندەها قاتە، خۆ ئەگەر داوای کاریان لێبکرێت لە بەرامبەریدا نایەتە دی، کەواتە هەوڵ و کۆششەکان هیچ بەرامبەری و هاوسەنگییەکیان پێناکرێت، بۆیە لەم کاتەدا بەندەکانی ئەو هەستەیان نامێنێت کە کار و کردەوەی زۆر دەکەن و خۆیان بە کامڵ دەزانن، بەڵکوو ئەوەی دەیبینن چاکە و پلەوپایەی خواییە بەسەریانەوە لە کارکردن و گرتنەبەری ئەو ڕێگایەدا.

**پێنجەم:** بەندەکانی بە بێگومان لەخۆگری کەمتەرخەمی و تاوانن، خۆ ئەگەر لێبوردنی خوایی لەسەر تاوانەکان و لە لایەکی تریشەوە وەرگرتنی کردەوە چاکەکان نەبێت؛ ئەوا شایستەی ئەو پاداشتە نەدەبوون، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەوەی لەکاتی لێپێچینەوەدا دەمەقاڵێ و چەند و چۆنی بکات سزا دەدرێت، وە خوای گەورەش دەفەرموێت: ئەوانەی کە کردەوە چاکەکانیان لێوەردەگرین و لە خراپەکانیان دەبوورین و دانیشتوانی بەهەشتن.

---

(١) رواه البخاري (٦٥٣٦)، وأبو داود (٣٠٩٣)، وأحمد في "المسند" (٢٤٩٥٨)، والبزار في "المسند" (١٩٣)، والبيهقي في "الشعب" (٢٦٥).

(٢) "جامع الرسائل" لابن تيمية (١/ ١٤٧ - ١٥٠).

❁ بەڵگەی سێیەمیان: قال الله تعالى: ﴿إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١١٨﴾ [المائدة: ١١٨].

واتە: (عیسی) عليه السلام فەرمووی: ئەی پەروەردگار گەر سزایان بدەیت ئەوا بەندەی خۆتن، وە گەر لێیان خۆشبیت ئەوا تۆ باڵادەست و دانایت.

**جەبەرییەکان و ئەشعەرییەکان دەڵێن: واتە گەر سزایان بدات ئەوا کرداری خوایە لە موڵکی خۆیدا، ستەمی نەکردووە، بۆیە ستەم بریتییە لە کارکردن لە موڵکی بێجگە لە خۆتدا، وە ستەم بۆ خوا نەبووە و نابێت (مستحيل)[1].**

**دەڵێن: بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە فەرمووی: گەر سزایان بدەیت ئەوا بەندەی خۆتن (عبادك)، نەیفەرموو لەبەرئەوەی تاوانبارن (عصوك).**

**(ابن القيم)** رَحِمَهُ اللهُ **دەڵێت:** وَأما قَوْله "فإنهم عِبَادك" فَلَيْسَ المُرَاد بِهِ أَنَّك قَادر عَلَيْهِم، مَالك لَهُم، وَأي مدح فِي هَذَا ... بل فِي ضمن ذَلِك الْأَخْبَار بغاية الْعدْل، وَأَنه تَعَالَى إن عذبهم فإنهم عباده الَّذين أنعم عَلَيْهِم بإيجادهم وخلقهم ورزقهم وإحسانه إِلَيْهِم، لَا بوسيلة مِنْهُم وَلَا فِي مُقَابلَة بذل بذلوه ... لم يعذبهم إِلَّا بجرمهم واستحقاقهم وظلمهم ... وَفِيه أَيْضا أمر آخر ... وَهُوَ أَن كَونهم عباده يَقْتَضِي عِبَادَته وَحده وتعظيمه واجلاله ... فَإِذا كفرُوا بِهِ أقبح الْكفْر وأشركوا بِهِ أعظم الشّرك ونسبوه إِلَى كل نقيصة ... كَانُوا أَحَق عباده وأولاهم بِالْعَذَابِ[2].

**واتە: مەبەست لەم ئایەتە ئەوە نییە کە ئەمانە بەندەی تۆن و تۆش باڵادەستی بەسەریاندا و خاوەنیانیت، جا ئەمە چ وەسفێکی تێدایە؟ (واتە ئەمە خۆی لەخۆیدا هەر وایە، بێجگە لەمە نییە)، بەڵکوو مەبەست پێی هەواڵدانە بە ئەوپەڕی دادپەروەری، بەوەی گەر پەروەردگار سزایان بدات ئەوە بە هۆکاری ئەوەوەیە کە بەندەی خۆین و دروستی کردوون و ڕۆزی داون و هەموو کارێکی چاك و پێویستی بۆ ئەنجام داون، ئەمانەی لەگەڵدا کردوون بەبێ هیچ هۆکارێکی خۆیان و هیچ کردارێك کە لە ئاست و بەرامبەریدا بێت، وە گەر سزایان بدات بە هۆکاری کەمتەرخەمی و**

(١) ينظر "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ٣٧٩)، و "مفتاح دار السعادة" لابن القيم (٢/ ٤٥٩).

(٢) "مفتاح دار السعادة" لابن القيم (٢/ ١٠٩).

تاوان و هەڵەکانیانەوەیە، وە دەشێت ئەم ئایەتە مەبەستێکی تریشی تێدابێت، لەبەرئەوەی بۆ گاوورەکان هاتووەتە خوارەوە کاتێك (عیسى) و (مریم)ی دایکیان کردووە بە خوا لەگەڵ خوادا، بۆیە گەر ئەو خەڵکانە سزا بدات لەبەر ئەو هۆکارەیە کە ئەوانە بەندەی خوان و پێویستە لەسەریان خوا بپەرستن و هەموو گەورەیی و تاك و تەنیایی و بێگەردییەك بۆ ئەو بڕیار بدەن، بەڵام کاتێك هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەن و بڕیاری کوڕی خوای بۆ دەدەن؛ ئەوا ئەوانە لە هەموو کەس لەپێشترن کە سزا بدرێن.

**٢. قەدەرییەکان و موعتەزیلەکان (القدرية - المعتزلة):**

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: الْقَدَرِيَّة النفاة الَّذين يجعلونه مُسْتقِلّا بِفِعْلِهِ، وَلَا يدْخل فعله تَحت مَقْدُور الرب تَعَالَى، وَلَا هُوَ وَاقع بِمَشِيئَة الله تَعَالَى وَقدرته، فأثبتوا لَهُ فعلًا وكسبًا واختيارًا حَقِيقَة[١].

واتە: (قەدەرییەکان) ئەوانەن کە باوەڕیان وایە بەندەکان سەربەخۆن لە کارەکانیاندا و هیچ لە کردارەکانیان ناچێتە ژێر باری توانا و دەسەڵاتی خواوە، بەڵکوو لەژێر ویست و ئیرادەی خواشدا نییە، خۆیان خاوەنی کاری ڕاست و دروستی خۆیانن و سەربەخۆن لە هەموو کردارێکی خۆیاندا.

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَقَالَ الْقَدَرِيَّةُ: الظُّلْمُ إِضْرَارٌ غَيْرُ مُسْتَحَقٍّ، أَوْ عُقُوبَةُ الْعَبْدِ عَلَى مَا لَيْسَ مِنْ فِعْلِهِ، أَوْ عُقُوبَتُهُ عَلَى مَا هُوَ مَفْعُولٌ مِنْهُ وَنَحْوَ ذَلِكَ[٢].

واتە: قەدەرییەکان دەڵێن: ستەمکردن (الظلم) بریتییە لە زیانێك کە خاوەنەکەی شاییستە نەبێت، یاخود سزادانی بەندەیەك لەسەر کارێك کە کاری ئەو نەبێت، یاخود سزای کەسێك بدرێت کە بەبێ ئیرادەی خۆی کەوتبێتە ستەمەوە، ئەم بۆچوونەش هۆکاری ئەوەیە کە دەڵێن خوا نابێت و ناشتوانێت ستەم بکات، وە ویستی تاوان و خراپەی نییە، ئادەمیزاد خۆی کاری خۆی دروست دەکات.

---

(١) "مفتاح دار السعادة" لابن القيم (٢/ ٢٤٣).

(٢) "مختصر صواعق المرسلة" ص٢٣١.

**بەم پێناسەیەش دەیانەوێت ئەوە بسەلمێنن کە:** إيجابهم على الله تعالى فعل كل ما هو حسن، وفيه نفع للعبد، وترك كل ما هو قبيح فيه ضرر، مع عدم إخلاله تعالى بهذه الواجبات، وإلا أدى إلى أن يكون سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ ظالمًا غير عادل [(١)].

**واتە: واجبی دەکەن لەسەر خوا بژاردەکردن و هێنانەدی هەموو کارێکی باش و سوودمەند بۆ بەندەکانی، لەگەڵ نەهێنانەدی هەموو کارێکی زیانبەخش و نەشیاو بۆیان، وە بەردەوامبوونیەتی خوا لەسەر ئەم سیفەتانە، تاوەکوو (عدالة)ی خوا بەردەوام بێت، وە گەرنا دەبێتە هۆکاری ستەمکردن لەلایەن خواوە بۆ بەندەکانی، ئەم تێڕوانینەش پێی دەوترێت (واجب الفعل الأصلح).**

**هۆکاری ئەم تێڕوانینەش (ابن القيم)** رَحِمَهُ اللَّهُ **باسی دەکات کە دەڵێت:** أَن الظُّلم الَّذِي حرمه وتنزه عَن فعله وارادته هُوَ نَظِير الظُّلم من الْآدَمِيّين بَعضهم لبَعض وشبهوه فِي الْأَفْعَال مَا يحسن مِنْهُمَا وَمَا لَا يحسن بعباده ... وصاروا بذلك مشبهة ممثلة فِي الْأَفْعَال فامتنعوا من إِثْبَات الْمثل الْأَعْلَى الَّذِي أثْبته لنَفسِهِ ثمَّ ضربوا لَهُ الْأَمْثَال ومثلوه فِي أَفعاله بخلقه ... قَالُوا ... إِذا أَمر العَبْد وَلم يعنه بِجَمِيع مقدوره ... كَانَ ظَالِما لَهُ والتزموا لذَلِك أَنه لَا يقدر أَن يهدي ضَالًّا كَمَا قَالُوا أَنه لَا يقدر أَن يضل مهتديا ... إِذا أَمر اثْنَيْنِ بِأَمْر وَاحِد وَخص أَحدهمَا بإعانته ... كَانَ ظَالِما ... [(٢)].

**واتە: پێناسەی قەدەرییەکان بۆ ستەمکردن دەڵێن: ئەو ستەمەی کە خوا حەرامی کردووە لە خۆی و خۆی بێگەرد دەکات لە ویستی و کارپێکردنی؛ هاوشێوەی ئەو ستەمەیە کە لە نێوان ئادەمیزاددا هەیە، کە بەبێ هۆکار و خوێندنەوە و ڕێژە و زانینی تاوانەکە ستەم لە یەکتری دەکەن، ئیتر ئەو جیاوازییە ناکەن کە (خالق) هەیەتی بەسەر (مخلوق)دا لە (العلم، الخبير، اللطيف، الحكيم، ...)، وە ئادەمیزاد خاوەنی ئەم سیفەتانە نییە.**

**بۆیە ئەنجامەکەی بەهاوشێوە و وێنەکردنی سیفات و کارەکانی خوایە بە سیفات و کارەکانی ئادەمیزادەوە، چی لای ئادەمیزاد باشبێت لای خواش باشە و چیش باش نەبێت لای خوا باش نییە.**

---

(١) "الشبهات النقلية لمخالفي أهل السنة والجماعة في مسائل القدر" لدكتورة هند بنت دخيل الله بن وصل القثامي ص٢٣١.

(٢) "مفتاح دار السعادة" لابن القيم (٢/ ١٠٦).

بەم هۆکارەوە (معتزلة)کان کەوتوونەتە دوو کاری دژبەیەك لە بەرنامەیاندا، ئەویش: شوبهاندنی کارەکانی پەروەردگار بە بەندەکانیەوە (مشبهة الأفعال)، وە لەکارخستن و باوەڕنەبوون بە سیفاتەکانی خوا (معطلة الصفات)، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە بنەمایە لایان کە (خالق) بە هەموو شتێکەوە جیاوازە لە (مخلوق).

بۆیە تەنانەت لەم باسەدا لە بواری ستەمدا لێکدانەوەیان بە هاوشێوە و هەمان لێکدانەوەی ئادەمیزادە، کە دەڵێن: گەر خوا فەرمان بە بەندەکانی بکات و یارمەتییان نەدات ئەوە ستەمە، وە گەر دوو تاوانبار یەکێکیان بەر لێبوردن بخات و ئەویتریان تۆڵەی لێبکاتەوە ستەمە، وە بەهەمان شێوە گەر فەرمان بە دووان بکات و یارمەتی یەکێکیان بدات و یارمەتی ئەویتریان نەدات ستەمە.

لای ئەمان بەندەکان خۆیان کاری خۆیان دروست دەکەن و خوا دروستی ناکات، بگرە لەژێر ویست و ئیرادە (المشیئة والإرادة)ی خواشدا نییە.

(ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: بَلْ قَالُوا: يَشَاءُ مَا لَا يَكُونُ، وَيَكُونُ مَا لَا يَشَاءُ، ثُمَّ إِنَّهُمْ وَضَعُوا لِرَبِّهِمْ شَرِيعَةً فِيمَا يَجِبُ عَلَيْهِ، وَيَحْرُمُ بِالْقِيَاسِ عَلَى أَنْفُسِهِمْ ... الَّذِي شَبَّهُوا فِيهِ الْخَالِقَ بِالْمَخْلُوقِ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا[1].

وە (ابن القیم)یش رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: أَجْمَعَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى أَنَّهُ مَا شَاءَ اللهُ كَانَ وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ، وَلَمْ يُخَالِفْ فِي ذَلِكَ إِلَّا الْقَدَرِيَّةُ الْمَجُوسِيَّةُ، الَّذِينَ يَقُولُونَ: يَشَاءُ مَا لَا يَكُونُ، وَيَكُونُ مَا لَا يَشَاءُ[2].

واتە: دەڵێن: دەشێت لە کەوندا ویستی خوا لەسەر کار و بوونێك هەبێت، بەڵام کار و بوونەکە نەبێت، وە بە پێچەوانەشەوە کار و بوونەکە هەبێت بەڵام ویستی خوای لەسەر نەبێت، ئەمانە بەرنامە و شەریعەتێکیان بۆ خوا داناوە بەوەی کە هەندێ کار واجبە بیکات و هەندێك حەرام و قەدەغەیە بیکات، دانانی ئەم یاسایەشیان بە هۆکاری تێڕوانین و بەهاوشێوەکردنی کارەکانی ئادەمیزادەوە داڕشتووە، کە بۆخۆی بەهاوشێوەکردن و شوبهاندنی خوایە بە بەندەکانیەوە، ئەمەش بووە هۆکاری گومڕاییان و گومڕاکردنی خەڵکیش.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٧/ ١٠٠).

(٢) "مدارج السالكين" لابن القيم (١/ ٢٦٦).

ئەمانە دەربارەی ستەم دەڵێن: إنَّ الله تعالى يوصف بالقدرة على ما لو فعله لكان ظلماً وكذباً، وإن كان تعالى لا يفعل ذلك لعلمه بقبحه، وباستغنائه عن فعله، ... وهذا مذهب أكثر المعتزلة ... ومنهم يقولون: إن وصف الله تعالى بالقدرة على الظلم محالٌ؛ لأن ذلك يوجب النقص والحاجة وذلك يستحيل عليه تعالى[(١)].

واتە: زۆری موعتەزیلەکان دەڵێن: خوا خاوەن توانایە بەسەر ستەمکردندا، ئەگەرچی هەندێك کار هەیە بیکات دەبێتە ستەم و درۆ، بەڵام نایکات لەبەر زانستی خوای گەورە بەسەر خراپی و ناپێویستی ئەو کارە (واتە دەتوانێت بەڵام نابێت بیکات)، وە هەندێکیان دەڵێن: وەسفکردنی خوا بەوەی کە دەتوانێت ستەم بکات هەڵەیە و ئەستەمە شتی وا، لەبەرئەوەی ئەگەر وابێت ئەوا لە پێویستی و ناتەواوی خوا خۆیدایە بۆ ئەو ستەمکردنە کە دەیکات، ئەمەش بۆخۆی ئەستەمە و شایستە نییە بە خواوە.

## بە کورتی لای ئەمان بە دوو بەڵگەی عەقڵی دەیسەلمێنن کە خوا ستەم ناکات:

١. کۆدەنگی (الإجماع) لەسەر ئەوەیە کە خوا ستەم ناکات.

٢. ئەگەر خوا دروستکاری کردەوەکانی ئادەمیزاد بێت پاشان سزایان بدات لەسەر ئەوەی کە ستەمیان کردووە؛ ئەوا دەبێت خوا ستەم بکات و دروستکاری ستەم بووبێت.

بەڵام بەڵگەکانی قورئان و فەرمووده سەلماندوویانە کە خوای گەورە عَزَّوَجَلَّ ستەم ناکات و بگرە وادەی ستەم نەکردنیشی داوە، ئیتر چ پێویست بەو دوو بەڵگە عەقڵییە دەکات؟ وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَمَاظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنۡ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿١١٧﴾﴾ [آل عمران: ١١٧].

واتە: خوا ستەمیان لێناکات، بەڵکوو خۆیان ستەم لە خۆیان دەکەن، کەواتە ئادەمیزاد خۆیان کردەوەکانی خۆیان دروست دەکەن، نەك خوا دروستی کردبێت.

وە دەفەرموێت: ﴿ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّامٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾﴾ [آل عمران: ١٨٢].

واتە: بەهۆی کردەوەکانی خۆیانەوە تووشی سزا بوون، خوای گەورە ستەمکار نییە بەرامبەر

(١) "القضاء والقدر في ضوء الكتاب والسنة ومذاهب الناس فيه" لدكتور عبد الرحمن بن صالح المحمود ص٢٨٢.

بەندەكانی.

وە ئەم ئایەتانەش دیسان نابنەوە بە بەڵگە بۆیان، لەبەرئەوەی مەبەست تیایاندا ئەوەیە كە خوا دادپەروەرە، وە ستەم ناكات و سزای بەندەكانی نادات بەبێ هۆكار، نەك خۆیان خاوەنی كردەوەی خۆیان بن و خوا دەسەڵاتی نەبێت، وەكوو (الشنقیطي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: أَنَّهُ لَا يَظْلِمُ أَحَدًا، فَلَا يَنْقُصُ مِنْ حَسَنَاتِ مُحْسِنٍ، وَلَا يَزِيدُ مِنْ سَيِّئَاتِ مُسِيءٍ، وَلَا يُعَاقِبُ عَلَى غَيْرِ ذَنْبٍ[1].

واتە: خوا ستەم لە كەس ناكات، بۆیە چاكەی كەس كەم ناكاتەوە، وە خراپەی كەسیش زیاد ناكات، وە كەسیش بەبێ هۆ سزا نادات.

**ئەهلی سوننەت بیروڕایان لەم بارەیەوە وایە كە ستەم (الظلم):** دانانی شتێكە كە لە جێگەی خۆیدا نەبێت، لە بەرامبەری ستەمیش دادپەروەرییە (العدل)، كە ئەمیش دانانی هەموو كارێكە لە شوێنی خۆیدا، بۆیە خوای پەروەردگار ستەم ناكات لەگەڵ هەبوونی توانای بەسەریدا، نەكردنی ستەمە نەوەك نەتوانینی، لەبەرئەوەی حەرام و قەدەغەی كردووە لەسەر خۆی، وە بێگەردە لەو لایەنەوە، وە شایستەی وەسف و بەگەورە ڕاگرتنە، وە خاوەنی بەخشندەیی و چاكە و لێبوردنە (الجود والكرم والإحسان)، بۆیە وەسف و بێگەردكرنی خۆی باس دەكات لە نەكردنی ستەمدا، وە خاوەنی سیفەتەكانی (الخلق والعلم والخبير واللطيف والحكيم والرؤوف ...)ە لەگەڵ دروستكراوەكانیدا (المخلوقات).

وە هۆكارەكانی ستەمكردنیش وەكوو (ابن القیم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: فَإِنَّ الظُّلْمَ سَبَبُهُ حَاجَةُ الظَّالِمِ، أَوْ جَهْلُهُ، أَوْ سَفَهُهُ[2].

واتە: هۆكاری ستەمكردن دەگەڕێتەوە بۆ:

**یەكەم: پێویستی و ناتەواوی (الحاجة والفقر):** لە كاتێكدا خوای پەروەردگار خاوەنی هەموو بوونەوەرەكانی ئاسمان و زەوییە، نە پێویستی پێیەتی و نە ناتەواوە تاوەكوو بیكات، بەڵكوو ستاییشكراوە، وەكوو دەفەرموێت: ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ٦٤﴾ [الحج: ٦٤].

(١) "أضواء البيان" للشنقيطي (٣/ ٢٨٩).

(٢) "زاد المعاد" لابن القيم (٤/ ١٩٠).

واتە: خوا خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشە کە لە ناویاندایە و دەوڵەمەندە و بێ نیاز و بێ پێویستە و شایستەی ستاییشە.

**دووەم: نەزانین و تێکچوویی (الجهل والسفه):** لە کاتێکدا خوای پەروەردگار لەم سیفەتانەی ئادەمیزاد بێگەردە، وە خوا زانایە بەسەر نهێنییەکانی بوونەوەردا، وە خاوەن زانستی تەواوە بەسەر دیار و نادیارەکاندا، وەکوو دەفەرموێت: ﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٧٨﴾ ﴾ [التوبة: ٧٨].

واتە: ئەوە نازانی کە خوا زانایە بەسەر نهێنییەکان و چپەکردنەکانتاندا، وە خوا خاوەن زانستە بەسەر نادیارەکاندا.

لە ئەنجامی تێڕوانینی ئەم بەشەدا ڕوون بووەوە کە خوای پەروەردگار بە هیچ شێوەیەك ستەم و بەزۆرپێکردنی نییە بۆ بەندەکانی و جێگەی نابێتەوە لە دادپەروەری و گەورەیی و بێ پێویستی خۆیدا بۆی، وە ئەگەر قەدەری شەرعیش کە بەرنامەکەیەتی هیچ جۆرە ستەمێك لە یاسا و شەرعەکەیدا نەبێت؛ ئەوا قەدەری کەونیش بە هەمان شێوە لە بەڕێوەبردنی (مخلوقات)دا هیچ جۆرە کار و فەرمانێکی ستەم و هەڵە بوونی نییە، ئەگەر دەرکیش نەکرێت بە ووردەکارییەکانی، لەبەرئەوەی کارەکان و یاساکانی هەمووی پڕن لە حیکمەت و دانایی و ڕەچاوکردنی هۆکارە ئاشکرا و نهێنییەکانی وەك لەم بابەتەی دوای ئەمەدا ڕوون دەبێتەوە زیاتر.

  

# بـابەتـی سـێـیـەم

## دانایی و هۆکارەکان لە کارەکانی پەروەردگاردا
## (الحكمة والتعليل في أفعال الله تعالى)

خوای پەروەردگار گەر بەشێك لە ناوەکانی بریتیبێت لە خاوەن زانایی و دانایی و ووردەکاری و بەسۆز و بەزەیی بۆ بەندەکانی، وەکوو خۆی دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ [الحج : ٨٣، ١٠٠]، ﴿وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ﴾ [الأنعام : ١٨، ٧٣]، [سبأ : ١]، ﴿وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ﴾ [الأنعام : ١٠٣]، [الملك : ١٤]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٤٣﴾ [البقرة : ١٤٣]، [الحج : ٦٥] ... ئەوا گومان نییە لە تەواوی و تێروپڕی و بێ کەموکورتی کارەکانی، لەبەرئەوەی خۆی بێ هیچ کەموکورتی و ناتەواوییەکە، گەر خۆی خاوەن و بەخشەری سیفەتە کاملەکان بێت بە بەندەکانی؛ ئەوا خۆی لەپێشترە کە کاملترینی سیفەتەکانی هەبێت و خاوەنیان بێت، وە کارەکانیشی بە هەمان شێوە ڕەنگدانەوەی ئەو تەواوی و بێ کەموکورتییەیە.

خوای گەورە عَزَّوَجَلَّ دروستکار و خاوەنی هەموو بوونەوەرەکانە و پەروەردگاریانە، لە دروستکردنیاندا داناییەکی بێ ئەندازەی هەیە و بەخشەری هەموو نیعمەتە گشتی و تایبەتییەکانە، بۆیە پرسیار و لێکۆڵینەوە لە کارەکانی ناکرێت، وەکوو خۆی دەفەرموێت: ﴿لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ ٢٣﴾ [الأنبياء : ٢٣]. نەك لەبەر باڵادەستی و توانایی خوا کە نابێت پرسیار لە کارەکانی بکرێت، بەڵکوو لەبەر کامڵی زانست و دانایی و بەزەیی و دروستکاری بێوێنەی خۆی، وەکوو خۆی دەفەرموێت: ﴿صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍ﴾ [النمل : ٨٨]، وە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ٥٠﴾ [طه : ٥٠]، وە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ﴾ [السجدة : ٧]، وە دەفەرموێت: ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ١٤﴾ [المؤمنون : ١٤]، هەر پەروەردگارە خاوەن (مخلوقات)ێکی پڕ و تەواو لە ووردەکاری و مافپێدان و ڕازاوە و بێ کەم و کورتییە[(١)].

---

(١) "المسائل والأجوبة" لابن تيمية ص١١٥، و"مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ٣٥١).

**ئەگەر ئەمە (القدر الكوني)یەکەی بێت، ئەوا (القدر الشرعي)یەکەشی وەکوو (ابن القیم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت:** وعلى أمره وكله حكمة ورحمة وعدل ومصلحة، وعلى نهيه وكل ما نهي عنه شر وفساد، وعلى ثوابه وكله رحمة وإحسان، وعلى عقابه وكله عدل وحق، فله الحمد كله وله الملك كله وبيده الخير كله وإليه يرجع الأمر كله(١).

**واتە: فەرمانەکانیشی (القدر الشرعي) هەمووی دانایی و بەزەیی و دادپەروەری و سوودمەندییە، وە هەموو قەدەغەکراوەکانی خراپە و تێکدانە، وە پاداشتەکانی هەمووی چاکە و بەزەییە، وە سزاکانی هەمووی دادپەروەری و ماف گەڕاندنەوەیە، کەواتە هەموو سوپاس و ستاییشەکان شاییستە بەوە و خاوەنی هەموو بوونەوەران و خێر و کارەکانە.**

**ئەگەرچی پرسیار ناکرێت و دەرك ناکرێت بە دانایی و حیکمەتەکانی خوا لە کارەکانیدا، لەبەرئەوەی خوای پەروەردگار دەفەرموێت:** ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ﴾ [الأنعام : ١١٥]، فَمَا أَخْبَرَ بِهِ فَهُوَ صِدْقٌ وَمَا أَمَرَ بِهِ فَهُوَ عَدْلٌ(٢): **واتە هەموو هەواڵەکانی ڕاستە و هەموو فەرمانەکانی دادپەروەرییە، وە دەفەرموێت:** ﴿أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ﴾ [الأعراف : ٥٤]، فالخلق: يتضمن أحكامه الكونية القدرية، والأمر: يتضمن أحكامه الدينية الشرعية(٣): **واتە هەر خوای پەروەردگار خاوەنی هەموو دروستکراوەکانی کەون و بوونەوەرە و هەر ئەو خاوەنی فەرمان و یاسا پڕ دادپەروەرییەکانە.**

**بۆیە گەر خوای پەروەردگار خاوەن و بەخشەری داناییەکان بێت؛ ئەوا خۆی لەپێشترە کە خاوەنی هەموو حیکمەت و داناییە تەواو و کامڵەکان بێت، وەکوو دەفەرموێت:** ﴿وَأَنزَلَ اللَّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ [النساء : ١١٣]، **وە دەفەرموێت:** ﴿وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ [البقرة : ٢٦٩]، **واتە هەرکەس دانایی پێببەخشرێت؛ ئەوا خێرێکی زۆری پێبەخشراوە، کەواتە دەبێت کارەکانی پەروەردگار بێ ناتەواوی و کەموکورتی بێت لە داناییدا.**

(١) "مدارج السالكين" لابن القيم (١/ ٢٦٦).
(٢) "مختصر الصواعق المرسلة" ص١٦٨.
(٣) "تفسير السعدي" ص٢٩١.

**ئەم داناییەی پەروەردگاریش دوو جۆرە:** حِكْمَةٌ تَعُودُ إِلَيْهِ يُحِبُّهَا وَيَرْضَاهَا، وَحِكْمَةٌ تَعُودُ إِلَى عِبَادِهِ هِيَ نِعْمَةٌ عَلَيْهِمْ يَفْرَحُونَ بِهَا وَيَلْتَذُّونَ بِهَا[1].

واته: هەموو ئەوانەی کە خوا دروستی کردوون داناییەکی خۆی تێدایە، جا ئەو هۆکار و داناییە بۆ دوو شت دەگەڕێتەوە: یەکێکیان بۆ خۆی دەگەڕێتەوە کە پێی خۆشە و پێی ڕازییە، بۆ دەرکەوتنی خوایەتی خۆی لە (التوحيد) و عیبادەتەکاندا، ئەویتریشیان بۆ بەندەکانی دەگەڕێتەوە کە مایەی پێخۆشحاڵی و سوودمەندییەکانیانە.

**❁ ئەو بەڵگانەشی کە باس لە بوونی دانایی پەروەردگار دەکات لەم شێوە داڕشتنە قورئانیانەدا بەدیدەکرێت:**

**١. بە ئاماژەکردنی بە وشەی (الحكمة):** قَالَ تَعَالَى: ﴿وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ [البَقَرَة: ٢٦٩]، قَالَ تَعَالَى: ﴿حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ﴾ [القَمَر: ٥]. هەر خوا خاوەنی داناییە و هەر ئەویش دەیبەخشێت، وە ئەوەی دانایی پێ ببەخشرێت ئەوە خێرێکی گەورەی پێ بەخشراوە.

**٢. هەواڵدان بەوەی کە ئەو کارە دەکات لەبەر ئەو کارە، یاخود فەرمانی داوە بە کردنی کارێك لەبەر کارێك:** قَالَ تَعَالَى: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ [الطَّلَاق: ١٢]. واته: ئەو خوایەی کە حەوت تەبەقەی ئاسمانی دروستکردووە و هەر بەو شێوەیەش زەوی دروستکردووە، تاوەکوو بزانن کە خوای پەروەردگار باڵادەستە بەسەر هەموو شتێکدا. قَالَ تَعَالَى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآئِ ذِي ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾﴾ [النَّحل: ٩٠]. واته: خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەری و چاکە و پەیوەندی خزمایەتی، وە ڕێگری لە تاوان و خراپە و ستەم دەکات، ئامۆژگاریتان دەکاتی تاوەکوو بیرتان بکەوێتەوە، دانایی خوا فەرمان و پەیوەستکردنی ئەو کارانەیە بە زنجیرەیی بەدوای یەکەوە.

**٣. بەکارهێنانی پیتی (كي):** قَالَ تَعَالَى: ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٥ – ٣٧)، و "طريق الهجرتين" لابن القيم ص٩٥.

ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ﴾ [الحشر: ٧]. واتە: ئەو دەستکەوتانەی کە بەبێ شەڕ دەستدەکەوێت ئەم ئایەتە دەیکاتە پێنج بەشەوە، تاوەکوو نەبێتە موڵکی تایبەت بەدەست بەهێز و دەوڵەمەندەکانەوە، ئەمە حیکمەت و هۆکاری دابەشکردنەکەیە.

**٤. بەکارهێنانی کاربۆکراوەکان (مفعول له) کە نیشانەی هۆکاری کارەکەیە:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾﴾ [النحل: ٨٩]. واتە: ئەم قورئانەمان بۆیە ناردووەتە خوارەوە تاوەکوو شیکەرەوە و ڕوونکەرەوە بێت بۆ هەموو شتێك، وە مایەی هیدایەت و بەزەیی و مژدە بێت بۆ موسوڵمانان، ئەمە مەبەست و هۆکارە لە ناردنی قورئان.

**٥. بەکارهێنانی وشەی (من أجل) واتە لەپێناوی:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا﴾ [المائدة: ٣٢]. واتە: بە هۆکاری کوشتنی بە ناحەق؛ وامان دەربڕیوە و داناوە کە هەرکەس کەسێك بکوژێت بە ناحەق وەکوو ئەوە وایە هەموو خەڵکی کوشتبێت ... .

**٦. بەکارهێنانی وشەی (لعل) واتە بە هیوای ئەوەی:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾﴾ [البقرة: ٢١]. واتە: ئەی خەڵکینە ئەو خوایە بپەرستن کە دروستی کردوون، تا ببێتە هۆکار و هیوای پاراستنتان لە ئاگر.

**٧. ڕوونکردنەوەی هۆکارێك بۆ نەهاتنەدی قەدەرێکی کەونی یاخود شەرعی لەبەر ڕێگرییەك:**

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ [الشورى: ٢٧]. واتە: ئەگەر خوا ڕۆزی بەشێوەیەکی فراوان بنێرێت بۆ خەڵکی ئەوا یاخی دەبن، بۆیە بەگوێرەی پێویست دەینێرێت.

**٨. بەرپەرچدانەوەی ئەو گومانانەی کە دەڵێن خوا بەبێ هیچ مەبەست و هۆکار و داناییەك دروستکراوەکانی دروستکردووە:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾﴾ [القيامة: ٣٦]. واتە: ئەوە ئادەمیزاد وا گومان دەبات کە هیچی لەسەر نییە لە فەرمان و ڕێگری و پاداشت و سزا؟.

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾﴾ [المؤمنون: ١١٥]. واتە: وا گومان دەبەن کە ئێوەمان بۆ گاڵتە دروستکردبێت و ناگەڕێنەوە بۆ لامان؟.

**٩. بەرپەرچدانەوەی ئەوانەی وا گومان دەبەن کە جیاوازەکان وەکوو یەك سەیردەکرێن، یاخود هاوشێوەکان وەکوو یەك پێوانە ناکرێن:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾﴾ [القلم: ٣٥]. واتە: ئایا ئیمانداران وەکوو تاوانباران سەیردەکرێن؟. قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ﴾ [التوبة: ٧١]، قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُم مِّن بَعْضٍ﴾ [التوبة: ٦٧]. واتە: ئیمانداران هاوشێوە و کاربەڕێوەبەری یەکن، وە هەروەها دووڕووەکانیش هاوشێوە و لێکچووی یەکن[١].

ئەمانە و چەند جۆرێکی تریش لە دارِشتنەکانی قورئان ئاماژە و سەلمێنەرن بۆ ڕەچاوکردن و خوێندنەوەی هۆکار و دانایی و مەبەست لە هێنانەدی هەندێ کار بەسەر هەندێکی تردا.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو دروستکراو و فەرمانێکی خوا لە (القدر الكوني والقدر الشرعي) پڕە لە دانایی و هۆکار و مەبەست و هێنانەدی سوودمەندییەك، یاخود لابردنی خراپەیەکە بۆ بەندەکانی، وە لەلایەکی تریشەوە هێنانەدی ئەو کارانەیە کە مایەی پێخۆشبوون و ڕازیبوونی خۆیەتی، لەبەرئەوە ﴿صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ [النمل: ٨٨]. دروستکراوەکانی خوا هەمووی لە شوێنی خۆیەتی و پڕە لە وردەکاری پێویست، بۆیە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا﴾ [المائدة: ٥٠]. چ یاسایەك لە یاساکانی خوا چاکترە؟ وە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثًا﴾ [النساء: ٨٧]. چ وتەیەك هەیە لە وتەی خوا ڕاستتر بێت؟ وە دەفەرموێت: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾ [الفرقان: ٢]. هەموو دروستکراوێکی بە ئەندازە و پێویست دروستکردووە، وە دەفەرموێت: ﴿وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا﴾ [الأحزاب: ٣٨]. فەرمانەکانی خوا دانراوە و دیاریکراوە و دەبێت بێتە دی، وە دەفەرموێت: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ﴾ [الأنعام: ١١٥]. وشە و فەرموودەکانی خوا هەمووی لەخۆگری ڕاستی و دادپەروەرییە.

---

(١) بۆ زیاتر لەو ڕێگایانە بڕوانە "شفاء العليل" لابن القيم ص٤٨٣ – ٥٢٢.

بێگومانین لەوەی كە حیكمەتەكانی پەروەردگار پەیوەستە بە زانست و دەسەڵاتەوە (العلم والقدرة)، بۆیە تاوەكوو دەسەڵات و زانست تێروپڕ و كاملتر بێت حیكمەتەكانیشی بەگوێرەی دەسەڵات و زانستەكەی كامڵ و بێ كەموكورتی دەبێت، وە خوای پەروەردگاریش هیچ بوونێك هاوشێوەی نییە لە زاتی و ناو و سیفات و كارەكانیدا، بۆیە حیكمەتەكەشی هاوشێوەی حیكمەتی دروستكراوەكانی نییە.

وە گەر دەرك نەكرێت بە دانایی و حیكمەتەكانی لە هەندێك بووندا؛ ئەوا واتای نەبوونی حیكمەت نییە، هەروەكوو بنەمایەكی ئوصولیمان هەیە دەڵێت: (عدم العلم بالشيء لا يستلزم العلم بعدمه)[1]، وە لەلایەكی تریشەوە لە كاملی و بێگەردی خۆی و دانایی پەروەردگار ئەوەیە كە حیكمەتەكانی تا ڕێژەیەكی زۆر شاراوە بێت لە بەندەكانی، خۆ ئەگەر یەكێك لە ئێمە هەموو كارەكانی والا و ئاشكرا بێت و شاراوەیی لە كار و نهێنییەكانیدا نەبێت ئەوا بە كەسێكی نەزان و بێئاگا دەدرێتە قەڵەم، وە گەر دانایی خوا بەدیبكرێت لە هەندێ كاریدا؛ ئەمە دەبێتە بەڵگە بۆ بوونی حیكمەت و ووردەكاری لە هەموو كارەكانی تریدا، وە گەر نەیشیزانن و دەركی پێنەكەن؛ ئەوا هیچ ڕێگەیەك نامێنێتەوە بۆیان بێجگە لە باوەڕبوون و بڕیاردان نەبێت لەسەر بوونی حیكمەتێكی خوایی نادیار تیایدا، بە بوونی متمانە و دڵنیایی لەسەر كارەكانی تری، وەك چۆن گەر لە قسەی زانایەكی پایەبەرز تێنەگەیت ئەوا دوودڵی و گومانت بۆی دروست نابێت، بە هۆكاری بوونی متمانەیەكی زانستی و پێكاندنە زۆر و تەواوەكانی تری، ولله المثل الأعلى.

وە بێگومان بوونی كارە دژەكان لە هەژاری و دەوڵەمەندی و بەهێز و لاواز و سارد و گەرم و شەو و ڕۆژ و پاك و پیس و مردن و ژیان و دەرد و دەرمان ... ئەمانە بەڵگەی تەواوی بوونی حیكمەت و دانایی خوایە تیایاندا، بۆ هاتنەدی بوون و ژیان بۆ دروستكراوەكانی، وە لە لایەنی خواییشەوە بۆ كاركردنی هەموو ناو و سیفاتەكانی پەروەردگار.

گەر هەموو بوونەوەرەكانی وەك یەك و بە یەكسانی دروستبكردایە لە ئیمان و هیدایەتدا، ئەوا زۆری ناو و سیفاتەكانی پەروەردگار لەكاردەكەوتن، هەر لە (الرحيم، الغفور، العفو، العزيز ...)، وە تەنانەت لە سیفاتەكانیشیدا سیفاتی بەرامبەریشی هەیە، وەك (الرضا والسخط، العفو والانتقـام، الحب والبغض)، كەواتە بە بوونی یەكسانی لە بووندا لەكاركەوتنی هەندێك سیفاتیەتی،

---

(١) "الموسوعة الفقهية" لحسين العوايشة (٤/ ٢٢٣).

کەواتە ئەمانە هەمووی بەڵگەن لەسەر بوونی دانایی و حیکمەتی بێسنووری پەروەردگار.

وە لەلایەکی تریشەوە دەبێت هەموو جۆرەکانی پەرستن (العبودیة) کاری پێبکرێت، هەندێك لەوانە (الحمد، الموالاة، المعاداة، الحب والبغض، الجهاد ...)، جا ئەگەر پێویستییەکانی ئەم سیفەتانە نەبێت لە تاوان و بێبڕوایی و دژایەتی؛ ئەوا ئەم جۆرە پەرستنانە لەکاردەکەوتن، کەواتە حیکمەتی خوایی لە بوونی ئەمانەدایە، خۆ ئەگەر دژایەتی فیرعەون و شوێنکەوتووانی و بێبڕوایی گەلی (نوح) و سەرپێچی گەلی (صالح) و (لوط) عليهم السلام نەبوایە؛ ئەوا دەسەڵات و نیشانە گەورەکانی پەروەردگار دەرنەدەکەوتن، وە ترسان و گەڕانەوەی گەلان بۆ لای خوا نەدەبوو.

خوای پەوەردگار خاوەن و دەسەڵاتداری هەموو بوونەوەرەکانە، وە ئەمەش پەیوەستە بە سوپاس و ستاییش و پێزانینەوە (الملك والحمد)، وە کە خاوەنی بوونەوەرەکانیشە ئەوا لە شایستەییدایە کە سوپاس و ستاییش بکرێت، بۆیە ئەمەش هۆکارە بۆ ئەوەی کە سەرەتای دروستکردنی بوونەوەرەکانی کردووەتەوە بە سوپاس و ستاییشی خۆی کە دەفەرموێت: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ [الأنعام: ١]، وە هەر بە سوپاس و ستاییشیش کۆتایی پێدێنێت، وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ وَقِيلَ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٧٥﴾ [الزمر: ٧٥]، وە سەرەتای کتێبەکەشی هەر بە سوپاس و ستاییشی خۆی کردووەتەوە کە دەفەرموێت: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ [الفاتحة]، وە هەموو یاسا شەرعییەکانیشی پێوە گرێداوە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْۚ وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٤٥﴾ [الأنعام: ٤٥]، وە هەموو پاداشت و سزاکانیشی پێ کۆتایی هێناوە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿لَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلۡأُولَىٰ وَٱلۡأٓخِرَةِ﴾ [القصص: ٧٠]، وە دەفەرموێت: ﴿وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ [الروم: ١٨].

وە (الحسن البصري) رحمه الله دەڵێت: لَقَدْ دَخَلُوا النَّارَ وَإِنَّ حَمْدَهُ لَفِي قُلُوبِهِمْ، مَا وَجَدُوا عَلَيْهِ سَبِيلًا[١].

واتە: دۆزەخییەکانیش کاتێك دەچنە دۆزەخەوە سوپاس و ستاییشی خوا لە دڵیاندایە گەر

---

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص١٣٥.

بۆشیان دەرنەبڕدرێت، لەبەر پاكبوونەوەیان و نەمانی مافی كەس بەسەریانەوە و هۆكاری ئەگەری ڕزگاربوونیان و چوونە بەهەشتیان، یاخود سوپاس و ستاییشی خوا بكەن لەبەر شایستەیی كارەكانی.

## چەند نموونەیەك لە دانایی و ڕەچاوكردنی هۆكارەكان لە كارەكانی پەروەردگاردا

**یەكەم: نموونە لە قەدەرە كەونییەكاندا:**

❁ قال تعالى: ﴿جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلۡكَعۡبَةَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ قِيَٰمٗا لِّلنَّاسِ﴾ [المائدة: ٩٧]، قال تعالى: ﴿فَلۡيَعۡبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ ٣﴾ [قريش: ٣]. هۆكار لە دانانی كەعبە لەو شوێنەدا بۆ پەرستن و بەندایەتی دەربڕینە بۆ پەروەردگار.

❁ قال تعالى: ﴿وَمَا جَعَلۡنَآ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةٗۙ وَمَا جَعَلۡنَا عِدَّتَهُمۡ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ [المدثر: ٣١]. ژمارەی تایبەت لە پاسەوانەكانی دۆزەخ (كە نۆزدە پاسەوانن) بەو شێوەیەی كە باسكراوە بۆ سزادانی بێبڕوایانە.

❁ قال تعالى: ﴿رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِ﴾ [النساء: ١٦٥]. پێغەمبەرانمان ناردووە تاوەكوو ببێتە بەڵگەكاری و نەمانی هیچ پاساوێك بۆ خەڵكی لە دوارۆژدا.

❁ قال تعالى: ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذۡهِبَ عَنكُمۡ رِجۡزَ ٱلشَّيۡطَٰنِ وَلِيَرۡبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمۡ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلۡأَقۡدَامَ ١١﴾ [الأنفال: ١١]. لە شەوی شەڕی بەدردا بارانمان باراند بەسەرتاندا تا ببێتە هۆكاری پاكبوونەوەتان لە پیسی شەیتان و بەهێزكردنی دڵتان و پتەوبوونی زەوییەكە لەكاتی شەڕدا.

❁ قال تعالى: ﴿وَإِذۡ يُرِيكُمُوهُمۡ إِذِ ٱلۡتَقَيۡتُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِكُمۡ قَلِيلٗا وَيُقَلِّلُكُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِهِمۡ لِيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗا﴾ [الأنفال: ٤٤]. لەپێش هەڵپژانی شەڕی بەدر ئێمە ئێوەمان لەچاو ئەواندا

زۆر بە کەم دادەنا، وە لەچاوی ئێوەشدا ئەوانمان زۆر بە کەم دادەنا، تاوەکوو ئەوەی کە خوا بیەوێت بێتە دی لە فەرمان و قەدەرەکانی.

❁ قال تعالى: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٢٢ لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ ٢٣﴾ [الحديد : ٢٢، ٢٣]. هەر بەڵا و ناخۆشییەك بەسەرتاندا بێت پێش دروستکردنتان لەسەرتان نووسراوە، ئەمە بزانن تا ببێتە هۆکاری ئەوەی خەفەتی ڕابوردووتان لەسەر لاببات و لەخۆباییبوونتان لە کاتی خۆشییەکاندا نەهێڵێت.

❁ قال تعالى: ﴿وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ مَلَكٞۖ وَلَوۡ أَنزَلۡنَا مَلَكٗا لَّقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ٨ وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ مَلَكٗا لَّجَعَلۡنَٰهُ رَجُلٗا وَلَلَبَسۡنَا عَلَيۡهِم مَّا يَلۡبِسُونَ ٩﴾ [الأنعام : ٨، ٩]. هۆکاری نەناردنە خوارەوەی (ملائکة) بە پێغەمبەرایەتی بۆ ناو ئادەمیزاد نەتوانینی بینینی مەلائیکەکە و سزای بەپەلەی خواییە لە ئەگەری باوەڕپێنەبوونی، وە لەلایەکی تریشەوە گەر (ملائکة)ش بێت دەبێت بێتە شێوەی ئادەمیزاد تاوەکوو پەیامەکە بگەیەنێت.

❁ قال تعالى: ﴿أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ كِفَاتًا ٢٥ أَحۡيَآءٗ وَأَمۡوَٰتٗا ٢٦﴾ [المرسلات : ٢٥، ٢٦]. زەویمان بە هۆکاری پێویستی ئادەمیزاد دروستکردووە، تاوەکوو لەسەری بژین و مردووەکانیشیان تیادا بشارنەوە.

❁ قال تعالى: ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا﴾ [الروم : ٢١]. هۆکاری دروستکردنتان بە ڕەگەزی نێر و مێ بۆ هاتنەدی ئارامی ژیانتانە.

❁ قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلشَّمۡسَ ضِيَآءٗ وَٱلۡقَمَرَ نُورٗا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ٥﴾ [يونس : ٥]. مانگ و ڕۆژمان دروستکردووە لە شوێنی تایبەتی خۆیان هاتووچۆ بکەن، تاوەکوو ببێتە ڕووناکی شەو و ڕۆژ و زانینی ژمارەی ڕۆژ و مانگ و ساڵتان.

❁ قال تعالى: ﴿وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا لَٰعِبِينَ ١٦﴾ [الأنبياء : ١٦]. دەبێت هۆکار

و مەبەست و حیکمەتێك هەبێت لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی کە لە نێوانیاندا هەیە، نابێت بە گاڵتە و بێهوودە دروستکرابێت.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾﴾ [هُود: ١١٧]، ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِىٓ أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا﴾ [القَصَص: ٥٩]. خوای گەورە هیچ گەلێك لەناو نابات بە هۆکاری بێبڕواییانەوە گەر لە نێوان یەکدا دادپەروەر بن، وە خوای گەورە هیچ گەلێك لەناو نابات هەتا پێغەمبەرانیان بۆ نەنێرێت کە لە ڕێگەیەوە پەیامی خوای پەروەردگاریان پێبگەیەنێت.

**دووەم: نموونە لە قەدەرە شەرعییەکاندا:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ [النَّحل: ٤٤]، قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ﴾ [النِّسَاء: ١٠٥]، قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾﴾ [النَّحل: ٨٩]. **قورئانمان** بۆیە ناردووەتە خوارەوە تاوەکوو ڕوونی بکەیتەوە بۆیان و یاسای ڕەوای نێوانیان بێت.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ﴾ [البَقَرَة: ١٤٣]. یەکێك لە هۆکاری قیبلە گۆڕینمان تاقیکردنەوەی خەڵکە، تاوەکوو بزانن کێ شوێنکەوتەی پێغەمبەرە ﷺ، وە کێش هەڵدەگەڕێتەوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ﴾ [القَمَر: ١٧]، قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾﴾ [الدُّخَان: ٥٨]. **قورئانمان به شێوەیەکی ئاسان دارشتووە، تا ببێتە مایەی بیرکەوتنەوە و لەبەرکردن.**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾﴾ [البَقَرَة: ١٨٣]. ڕۆژوومان فەرز کردووە لەسەرتان، تا ببێتە مایەی خواپەرستی بۆتان.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ

عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾﴾ [المائدة :٣٨]، قال تعالى: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ﴾ [النور : ٢]، قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا﴾ [النور : ٤]. سزای دەستبڕین و جەلد لێدان بۆ تەمێکردنیان لەسەر خراپەکانیان دانراوە.

❁ قال تعالى: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾ [البقرة : ١٤٣]. ئێوەمان گێڕاوە بە گەلێکی مامناوەند لە نێوان زیادەڕەوی و کەمڕەویدا بەگوێرەی بەرنامەکەتان، تاوەکوو ببنە پێشەواو شایەتی سەر گەلان.

❁ قال تعالى: ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾﴾ [الأنعام : ٥٣]. هەندێك تایبەت دەكرێن بە نیعمەتە دینی و دونیاییەکانەوە، بۆ تاقیکردنەوەی خۆیان و خەڵکی، تاوەکوو سوپاسگوزارانیان تیادا دەرکەوێت.

❁ قال تعالى: ﴿وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾﴾ [الأنفال : ٢٣]. ئەگەر خێر و هیدایەت بەدیبکرایە لە بێباوەڕاندا؛ خوای گەورە ئایەتەکانی بە تێگەیشتنەوە دەدا بە گوێیاندا، بەڵام بۆیە نایکات لەبەرئەوەی وەری ناگرن.

❁ قال تعالى: ﴿مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ﴾ [آل عمران : ١٧٩]. حیکمەتی خوا وانییە کە ئیمانداران بەبێ تاقیکردنەوە بهێڵێتەوە، تاوەکوو پاك و پیس لەیەك جیابکاتەوە.

❁ قال تعالى: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًۢا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾﴾ [التوبة : ١١٥]. حیکمەتی خوا لەوەدا نییە گەر گەلێك هیدایەت بدات پاشان وازیان لێبێنێت، تاوەکوو ڕێنموونی تەواوی پێویستییەکانی دونیا و قیامەتیان نەکات و پارێزراو نەبن لە گومڕایی و نەزانین بەسەر دینەکەیاندا.

❁ قال تعالى: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٦﴾﴾ [المائدة : ٦]. حیکمەتی خوا بە گشتی لە کارە

شەرعییەکاندا پاکبوونەوە و تەواوکاری ڕژاندنی نیعمەتەکانیەتی بەسەر بەندەکانیدا.

۞ حیکمەتی خوای پەروەردگار لەوەدایە کە هاوشێوەکان ڕیزبەند بکات لە پاداشت و هیدایەت و بەزەیی و باسدا، وە جیاوازەکانیش وەك یەك سەیر نەکات لەو بوارانەدا، وەك بەشێوەی دژایەتی و نکوولّی دەفەرموێت: ﴿أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾﴾ [القلم: ٣٥، ٣٦]، وە بۆ جیاوازەکانیش دەفەرموێت: ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ﴾ [التوبة: ٦٧].

## بیروڕای فیرەقەکان لەسەر دانایی و بوونی هۆکارەکان لە کارەکانی پەروەردگاردا

بۆ قسەکردن لەسەر بابەتی دانایی و هۆکارەکان (الحكمة والتعليل) لە کارەکانی پەروەردگاردا (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: هَذِهِ الْمَسْأَلَةُ كَبِيرَةٌ مِنْ أَجَلِّ الْمَسَائِلِ الْكِبَارِ الَّتِي تَكَلَّمَ فِيهَا النَّاسُ وَأَعْظَمِهَا شُعُوبًا وَفُرُوعًا وَأَكْثَرِهَا شَبَهًا وَمَحَارَاتٍ؛ فَإِنَّ لَهَا تَعَلُّقًا بِصِفَاتِ اللهِ تَعَالَى وَبِأَسْمَائِهِ وَأَفْعَالِهِ وَأَحْكَامِهِ مِنْ الْأَمْرِ وَالنَّهْيِ وَالْوَعْدِ وَالْوَعِيدِ ... وَهِيَ مُتَعَلِّقَةٌ بِالْخَالِقِ سُبْحَانَهُ وَكَذَلِكَ الشَّرَائِعُ كُلُّهَا[1].

واتە: ئەم بابەتە یەکێکە لە بابەتە گەورەکان کە قسەی لەسەر کراوە و زۆر بابەت و پەل و پۆی لێدەبێتەوە، لەلایەکی تریشەوە لەخۆگری زۆر گومان و تێڕامانە، لەبەرئەوەی پەیوەندی بە ناو و سیفات و کارەکانی خواوە هەیە، وە هەروەها پەیوەندی بە فەرمانەکانی خواوە هەیە.

بۆیە دەڵێت:

وَأَصْلُ ضَلَالِ الْخَلْقِ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ      هُوَ الْخَوْضُ فِي فِعْلِ الْإِلَهِ بِعِلَّةِ[2]

واتە: سەرچاوەی گومڕایی هەموو فیرەقەکان گەڕانە بەدوای هۆکاری کارەکانی خوادا.

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٨١).

(٢) "القصيدة التائية في القدر" لابن تيمية ص١١١، و"مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٢٤٦).

وە (ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: فإنهم لما طلبوا علة أفعاله فأعجزهم العلم بها افترقوا بعد ذلك[(١)].

واتە: کاتێك گەڕان بەدوای هۆکارەکاندا و نەگەیشتنە ئەنجام؛ بووە هۆی جیاوازی بیروڕایان لەسەری.

**بیروڕای یەکەم (نفاة الحكمة والتعليل): واتە: نکوولێکاران لە بوونی دانایی و هۆکارەکان لە کارەکانی خوادا، دەڵێن: خوا بە ویست و ئیرادەیەکی گشتی (الإرادة المطلقة) کارەکانی ئەنجام دەدات لە کەونی و شەرعیدا، بەبێ هیچ هۆکار و وردبینی و داناییەك، ئەمانە پێکهاتوون لە:**

١. **الجبرية.**
٢. **الجهمية والأشاعرة.**
٣. **الإباضية.**
٤. **نفاة القياس (ابن حزم وأمثاله).**
٥. **الفلاسفة (ابن سينا).**
٦. **طوائف من أصحاب مالك والشافعي وأحمد وغيرهم (من المتأخرين منهم)**[(٢)].

ئەگەرچی کۆدەنگی گشتی هەموو ئەهلی ئیسلام لەسەر ئەوەن کە خوای پەروەردگار خاوەنی حیکمەتە، بەڵام هەریەکەیان بە پێناسەی خۆیان حیکمەتەکان لێکدەدەنەوە، وە لە کۆتایی و ئەنجامی ئەو تێڕوانین و خوێندنەوانەیان بۆ حیکمەت، ئەو هۆکارانەی کە لە قورئان و سوننەتدا مەبەستە؛ لە (واقع)دا بوونی نامێنێت و پێچەوانەی مەبەستەکانی قورئان و سوننەت دەردەچن، بۆیە بەشێکیان بە هۆکاری بیروبۆچوونەکانیانەوە ناودەبرێن بە (نفاة الحكمة والتعليل)، واتە: نکوولێکاران لە بوونی دانایی و هۆکارەکان لە کارەکانی خوادا.

---

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص٢١٦.

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٨٣)، و "جامع الرسائل" لابن تيمية (١/ ٤٤٠)، و "مقالات الإسلاميين" للأشعري (١/ ١٨٣)، و "الفرق بين الفرق" ص٧٠، و "الملل والنحل" للشهرستاني (١/ ١٥٦)، و "الفصل" لابن حزم (٣/ ٢١٠)، و "الأحكام" لابن حزم (٨/ ١١١٠)، و "المحلى" لابن حزم (١/ ٤٦)، و "الإشارات" لابن سينا ص٥٤٨، و "شفاء العليل" لابن القيم ص٥٢٣، و "القضاء والقدر" لعبد الرحمن صالح المحمود ص٢٤٢، و "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص٨٢.

**بەڵگەعەقڵییەکانیان لەسەر نەبوونی دانایی و ڕەچاوکردنی هۆکارەکان لە کارەکانی خوادا:**

**پێشەکی پێویستە ئەوە بزانین کە بنەمای هەموو فیرەقەکان بە شێوەیەکی گشتی دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵە گومان و بۆچوونێکی عەقڵی کە پێشوەختە هەڵگری بوون و لەسەری پەروەردە بوون، وە کاتێکیش ویستوویانە بگەڕێنەوە بۆ دەقەکانی شەرع، سەیریان کردووە ناگونجێت و پێچەوانەیەتی؛ پەنایان بردووە بۆ (تأویل) و مەبەست و واتا گۆڕینی دەقە شەرعییەکان، بە بەڵگەی ئەوەی کە دژایەتی ئەو دەق و بابەتانە دەکات کە زۆر ڕوون و ئاشکران و نکوولی هەڵناگرن (معلوم بالضرورة)، وە بە ناچاری پەنایان بردووەتە بەر بەڵگە واتا هەمە چەشنەکان (المتشابهات) و کردوویانەتە بەڵگە لەسەر مەبەستە هەڵە و گومڕاکانیان، بۆیە دوو تاوانیان ئەنجام داوە: یەکەمیان هەڵگری بەرنامەیەکی جیاواز بوون لە بنەماکانی دین، دووەمیش هێرش و گەڕانەوەیان بۆ سەر دەقەکان بەشێوەی تۆمەتبارکردن و ڕاستکردنەوەیان لەلایەن (مخلوق)ەوە بۆ بەرنامەی (خالق).**

١. **(محمد بن عمر الرازي) دەڵێت:** "كل من فعل فعلًا لأجل تحصيل مصلحة أو لدفع مفسدة، فإن كان تحصيل تلك المصلحة أولى من عدم تحصيلها؛ كان ذلك الفاعل قد استفاد بذلك الفعل تحصيل ذلك" ومن كان كذلك كان ناقصًا بذاته مستكملًا بغيره، وهو في حق الله محال[(١)].

**واتە: هەرکەسێك هەر کارێك بکات لە پێناوی هێنانەدی سوودمەندییەك، یاخود دوورخستنەوەی زەرەرۆمەندییەك، وە هاتنەدی ئەو سوودمەندییە یاخود دوورخستنەوەی ئەو زەرەرۆمەندییە لەپێشتر بێت بۆ کەسەکە؛ ئەوا کەسەکە سوودمەند بووە بەو هێنانەدییە، ئەوەشی بەو شێوەیە بێت ئەوا لەخۆگری ناتەواوییە و پێویستی بە تەواوکارییە بە بێجگە لە خۆی، ئەمەش بۆ خوا ئەستەمە (مستحيل) کە پێویستی بە تەواوکارییەك هەبێت بۆ خۆی.**

٢. **دەڵێن:** لو كان فعله تعالى معللًا بعلة، فتلك العلة إن كانت قديمة لزم من قدمها قدم الفعل وهو محال، وإن كانت محدثة افتقر كونه موجودًا لتلك العلة إلى علة أخرى وهو محال[(٢)].

---

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص٢٠٦.

(٢) "شفاء العليل" لابن القيم ص٢٠٩، و "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (١/ ١٤٥).

واتە: ئەگەر کارەکانی خوا هۆکار (العلة)ی تێدا ڕەچاوکرابێت؛ ئەوا ئەو هۆکارانە لە دوو حاڵەت بەدەر نین:

**یەکەم:** خوا خاوەنی سیفەتی (قدیم والأزلي)یە، کەواتە دەبێت ئەو هۆکارە ڕەچاوکراوانە (قدیم) بن، وە (قدیم)یش سیفەتی خوایە، واتە ئەو هۆکارانە هەر بوون، وە دەشبێت هەر بن، یاخود ئەزەلین بە ئەزەلیەتی خوا، ئەمەش ئەستەمە (مستحیل)ە دیسان، لەبەرئەوەی هۆکارەکان سیفەتی (خالق) وەردەگرن کە بریتییە لە ئەزەلیەت، وە دەبێت هەر خوا خاوەنی سیفەتی ئەزەلی بێت، گەر نا ئەوا چەند خوایەتی (تعدد الآلـهة) دروست دەبێت، کە ئەمەش مەحاڵە.

**دووەم:** هۆکارەکان (العلل) دەبێت تازە و دروستکراو بێت و سیفەتی ئەزەلیەتی نەبێت، بۆیە گەر دروستکراو بێت ئەوا پێویستی بە هۆکارێکی ترە بۆ ئەو کارە، وە ئەو هۆکارەش بە هۆکارێکی تر، بەو شێوەیەش بە بازنەی (التسلسل) و زنجیرەی لێکنەپچڕاوی یەك لەدوای یەکی کاریگەرییەکان بەسەر یەکەوە دروستدەبێت بەبێ کۆتایی، ئەمەش دیسان مەحاڵە.

**٣. دەڵێن:** جميع الأغراض يرجع حاصلها إلى شيئين: تحصيل اللذة والسرور، ودفع الألم والحزن والغم، والله سبحانه قادر على تحصيل هذين المطلوبين ابتداء من غير شئ من الوسائط، ومن كان قادرًا على تحصيل المطلوب ابتداء بغير واسطة؛ كان توسله إلى تحصيله بالوسائط عبثا وهو على الله محال(١)، وقالوا: فثبت أنه لا يمكن تعليل أفعاله وأحكامه بشئ من العلل والأغراض(٢).

واتە: مەبەست لە هێنانەدی هەموو پێویستییەکان بۆ دوو هۆکارە:

**یەکەم:** بۆ هێنانەدی خۆشی و کامەرانییەکان.

**دووەم:** یاخود ڕەواندنەوەی خەم و ئازارەکان.

خوای پەروەردگار لە توانایدایە ئەم دوو هۆکارە ڕاستەوخۆ لە کارەکاندا بهێنێتە دی، بەبێ بەکارهێنانی هیچ هۆکارێك، ئەوەشی کە بەتوانا بێت لەسەر ئەم کارە هەر لە سەرەتاوە؛ ئەوا

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص٢١٣.

(٢) "الأربعين في أصول الدين" للرازي ص٣٥٠.

بەکارهێنانی هۆکارەکان لەلایەن ئەوەوە کارێکی بەتاڵ و گاڵتەجارییە، ئەمەش بۆ خوا مەحاڵ و نەگونجاو و نەبووە.

ئەمانە گرنگترین ئەو بەڵگە عەقڵیانەن کە ئەم کۆمەڵە دەیگرنە بەر بەشێوەیەکی گشتی بۆ سەلماندنی ئەوەی کە هیچ هۆکار و ڕەچاوکردنی حیکمەتێك لەلایەن خواوە نەگیراوەتە بەر بۆ هێنانەدی و دروستکردنی بوونەوەرەکان، بەڵکوو ئیرادە و ویستی گشتی پەروەردگارە و لە (الإرادة والمشيئة المطلقة) دەرناچێت، گەر هەر ناوێکیشی لێبنێیت لە (الحكم والعلل) و بێجگە لەمانیش.

**بۆ وەڵامی یەکەم بەڵگەی عەقڵییان:** (ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ لە کتێبی "شفاء العليل" دا بە شانزە خاڵ وەڵامیان دەداتەوە، ئێمەش بە شێوەیەکی کورت گرنگەکانی باس دەکەین:

ئەوان دەڵێن: هەر کارێك بکرێك بۆ هێنانەدی سوودمەندییەك یاخود نەمانی زەرەرۆمەندییەك؛ ئەوا خاوەنەکەی سوودمەندە بەو کارە و تەواوکاری خۆیەتی بە بێجگە لە خۆی، کە ئەمە بۆ خوا مەحاڵە.

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: أتعني به أنه يكون عادما لشيء من الكمال الذي لا يجب أن يكون له قبل حدوث ذلك المراد أم تعني به أن يكون عادما لما ليس كمالا قبل وجوده ... فإن عنيت الأول فالدعوى باطلة فإنه لا يلزم ... أن يكون عادما لشيء من الكمال الواجب قبل حدوث المراد فإنه يمتنع أن يكون كمالا قبل حصوله وإن عنيت الثاني لم يكن عدمه نقصا فإن الغرض ليس كمالا قبل وجوده وما ليس بكمال في وقت لا يكون عدمه نقصا فيه [(١)].

واتە: مەبەست بە تەواوکارییەکە کە پێشتر نەیبوویێت و بەو هۆکارەوە ناتەواوی بۆ دروستکردبێت، بەڵام بە بوونی ئەوەوە تەواوکاری بەدەست هێنابێت؟! یاخود مەبەستت پێی کارێکە کە پێشتر بە نەبوونی ئەو کارەش هەر تەواو بوویێت و ناتەواوی بۆ دروستنەکردبێت؟ گەر مەبەستت یەکەمە ئەوا قسەکەت بێبنەمایە، لەبەرئەوەی مەرج نییە هەر کارێك کە دەکرێت بۆ مەبەستێك؛ نەبوونی ئەو کارە ببێتە هۆکاری لەدەستدانی تەواوی و کامڵییەکی پێویست (واجب) بۆ خاوەنەکەی (با ئەو کارەشی پێویست بێت).

---

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص٢٠٦، ٢٠٧.

**وە گەر مەبەستت دووەمە کە کارێکە بە نەبوونی یاخود پێش بەدەستهێنانی؛ ناتەواوی دروست نەکات بۆ خاوەنەکەی؛ ئەمەش هەڵەیە، لەبەرئەوەی هەرچییەك لە کاتێکی دیاریکراودا هۆکاری تەواوی و کامڵی نەبێت، ئەوا بە نەبوونی لەو کاتەدا ناتەواو نابێت.**

**کەواتە بەم بیردۆزە ئەوانەی بڕیاری نەبوونی (الحكمة والتعليل) دەدەن، ئەوانە بڕیاری کەموکورتی و ناتەواوی دەدەن بۆ خوا، نەك ئەوانەی کە خاوەنی بڕیاری بوونی (الحكمة والتعليل)ن بۆ خوا، لەبەرئەوەی هەموو کارەکانی خوا بە (واقع) دانایی و هۆکار (الحكم والعلل)ی تیادا بەدیدەکرێت ئەوەی کە هەیە، ئەوەشی کە نییە.**

**هەموو گومڕایی ئەمانەش لەو یاسا عەقڵییە هەڵەیەدا ڕەنگی داوەتەوە کە دەڵێت:** من فعل شيئًا لمراد كان مفتقراً إلى ذلك المراد مستكملًا بغيره[١].

**واتە: هەرکارێك بکرێت ئەوا هۆکارەکەی لە پێویستی و بۆپڕکردنەوەی ئەو کارەدایە بە بێجگە لە خۆی.**

**(ابن تيمية)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** أن لفظ الغير مجمل، فإن أريد بذلك أنه يفتقر إلى شيء مباين منفصل عنه فهذا ممنوع فإن مفعولاته ومراداته هو الفاعل لها كلها، لا يحتاج في شيء منها إلى غيره، وإن أريد بذلك أنه يفتقر إلى ما هو مقدور له مفعول له، كان حقيقة ذلك أنه مفتقر إلى نفسه أو لوازم نفسه. ومعلوم أنه سبحانه موجود بنفسه لا يفتقر إلى ما هو غير له مباين له، ... فإذا قال القائل إنه مفتقر إلى نفسه كان حقيقته أنه لا يكون موجوداً إلا بنفسه وهذا المعنى حق[٢].

**واتە: هەموو گومڕاییەکە لە بەکارهێنانی وشەی (الغير)دایە، واتە بێجگە لە خۆی، ئەم وشەیە وشەیەکی کورتە، مانا نادات بەدەستەوە، ئەگەر مەبەست پێی بوونی شتێك بێت بێجگە لە خوا خۆی کە بەو شتە پێویستییەکانی خوا پڕ ببێتەوە؛ ئەوا هیچ بوونێك بێجگە لە خوا بوونی نییە، هەر ئەو خاوەن و تەواوکار و بەخشەری هەموو پێویستییەکانە و خوای هەموو بوونەوەرەکانە و دروستکاریانە، نەك بوونێکی تر بێجگە لە خۆی.**

(١) (٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٤/٢٠٣، ٢٠٤).

وە گەر مەبەست لە (الغیر)، دروستکراوەکانی خۆی بێت؛ ئەوا لە ڕاستیدا دروستکراوەکان پێویستیان بە خوا خۆیەتی، کەواتە بوونێك نییە بێجگە لە خۆی، وە پێویستییەك نییە لە دەرەوەی خۆی.

هەموو موسوڵمانان کۆدەنگن لەسەر بڕیاری نەبوونی ناتەواوی بۆ خوا، ئەمە لە زانستە هەرە پێویستییەکانی ناخی ئادەمیزادە کە نکوڵی لێناکرێت، وە گەر کارەکانیشی دانایی و ڕەچاوکردنی هۆکارەکانی تیادا نەبێت؛ ئەوا ناتەواوی پەیوەستە پێوەی، کە ئەمەش بۆ خوا مەحاڵە، کەواتە لەڕووی عەقڵ و بەڵگەوە بڕیاری ناتەواوی و کەموکورتی بۆ خوا نابێت بوونی هەبێت، کە ئەمەش زۆر ڕوون و ئاشکرایە، وە هەر ئەو دووانەش (بەڵگە و عەقڵ) بەڵگەن بۆ بڕیاردان لەسەر تەواوی و کاملّی سیفاتەکانی پەروەردگار.

(ابن القیم) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: حصول ما يحبه الرب تعالى في الوقت الذي يحبه فإنها يكون كمالاً إذا حصل على الوجه الذي يحبه[1].

واتە: هەموو هاتنەدییەکانی ئەو کارانەی کە خوا پێیخۆشە لەو کاتانەدا بێتە دی؛ ئەوە کاملّییە گەر بەو شێوەیە بێتە دی کە پێیخۆشە، وە نەبوونیشی پێش ئەو کاتە ناتەواوی نییە، لەبەرئەوەی لەو کاتەدا پێی خۆش نییە بوونی هەبێت.

**بۆ وەڵامی دووەم بەڵگەی عەقڵییان:** ئەوان دەڵێن: گەر هۆکارەکان (قدیم) بن، ئەوا کارەکانیشی هەروەها (قدیم) و ئەزەلین، وە گەر دروستکراو بن، ئەوا پێویستیان بە دروستکراوێکی ترە، ئەمەش (الدور والتسلسل) دروست دەکات.

ئەمەش (ابن القیم) رَحِمَهُ اللهُ بە دە خاڵ وەڵامیان دەداتەوە، کە بە کورتی دەڵێت[2]: ئەگەر هۆکارەکان (العلة) ئەزەلی بن، ئەوا کارەکانیش ئەزەلین، ئەمەتان بەرپەرچ دەدەینەوە بە ویستی کارکردن (الإرادة) لای خوا کە ئێوە بڕیاری لەسەر دەدەن[3]، بەوەی کە ئەگەر ئیرادەی خوا ئەزەلی بێت، ئەوا ئیرادەپێکراوەکانیش (واتە دروستکراوەکانیش) ئەزەلین، گەر ئیرادە تایبەت بێت

---

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص٢٠٨.

(٢) "شفاء العليل" لابن القيم ص٢٠٥.

(٣) مەبەست لە ئەشعەرییەکانە کە بڕیار لەسەر حەوت سیفات دەدەن کە دەڵێن ئەم سیفاتانە ئەزەلین، وەك: (العلم، الإرادة، القدرة، السمع، البصر، الكلام، الحياة).

بە کاتی دروستکردنیەوە؛ ئەوا حیکمەتیش تایبەتە بە کاتی دروستکردنەکەیەوە و جیاواز نییە لێی، وە دەڵێین: هەموو کارێك هۆکاری بوونی هەیە، بەڵام ئێمە واناڵێین، بەڵکوو دەڵێین: خوای گەورە هەموو کارێك بە حیکمەتێك دەکات، ئەو حیکمەتەش بە حیکمەتێکی تر دەکات، تا دەگاتە حیکمەتێك کە هیچ حیکمەتێکی تر لەسەریەوە نییە، بێجگە لە ویست و ئیرادەی خوا نەبێت.

**بۆ وەڵامی سێیەم بەڵگەی عەقڵییان:** ئەوان دەڵێن: هۆکاری هاتنەدی مەبەستەکان بۆ هێنانەدی خۆشی و ڕەواندنەوەی ناخۆشییەکانە، خواش دەتوانێت ئەم دووانە بێنێتە دی بەبێ گرتنەبەری هۆکارەکانیش، کەواتە بەکارهێنانی هۆکارەکان لەلایەن خواوە بەتاڵ و گاڵتەجاڕییە.

ئەمەش (ابن القیم) رَحِمَهُ اللَّهُ بە یانزە خاڵ وەڵامیان دەداتەوە، کە بە کورتی دەڵێت: فإن حكمة الرب تعالى فوق تحصيل اللذة ودفع الغم والحزن، فإنه يتعالى عن ذلك، بل ليس كمثل حكمته شيء ... بل هي أجل وأعلى من أن يقال أنها تحصيل لذة أو دفع حزن، فالمخلوق لنقصه يحتاج أن يفعل ذلك لأن مصالحه لا تتم إلا به، والله سبحانه غني بذاته عن كل ما سواه، لا يستفيد من خلقه كمالاً بل خلقهم يستفيدون كمالهم منه[(١)].

واتە: ئایا ویست لە مەبەستەکاندا هێنانەدی سوودمەندی و ڕەواندنەوەی ناخۆشییەکانە لە کارەکانی ئادەمیزاددا، یا لە کارەکانی خوادا؟ گەر مەبەست لە کارەکانی ئادەمیزاد بێت ئەوە تەواوە، وە ئەگەر مەبەست لە کارەکانی خوا بێت، ئەوا حیکمەتەکانی خوا لە سەروو ئەو تێڕوانینەوەیە، بەڵکوو شایستەی ئەو داڕشتنە نییە بۆ ئەو، لەبەرئەوەی ئەو داڕشتنە بۆ ئادەمیزاد دەبێت، لەبەر پێویستی و ناتەواوییەکانی، بەڵام خوای پەروەردگار هیچ پێویستییەکی بە بەندەکانی نییە و سوودمەند نییە لێیان، بەڵکوو دروستکراوەکانی سوودمەندن لە خوای خۆیان.

کەواتە چۆن ناو و سیفاتەکانی لە دروستکراوەکانی ناچێت؛ بەو شێوەیەش حیکمەتی خوا لە حیکمەتی ئادەمیزاد ناچێت.

بەکارهێنانی هۆکارەکان گاڵتە نین و پێویستن بۆ هێنانەدی بوونەکان و گاڵتەش شایستە نییە بە خواوە، کەواتە نابێت خوا هیچ فەرمانێك و دروستکراوێك بەبێ هۆکار و سوودمەندی دروستبکات، ئەمە بەرپەرچدانەوەی خۆتانە، وە دەبێت پاشماوەی کارکردنی ناو و سیفاتەکانی

---

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص٢١٤.

دەرکەویت، بۆ نموونە ئەگەر ڕۆژیەدەر بێت؛ دەبێت یەکێك هەبێت کە ڕۆژپێیدراو بێت، وە هەروەها.

بۆیە گاڵتە و بێ هوودە (العبث) ئەوەیە کە سوودمەندی تیادا نەبێت، بەڵام لە هۆکار و ناوەندگیری مەرج و هۆکارەکانی بووندا هیچ گاڵتەیەك نییە، بگرە لە نەبوونی هۆکارەکان ئەگەری بوونیان نابێت، کەواتە چۆن دەڵێن بەکارهێنانیان گاڵتەیە؟! وە گەر بڵێین: ئایا خوا دەتوانێت بەبێ هۆکار ئەنجامیان بدات؟ گەر بڵێین دەتوانێت: ئەوا هۆکارەکان گاڵتەن، وە گەر بڵێن ناتوانێت: ئەوا ناتەواوییە بۆ خوا، کەواتە هیچیان قابیلی قبووڵ نین، نە دانانی ناوەندگیری هۆکارەکان بە گاڵتە و نە بڕیاردانی نەتوانین و ناتەواوی بۆ خوا.

وە (**الجهمية**)کانیش بڕیاری نەبوونی حیکمەت دەدەن و دەڵێن وشەی (المشيئة) مەبەست پێی حیکمەتە، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: ينكرون التعليل جملة، ولا يثبتون إلا محض المشيئة[1].

واتە: جەهمییەکان نکووڵی لە هۆکارەکان دەکەن بە شێوەی ڕەها و دەڵێن: حیکمەت تەنها ویست و ئیرادەیە.

وە (**الماتريدية**)کانیش بە هەمان شێوەی (المعتزلة)کان بڕیاری حیکمەتێك دەدەن تایبەت بۆ (مخلوقات)[2]، کە ئەمەش بەشی دووەمی حیکمەتە و تەنها پەیوەندی بە سوودمەندییەکانی ئادەمیزادەوە هەیە، ناگەڕێتەوە بۆ خوا.

وە (**الأشعري**) دەڵێت: ولا لأفعاله علل[3]، واتە کارەکانی خوا هیچ هۆکارێك بوونی نییە تیایدا.

وە هەروەها بە هەمان شێوە (الآمدي) و (الباقلاني) و (الرازي) هەموویان بڕیاری ئەوە دەدەن کە خوا حەکیمە، بەڵام (الآمدي) دەڵێت: يخلقه على وفْق علمه بِهِ وبإرادته[4]. واتە

---

(١) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٨/ ٥٤).

(٢) "التوحيد" لأبي منصور الماتريدي ص٢١٦، و "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص٧٤.

(٣) "رسالة إلى أهل الثغر" لأبي الحسن الأشعري ص١٣٦.

(٤) "غاية المرام في علم الكلام" للآمدي ص٢٣٣.

حیکمەت نییە بەڵکوو دروستکردنە بە زانست و ئیرادەی خوا، نەك حیکمەت و دانایی، واتە: وَلَمْ يُثْبِتُوا إِلَّا الْعِلْمَ وَالْإِرَادَةَ وَالْقُدْرَةَ[١]، واتە زانست و ئیرادە و دروستکردنە نەك حیکمەت.

وە (الباقلاني) دەڵێت: الْعِلَل لَا تجوز عَلَيْهِ[٢]. واتە نابێت بڕیاری هۆکار بۆ خوا بدرێت لە کارەکانیدا. دەڵێن کە خوا حەکیمە، بەڵام دەڵێن: ولكن ينفون كون أفعاله تعالى خاضعة لمعنى العلة[٣]. واتە هۆکار گرتنەبەر شایستە نییە بۆ خوا، لەبەرئەوەی گەر بیگرێتە بەر ئەوا پێویستی پێیەتی، وە گەر واش بێت ئەوا ناتەواوە، وە خواش ناتەواو نییە.

(ابن القيم)یش رَحِمَهُ اللهُ لێیانەوە نەقڵ دەکات کە دەڵێن: أنه سبحانه لا يفعل شيئاً لشيء ولا يأمر بشيء لحكمة ولا جعل شيئاً من الأشياء سببا لغيره وما ثم إلا مشيئة محضة ... لا يقال في فعله لم ولا كيف ولا لأي سبب وحكمة ولا هو معلل بالمصالح[٤].

واتە: ئەشعەرییەکان باوەڕیان بە حیکمەتێك نییە بە مەبەستی قورئان و فەرموودە کە هۆکار و هێنانەدی داناییەکانی خوا بێت، بەڵکوو دەڵێن خوا حەکیمە، بەڵام بە واتای ویست و ئیرادەی گشتی (المشيئة المطلقة)، وە تەنانەت دەڵێن لامی هۆکار (لام التعليل) لە قورئاندا نییە، واتە ئەو لامەی کە مەبەستەکانی خوا دیاری دەکات، بەڵکوو هەمووی (لام العاقبة)یە، بە واتای کۆتاییە[٥].

لەگەڵ ئەوەشدا (لام العاقبة) لە بەکارهێناندا مەبەست پێی نەزانینە بە دواڕۆژی شتەکان، نەك کۆتایی، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: أَنَّ لَامَ الْعَاقِبَةِ إنَّمَا تَصِحُّ مِمَّنْ يَكُونُ جَاهِلًا بِعَاقِبَةِ فِعْلِهِ كَفِرْعَوْنَ الَّذِي لَمْ يَكُنْ يَدْرِي مَا يَنْتَهِي إلَيْهِ أَمْرُ مُوسَى أَوْ مِمَّنْ يَكُونُ عَاجِزًا عَنْ رَدِّ عَاقِبَةِ فِعْلِهِ كَعَجْزِ بَنِي آدَمَ عَنْ دَفْعِ الْمَوْتِ عَنْ أَنْفُسِهِمْ وَالْخَرَابِ عَنْ دِيَارِهِمْ[٦].

واتە: بەکارهێنانی (لام العاقبة) بۆ نەزانینی دواڕۆژە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا﴾ [القَصَص: ٨]. لایەنگرانی فیرعەون (موسى)یان

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (١/ ١٤١).
(٢) "تمهيد الأوائل وتلخيص الدلائل" للباقلاني ص٥١.
(٣) "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص٧٨.
(٤) "شفاء العليل" لابن القيم ص١٨٥، ١٨٦.
(٥) "منهاج السنة" لابن تيمية (١/ ١٤٢).
(٦) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٧/ ١٠٠).

هەڵگرتەوە تاوەكوو لە دوارۆژدا ببێتە دوژمن و خەم بۆیان، لێرەدا لامی (لیكون) بۆ دوارۆژە، كە (لام العاقبة)ی پێدەوترێت، واتە لایەنگرانی فیرعەون نەیاندەزانی لە دوارۆژدا (موسى) دەبێت بە دوژمن و خەم بۆیان، كەواتە (لام العاقبة) واتای (لام السببية أو التعليل) ناگرێتەوە لە زمانەوانیدا كە بۆ دیاریكردن و زانینی هۆكارەكانە و ئەشعەرییەكان لایان وایە كە لە قورئاندا نییە.

بەمەش (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَالْحِكْمَةُ لَيْسَتْ مُطْلَقَ الْمَشِيئَةِ إِذْ لَوْ كَانَ كَذَلِكَ لَكَانَ كُلُّ مُرِيدٍ حَكِيمًا[1].

واتە: ئەگەر حیكمەت بە واتای ئیرادە و ویست بێت بە گشتی؛ ئەوا دەبێت هەموو خاوەن ئیرادەیەك حەكیم بێت، كە ئەوەش نابێت و پێچەوانەی واقعە.

وە زۆری شوێنكەوتەی هەرچوار مەزهەبەكە هەڵگری ئەم بیروڕایانەی (أبو الحسن الأشعري)ن لە عەقیدەدا.

وە لەوانەیش كە دژایەتی حیكمەت دەكەن لە كارەكانی خوادا (مذهب الظاهري)یەكانن، لەبەرئەوەی ئەمانە بەگوێرەی بەرنامەی خۆیان باوەڕیان بە (قياس) نییە، وە هۆكاریش (العلة) یەكێكە لە بنەماكانی قیاس كە باوەڕیان پێی نییە، بۆیە حیكمەتیش هەمان بابەتە.

وەكوو (ابن حزم الظاهري) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: من أَرَادَ إِجْرَاء أَفعاله تَعَالَى على الْحِكْمَة الْمَعْهُودَة بَيْننَا وَالْعدْل الْمَعْهُود بَيْننَا فقد ألحد وأخطأ[2].

واتە: ئەوەی بیەوێت كارەكانی خوا بەگوێرەی ئەو حیكمەت و دادپەروەریەی كە لە نێوانماندا هەیە و پێی ئاشناین پێناسە بكات؛ ئەوا گومڕایە و هەڵەی كردووە.

(ابن حزم) مەبەستی نەبوونی حیكمەتە بۆ كارەكانی خوا، بەڵام بەو شێوەیە دەری دەخات كە دەڵێت ئەگەر پێوەر بۆ حیكمەتی خوا پێوەری حیكمەتی ئادەمیزاد بێت لەناو كارەكانیاندا؛ ئەوا بێبڕوایی و هەڵەیە.

بەڵام ئەهلی سوننەت دەڵێت خوا خاوەنی حیكمەتە و پێوەریش بۆ حیكمەتەكەی پێوەری (مخلوقات) نییە.

---

(١) "منهاج السنة" لابن تيمية (١/ ١٤١).

(٢) "المحلى" لابن حزم (١/ ٤٦)، و "الفصل" لابن حزم (٣/ ٩٨)، و "الإحكام" لابن حزم (٨/ ١١٢٦).

**بیروڕای دووەم** (**مثبتوا الحكمة والتعليل**): ئەوانەی کە دان دەنێن بە بوونی حیکمەت و هۆکارەکان لـە کارەکانی خوادا، ئەمانیش پێکهاتوون لـە:

١. المعتزلة.

٣. الكرامية.

٢. الماتريدية.

٤. الشيعة.

بەڵام باوەڕپێبوون و دانپیانانێك بە شێوەیەکی کەم و کورت و ناتەواو و پێنەدانی حەقی خۆی، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ لـێیانەوە باسی دەکات کە دەڵێن: إِنَّ الْحِكْمَةَ الْمَطْلُوبَةَ مَخْلُوقَةٌ مُنْفَصِلَةٌ عَنْهُ أَيْضًا؛ كَمَا يَقُولُ ذَلِكَ مَنْ يَقُولُهُ مِنْ الْمُعْتَزِلَةِ وَالشِّيعَةِ وَمَنْ وَافَقَهُمْ؛ وَقَالُوا: الْحِكْمَةُ فِي ذَلِكَ إحْسَانُهُ إلَى الْخَلْقِ؛ وَالْحِكْمَةُ فِي الْأَمْرِ تَعْوِيضُ الْمُكَلَّفِينَ بِالثَّوَابِ؛ ... فَخَلَقَ الْخَلْقَ لِهَذِهِ الْحِكْمَةِ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَعُودَ إلَيْهِ مِنْ ذَلِكَ حُكْمٌ؛ وَلَا قَامَ بِهِ فِعْلٌ وَلَا نَعْتٌ[(١)].

واتە: دەڵێن حیکمەت خوا دروستی کردووە جیایە لـە خۆی و پەیوەندی بە خۆیەوە نییە، هیچی بۆخۆی ناگەڕێتەوە، نە بە کار نە بە وەسف، وە حیکمەت لـە دروستکراوەکانیدا چاکەیە لـەگەڵ دروستکراوەکانی، واتە لـە (قەدەری کەونی)دا، وە لـە (شەرعی)شدا پاداشتە بۆ بەندەکانی لـەسەر کارە چاکەکان.

وە دەڵێن: ولا يجوز أن يكون خلقهم لنفع نفسه، لأن ذلك لا يجوز عليه[(٢)].

واتە: نابێت بوونەوەری دروستکردبێت بۆ سوودمەندی خۆی، ئەوە بۆ ئەو دروست نییە، بەڵام ئەهلی سوننەت دەڵێن لـە دروستکردنی بوونەوەردا هەندێك لـە حیکمەت دەگەڕێتەوە بۆ خوا خۆی کە پێی خۆشە و پێی ڕازییە، نەك بۆ سوودمەندی و پێویستی خۆی.

بە هۆکاری ئەم قسەیەیان بڕیاری یاسای (واجب فعل الأصلح) بۆ خوا دەدەن کە دەبێت مادام خوا بوونەوەری تەنها بۆ سوودمەندی خۆیان دروستکردووە؛ واجبە لـەسەری کە چی پێویست و بەرژەوەندی (مخلوقات)ی تێدایە ئەو کارانە ئەنجام بدات بۆیان، وە بڕیاری ئەوە نەدرێت

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٨٩).

(٢) "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص٨٩، و "الاقتصاد فيما يتعلق بالاعتقاد" لمحمد بن الحسن الطوسي ص٥٩.

کە کاری بەندەکان دروست دەکات، تاوەکوو لە (عدالة) بێبەری نەبێت، لەبەرئەوەی ئەگەر دروستیان بکات ئەوا دەسەڵاتیان نییە و لێپێچینەوەشیان دەبێتە ستەم، وە دەبێت فەرمانێك کە لە توانای جێبەجێکردندا نەبێت لەبەر قورسییەکەی نەیدات بەسەر بەندەکانیدا (ممنوع تكليف ما لايطاق). بە خوێندنەوەی ئەم هۆکارانەوە کەوتوونەتە ئەوەی بڕیاری حیکمەت بۆ خوا نەدەن.

ئەهلی سوننەتیش دەڵێن ئەو واجبەی کە ئەمان دایدەنێن بۆ خوا و لێی دەرنەچێت؛ بە هیچ شێوەیەك خوا نە لای خۆی واجبی کردووە، نە وادەی ئەوەشی داوە.

**(الماتريدية)**کان دەڵێن: وَالَّذِي بِهِ الْخُرُوج عَن الْحِكْمَة فِي الشَّاهِد وَيبْعَث صَاحبه عَلَيْهِ جَهله أَو حَاجته وهما منفيان عَن الله[١].

واتە: هۆکاری بوونی حیکمەت لە کارێکدا ئەوەیە کە خاوەنەکەی لەبەر نەزانین یاخود پێویستی ئەنجامی بدات، واتە نازانێت و پێی دەوترێت لەبەر ئەم حیکمەتە ئەو کارە ئەنجام بدە، یاخود پێویستی بەو حیکمەتە هەیە بۆیە کارەکە ئەنجام دەدات، ئەم دووانەش لە خواوە دوورە، لەبەرئەوەی خوا زانایە و پێویستیشی پێی نییە.

**(الكرامية)**کان دەڵێن: الْقَوْلُ الثَّالِثُ: قَوْلُ مَنْ أَثْبَتَ حِكْمَةً تَعُودُ إلَى الرَّبِّ؛ لَكِنْ بِحَسَبِ عِلْمِهِ. فَقَالُوا: خَلَقَهُمْ لِيَعْبُدُوهُ وَيَحْمَدُوهُ وَيُثْنُوا عَلَيْهِ وَيُمَجِّدُوهُ[٢].

واتە: ئەمان باوەڕیان بە حیکمەتێك هەیە کە تەنها بۆ خوا بگەڕێتەوە و پەیوەندی بە دروستکراوەکانییەوە نەبێت، وە بۆیە دروستکراوەکانیشی دروستکردووە تا بیپەرستن بە هەموو جۆرەکانی پەرستن.

**(المعتزلة والماتريدية)**کانیش لەسەر بنەمای ئەوەن کە نابێت "کاری هەڵبژاردنی بەردەوام (الأفعال الإختيارية)" پەیوەست بێت بە خواوە، تاوەکوو ئەو کارانە سیفەتی ئەزەلی وەرنەگرن، بەڵکوو تەنها خوا خاوەنی ئەو سیفەتە بێت.

بیروڕای دووەمیش نەیانتوانی لەژێر کاریگەری ئەو بۆچوون و یاسا عەقڵییەدا دەرچن و لە پێوەری "ناسینی خوا بە ڕێگەی دروستکراوەکانی" دەرباز بن، هەریەکەیان لایەنێکیان بۆ گیرا.

---

(١) "التوحيد" لأبي منصور الماتريدي ص٢١٦، و "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص٨٦.

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٩).

## بیروڕای ئەهلی سوننەت لەسەر
## (الحكمة والتعليل)

ئەهلی سوننەت باوەڕیان بە سیفەتی حیکمەت هەیە بۆ خوا، وە کارەکان بە مەبەستی حیکمەت و داناییبوون تیایدا دەکات، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَقَالَ الْجُمْهُورُ مِنْ أَهْلِ السُّنَّةِ، وَغَيْرُهُمْ: بَلْ هُوَ حَكِيمٌ فِي خَلْقِهِ، وَأَمْرِهِ، ... وَمَعْلُومٌ أَنَّ الْإِرَادَةَ تَنْقَسِمُ إِلَى مَحْمُودَةٍ وَمَذْمُومَةٍ[(١)].

وە دەڵێت: فَالْحِكْمَةُ تَتَضَمَّنُ شَيْئَيْنِ: أَحَدُهُمَا: حِكْمَةٌ تَعُودُ إِلَيْهِ يُحِبُّهَا وَيَرْضَاهَا. وَالثَّانِي إِلَى عِبَادِهِ هِيَ نِعْمَةٌ عَلَيْهِمْ يَفْرَحُونَ بِهَا وَيَلْتَذُّونَ بِهَا؛ وَهَذَا فِي الْمَأْمُورَاتِ وَفِي الْمَخْلُوقَاتِ[(٢)].

واتە: کۆدەنگی ئەهلی سوننەت لەسەر ئەوەیە کە خوا خاوەنی حیکمەتە لە قەدەری کەونی و شەرعیدا، وە حیکمەتیش دەبێتە دوو بەشەوە:

**یەکەم:** حیکمەتێك بۆ خوا دەگەڕێتەوە کە پێی خۆشە و پێی ڕازییە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾ [النِّسَاءِ: ١١٣]. خوای پەروەردگار پێی خۆشە و پێی ڕازییە کە پەیام و حیکمەتی بۆ ناردوویت کە کتێب و بەرنامەکەیەتی، وە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُؤۡتَ ٱلۡحِكۡمَةَ فَقَدۡ أُوتِيَ خَيۡرٗا كَثِيرٗا﴾ [البَقَرَةِ: ٢٦٩]. ئەوەی خوا حیکمەتی بداتیّ ئەوا خێرێکی زۆری پێبەخشیوە، وەکوو پێغەمبەران و زانایان کە بە هۆکاری حیکمەتەکانی خواوە عاقڵ و زاناتر بوون، ئەمەش خوا پێی خۆشە و پێی ڕازییە.

**دووەم:** حیکمەتێك هۆکاری بوونەکەی بۆ خۆشی و سوودمەندی بەندەکانی دەگەڕێتەوە، وەك هەواڵ دەدات ئەو کارەی کرد لەبەر ئەوە، یا ئەو فەرمانەی دا لەبەر ئەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلۡكَعۡبَةَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ قِيَٰمٗا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَٱلۡهَدۡيَ وَٱلۡقَلَٰٓئِدَۚ ذَٰلِكَ لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ٩٧﴾ [المَائِدَةِ: ٩٧]. خوای گەورە کەعبەی کردووەتە ماڵی خۆی بۆ جێبەجێکردن و ئەنجامدانی پەرستن و بەندایەتی تیایدا کە مایەی

---

(١) "منهاج السنة" لابن تيمية (١/ ١٤١).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٥، ٣٦).

**سوودمەندییانە ... تاوەکوو بزانن کە خوا زانایە بە ئاسمان و زەوی و بە هەموو شتێك. وە دەفەرموێت:** ﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ﴾ [النساء : ١٦٥]. **خوای پەروەردگار پێغەمبەرانی ناردووە تا ببنە هۆکاری موژدە و ئاگادارکردنەوە بۆ خەڵکی، تاوەکوو خەڵك بەڵگەیان نەمێنێت لای خوا.**

**کەواتە لای ئەهلی سوننەت حیکمەت و هۆکارەکان بوونیان هەیە لە بەڕێوەبردن و دروستکردنی بوونەوەر و فەرمانە شەرعییەکاندا (مخلوقات ومأمورات)، بە گەڕانەوەی هەندێك لەو حیکمەتانە بۆ خوا، وەکوو خۆی پێی خۆشە و پێی ڕازییە ئەو کارانە بەو شێوازانە بێت، تا ببێتە هۆکاری سوپاس و ستاییش و وەسف و پەرستن و بەندایەتی دروستکراوەکانی، وە دەرکەوتنی دەسەڵات و بەها و قەدر و گەورەیی ئەو، وە لەلایەکی تریشەوە بە گەڕانەوەی هەندێکی تری ئەو حیکمەتانە بۆ بەندەکانی، لە کامڵبوونیان و هیدایەت و سوودمەندییەکانی دونیا و دواڕۆژیان.**

  

# بـــابەتـــی چـــوارەم

## بە چاك و خراپ زانین لە پێزانینی عەقڵەوە

## ( التحسين والتقبيح العقليين )

پێشەکی عەقڵ بریتییە لەو بەهرە و نیعمەتەی کە خوا داویەتی بە بەندەکانی و بەو هۆکارەشەوە هەموو بوونەوەرەکانی چواردەوری بۆ ژێردەستە کردووە و خۆیشی باڵادەست کردووە بەسەریاندا، بەڵام عەقڵیش وەکوو هەموو شتەکانی تر یاخیبوون و گومڕایی و لێتێکچوون ڕووی تێدەکات، تا گەیشتووەتە ئاستێك لێپێچینەوە و یاسا و بنەما بۆ خوا دادەنێت و هەموو سنوورەکان دەبەزێنێت، تا وای لێدێت دەبێتە بەڵا بەسەر خاوەنەکەیەوە و نەزانێك و نەخوێندەوارێك و کەسێکی بەکارنەهێنەری زۆر سەلامەتتر دەبێت لە بەناو عاقڵ و خوێندەوار و بەکارهێنەری، وەکوو دەڵێن گەورەیی بۆ خوا کە عاقڵ حەیرانە و نەزان سەلامەتە.

لەپاش ئەوەی لە بابەتی (أفعال العباد)دا زانیمان کە ئادەمیزاد خاوەن بژاردە و ئیرادەیە و هیچ کارێکی بەزۆر پێناکرێت، وە لە بابەتی (تنزيه الله عن الظلم) زانیمان کە بە هیچ شێوەیەك لە کارەکانی خوادا ستەمکردنێك لە دروستکراوەکان بوونی نییە، بۆیە نە بەزۆر و نە بەبێ هۆکار گومڕایی و سزا نادات بەسەر بەندەکانیدا، وە لە بابەتی سێهەمیشدا (الحكمة والتعليل) هەموو کارە کەونییەکانی بۆ بەڕێوەبردنی (مخلوقات) پڕە لە هۆکار و ووردەکاری پڕ حیکمەت و دانایی پەروەردگار، وە لە قەدەری شەرعیشدا کۆی هەموو فەرمانەکانی لەسەر سوودمەندییەکانی ئادەمیزاد و چواردەوری بنیاد نراوە و ڕەچاوی حیکمەت و دانایی و هۆکاری تەواوی پێخۆشبوون و ڕازیبوونی خوایەتی خۆی و سوودمەندی بەندەکانی تێدایە و هۆکاری داڕشتنی ئەو شەریعەتەیە.

کەواتە بەم زنجیرە باسانە دەمانەوێت وەڵامی پرسیار و گومانێکی زۆری خەڵکی بدەینەوە دەربارەی قەدەر و ووردەکارییەکانی خوا لە (مخلوقات)یدا، کە ئەو پرسیارانە زۆرن و لەبن نایەن، بەڵام ئێمە بە شێوەی یاسا و بنەما ئەم بابەتە باس دەکەین، تاوەکوو وەڵامی خۆیانی تێدا وەربگرن، وەك پرسیار دەکرێت دەڵێن: خوا بۆ ئەوەی کرد؟ یاخود بۆ منی دروستکرد؟ یاخود بۆ ئەوەی نەکرد؟ یاخود چ سوودێك لە بوونی ئەمانەدا هەیە؟ یاخود دەبوایە ئەوەی نەکردایە ... ئەمانە و بە لێشــاو پرسیاری تر ، بەڵام خـۆ بە لایەنی کەمەوە خوا عەقل و تێگەیشتنی بە ئادەمیزاد بەخشیوە و

بەو ڕێگەیەوە دەتوانێت لە زۆری شتەکان تێبگات، وەك لەم باسەدا دێت.

پاش ئەو سێ بابەتەی باسکران دەمانەوێت ئەوە بسەلمێنین لە قەدەری کەونی و شەرعیدا ئەو کارانەی کە ئادەمیزاد سەربەستە تیایاندا و ئەو کارانەشی کە پەروەردگار لە کەونی و شەرعیدا دەیکات بە دادپەروەری و ئەو حیکمەت و هۆکارانەی کە ڕەچاوکراوە لە بوونەوەر و کارەکانیاندا؛ ئایا دەتوانرێت بە عەقڵ بڕیار بدرێت لەسەر چاك و خراپییان؟ تاوەکوو بکەوێتە ژێر بڕیاری ئادەمیزاد و هەڵبژاردەکانیەوە.

گومان لەوەدا نییە کە (مخلوق) لەخۆگری هەموو سیفەتەکانی کەم و کورتی و ناتەواوییە، ناتوانێت لە (خالق) و نهێنی دروستکراوەکانی و وردەکاری کارەکانی بگات تاوەکوو خاوەن بڕیار بێت، لەبەرئەوەی بوونی ئادەمیزاد و ژیانی گرێدراوە بە بوونی هەموو بوونەوەر و چواردەورییەوە، بۆیە ئەستەمە لە زۆر کاردا بگاتە دڵنیایی، وە کاری ئادەمیزاد خۆیشی نەدراوەتە دەست خۆی، لەبەر کەم و کورتی و ناتەواوی لە هەموو شتێکی خۆیدا.

بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی ئەم بابەتە لە پێوانەی بیروڕا عەقڵی و فەلسەفییەکاندا، بزانین فیرەقە عەقڵانییەکان چی دەڵێن:

**١. ڕای یەکەمیان لە تێڕوانینی هۆکار و حیکمەتەکانی خوا لە کارەکانیدا، ئایا دەتوانرێت بە ڕێگەی عەقڵ دەرك بکرێت بە چاکی و خراپییان و بڕیاریان لەسەر بدرێت؟**

ئەوانەی پەروەردە و کاریگەری فەلسەفە و عەقڵییان لەسەرە وەك:

**١. المعتزلة.**

**٢. الشيعة.**

**٣. الكرامية.**

**٤. مدرسة أبي حنيفة.**

**٥. الماتريدية.**

**٦. عدد من علماء المذاهب.**

**٧. الإباضية.**

**٨. الفلاسفة**[(١)].

---

(١) "منهاج السنة" لابن تيمية (١/ ٤٩٩)، و "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٩/ ٦١)، و "الشبهات النقلية" لهند =

**دەڵێن:** أن الحسن والقبح صفتان ذاتيتان في الأشياء، فالحاكم بالحسن والقبح هو العقل، والفعل الحسن أو قبيح؛ إما لذاته، وإما لصفته من صفاته لازمة له، وإما لوجوه واعتبارات أخرى، وأما الشرع فإنه كاشف ومبين لتلك الصفات فقط[١].

**واتە: چاك و خراپ وەسفێكی خودی خۆیی ناوەڕۆكی شتەكانە، وە بڕیاردەر بە چاك و خراپ بەسەر شتەكاندا عەقڵە، چاكە و خراپەكان بە خۆیەتی خۆیان چاكن یان خراپن (وەك ڕاستگۆیی و درۆ، خودی هەردووكیان هۆكارن بۆ ئەوەی كە ڕاستگۆیی چاكە بۆیە چاكە، وە درۆ خراپە بۆیە خراپە)، یاخود بڕیاردانەكە بە هۆكاری وەسفێكی پەیوەستبووەوەیە پێوەی، (وەك: ڕاستگۆیی چاك نییە ئەگەر وەسفێكی وەكوو "سوودمەندی" پێوە نەبێت، واتە ڕاستگۆیی سوودمەندی تێدایە بۆیە چاكە، وە هەروەها درۆ وەسفێكی زەرەرۆمەندی پێوە نەبێت ناونابرێت بە خراپە)، یاخود بە ڕەچاوكردنی چەند شتێكی تر بێت لە چواردەوری، (وەك: زللەیەك لە بێ باوكێك بدرێت، گەر بۆ پەروەردەكردنی بێت ئەوا چاكە، وە گەر وەكوو ستەملێكردنی بێت ئەوا خراپە)، وە شەرعیش دەوری پاڵپشتی هەیە وەك دەرخەر و ڕوونكەرەوەیەكی زیاتری ئەو سیفەتە چاك و خراپانەی كە هەیە، واتە بەبێ شەرعی خواش عەقڵ دەرك بە هەموو چاك و خراپەكان دەكات، وە شەرع هیچ كارێكی تازە ناهێنێت بێجگە لەوانە نەبێت كە عەقڵ بڕیاری لەسەر داوە.**

**(القاضي عبد الجبار الهمذاني) دەڵێت:** واعلم أن النهي الوارد عن الله عز وجل يكشف عن قبح القبيح لا أنه يوجب قبحه، وكذلك الأمر يكشف عن حسنه لا أنه يوجبه[٢].

**واتە: حەرامكراوە خواییەكان مەبەست و كاری دەرخستنی خراپەیان هەیە نەك دەركپێكردن، وە هەروەها فەرمانەكانیشی بە چاكە. واتە شەرع بڕیاردەر نییە، بەڵكوو عەقڵ بڕیاردەرە لەسەر شتەكان، وە بەم هۆكارەوە بەبێ بوونی شەرع و هاتنی پێغەمبەرانیش؛ هەموو چاكەكان واجبە و هەموو خراپەكانیش حەرامە، وە پاداشت و سزاش دادەبەزێتە سەر خاوەنەكەی.**

---

= بنت دخيل الله ص١٣٥، و "القضاء والقدر" لعبد الرحمن صالح المحمود ص٢٤٨.

(١) "القضاء والقدر" لعبد الرحمن صالح المحمود ص٢٥١، ٢٥٢، و "القدر" لابن تيمية ص٤٣١، و "شرح العقيدة الأصفهانية" (١/ ٢١٦)، و "مجموع الفتاوى" (٨/ ٤٣١)، و "مجموعة الرسائل" (٥/ ١٢٠)، و "الأصول الخمسة" للقاضي عبد الجبار الهمذاني ص٥٦٥، و "الإرشاد" للجويني ص٢٥٨.

(٢) "المحيط بالتكليف" للقاضي عبد الجبار الهمذاني ص٢٥٤، و "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص١٣٥.

**٢. ڕای دووەم ئەوانەی ڕایان وایە كە بە عەقڵ دەرك ناكرێت بە چاك و خراپی كارەكان، بەڵكوو تەنها شەرع دیاریكارە، هەرچییەك شەرع دیاری بكات كە چاكە، ئەوە چاكە، وە هەرچییەك شەرع دیاری بكات كە خراپە، ئەوە خراپە، وە پاداشت و سزاش ئەوكات دادەبەزێتە سەری، ئەمانیش وەك:**

**١. الأشاعرة.**

**٢. ابن حزم.**

**٣. القاضي أبو يعلى.**

**٤. ابن حاجب من المالكية[١].**

(**الجويني**) **دەڵێت**: العقل لا يدل عن حسن شيء ولا قبحه في حكم التكليف، وإنما يتلقى التحسين والتقبيح من موارد الشرع وموجب السمع [٢].

**واتە: عەقڵ هیچ دەركپێكردنێكی نییە بۆ دیاریكردنی چاك و خراپی شتەكان، بەڵكوو چاك و خراپ تەنها لە شەرعەوە وەردەگیرێت.**

(**الأشعري**) **دەڵێت**: أن القبيح من أفعال خلقه ما نهاهم عنه، وزجرهم عن فعله، وأن الحسن ما أمرهم به، أو ندبهم إلى فعله، أو أباحه لهم[٣].

**واتە: خراپە ئەوەیە شەرع ڕێگری لێ بكات، وە چاكەش ئەوەیە كە شەرع فەرمانی پێبكات یاخود ڕێگەی پێبدات.**

**وە (ابن حزم) یش دەڵێت**: لَيْسَ فِي الْعَالم شَيْء حسن لعَينه وَلَا شَيْء قَبِيح لعَينه لَكِن مَا سَمَّاهُ الله تَعَالَى حسنا فَهُوَ حسن ... وَمَا سَمَّاهُ الله تَعَالَى قبيحاً فَهُوَ حَرَكَة قبيحة[٤].

---

(١) "شرح العقيدة الأصفهانية" لابن تيمية ص٢١٦، و "القدر" لابن تيمية (٨/ ٤٢٨)، و "الفصل" لابن حزم (٣/ ٩٨)، و "الإنصاف" للباقلاني ص٤٩، و "الملل" للشهرستاني (١/ ١١٥)، و "القضاء والقدر" لعبد الرحمن صالح المحمود ص٢٥٠، و "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص١٨٠.

(٢) "الإرشاد" للجويني ص٢٥٨.

(٣) "رسالة إلى أهل الثغر" لأبي الحسن الأشعري ص١٣٧.

(٤) "الفصل" لابن حزم (٣/ ٣٩).

واتە: هیچ شتێك لـە جیهاندا بۆ خودی خۆی چاك نییە و خراپیش نییە، بەڵام ئەوەی کە خوا ناوی برد بە خراپ خراپە و ئەوەشی ناوی برد بە چاك چاکە.

کەواتە ئەگەر شەرع کارەکان پێچەوانە بکات، دروستە و هیچ گۆڕانکارییەکیان بەسەردا نایەت، واتە فەرمان بە کردنی ڕێگرییەکان (حرام) بدات و ڕێگری لـە فەرمانە چاکەکان (أوامر) بگرێت؛ ئەوا پێچەوانە دەبێتەوە، چاکەکان دەبنە خراپە و خراپەکانیش دەبنە چاکە، وەکوو **(الجرجاني) دەڵێت**: ولو عكس الشارع القضية فحسن ما قبحه وقبح ما حسنه لم يكن ممتنعاً وانقلب الأمر، فصار القبيح حسناً، والحسن قبيحاً[(١)].

واتە: خۆ ئەگەر شەرع بابەتەکە پێچەوانە بکاتەوە، ئەوا ڕێگری لێ ناکرێت و بە چاك دەوترێت خراپ و بە خراپیش دەوترێت چاك!

کەواتە هیچ بوارێك بۆ زانینەکانی عەقڵ نەما، بەڵکوو ڕووکەشی شەرع پێوەرە بەبێ بنەما زانستییەکانی عەقڵ و (فطرة) و خاڵە هاوبەشەکانی نێوان عەقڵ و شەرع، وە بگرە پاداشت و سزاش تەنها لـەسەر شەرعە.

بیروڕای فیرەقەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەریەك لـە خۆیان بە هۆکاری بەرنامەکانیانەوە نەیانتوانیوە حەق بپێکن.

## بیروڕای ئەهلی سوننەت لەسەر
## (التحسين والتقبيح العقليين)

ئەهلی سوننەت هەموو تێڕوانین و بیروڕاکانی تێگەیشتنیان بۆ خاڵە ناکۆکەکانی نێوان خۆیان و فیرەقەکان بە شێوەی ووردکردنەوە و ووردبینییە، لـەبەرئەوەی فیرەقەکان بەرنامەیان ورووژاندنی چەند وشەیەکی کورت و مانا لـێکچووە، کە یەکلابوونەوە تیایدا بەدەست نایەت، وەکوو **(ابن القيم)** رَحِمَهُ ٱللَّهُ **دەڵێت**: إذا تأملها اللبيب العاقل الفطن وجدها مبنية على ألفاظ مجملة ومعاني مشتبهة[(٢)].

---

(١) "شرح المواقف" للجرجاني ص٢٠٢.

(٢) "الصواعق المرسلة" لابن القيم (٣/ ١١٨١).

**واته: ئەگەر كەسێكی وریای ووردبین تێبڕوانێت دەبینێت بنەمای بیروڕاكانیان لەسەر چەند وشەیەكی كورتە و چەند واتایەكی هاوشێوەیە.**

وە (ابن تيميه)ش رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: رَدُّ بِدْعَةٍ بِبِدْعَةِ، وَقَابَلَ الْفَاسِدَ بِالْفَاسِدِ وَالْبَاطِلَ بِالْبَاطِلِ؛ ... يَتَكَلَّمُونَ بِالْمُتَشَابِهِ مِنْ الْكَلَامِ وَيُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ وَيَخْدَعُونَ جُهَّالَ النَّاسِ بِمَا يُشَبِّهُونَ عَلَيْهِمْ[١].

**واته: ئەنجامی بیروڕاكانیان بریتییە لە: بەرپەرچی بیدعە بە بیدعە و گومڕایی بە گومڕایی دەدەنەوە، وە بەتاڵ بە بەتاڵ، وە قسەكانیان لە تێكەڵەیەكی هاوشێوە دەچێت كە هەندێك لایەنی حەق لەخۆ بگرێت، بۆیە قسەكان لە شوێنی خۆیان دەگۆڕن و دەبێتە هۆكاری هەڵخەڵەتاندنی خەڵكی نەزان و لێتێكدانیان.**

**ئەمەش هۆكاری هەموو گومڕاییەكانە، وەكوو دەڵێت:** وَأَمَّا الْأَلْفَاظُ الْمُجْمَلَةُ فَالْكَلَامُ فِيهَا بِالنَّفْيِ وَالْإِثْبَاتِ دُونَ الِاسْتِفْصَالِ يُوقِعُ فِي الْجَهْلِ وَالضَّلَالِ، وَالْفِتَنِ وَالْخَبَالِ، وَالْقِيلِ وَالْقَالِ، وَقَدْ قِيلَ: أَكْثَرُ اخْتِلَافِ الْعُقَلَاءِ مِنْ جِهَةِ اشْتِرَاكِ الْأَسْمَاءِ[٢].

**واته: بەرنامەی ئەهلی بیدعە بریتییە لە واتاكردنی هەموو ئەو وشە كورتانە بە شێوەی باوەڕپێبوون و باوەڕپێنەبوون، بەبێ شیكردنەوە، كە دەبێتە هۆكاری كەوتنە ناو نەزانین و گومڕایی و وتی و وتی و دەمەقاڵێ لەسەری، بۆیە دەڵێن هۆكاری بوونی زۆری جیاوازییەكان و دووبەرەكایەتییەكانی نێوان ئەهلی عەقڵ كێشە نانەوەیە لەسەر ئەو ناوانەی كە واتای زۆر لەخۆدەگرن.**

**دەرئەنجامەكەشی وەكوو دەڵێت:** وَذَلِكَ بِسَبَب ترك بعض الْحق وَأخذ بعض الْبَاطِل وكتمان الْحق وَلبس الْحق بِالْبَاطِلِ[٣].

**واته: كەوتنە ناو گومڕاییەكانە بە هۆكاری وازلێهێنانی هەندێك لە حەق و لەخۆگرتنی هەندێك لە بەتاڵ و شاردنەوەی حەقەكان و لەبەركردنی بەرگی حەق بە بەتاڵدا.**

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٣٢٢)، و "الفتاوى الكبرى" (١/ ١٤٩).

(٢) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٢/ ٢١٧).

(٣) "الاستقامة" لابن تيمية (١/ ٣).

**ئەمە هۆکاری ئەو ڕا جیاواز و بەرامبەرانەیە وەك لەم بابەتەدا بەدیدەکرێت، بەڵام ئەهلی سوونەت وەکوو (ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت:** أَنَّ أَهْلَ السُّنَّةِ يَعْرِفُونَ الْحَقَّ وَيَرْحَمُونَ الْخَلْقَ فَلَهُمْ نَصِيبٌ وَافِرٌ مِنَ الْعِلْمِ وَالرَّحْمَةِ[1].

**واتە: ئەهلی سوننەت ئاشناترین کەسن بەسەر حەقدا و بەبەزەیین لەگەڵ خەڵکدا، بۆیە لەخۆگری بەشێکی زۆری زانست و هیدایەتە پڕ بەزەییەکەی خوان.**

## ئەهلی سوونەت لەسەر ئەم بابەتەش بە شێوەیەکی وورد و شیکار دەڵێن:

✐ **(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت:** هَاهُنَا أَمْرَانِ مُتَغَايِرَانِ لَا تَلَازُمَ بَيْنَهُمَا.

**أَحَدُهُمَا:** هَلِ الْفِعْلُ نَفْسُهُ مُشْتَمِلٌ عَلَى صِفَةٍ اقْتَضَتْ حُسْنَهُ وَقُبْحَهُ، بِحَيْثُ يَنْشَأُ الْحُسْنُ وَالْقُبْحُ مِنْهُ، فَيَكُونُ مَنْشَأً لَهُمَا أَمْ لَا؟

**وَالثَّانِي:** أَنَّ الثَّوَابَ الْمُرَتَّبَ عَلَى حُسْنِ الْفِعْلِ، وَالْعِقَابَ الْمُرَتَّبَ عَلَى قُبْحِهِ، ثَابِتٌ -بَلْ وَاقِعٌ- بِالْعَقْلِ، أَمْ لَا يَقَعُ إِلَّا بِالشَّرْعِ؟[2].

**واتە: لەم بابەتەدا دوو خاڵی جیاواز هەیە کە پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە:**

**یەکەم: ئایا کارەکان خۆیان لەخۆگر و خاوەنی سیفەتی چاك و خراپن، تاوەکوو لەوانەوە ئەو دوو سیفەتە وەربگیرێت؟**

**دووەم: یاخود: ئایا پاداشت و سزا لەسەر کارە چاکەکان و خراپەکان بە عەقڵ دادەبەزێتە سەریان یاخود بە شەرع؟**

**وە دەڵێت:** وَالْحَقُّ الَّذِي لَا يَجِدُ التَّنَاقُضُ إِلَيْهِ السَّبِيلَ أَنَّهُ لَا تَلَازُمَ بَيْنَهُمَا، وَأَنَّ الْأَفْعَالَ فِي نَفْسِهَا حَسَنَةٌ وَقَبِيحَةٌ، كَمَا أَنَّهَا نَافِعَةٌ وَضَارَّةٌ، ... وَلَكِنْ لَا يَتَرَتَّبُ عَلَيْهِمَا ثَوَابٌ وَلَا عِقَابٌ إِلَّا بِالْأَمْرِ وَالنَّهْيِ، وَقَبْلَ وُرُودِ الْأَمْرِ وَالنَّهْيِ لَا يَكُونُ قَبِيحًا مُوجِبًا لِلْعِقَابِ مَعَ قُبْحِهِ فِي نَفْسِهِ، بَلْ هُوَ فِي غَايَةِ الْقُبْحِ، وَاللهُ لَا يُعَاقِبُ عَلَيْهِ إِلَّا بَعْدَ إِرْسَالِ الرُّسُلِ، ... أَمَّا الْأَوَّلُ: فَفِي قَوْلِهِ تَعَالَى:

---

(١) "مختصر الصواعق المرسلة" ص٦٠٤.

(٢) "مدارج السالكين" لابن القيم (١/ ٢٤٦).

﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ [الإسراء: ١٥]. ... فَتَكُونُ الْآيَةُ دَالَّةً عَلَى الْأَصْلَيْنِ: أَنَّ أَفْعَالَهُمْ وَشِرْكَهُمْ ظُلْمٌ قَبِيحٌ قَبْلَ الْبَعْثَةِ، وَأَنَّهُ لَا يُعَاقِبُهُمْ عَلَيْهِ إِلَّا بَعْدَ الْإِرْسَالِ، ... وَأَمَّا الْأَصْلُ الثَّانِي: وَهُوَ دَلَالَتُهُ عَلَى أَنَّ الْفِعْلَ فِي نَفْسِهِ حَسَنٌ وَقَبِيحٌ فَكَثِيرٌ جِدًّا، كَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾ [الأعراف: ٣٢]. دَلَّ عَلَى أَنَّهُ طَيِّبٌ قَبْلَ التَّحْرِيمِ، ... ثُمَّ قَالَ: ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾ [الأعراف: ٣٣]. فَالظُّلْمُ ظُلْمٌ فِي نَفْسِهِ قَبْلَ النَّهْيِ وَبَعْدَهُ، وَالْقَبِيحُ قَبِيحٌ فِي نَفْسِهِ قَبْلَ النَّهْيِ وَبَعْدَهُ، وَالْفَاحِشَةُ كَذَلِكَ، وَكَذَلِكَ الشِّرْكُ، لَا أَنَّ هَذِهِ الْحَقَائِقَ صَارَتْ بِالشَّرْعِ كَذَلِكَ. نَعَمْ، الشَّارِعُ كَسَاهَا بِنَهْيِهِ عَنْهَا قُبْحًا إِلَى قُبْحِهَا، فَكَانَ قُبْحُهَا مِنْ ذَاتِهَا، وَازْدَادَتْ قُبْحًا عِنْدَ الْعَقْلِ بِنَهْيِ الرَّبِّ تَعَالَى عَنْهَا وَذَمِّهِ لَهَا، وَإِخْبَارِهِ بِبُغْضِهَا وَبُغْضِ فَاعِلِهَا[1].

واتە: ڕاست و دروستی ئەم بابەتە لەوەدایە کە ئەم دوو بابەتە پەیوەست نین بەیەکەوە، گەر کارەکان بۆخۆیان چاك و خراپ و سوودمەند و زیانبەخش بن هۆکار نین بۆ ئەوەی پاداشت و سزا دابەزێتە سەریان، لەبەرئەوەی بە فەرمانی خوا خۆی بەو شێوەیە دەبێت، ئەگەرچی خۆی بۆخۆی خراپەکان لەخۆگری خراپەن، بەڵام سزای لەسەر نابێت پێش ناردنی پێغەمبەران، بەڵگەش لەسەر ئەم دوو بابەتە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ [الإسراء: ١٥]. واتە ئێمە سزای کەس نادەین تاوەکوو پێغەمبەرانیان بۆ دەنێرین، ئەمە هەردووکی دەگرێتەوە، یەکەم: تاوان و هاوبەش بڕیاردانەکانیان بۆ خوا، خۆی بۆخۆی پێش پێغەمبەران خراپن و شاییستەی سزان، بەڵام سزا نادرێن تاوەکوو پێغەمبەرانیان بۆ ڕەوانە نەکرێن، دووەم: هەموو کارەکان بۆخۆیان لەخۆگری سیفەتی چاك و خراپن، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾ [الأعراف: ٣٢]. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو ڕۆزییانە پاکن پێش حەرامکردنیان بە ناحەق لەسەر خۆیان، بۆیە پاش ئەم ئایەتە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾ [الأعراف: ٣٣]. بەڵێ خوا خراپەکانی

(١) "مدارج السالكين" لابن القيم (١/ ٢٤٧ - ٢٥٠).

حەرامکردووە لە ئاشکرا و شاراوەکان، ستەم و خراپە و هاوبەش بڕیاردان بۆخۆیان خراپن پێش حەرامکردنیشیان و ڕێگری لێکردنیان لەلایەن خواوە، بە حەرامکردنی خوایی لەسەریان زیاتر لە خراپی خۆیان خراپتر بوون، بەتایبەت کە سزایان لەسەر دانرا و خاوەنەکانیان بە خراپ باسکران و بێزران.

**ووردەکاری بڕیاردانیش لەسەر چاك و خراپ بەم شێوەیەیە:**

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** وَقَدْ ثَبَتَ بِالْخِطَابِ وَالْحِكْمَةِ الْحَاصِلَةِ مِنْ الشَّرَائِعِ ثَلَاثَةُ أَنْوَاعٍ؛ **أَحَدُهَا**: أَنْ يَكُونَ الْفِعْلُ مُشْتَمِلًا عَلَى مَصْلَحَةٍ أَوْ مَفْسَدَةٍ وَلَوْ لَمْ يَرِدْ الشَّرْعُ بِذَلِكَ كَمَا يَعْلَمُ أَنَّ الْعَدْلَ مُشْتَمِلٌ عَلَى مَصْلَحَةِ الْعَالَمِ وَالظُّلْمَ يَشْتَمِلُ عَلَى فَسَادِهِمْ فَهَذَا النَّوْعُ هُوَ حَسَنٌ وَقَبِيحٌ وَقَدْ يُعْلَمُ بِالْعَقْلِ وَالشَّرْعِ قُبْحُ ذَلِكَ لَا أَنَّهُ أَثْبَتَ لِلْفِعْلِ صِفَةً لَمْ تَكُنْ، ... **النَّوْعُ الثَّانِي**: أَنَّ الشَّارِعَ إذَا أَمَرَ بِشَيْءٍ صَارَ حَسَنًا وَإِذَا نَهَى عَنْ شَيْءٍ صَارَ قَبِيحًا وَاكْتَسَبَ الْفِعْلُ صِفَةَ الْحُسْنِ وَالْقُبْحِ بِخِطَابِ الشَّارِعِ. **وَالنَّوْعُ الثَّالِثُ**: أَنْ يَأْمُرَ الشَّارِعُ بِشَيْءٍ لِيَمْتَحِنَ الْعَبْدَ هَلْ يُطِيعُهُ أَمْ يَعْصِيهِ وَلَا يَكُونُ الْمُرَادُ فِعْلَ الْمَأْمُورِ بِهِ كَمَا أَمَرَ إبْرَاهِيمَ بِذَبْحِ ابْنِهِ فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ حَصَلَ الْمَقْصُودُ فَفَدَاهُ بِالذَّبْحِ ... فَالْحِكْمَةُ مَنْشَؤُهَا مِنْ نَفْسِ الْأَمْرِ لَا مِنْ نَفْسِ الْمَأْمُورِ بِهِ وَهَذَا النَّوْعُ وَالَّذِي قَبْلَهُ لَمْ يَفْهَمْهُ الْمُعْتَزِلَةُ؛ وَزَعَمَتْ أَنَّ الْحُسْنَ وَالْقُبْحَ لَا يَكُونُ إلَّا لِمَا هُوَ مُتَّصِفٌ بِذَلِكَ بِدُونِ أَمْرِ الشَّارِعِ وَالْأَشْعَرِيَّةُ ادَّعَوْا: أَنَّ جَمِيعَ الشَّرِيعَةِ مِنْ قِسْمِ الِامْتِحَانِ وَأَنَّ الْأَفْعَالَ لَيْسَتْ لَهَا صِفَةٌ لَا قَبْلَ الشَّرْعِ وَلَا بِالشَّرْعِ؛ وَأَمَّا الْحُكَمَاءُ وَالْجُمْهُورُ فَأَثْبَتُوا الْأَقْسَامَ الثَّلَاثَةَ وَهُوَ الصَّوَابُ(١).

واتە: بەگوێرەی شەرع و عەقڵ و داناییەك كە لە شەریعەتەوە وەرگیرابێت، ئەم بابەتە سێ جۆرە:

**یەکەم:** کارەکان لەخۆگری سوودمەندی و زیانن، ئەگەر شەرعیش لەسەری دانەبەزیبێت، وەك چۆن دادپەروەری لەخۆگری سوودمەندی هەموو جیهانە، وە ستەمیش لەخۆگری هەموو

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٤٣٤ - ٤٣٦).

خراپەیەکە، ئەم جۆرە چاکە و خراپانە بە ڕێگەی عەقڵ و شەرعیش دەزانرێت، نەك بەو واتایەی کە سیفەتێکی بۆ دروست دەبێت و لەخۆی دەگرێت کە نەیبووبێت.

**دووەم:** گەر شەرع فەرمانی دا بە هەر کارێك ئەوا چاکە، وە گەر ڕێگری لە هەر کارێك کرد ئەوە خراپە، کەواتە بە هۆکاری دارِشتنەکانی شەرعەوە سیفەتی چاك و خراپی پێدرا.

**سێیەم:** دەشێت شەرع فەرمان بە کارێك بدات بۆ تاقیکردنەوەی بەندەکانی کە ئایا گوێڕایەڵی دەکرێت یاخود فەرمانی دەشکێنرێت؟ مەبەست بەمە هاتنەدی فەرمانەکە نییە، هەروەك فەرمانەکەی کە بە (إبراهیم) ﷺ کرا بە سەربڕینی کوڕەکەی، بۆیە کاتێك ئامادە بوو بۆ جێبەجێکردنی کارەکە مەبەستەکە هاتە دی و مەڕێك لە بریتی سەربڕدرا، هەروەکوو لە فەرموودەکەدا باسی تاقیکردنەوەی کەسێکی بەڵەك و کوێرێك و کەچەڵێك (أبرص وأقرع وأعمى) کراوە، مەبەست لەمانە تاقیکردنەوەیە نەك جێبەجێکردن.

(معتزلة)کان باوەڕیان تەنها بە بەشی یەکەمی ئەم دابەشکردنە هەیە و باوەڕیان بە دووەم و سێیەم نییە و لێی تێنەگەیشتوون و دەڵێن: چاك و خراپ سیفەتی (ذاتي) خۆیانە و فەرمانی شەرع ئەو سیفەتانەی بۆ دروست نەکردوون.

ئەشعەرییەکانیش باوەڕیان بە بەشی دووەم و سێیەمە و دەڵێن: هەموو دین تاقیکردنەوەیە، واتە ویستی ڕەها (المشیئة المطلقة)ی خواییە، وەك لەمەوپێش باسمان کرد، کە دانایی و هۆکارەکان (الحکمة والتعلیل) بوونیان نییە لە شەرعدا، وە لێرەشدا دەڵێن کارەکان خاوەنی هیچ سیفەتێکی چاك و خراپ نین، نە لەپێش شەرع و نە بە شەرعیش، مەبەست پێی بەس فەرمانەکەی خوایە گەر بە هەر شێوەیەك بوونی هەبوو ئەوە چاکە وە ڕێگری بوو ئەوە خراپە، نەك بوونی چاکە و خراپە لە کارەکەدا، بۆیە دەشێت کارەکان پێچەوانە ببنەوە، بۆ نموونە بەهەشتییەکان دۆزەخی بن و دۆزەخییەکانیش بەهەشتی بن، وە دەشێت خواناسان بچنە دۆزەخ و بێبڕوایان بچنە بەهەشتەوە، یاخود شتێك ئەولیای خوا بێت و نەزانێك نزیك بێت لە خوا، بەڵام زانا و خواناسێك خراپترین کەس و دوور بێت لە بەزەیی و هیدایەتی خواوە، وە حەڵاڵەکان حەرام بن و حەرامەکانیش حەڵاڵ بن، بەڵام کۆی زانایان و دانایانی ئەهلی سوننەت چاك و خراپیان بەم سێ حاڵەوە پەیوەست کردووە.

موعتەزیلەکان هەموو بڕیارەکانیان بۆ خوا بە هاوشێوەی بڕیارەکانی ناو بەندەکانی داناوە، بۆیە ئەوەی کە بەندەکان بە چاك و خراپی دادەنێن بۆ خۆیان؛ بە هاوشێوەی ئەوەش بۆ خوای بڕیار دەدەن، وە ئەوەی لەسەر بەندەکانی حەرامە بۆ خواش حەرامە، وە ئەوەی کە لە عەقڵی ئادەمیزاددا باشە دەبێت لای خواش باش بێت، وە ئەوەی خراپ بێت دەبێت خراپ بێت، بۆیە پێیان دەوترێت: (مشبهة الأفعال، ومعطلة الصفات)، واتە شوبهێنەرانی کارەکانی خوا و لەکارخەرانی سیفاتەکانی خوا، ئەم تێڕوانینەیان بووە هۆکاری ئەو بڕیارەی کە ئادەمیزاد دروستکاری کارەکانی خۆیەتی و خوا دەسەڵاتی تیادا نییە، ئەمەش لە ئەنجامی بەکارهێنانی عەقڵ و زیادەڕەوی بوو تیایدا.

لە ئەنجامی ئەم بیرکردنەوانەیاندا ئەشعەرییەکان دەڵێن: کاری چاکە هۆکاری پاداشت نییە، وە کاری خراپەش هۆکاری سزا نییە، بۆیە ئادەمیزاد هیچ دەسەڵاتێکی لە کارەکانیدا نییە و خاوەنی کارەکانی نییە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا شایستەی پاداشت و سزان لای خوا، ئەم تێڕوانینەشیان پێی دەوترێت (نظرية الكسب).

(معتزلة)کانیش دەڵێن ئەگەر خوا کارەکانی ئادەمیزاد دروستبکات و پاشان سزا و پاداشتیان بداتەوە، ئەوا ستەم لە بەندەکانی دەکات، لەبەرئەوە ئادەمیزاد خۆی کارەکانی دروست دەکات.

ئەشعەرییەکانیش دەڵێن: ئەگەر ئادەمیزاد خۆی کارەکانی خۆی دروستبکات، وە سزا و پاداشتیشیان لێ وەربگیرێت، ئەوا بێدەسەڵاتییە لە کاری خوادا و دەسەڵاتی خوا دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە، لەبەرئەوە دەڵێین خوا دروستی دەکات و دەسەڵات لای ئادەمیزاد نییە. ئەمان باوەڕیان بە قەدەرە و لە ئاستیدا جێبەجێکردنی شەرع بوونی نەما، بەڵام (معتزلة)کان باوەڕیان بە جێبەجێکردنی شەرعە و لە ئاستیدا باوەڕبوون بە قەدەر بوونی نەما.

بەڵام ئەهلی سوننەت بیروباوەڕیان ناوەندە و باوەڕیان بەوەیە کە بە عەقڵ چاك و خراپ دەرکی پێدەکرێت، وە شەرعیش پاڵپشت و ووردبین و ڕوونکەرەوە و تەواوکار و ڕاستکەرەوەی عەقڵە لە دەرکپێکردنیدا، بۆیە ئادەمیزاد خاوەن ئیرادە و توانای خۆیەتی بۆ کارەکانی، وە لە پاش هاتنی شەرع و بەرنامەی خوا و (إقامة الحجة) بەسەر خەڵکەوە؛ ئەوکات شایستەی لێپرسینەوە و پاداشت و سزان و بەم شێوەیە ئەهلی سوننەت پەیوەستن بە شەرع و باوەڕیشیان بە قەدەر هەیە، تێڕوانینیان بۆ کارەکان لەسەر هەردووکیانە، وەکوو ئەشعەرییەکان نین کە باوەڕیان بە

دەرکپێکردنی عەقڵ نەبێت بە چاك و خراپ بۆ کارەکان، وە لە ئەنجامیشدا باوەڕیان بە کار و توانای بەندەکان نەبێت لەسەر کردنی کارەکانیان و بە جۆرێك لە جۆرەکان بەناوی (کسب)ەوە بلێن بەزۆر پێیان دەکرێت.

وە وەکوو (معتزلة)کانیش نین لەسەر دەرککردنی عەقڵ بە تەواوی بەسەر چاك و خراپەکاندا، وە بڕیاری ئەوەش بدەن کە ئادەمیزاد خۆی کاری خۆی دروستدەکات و دەسەڵاتی خوای تیادا نییە[1].

ئەهلی سوننەت بەرنامەیان وایە کە حەق لە هەرشوێنێك و هەرچەندێك بێت و خاوەنەکەی هەرکەسێك بێت وەری دەگرن، بۆیە ئەو حەقەی کە لە ڕای (معتزلة)کاندا هەیە کە دەڵێن: "عەقڵ دەرك بە چاك و خراپ دەکات" ئەوەندەی لێ وەردەگرن، وە ئەو حەقەشی کە لە ڕای (ئەشعەری)یەکاندا هەیە کە دەڵێن: "پاداشت و سزا بە شەرع دادەبەزێتە سەر کارەکان" ئەوەندەی لێ وەردەگرن، ئەوانیتریان کە نەیانپێکاوە لێیان وەرناگرن.

لەلایەکی تریشەوە ئەم بابەتە پەیوەندی بە باوەڕبوون بە قەزا و قەدەرەوە هەیە، کە دەرنەچوونە لێی بە عەقڵ بەبێ تێڕوانین و پاڵپشتی عەقڵی بۆ ووردەکارییەکان و دەرککردن بە نهێنییەکانی قەدەر، کە بە بیرکردنەوەی ئادەمیزاد ناتوانرێت دەرك بەو بابەتە بکرێت بێجگە لە پێشەکی و هەندێ بابەتی نەبێت، وەکوو خوای گەورە جَلَّ وَعَلَا دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ﴾ [الإسراء: ٣٦].

واتە: شوێنی ئەوانە مەکەوە کە زانستتان بەسەریاندا ناشکێت، دەبێتە هۆکاری گومان و بابەتی خەیاڵاوی تیایدا[2].

لە کۆتایی ئەم بابەتەشدا ڕوون بووەوە بە هەموو پێوەرەکانی عەقڵ و بیرکردنەوەی ئادەمیزاد کە بە ناچاری دەبێت باوەڕ بە قەدەر بێنێت و خۆی ڕادەست بکات، لەبەر نەتوانینی دەرکپێکردنی ووردەکارییەکان و بە واقع نەتوانینی چوونەدەرەوەی لە قەدەردا لەلایەك، وە لەلایەکی تریشەوە هەر بەو پێوەرە عەقڵیانە دەرك بە هەموو چاك و خراپەکانی شەرعیش دەکرێت و بواری (بدیل) و

---

(١) "القضاء والقدر" لعبد الرحمن صالح المحمود ص٢٥٧.

(٢) "تفسير ابن كثير" (٥/ ٧٥).

چوونەدەرەوەش نییە لە جێبەجێ نەکردنیشیدا، لەبەر بوونی سیفاتە تەواوەکانی خوایەتی لە (العليم، الخبير، اللطيف، الحكيم، القدير ...) و بوونی هەموو سیفاتە ناتەواوەکانی ئادەمیزاد.

وە هەر بەو پێوەرە عەقڵییەش دەسەلمێت کە بەزۆرپێکردن و بێدەسەڵاتی و نەبوونی توانای جێبەجێکردن لە فەرمانەکانی خوادا بوونی نییە، نە لە قەدەری کەونی و نە لە قەدەری شەرعیشدا، بۆیە هەر پێویستمان بە دینی خوایە و دەبێت تەسلیمی بین، وەك لەم بابەتەی دوای ئەمەدا ڕوون دەبێتەوە و دەیسەلمێنین.

  

# بــابەتــی پــێــنــجــەم

## توانایی و داواکارییەك لە سنووری جێبەجێکردندا نەبێت
## (الإستطاعة والتكليف بما لا يطاق)

گومان لەوەدا نییە کە ئادەمیزاد خاوەنی توانا و ئیرادە و بژاردەی خۆیەتی بۆ کارەکانی، بە هۆکاری بوونی عەقڵ و ئیرادە و تواناکانی لە خۆیدا، وە بە واقع بەرامبەربوونەوەی هەموو جۆرەکانی (تکلیف) و داواکاری جێبەجێکردن پێشی پێ دەگرێت بۆ دونیا و دینی، ئەمانە حاشا هەڵنەگرن بۆ سەلماندنی تواناکانی ئادەمیزاد، وە بەڵگەی زیاتریش وەك:

**یەکەم:** هەستکردنی ئادەمیزاد بە شێوەیەکی پێویست لە کار و کردارەکانی کە بە ویست و ئیرادە و توانای خۆی دێتە دی و گەر ویستی لێبێت دەیکات و ویستی لێ نەبێت نایکات، وە کارەکانیشی لە نەبوونەوە دەکاتە بوون.

**دووەم:** ئادەمیزاد بەردەوام لە هەوڵی یاسا و ڕێکخستندایە بۆ ژیانی، جا بوونی ئەم هەوڵە لە چوارچێوەی دەوڵەت بێت یاخود خوارتر و بچووکتر، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر توانای جێبەجێکردن و بوونی ئیرادە و ویست و سەربەخۆیی لە ناخی ئادەمیزاددا بۆ هێنانەدی کار، نکوولێکردن لەم دووانە دژایەتی عەقڵ و هەستە[(١)].

بۆ تێڕوانینی بوونی ئەم تواناییەش لە ئادەمیزاددا شوێنی ڕای جیاوازە لە نێوان فیرەقەکان و ئەهلی سوننەتدا، ئایا ئەم توانایە پێش ئەنجامدانی کارەکان بوونی هەیە؟ یاخود تەنها لەکاتی ئەنجامدانی کارەکاندا بوونی دەبێت؟ وە ئایا ئەو توانایانە پاش کارەکان بوونی دەمێنێتەوە؟ شیکردنەوەی ئەم بابەتە دەبێتە زیاتر دڵنیابوون لەسەر بوونی حەقیقی تەواوی توانا و ئیرادە و پێویستییەکانی کارکردن لە ئادەمیزاددا و خاوەنی بژاردەی سەربەخۆی خۆیەتی و هیچ کارێکی لەلایەن خواوە بەزۆر پێناکرێت و هیچ پاساو و خۆدەربازبوونێك نییە لە جێبەجێ نەکردنی شەرع و نەچوونە ژێر باری ... بۆ شیکردنەوەی بابەتەکەش پێشەکی بە بەرنامەی ئەهلی سوننەت دەست پێدەکەین، تاوەکوو سەرەتا حەقەکە بناسین ئەوکات ناحەق و هەڵەکان.

---

(١) "الخلاف العقدي في باب القدر" لدكتور: عبد الله بن محمد القرني ص٦٧، و "المحيط بالتكليف" للقاضي عبد الجبار الهمذاني ص٣٤٠.

**توانای ئادەمیزاد (الإستطاعة والقدرة) لای ئەهلی سوننەت دەبێتە دوو بەشەوە:**

١. **الْقُدْرَةُ الشَّرْعِيَّةُ الْمُصَحِّحَةُ لِلْفِعْلِ الَّتِي هِيَ مَنَاطُ الْأَمْرِ وَالنَّهْيِ**: بمعنى الصحة والوسع والتمكن، وسلامة الآلات، هذه الاستطاعة المتقدمة صالحة للضدين.

٢. **الْقُدْرَةُ الْقَدَرِيَّةُ الْكَوْنِيَّةُ الْمُوجِبَةُ لِلْفِعْلِ الَّتِي هِيَ مُقَارِنَةٌ لِلْمَقْدُورِ لَا يَتَأَخَّرُ عَنْهَا**: الاستطاعة التي يجب معها وجود الفعل[1].

**یەکەم:** توانایەك مەبەست پێی بەخشینی پێویستییەکانی کارکردنە لە لاشە و ئەندامەکانی کارکردن و توانا و ئیرادە و شەو و ڕۆژ ...، ئەمە پێش کارەکان بوونیان هەیە، خوا هەموو ئامادەکارییەکی بۆ ڕەخساندووە و پەیوەندی بە قەدەری شەرعییەوە هەیە و داواکارییە شەرعییەکانیش لەسەر ئەم توانا و کارانە بەندە، وە بۆ کاری خێر و شەڕیش بەکاردەهێنرێت.

**دووەم:** توانا و ئیرادەیەك لەگەڵ کارەکاندا بوونی هەیە لە یارمەتیدان و هێنانەدی هۆکار و پێویستییەکانی، لەگەڵ نەمان و هەڵگرتنی ڕێگرییەکان تیایاندا، ئەمە پەیوەندی بە قەدەری کەونییەوە هەیە و لە دەسەڵاتی پەروەردگاردایە و بەس.

## پەیوەندی نێوان ئیرادە و ویستی ئادەمیزاد
## بە قەدەری کەونییەوە

پەیوەندی ئادەمیزاد بە قەدەری کەونییەوە جیاوازە تا قەدەری شەرعی، لەبەرئەوەی ئادەمیزاد لێرەدا مامەڵە و کار و هەڵسووڕانی بەگوێرەی خۆی لەگەڵ دەکرێت، لە نیەت و بژاردە و کاری پێشینەی خۆی، بەگوێرەی ئەو یاسا و کار و ئیرادانەی خوا کە بۆ بەڕێوەبردنی دروستکراوەکانی دایڕشتووە، وەك: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾﴾ [الليل: ٥ - ١٠]. هەرکەسێك ببەخشێت و خواپەرستی

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٢٩)، و "مجموع الرسائل" لابن تيمية (٥/ ١٥٠)، و "العقيدة الطحاوية" (١/ ٧٤)، و "الفصل" لابن حزم (٣/ ٢٠)، و "بدائع الفوائد" لابن القيم (٤/ ١٧٥)، و "شفاء العليل" لابن القيم ص١٠٤، و "القضاء والقدر" لعبد الرحمن صالح المحمود ص٢٦٩، و "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص٢٢٠، و "القدر" للصلابي ص٢٤٥، و "القضاء والقدر عند السلف" لأبي عبد الرحمن علي بن السيد الوصيفي ص١٨٢.

بكات و باوەڕی بە ڕۆژی دوایی هەبێت؛ ئەوكاتە ڕێگەی چاكەی بۆ ئاسان دەكرێت، وە بە پێچەوانەشەوە ئەوەی بەخیل بێت لە بەخشیندا و جێبەجێكاری خواپەرستی نەبێت و بێبڕوا بێت بە ڕۆژی دوایی؛ ئەوا ڕێگەی ناخۆشی بۆ ئاسان دەكرێت.

كەواتە بە هۆكاری بژاردەكانی ئادەمیزادەوە ڕێگەكانی بۆ بژاردە دەكرێت، هەروەكوو چۆن بۆ هەردوو ڕێگەكە فەرموویەتی (فَسَنُيَسِّرُهُ)، واتە كارئاسانی بۆ بژاردەكانی دەكەین، یەكەمیان بۆ چاكە، دووەمیان بۆ خراپە، ئەمە یاسا و سونەتی خوایە لە كەوندا، هەروەكوو دەفەرموێت: ﴿هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ٦٠﴾ [الرحمن : ٦٠]. ئایا پاداشتی چاكە چاكە نییە؟ واتە لەدوای كردەوەیەكی چاكەتان بۆ كرداری چاكترتان دەبەین، وەكوو پاداشتێك، وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَا﴾ [الشورى : ٤٠]. سزای خراپەش كارئاسانییە بۆ ڕێگەی خراپەیەكی تر بەدوای خۆیدا، وەك دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنۡ أَمۡرِنَا يُسۡرٗا ٨٨﴾ [الكهف : ٨٨]. ئەوەی ئیمان بهێنێت و كاری چاك بكات؛ ئەوا پاداشتی بەهەشتە و ئێمەش كارئاسانی بۆ دەكەین بۆ كارەكانی تری، وە بەو هۆكارەوە بەڵێن بە پێغەمبەرەكەی دەدات كە بەردەوام كارئاسانی بۆ بكات، لەبەر بەردەوامبوونی بژاردەی چاك و كاری پێغەمبەرایەتی، وەك دەفەرموێت: ﴿وَنُيَسِّرُكَ لِلۡيُسۡرَىٰ ٨﴾ [الأعلى : ٨].

هەروەكوو چۆن هۆكارەكانی شكاندنی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ لەلایەن كەسانێكەوە لە شەڕی ئوحوددا، دەگەڕێتەوە بۆ چەند هەڵە و كارێكی ڕابوردوو و شكاندنی فەرمانی خوا لەلایەن خۆیانەوە، كە بەو هۆكارەوە نەفس و شەیتان توانی زاڵبێت بەسەریاندا و ئەو فەرمانەی پێغەمبەر ﷺ بشكێنن، وەكوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا كَسَبُواْ﴾ [آل عمران : ١٥٥]. شەیتان توانی زاڵبێت بەسەریاندا بە هۆكاری هەندێك لە كردەوەكانی خۆیانەوە، بۆیە دەفەرموێت: ﴿فَأَصَابَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْ﴾ [الزمر : ٥١]. واتە بەو هۆكارەوە تووشی سزای كردارە خراپەكانیان بوون، وەك دەفەرموێت: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفۡـِٔدَتَهُمۡ وَأَبۡصَٰرَهُمۡ كَمَا لَمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَنَذَرُهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ١١٠﴾ [الأنعام : ١١٠]. ئێمە سزایان دەدەین بەوەی كە دڵ و چاویان هەڵدەگێڕینەوە لە ئاستی حەقدا تا نەگەن بە ئیمان و كارئاسانییان بۆ ناكەین و

دەیانهێڵێنەوە لە کوێری و گومڕاییدا، لەبەرئەوەی یەکەم سات ئیمانیان نەهێنا و گوێڕایەڵییان نەکردین، ئەمە دادپەروەری خوایە لەگەڵ بەندەکانی[1]. واتە بۆیە ئێستا ئیمان ناهێنن لەبەر بژاردە و پێشینەی خۆیان، کە هەر یەکەم سات ویستی ئیمان و ڕێگەکەیان نەگرتە بەر و بەردەوامن لەسەری، بۆیە کاریگەری کارەکانیان زیاتر دەبێت لەسەریان.

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ، أَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ، وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاءِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ»[2].

واتە: هەموو کەسێك کارئاسانی بۆ دەکرێت لای خواوە، کەسانی چاك کارئاسانییان بۆ دەکرێت بۆ کاری چاك، وە کەسانی خراپیش کارئاسانییان بۆ دەکرێت بۆ کاری خراپ.

هەروەکوو چۆن خوای پەروەردگار هۆکاری کارەکان دەخاتە ڕوو لە کاتە سەختەکاندا و دەفەرموێت: ﴿ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا۟ وَلَـٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ [الأنعام: ٤٣].

واتە: ملکەچ نەبوون و نەگەڕانەوە لەکاتی هاتنی سزا سەختەکانماندا، بە هۆکاری پێشینەییان لە دڵڕەقییان و ڕازاندنەوەی کارەکانیان لەلایەن شەیتان و نەفسیانەوە، بەوەی کە لەسەر حەقن و هەڵە نین، ئەم دوو هۆکارەی ڕابوردوویان بوو بە مایەی نەگەڕانەوە و تەوبەنەکردنیان.

هەروەك (حكيم بن حِزَام) بە پێغەمبەری ﷺ وت: کۆمەڵە کارێکم هەبوو لەپێش ئیسلامدا لە هاتووچۆی کەسوکار و ئازادکردنی بەندە و خێر و خێرات، ئایا پاداشتم هەیە لەسەری؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «أَسْلَمْتَ عَلَى مَا سَلَفَ مِنْ خَيْرٍ»[3].

واتە: موسوڵمان بوویت بە هۆکاری کارە خێرەکانی پێشووتەوە.

وە هەروەها هۆکاری هاتنە ناو ئیسلامی (عمر بن الخطاب) رضي الله عنه؛ ئەو سیفەتە جوانانەی بوو کە لەپێش ئیسلامدا هەیبوو، کە پێیان دەوت: بَاطِنُهُ خَيْرٌ مِنْ ظَاهِرِهِ. واتە ناخی پاکتر بوو لە

(١) "تفسير السعدي" ص٢٦٩.

(٢) رواه البخاري (٤٩٤٩)، ومسلم (٢٦٤٧)، والبزار في "المسند" (١٢١)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٤٠)، والآجري في "الشريعة" (٣٢٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٠٦٣)، والفريابي في "القدر" (٤٠).

(٣) رواه البخاري (١٤٣٦)، وأحمد في "المسند" (١٥٣١٨)، والطبراني في "الكبير" (٣٠٨٥).

ڕووکەشی، یاخود (أبو بكر وعثمان) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ... سیفەتە جوانەکانیان هۆکاری ئیمانیان بوو، بە دوورکەوتنەوەیان لە سەردەمی پێش ئیسلامیشدا لە عەرەق خواردن و زینا و ستەمکردن، تەنانەت لە بێگیانەکانیشدا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَٱلَّذِي خَبُثَ لَا يَخۡرُجُ إِلَّا نَكِدٗا﴾ [الأعراف: ٥٨]. زەوی پاك بەرهەمی پاکە و زەوی پیسیش بەرهەمی پیسە، وە لە یاسا شەرعییەکانیشدا پاکی حەڵاڵ کردووە و پیسی حەرامکردووە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ﴾ [الأعراف: ١٥٧]. ئەمانە یاسای کەونی خوان.

ئەم دوو ڕێگەیە خوای پەروەردگار لە قەدەرە کەونییەکەدا بەو شێوەیە نەخشاندوویەتی بەرامبەر بە ئادەمیزاد، بۆیە هیچ بوارێك نییە تیایدا بێجگە لە قبووڵکردن و ئارامگرتن نەبێت لەسەر ناخۆشییەکان و سوپاس و ستاییشکردن لەسەر خۆشییەکان، وە هیچ دەسەڵاتێك نییە ئەم کارانە بگۆڕێت لای خوا، بەڵکوو حیکمەت و دادپەروەری و قەدەرێکی خوایە بەسەر بەندەکانیەوە.

کەواتە ئیرادەی ئادەمیزاد لە ئاستی ئەنجامەکانی قەدەری کەونی دەستەوەستانە و هیچی پێناکرێت بێجگە لە ڕازیبوون و ئارامگرتن نەبێت، یاخود شوکرانە و ستاییشکردن نەبێت.

ئەمە یاساکانی خوایە بۆ کاری بەندەکانی، هەریەکە بەجیا و هیچ تێکەڵییەك لە نێوانیاندا نییە: فهذا فعل الله، وهذا كسب العبد، فكما أن الله تعالى لا ينسب إليه فعل العبد لأنه يعاقبه عليه؛ فكذلك العبد لا ينسب إليه الخلق لأنه لا يقدر عليه[1].

واتە: ئەمە کاری خوا و کرداری بەندەکانیەتی جیاوازن، هەروەك چۆن کرداری بەندەکان ناخرێتە پاڵ خوا؛ ئاواش توانای دروستکردن و هێنانەدی کارەکان ناخرێتە پاڵ بەندەکان، لەبەرئەوەی توانایان نییە بەسەریاندا.

هەروەك چۆن (إبليس) کارەکانی دەخاتە پاڵ خوا و دەڵێت: ﴿فَبِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي﴾ [الأعراف: ١٦]. واتە ئەی خوایە تۆ سەرت لێ شێواندم، لەگەڵ ئەوەشدا خۆی هەڵبژاردووە، لەجیاتی ئەوەی دەرەنجامی کارەکانی بخاتە پاڵ خوا کارەکانی دەخاتە پاڵ ئەو.

(١) "القضاء والقدر عند السلف" لأبي عبد الرحمن علي بن السيد الوصيفي ص١٨٢.

بۆیە لای زانایان ئەم توانایە پێی دەوترێت: الِاسْتِطَاعَةُ الْمُقَارِنَةُ لِلْفِعْلِ الْمُوجِبَةُ لَهُ ... بِهَا يَتَحَقَّقُ وُجُودُ الْفِعْلِ[١]. واتە: توانایەکی پێشوەختەی کارەکان دراوە بە ئادەمیزاد کە بتوانن کارەکانی پێ بهێننە دی، نەك بۆ گۆڕانکاری لە ئەنجام و ڕێگەی بژاردەی هێنانەدی کارەکان.

ئەمە دەسەڵاتی ڕەهای خوایە و پەیوەندی بە هەرسێ جۆرەکەی (توحید)ەوە هەیە، هەروەك دروستکردن و هێنانەدی و بەڕێوەبردنی بوونەوەرەکان، کە هەر ئەو خاوەن و خالقیانە، ئەمە (الربوبیة)ە، وە بە گرتنەبەری ڕێگەکانی پەرستن و ڕووتێکردن و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی کارئاسانی بۆ دەکرێت و یارمەتی دەدرێت، ئەمەش پەیوەندی بە (الألوهیة)ەوەیە، وە ئەمانە لە دەسەڵاتی خوایەکدایە کە خاوەنی سیفەتە کامڵەکانە لە دەسەڵات و دانایی و دادپەروەری و هیدایەت و لەخۆگری هەموو سیفەتە تەواوەکانە، ئەمەش پەیوەندی بە (الأسماء والصفات)ەوەیە، کە بەڵگەیە لەسەر خوایەتی بێوێنە و تاك و تەنیاییبوونی خۆی، هەمووی لە تۆوەیە و بۆتۆیە (منك وإليك).

فیرەقی جەبەرییەکان باوەڕیان نییە بەم توانایی و خاوەن کار و ئیرادەی ئادەمیزادییە، وەکوو دەڵێن ئادەمیزاد خاوەن هیچ ئیرادەیەك نییە، ئەم قسەیەشیان دەبێتە هۆکاری: هضم لحقوق الربوبية، وتنقص لعظمة الألوهية، وسوء ظن بالله رب العالمين[٢]. ماف نەدان بە خاوەن سیفاتە تەواوەکانی خوایەتی خوا لە (ربوبیة)دا، وە ناتەواوی لە دەسەڵاتداریێتی و پەرستنی خوادا لە (الألوهیة)دا، وە کەموکورتی لە سیفاتە شایستە پڕ بەهاکانی خوادا بە گومانی خراپ لە (الأسماء والصفات)دا.

لە قورئانیشدا خوای پەروەردگار ئاماژە بۆ ئەم توانایانە دەکات، وەك دەفەرموێت: ﴿مَا كَانُواْ يَسْتَطِيعُونَ ٱلسَّمْعَ وَمَا كَانُواْ يُبْصِرُونَ ۝٢٠﴾ [هُود: ٢٠]، وە دەفەرموێت: ﴿وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَٰفِرِينَ عَرْضًا ۝١٠٠ ٱلَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِي غِطَآءٍ عَن ذِكْرِي وَكَانُواْ لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا ۝١٠١﴾ [الكهف: ١٠٠، ١٠١]. واتە بێبڕواکان توانای گوێگرتن و بینینی فەرمانەکانی خوایان نییە، مەبەست بەم نەتوانینە نەبوونی هۆکار و ئەندامەکانی بینین و بیستن نییە، ئەم هۆکار و ئەندامانە بە دڵنیاییەوە

(١) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٦١)، و"مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٧٣).

(٢) "القضاء والقدر عند السلف" لأبي عبد الرحمن علي بن السيد الوصيفي ص١٩١.

بوونیان هەیە، بەڵام نەبوونی ئەم توانای گوێگرتن و بیستن و بینینە دەگەڕێتەوە بۆ كاری پێشوەختەیان كە بووەتە هۆكاری ئەوەی لەسەریان قورس بێت و نەتوانن، تا لە ئەنجامدا توانای بینین و بیستنیان نەبێت، خۆ ئەگەر بیانویستایە ئەوا دەیانتوانی ببیستن و ببینن، وەك ئەوانەی كە ویستوویانە و ئیمانیان هێناوە، ئەم نەتوانینەش دەگەڕێتەوە بۆ پێشینەیی كارەكانیان و زاڵكردنی هەواو ئارەزوویان و دەستبەردارنەبوونیان و بەردەوامبوونیان لەسەری و نەویستنی گۆڕانكاری، وە هەواڵدانی قورئانیش بەم نەتوانینانە مەبەست لە بوونی ئەو توانایانەیە كە خوا بەخشیویەتی بە ئادەمیزاد پێش ئەنجامدانی كارەكانیان و ئەوانیش لە ڕێگەی هەڵەدا بەكاریان هێناوە، بەو هۆیەوە توانای گۆڕانكاری هۆكارەكانیان نییە لە بیستن و تێگەیشتن و شوێنكەوتەیی حەق.

بۆ نموونە كاتێك كە (خضر) ﵇ بە (موسى) ﵇ دەڵێت: ﴿إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾﴾ [الكهف: ٦٧]. خۆ مەبەست بەم نەتوانینەی (موسى) ﵇ لەسەر ئارامگرتن ئەوە نییە كە خاوەنی ئارامگری نەبێت لە ناخ و بوونیدا، لەبەرئەوەی گەر سیفەتی ئارامگری بوونی نەبێت؛ ئەوا شوێنی ڕەخنەش نییە، بەڵكوو: الْقُرْآنُ يَدُلُّ عَلَى أَنَّ هَذِهِ الاِسْتِطَاعَةَ إِنَّمَا نُفِيَتْ عَنْ التَّارِكِ لَا عَنْ الْفَاعِلِ(١). ئەم نەتوانینی ئارامگرتنە ڕەخنەیە لەسەر كەسێك كە خۆی نایەوێت ئارامبگرێت، یاخود: إِنَّمَا يُلَامُ مَنِ امْتَنَعَ مِنْهُ الْفِعْلُ لِاشْتِغَالِهِ بِغَيْرِ مَا أُمِرَ بِهِ، أَوْ لِعَدَمِ اشْتِغَالِ الآلَاتِ بِفِعْلِ مَا أُمِرَ بِهِ(٢). ڕەخنەیە لەسەر كەسێك كە ئارام ناگرێت بە هۆكاری سەرقاڵبوونی بە شتێكی ترەوە كە فەرمانی پێ نەكراوە، یاخود نایەوێت ئارامگرییەكە بەكاربهێنێت لەو كارانەدا كە فەرمانی پێكراوە، كەواتە (موسى) ﵇ ئەم ئارامگرتنەی نییە: وَكَيْفَ تَصْبِرُ يَا مُوسَى عَلَى مَا تَرَى مِنِّي مِنَ الْأَفْعَالِ الَّتِي لَا عِلْمَ لَكَ بِوُجُوهِ صَوَابِهَا، وَتُقِيمُ مَعِي عَلَيْهَا، وَأَنْتَ إِنَّمَا تَحْكُمُ عَلَى صَوَابِ الْمُصِيبِ وَخَطَأِ الْمُخْطِئِ بِالظَّاهِرِ الَّذِي عِنْدَكَ(٣)، لِمُخَالَفَةِ مَا يَرَاهُ لِظَاهِرِ الشَّرْعِ، وَلَيْسَ عِنْدَهُ مِنْهُ عِلْمٌ(٤). ئەو ئارامگرتنە بۆیە بوونی نەبووە بە هۆكاری ئەوەی كە (موسى) ﵇ سەرقاڵ بووە بەو زانستە

---

(١) "القدر" لابن تيمية ص٢٩١، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٢٩٢).

(٢) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٤٣٤.

(٣) "جامع البيان" للطبري (١٥/ ٣٣٤).

(٤) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٤٤٦.

شەرعییەی کە پێی بووە، ئەو زانستەش ڕووکەش ڕووکەش خوێندنەوەیە، وە بە ڕووکەشیش هەموو ئەو کارانەی (خضر) ﷺ پێچەوانەی کارە شەرعییەکان بوون، بەڵام کاتێك (خضر) ﷺ ناوەڕۆکی بابەتەکانی بۆ شیکردەوە؛ ئەوکات تێگەیشت کە پێچەوانەی کارە شەرعییەکان نییە، ئەوکات پەشیمان بووەوە لەسەر ئارامنەگرتن، واتە ئارامگرتن لەسەر کارە نادیارە شاراوەکان زەحمەتە و گونجاو نییە لەگەڵ ناخی ئادەمیزاددا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گەر کەسێك بیەوێت ئارامبگرێت دەتوانێت، ئەویش بە شێوەی زۆرکردن لە خۆی و دروستکردنی ئەو زۆرەملێییە لە خۆیدا کە ئەویش کارێکی قورسە، وەکوو (ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: فَعُلِمَ أَنَّهَا مُضَادَّةٌ لِمَا يَقُومُ بِالْعَبْدِ مِنْ الْمَوَانِعِ الَّتِي تَصُدُّ قَلْبَهُ عَنْهُ إرَادَةُ الْفِعْلِ وَعَمَلُهُ[1].

واتە: ئەو ئارامگرتنە پێچەوانەی ئەو بابەتانەیە کە دڵی سەرقاڵ کردووە و ڕێگرە لە ویستی ئەو کارە و کاربۆکردنی.

کەواتە مەبەست بە ﴿إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا﴾ ئەوەیە کە تۆ لەگەڵ ویست و گرتنەبەری هۆکارەکانی ئارامگرتندا نیت، لەبەرئەوەی پێدانی ئەو توانایە بۆ خوایە بەتەنیا و لە دەسەڵاتی ئەودایە ئەگەر ببیەخشێت، بۆیە ئادەمیزاد لە سروشتی خۆیدا ئارامگرتنی لەسەر کارە نادیار و شاراوە و نەزانینەکان نییە، هەر بۆیە (خضر) ﷺ دەیوت: ﴿وَكَيۡفَ تَصۡبِرُ عَلَىٰ مَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ خُبۡرٗا ٦٨﴾ [الكهف: ٦٨]. واتە چۆن ئارام دەگریت لەسەر شتێك کە زانیاریت بەسەریدا نەبێت؟ وە زانین و زانستی هەموو ئەو ڕووداوانەی کە لای (خضر) ﷺ بوو هەمووی لای (موسی) ﷺ نەبوو، بۆیە ئارامگرتنیشی نەبوو و بەردەوامیش دژایەتی دەکرد و بە کارەکانی ڕازی نەبوو، بەڵام کاتێك کارەکانی بۆ شیکردەوە ئەوسا قەناعەتی کرد بە ئارامگرتن.

هەروەك باوەڕبوون بە خوا و ڕۆژی دوایی و بەهەشت و جەهەنەم و ... هەموو شتە غەیبییەکان، لەپاش بەکارهێنانی هۆکارەکانی باوەڕپێبوون لە بیستن و بینین و عەقڵ خستنە کار و ڕازیبوون و چوونە ژێر باری کارکردن لەو بوارەدا لە ئیمان و عیبادەت و گوێڕایەڵی، ئەوکات یارمەتی خوا دادەبەزێت بۆیان، بۆ یارمەتی زیاتریان لە بیستنی تەواو و بینینی تەواو و تێگەیشتن و گوێگرتن و ڕازیبوونی تەواو، بە سەرەتا هەڵگرتنی هەنگاو و ئیرادەی خۆیان، پاشان یارمەتی و

(١) "القدر" لابن تيمية ص٢٩١، و"مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٢٩٢).

کاملبوونی خوایی بۆیان، توانییان بگەنە هەموو بواری قەدەرە شەرعییەکان، هەر بۆیە بەم شێوەیە وەصفی ئیمانداران دەکات کە دەفەرموێت: ﴿الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾﴾ [البَقَرَة : ١ – ٣]، وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١٢﴾﴾ [المُلك : ١٢].

واتە: ئەم قورئانە هیدایەتە بۆ کەسێك کە باوەڕی بە غەیب و نادیارەکان هەیە، کە دەبێتە هۆکاری نوێژ و خێر و بەخشندەیی و لە خوا ترسان و گوێڕایەڵی کردن.

وە بەپێچەوانەوە بۆ ئەوانەی کە هۆکارەکان بەکارناهێنن دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّٰهُمْ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَٰرًا وَأَفْـِٔدَةً فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُهُمْ وَلَآ أَفْـِٔدَتُهُم مِّن شَىْءٍ إِذْ كَانُوا۟ يَجْحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٢٦﴾﴾ [الأحقاف : ٢٦].

واتە: بە بیروایانی مەککە دەفەرموێت: هەموو توانا و دەسەڵاتێکمان پێدان، لە ژیان و لاشە و هێز، لەگەڵ بیستن و بینین و دڵ و زمان، بەڵام وەکوو (الطبري) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: لَمْ يَسْتَعْمِلُوهَا فِيمَا أُعْطُوهَا لَهُ، وَلَمْ يُعْمِلُوهَا فِيمَا يُنْجِيهِمْ مِنْ عِقَابِ اللهِ، وَلَكِنَّهُمُ اسْتَعْمَلُوهَا فِيمَا يُقَرِّبُهُمْ مِنْ سَخَطِهِ[1]. هیچیتان بەکارنەهێنا بۆ کارپێکردن و خۆ ڕزگارکردن لە سزای خوا، لەبەرئەوە دژایەتی و بەدرۆزانینی بەڵگەکانی خواتان هەڵبژارد بەرامبەر بە قورئانەکەی و پێغەمبەرەکەی، وە کارتان لەسەر کرد، بۆیە سزای ئەوەتان بەسەردا هات بە هۆکاری گاڵتەکردنتان پێی.

وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ﴾ [الأعراف : ١٧٩].

واتە: زۆری کەسانی دۆزەخ لە جنۆکە و ئادەمییەکان، دڵێکیان هەبوو هیچی پێ تێنەدەگەیشتن، وە چاوێکیان هەبوو هیچیان پێ نەدەبینی، وە گوێیەکیان هەبوو هیچیان پێ نەدەبیست.

---

(١) "جامع البيان" للطبري (٢١/ ١٦٠).

هەرووەك وەكوو ڕەخنەش دەفەرمویێت: ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ أَوۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَا﴾ [الحج: ٤٦].

واتە: ئەوە بۆ ناگەڕێن بە زەویدا تاوەكوو دڵێكتان بۆ دروستبێت كە پێی تێبگەن، یاخود گوێیەك كە هۆكاری بیستنتان بێت پێی.

وە ڕەخنە لەسەر نەگرتنەبەری هۆكارەكان بەردەوامە بۆ ئادەمیزاد، وەكوو خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾، ﴿أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ﴾، ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾، ﴿أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾، ﴿أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ﴾، ﴿أَفَلَا تَسۡمَعُونَ﴾، ﴿أَفَلَا تُبۡصِرُونَ﴾، ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ﴾، ﴿أَفَلَا يَشۡكُرُونَ﴾. واتە ئەوە بۆ عەقڵ بەكارناهێنن و بیرناكەنەوە و خۆتان ناپارێزن و ئیمان ناهێنن و نابیستن و نابینن و ... هەتا دوایی.

توانای ئادەمیزاد (الإستطاعة والقدرة) لە ئاستی قەدەرە كەونییەكەدا: لە ئاستی قەدەرە كەونییەكەدا ئادەمیزاد خاوەنی هیچ ئیرادە و بژاردەیەك نییە و (مُیَسّر) و بێدەسەڵاتە، وەك هەموو بێگیان و گیانلەبەران و هەسارەكان، كە بە یاسا و ڕێسا و جۆر و چۆنییەتییەك داڕێژراون بە شێوازی جووڵەی زۆرەملێ و بەڕێكردنێك كە بە شێوەی كردارە ئامێرییەكان (الآلية) كار دەكەن، ئادەمیزاد لەمەدا خاوەنی هیچ جۆرە كار و ئیرادەیەك نییە تیایدا، وەك هاتنەدی لە نەبوونەوە بۆ بوون، وە جووڵەی گەشەكردن و بەهێزی و پیربوون و لاوازی و مردن و شێوازی جەستە و ڕەنگ و شوێنی لەدایكبوون و ژیان و هەموو ئەو سیفات و ڕەگەزانەی لە ناخیدا هەیە، وەك خۆشەویستی و ترس و ڕقلێبوون و برسێتی و تینوویەتی و هەڵپە و كار و ...، هەرووەك دروستبوون و كاری بێگیانەكان لە خاك و ئاو ... یاخود گیانلەبەران بە هەموو شێواز و جۆر و چۆنیەتی و بوونیانەوە، یاخود لە هەسارەكان بە هاتنی شەو و ڕۆژ و جووڵەی مانگ و ڕۆژ و سووڕانەوەی هەموو هەسارەكان، وەكوو خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿كُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ﴾ [الأنبياء: ٣٣]. ئەم جۆرە جووڵە و كردارانە پەیوەندییان بە قەدەری كەونییەوە هەیە، لەژێر باری ویستی گشتی خوادایە (المشيئة المطلقة)، كە لە قورئاندا وشەی (المشيئة) بۆ ئەم جۆرە كردار و قەدەرە بەكارهێنراوە، وەكوو خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿وَرَبُّكَ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخۡتَارُ﴾

[القصص: ٦٨]. واتە خوا چی ویستی لیبیت دروستی دەكات و بژاردەی دەكات، لەم جۆرەشیاندا هیچ جۆرە داواكاری (التكليف) و لیپرسینەوە و سزا و پاداشتیكی لەسەر نییە: لا تتناول إلا الرضى بما يتم بالقضاء والقدر في جانب الطاعة، أو السخط في جانب المعصية[١]. واتە: لیرەدا رازیبوون بە هاتنی هەر جۆریك بەسەر ئادەمیزاددا لەم بوارەیاندا دەبیتە عیبادەت و نارازیبوونیش دەبیتە تاوان، تەنها ئەوەندە پەیوەندی بە عیبادەتەوە هەیە.

ئەم توانا و ئیرادەیەش پیی دەوتریت: الِاسْتِطَاعَةُ الَّتِي يَجِبُ مَعَهَا وُجُودُ الْفِعْلِ فَهِيَ مُقَارِنَةٌ لَهُ[٢]. واتە توانایەكە گریدراوە و پەیوەستە بە كارەكانەوە و هۆكاری بوونی كارەكانە و لییان نابیتەوە.

**توانای ئادەمیزاد (الإستطاعة والقدرة) لە ئاستی قەدەرە شەرعییەكەدا:** ویست و ئیرادەی ئادەمیزاد لە ئاستی هینانەدی قەدەرە شەرعییەكەدا بوونی هەیە، گەرنا داوای جیبەجیكردنی فەرمان و دووركەوتنەوە لە ریگرییەكان (التكليف) بوونی نەدەبوو، ئەمەش سەلمینەری بوونی بژاردەیە لە ئادەمیزاددا و لە توانایدایە بەكارهینانی.

بۆ ئەم بابەتە ئەهلی سوننەت دەلین: وَأَمَّا الْقُدْرَةُ الَّتِي مِنْ جِهَةِ الصِّحَّةِ وَالْوُسْعِ، وَالتَّمَكُّنِ وَسَلَامَةِ الْآلَاتِ، فَقَدْ تَتَقَدَّمُ الْأَفْعَالَ، وَهِيَ الَّتِي مَنَاطُ الْأَمْرِ وَالنَّهْيِ، وَهِيَ الْمُصَحِّحَةُ لِلْفِعْلِ، فَهَذِهِ لَا يَجِبُ أَنْ تُقَارِنَ الْفِعْلَ، بَلْ تَكُوْنُ مُتَقَدِّمَةٌ عَلَيْهِ، وَهَذِهِ الِاسْتِطَاعَةُ الْمُتَقَدِّمَةُ صَالِحَةٌ لِلْضِدَّيْنِ[٣].

واتە: توانایەكە بەخشراوە بە ئادەمیزاد، لە رووی پیدانی ئەندامەكانی كاركردنەوە لە چاو و عەقل و دل و زمان و لاشەی تەواو و توانای كاركردن، ئەم پیویستییانەی جەستە هۆكاری تەواون

(١) "أفعال العباد بين الجبر والاختيار" لمحمد حسن رباح بخيت ص٨٥.

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٦٠)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٣١٩).

(٣) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٤٨٨، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٣١٩)، (٨/ ١٢٩)، و "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٦٠)، و "شفاء العليل" لابن القيم (١/ ١٠٤)، و "الفصل" لابن حزم (٣/ ٢)، و "القضاء والقدر" لعبد الرحمن بن صالح المحمود ص٢٦٩، و "القضاء والقدر عند السلف" لأبي عبد الرحمن علي بن السيد الوصيفي ص١٨٢.

لە ئادەمیزاددا بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوا، وە ئەم توانایە پێشوەختە لەپێش جێبەجێکردنی کارەکاندا بوونی هەیە و لەگەڵ جێبەجێکردنیشدا هەر بوونی هەیە، وە ئەم توانایانە بۆ ڕێگەی چاك و خراپ قابیلی بەکارهێنانن، وە ئەم توانایانە بوونیان لەسەروو توانای هێنانەدی داواکاری و فەرمانەکانی خواوەیە، واتە لە داواکارییەکانی خوا زیاتریشی پێ ئەنجام دەدرێت، وە لێرەدا خوای پەروەردگار داوای کارێك ناکات کە لە توانای خاوەنەکەیدا نەبێت، وەکوو دەفەرموێت: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ [البَقَرَة : ٢٨٦]. بەڵکوو تواناکان لەسەروو داواکارییەکانەوەن، وە کاتێکیش کە داوای زیاتر لە بەندەکان ناکات لەبەر بەزەیی و بەخشندەیی خۆیەتی بۆیان، وەکوو دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ﴾ [النِّسَاءِ : ٢٨]، ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ [الحَج : ٧٨]. خوا دەیەوێت کارەکانتان لەسەر ئاسان بکات، وە لە دیندا هیچ قورساییەك دانەنراوە لەسەرتان کە قابیلی جێبەجێکردن نەبێت.

بۆیە هیچ کارێك بوونی نابێت بەبێ بوونی ئەم توانایانە، وە ئەو توانایانەش بەبێ بوونی ئیرادە و ویستی تەواو لە کارەکاندا بوونی نابێت، وە بە پێچەوانەوە بە بوونی توانا و ئیرادە کارەکان دروست دەبن، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: أَنَّ الْإِرَادَةَ الْجَازِمَةَ مَعَ الْقُدْرَةِ التَّامَّةِ مُسْتَلْزِمَةٌ لِلْفِعْلِ وَمُقَارِنَةٌ لَهُ، فَلَا يَكُونُ الْفِعْلُ بِمُجَرَّدِ قُدْرَةٍ مُتَقَدِّمَةٍ غَيْرِ مُقَارِنَةٍ، وَلَا بِمُجَرَّدِ إِرَادَةٍ مُتَقَدِّمَةٍ غَيْرِ مُقَارِنَةٍ[1]. بۆیە ویست و ئیرادە بۆ کارکردن مەرجی دووەمی دەوێت کە ئەویش توانایە (الاستطاعة)، ئەوکات زانیمان کە: فعلم أن الإرادة محركة للاستطاعة، ولكن لايقال إن الإرادة استطاعة، لأن العاجز عن الحركة مريد لها وهو غير مستطيع[2]. ئیرادەکان جووڵێنەری تواناکانن، بەڵام ناوترێت ئیرادە توانایە، ئەی نابینیت کەسێك ئیرادە و ویستی هەیە کە بەپێوە بێت، بەڵام ناتوانێت! وەکوو (ابن حزم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: لِأَنَّهُمَا ضدان والضدان لَا يَجْتَمِعَانِ[3]. لەبەرئەوەی دوو کاری دژبەیەکن، لە یەك کاتدا کۆنابنەوە ئەگەر ئیرادەشی لەسەربێت، وەکوو خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا﴾

---

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (١/ ٤٠٧).

(٢) "أفعال العباد بين الجبر والاختيار" لمحمد حسن رباح بخيت ص٩٩.

(٣) "الفصل في الملل والأهواء والنحل" لابن حزم (٣/ ١٨).

[المجادلة : ٤]. واتە ئەوەی نەیتوانی با خواردنی شەش هەژار بدات، وە پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «صَلِّ قَائِمًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِدًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ، فَعَلَى جَنْبٍ»[(١)]. واتە بەپێوە نوێژ بكە، گەر نەتتوانی ئەوا بە دانیشتنانەوە، وە گەر هەر نەتتوانی ئەوا بە ڕاكشانەوە لەسەر لا بیكە، كەواتە ئەم توانایانە پێش كارەكانە، مەرج نییە لەگەڵیاندا بێت.

وەك ئەشعەرییەكان دەڵێن: أما الأشاعرة، فقالوا: إن القدرة مع الفعل، لا يجوز أن تتقدمه[(٢)]. واتە تواناكان لەگەڵ كارەكاندا بوونیان هەیە، پێش كارەكان بوونیان نییە، ئەم ڕایەی ئەشعەرییەكان ئەوە دەگەیەنێت كە داواكارییەكان توانای جێبەجێكردنیان نییە، لەبەرئەوەی ئەگەر لەپێش كارەكان تواناكان بوونیان نەبێت؛ ئەوا لەكاتی كارەكاندا توانا بۆ كارەكان بوونیان نابێت، وە لە ئەنجامیشدا وەك (ابن تیمیة) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: أَنْ يَكُونَ كُلُّ عَبْدٍ لَمْ يَفْعَلْ مَا أُمِرَ بِهِ قَدْ كُلِّفَ مَا لَا يُطِيقُهُ إِذَا لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ قُدْرَةٌ إِلَّا مَعَ الْفِعْلِ[(٣)]. واتە ئەگەر تواناكان تەنها لەكاتی كارەكاندا بوونیان هەبێت؛ ئەوا هەموو كارەكان داواكاری لەتوانادا نەبوو (تكلیف ما لا یطاق) دەبن، لەبەرئەوەی پێشوەختە هیچ توانایەك بوونی نەبووە بۆ ئەنجامدانی.

## نموونە بۆ ئەم توانایە:

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾ [آل عمران : ٩٧].

خوای گەورە حەجی ماڵەكەی فەرز كردووە لەسەر بەندەكانی، بۆ كەسێك كە توانای ئەنجامدانی هەبێت.

ئەم توانایە دەبێت پێش كارەكە بوونی هەبێت، واتە كەسێك خاوەنی هەموو جۆرە توانا و بوونەكانی ئەو ڕێگا و حەجكردنەی هەبێت؛ ئەوكات هەستێت بە ئەنجامدانی.

دەبێت ئەو توانایە پێش كارەكە بوونی هەبێت، بەڵام گەر لەگەڵ دەستپێكردنی كارەكەدا

(١) رواه البخاري (١١١٧)، وأبو داود (٩٥٢)، والترمذي (٣٧٢)، وابن ماجه (١٢٢٣)، وابن خزيمة في "صحيحه" (١٢٥٠)، وأحمد في "المسند" (١٩٨١٩)، والدارقطني في "السنن" (١٤٢٥)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (١٦٩٣)، والبغوي في "شرح السنة" (٩٨٣).

(٢) انظر هامش "النبوات" لابن تيمية (٢/ ٩٩٢).

(٣) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٦٠)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٣١٨).

(مع الفعل) ئەو توانایەی بوونی هەبێت وەکوو (الجبرية والأشعرية)کان وا دەڵێن؛ ئەوا حەج واجب نەدەبوو لەسەر کەس، بێجگە لەوانەی کە لەناو کاری ئەنجامدانی حەجەکەدان، لەبەرئەوەی بەس ئەوان توانایان هەیە بەسەریدا، وە بۆ هەموو عیبادەتەکانی تریش هەر بەو شێوەیە، کەوابوو کەس تاوانبار نابێت بە ئەنجامنەدانی حەج و عیبادەتەکان، لەبەرئەوەی لە توانایاندا نییە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ﴾ [التغابن: ١٦].

(ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: فَأَمَرَ بِالتَّقْوَى بِمِقْدَارِ الِاسْتِطَاعَةِ وَلَوْ أَرَادَ الِاسْتِطَاعَةَ الْمُقَارِنَةَ لَمَا وَجَبَ عَلَى أَحَدٍ مِنْ التَّقْوَى إلَّا مَا فَعَلَ فَقَطْ إذْ هُوَ الَّذِي قَارَنَتْهُ تِلْكَ الِاسْتِطَاعَةُ[1].

واتە: خوای گەورە جَلَّ وَعَلَا داوای خواپەرستی کردووە بەگوێرەی توانا، ئەگەر مەبەستی پێی توانایەك بێت کە بەس لەگەڵ کارەکاندا بێت؛ ئەوا کەس ئەو تەقوا و خواپەرستییەی بۆ نەدەکرا بێجگە لەوانەی کاتێك کە ئەنجامی دەدەن، لەبەرئەوەی بەس ئەوان توانایان بۆی بووە.

ئەمە بەس نییە بۆ تەواوبوون و ئەنجامدانی کارەکان، بەڵکوو پێویستی بە قەدەری کەونی هەیە لە یارمەتی خوا بۆی.

بەڵام جەبەرییەکان و ئەشعەرییەکان دەڵێن: توانا (القدرة والاستطاعة) بریتییە لە پێدان و بوونی ئەندامەکانی لاشە و هۆکارەکانی، نەك بوونی تواناکە، کەواتە لای ئەوان کەسێکی شەلەل خاوەن توانایە، لەبەرئەوەی ئەندامەکانی هەیە، بەڵام گەر وا بێت ئەوا ئەوەی کە کارەکان جێبەجێ دەکات فەرمانی خوای هێناوەتە دی، وە ئەوەشی بەکاری نەهێنابێت توانای نەبووە و تاوانبار نابێت، لەبەرئەوەی توانا و (قدرة) بەس بوونی ئەندامەکانی لاشەیە نەك توانای کارکردن پێیان، ئەمەش هۆکارە بۆئەوەی شەریعەت لەکاربکەوێت (تعطيل الشريعة).

کەواتە کاتێك خوای پەروەردگار تۆی دروستکرد و ئەندامەکانی لاشەی پێبەخشیت و عەقڵ و ئیرادە و توانا و غەریزەکانی پێدایت و پێویستییەکانی تری کارکردن لە تەمەن و شەو و ڕۆژ و بەرنامەی خوایی و ... هەموو ئەمانەی بۆ ڕەخساندوویت؛ ئەوا تۆ خاوەن ئیرادە و بژاردەیت و هەموو تواناکانی کارکردنت تێدایە و لەژێر داواکارییەکانی جێبەجێکردندای.

(١) "القدر" لابن تيمية ص٣٧٢، و"مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٧٢).

(ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: مَنَاطُ الْأَمْرِ وَالنَّهْيِ وَالثَّوَابِ وَالْعِقَابِ وَعَلَيْهَا يَتَكَلَّمُ الْفُقَهَاءُ وَهِيَ الْغَالِبَةُ فِي عُرْفِ النَّاسِ(١).

واتە: ئەو جۆرە توانایەی كە پێویستە لە جێبەجێكردنی فەرمانەكان و قەدەغەكراوەكاندا هەبێت و بەو هۆكارەوە پاداشت و سزا لەسەریان بێت، ئەو جۆرە توانایەیە كە زانایانی شەرعی (فقە) باسی لێوە دەكەن لە ئەنجامدان و حوكمە شەرعییەكانی، وە هەر لە چوارچێوەی ئەم توانایەدا خەڵكی لە نێوان خۆیاندا كار و حوكمی پێدەكەن لەسەر یەك دەیخوێننەوە، وە هەروەها لە یاساكانی بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا ڕەچاوی دەكەن، وە گومانیش نییە لەسەر بوونی ئەم توانا و ئیرادانە لە ئادەمیزاددا، بۆیە خوای پەروەردگار لە قورئاندا لەگەڵ كارەكاندا باسی دەكات، یاخود بە مەرجی دەگرێت، وەكوو دەفەرمووێت: ﴿مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗا﴾ [التغابن: ١٦]، ﴿فَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ فَإِطۡعَامُ سِتِّينَ مِسۡكِينٗا﴾ [المجادلة: ٤]، ﴿وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمۡ عَن دِينِكُمۡ إِنِ ٱسۡتَطَٰعُواْ﴾ [البقرة: ٢١٧]، ﴿فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا ٩٧﴾ [الكهف: ٩٧]، ﴿وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡ﴾ [النساء: ١٢٩]، ﴿أَوۡ يُصۡبِحَ مَآؤُهَا غَوۡرٗا فَلَن تَسۡتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبٗا ٤١﴾ [الكهف: ٤١]، ﴿فَقَدۡ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ فَمَا تَسۡتَطِيعُونَ صَرۡفٗا وَلَا نَصۡرٗا﴾ [الفرقان: ١٩].

ئەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر بوونی توانا و ئیرادە و بژاردە لە كارەكانی ئادەمیزاددا تاوەكوو ببنە خاوەنی سەربەخۆیی كاری خۆیان.

گرتنەبەری ئەم توانا و هۆكارانەش ئەگەرچی خاوەنەكانیان ناتوانن ببنە خاوەنی ئەنجامدانی تەواوی كارەكان و هێنانەدییان؛ بەڵكوو لەدوای ئەم قەدەرە شەرعییەوە كە پێش كارەكانە پێویستی بە قەدەری كەونی هەیە، كە یارمەتی و كارئاسانی و لابردنی ڕێگرییەكانە لەلایەن خواوە، كەواتە كردەوەكان بەو توانایانە دێنە دی كە بوونیان هەیە لەپێش كارەكان و لەگەڵ كارەكاندا (قبل الفعل ومع الفعل)، واتە بە قەدەری شەرعی و بە قەدەری كەونی، هەروەك خوای پەروەردگار ئاماژە بۆ هەردوو ئەم توانا و كارانە دەكات لە قورئاندا، كە سەرەڕای بوون و ئیرادە و

---

(١) "القدر" لابن تيمية ص١٢٩، ٢٩٠، ٣٧٣، و"مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٧٣).

هەنگاوەکانی تۆ؛ گەر بەردەوامی توانا و یارمەتی خوایی نەبێت لەسەر کارەکان، ئەوا هیچ کارێك ئەنجام نادرێت، وەك دەفەرموێت: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ٢٨ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢٩﴾ [التكوير: ٢٨، ٢٩]، ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ٢٩ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ [الإنسان: ٢٩، ٣٠].

ئایەتی ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ﴾ لەگەڵ ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا﴾ مەبەست پێی قەدەری شەرعییە و ئاماژەیە بۆ تواناکانی ئادەمیزاد، وە ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ی هەردوو ئایەتەکەش کە بەدوای شەرعییەکەدا هاتووە قەدەری کەونی دەگەیەنێت، کە دەسەڵات و دروستکردن و یارمەتیدانی خواییە، بە هەردووکیان ئەوکات تەواوکاری کارەکانن، وەك دەفەرموێت: ﴿لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ﴾ [الأعراف: ٥٤]. پەروەردگار خاوەنی دروستکردن و بەڕێوەبردنی (مخلوقات)ە، وە هەر فەرمانی ئەویش خاوەنی جێبەجێکردنە تیایاندا، ﴿لَهُ ٱلۡخَلۡقُ﴾ واتە قەدەری کەونی، وە ﴿وَٱلۡأَمۡرُ﴾ واتە قەدەری شەرعی.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۭ بِأَمۡرِهِۦٓۗ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٥٤﴾ [الأعراف: ٥٤].

الشَيخ (عبد الرحمن بن ناصر السعدي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: وتدبر في هذه الآية سرًّا عجيبًا؛ فإنه ذكر في أولها خلقه للسماوات والأرض خصوصًا، وتسخيره الشمس والقمر والنجوم بأمره خصوصًا، وصرح بالفعل فيهما، وذكر في آخرها الوصف والتعميم في قوله: ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ﴾ ... فالمثبتون للخلق والأمر، المفرقون بينهما قولهم هو الحق المحكم الذي يصدق بعضه بعضًا[1].

واتە: گەر سەیری ئایەتەکە بکەین نهێنییەکی سەرسوڕهێنەری تێدایە، لە سەرەتای ئایەتەکەوە

(١) "مجموع مؤلفات الشيخ عبد الرحمن ناصر السعدي" (٦/ ٤٠٤).

باسی دروستكردنی ئاسمان و زەوی دەكات، بەتایبەت بە وشەی (خلق)، پاشان باسی هاتوچۆی ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەكان دەكات بە فەرمانی تایبەتی خۆی بە وشەی (بأمره)، لە كۆتاییشدا بە گشتی كۆیكردوونەتەوە بۆخۆی بە وەسفی دروستكردن و بەڕێوەبردن ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ﴾ كە تایبەتە بە خۆی، بۆیە ئەوانەی كە باوەڕیان بە قەدەری كەونی و شەرعییەكە هەیە لەگەڵ جیاكردنەوەیان لە یەكتر؛ خاوەنی ڕای دروستن و هەموو بڕیارەكانیان پشتیوانی یەكتر دەبن بەگوێرەی بەڵگەكان، وە پارێزراون لە گومڕایی.

## ئـــایـــا داواكـــاریـــیەك
## كە لە سنووری جێبەجێكردندا نەبێت بوونی هەیە؟

هەر بە خوێندنەوەی سەردێڕەكە پرسیار و سەرسوڕمان لای خوێنەر دروستدەبێت، بەوەی كە ئەمە بوونی نییە لە عورف و مامەڵەی نێوان ئادەمیزاددا، ئایا لە شەریعەتی خوادا بوونی هەیە؟!

دوابەدوای ئەمە كۆمەڵێك دەق دێتە پێش چاوت، كە واتای هەموو دەقەكان باس لە نەبوونی داواكارییەك دەكەن لەلایەن خواوە كە لە توانای ئادەمیزاددا نەبێت بە هۆكاری بوونی بەزەیی فراوانی خوا لەسەر بەندەكانی، وەك:

- قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ [البَقَرَة: ٢٨٦].
- قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ﴾ [البَقَرَة: ١٨٥].
- قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ [الحَج: ٧٨].
- قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ﴾ [المَائِدَة: ٦].
- قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا﴾ [البَقَرَة: ٢٣٣].
- قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ﴾ [النُور: ٦١].
- قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ﴾ [النِّسَاء: ٢٨].
- قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ﴾ [البَقَرَة: ٢٨٦].

۩ قال رسول الله ﷺ: «إِنَّ اللهَّ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ، وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ»[(١)].

۩ قال رسول الله ﷺ: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّغِيرِ حَتَّى يَكْبَرَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ، أَوْ يُفِيقَ»، قَالَ أَبُو بَكْرٍ فِي حَدِيثِهِ: «وَعَنِ الْمُبْتَلَى حَتَّى يَبْرَأَ»[(٢)].

لەگەڵ بوونی چەندەها یاسا و حوکمی شەرعی کە هەمووی ڕەچاوکردنی تواناکانی ئادەمیزادی تیادا خوێنراوەتەوە، بەڵام هاتنی (شطحات)ی فەلسەفە و بەکارهێنانی بۆچوونە عەقڵییەکان بەشێوەیەکی ڕەهایی؛ هۆکارە بۆ هاتنی ئەم سەردێڕ و باسە گومڕاییانە، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: أُمُورٍ عَقْلِيَّةٍ ظَنُّوهَا بَيِّنَاتٍ وَهِيَ شُبُهَاتٌ[(٣)]. چەند بۆچوونێکی عەقڵییە و بە یەکلاکەرەوەی دەزانن، لەگەڵ ئەوەشدا هەمووی گوماناوییە. بەڵام بەڵگەکانیشیان وەکوو دەڵێت: بِقِيَاسٍ فَاسِدٍ أَوْ نَقْلٍ كَاذِبٍ أَوْ خِطَابٍ أُلْقِيَ إلَيْهِمْ ... وَهَذِهِ الثَّلَاثَةُ هِيَ عُمْدَةُ مَنْ يُخَالِفُ السُّنَّةَ بِمَا يَرَاهُ حُجَّةً وَدَلِيلًا[(٤)]. واتە بریتییە لە بەهاوشێوە و پێوانەکارییەك کە هەڵە دەردەچێت، یاخود گواستنەوەی قسەیەکی درۆ و دەستاودەستە، یاخود کۆمەڵە قسەیەکە کە بەپێی حەز و نەفسی خۆیەتی و بە دینیشی دەزانێت، ئەمانە هەموو ئەوانەن کە بە بەڵگەی دەزانن و دژایەتی حەقەکەی پێدەکەن. پاش ئەمانە ئەوسا دەگەڕێنەوە سەر دەقەکان بۆ بەڵگەکاری، ئەوکاتەش وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: فقابلوها إمّا بالرد والتكذيب، وإمّا بالتحريف

---

(١) رواه ابن ماجه (٢٠٤٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٢١٩)، والدارقطني في "السنن" (٤٣٥١)، والحاكم في "المستدرك" (٢٨٠١)، وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، ووافقه الذهبي، والطبراني في "الكبير" (١٤٣٠)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (١٩٠٥١)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٤٦٤٩)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١١٤٥٤)، وأبو نعيم في "الحلية" (٦/ ٣٥٢)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (١٧٣١، ١٨٣٦، ٣٥١٥).

(٢) رواه أبو داود (٤٣٩٨)، والترمذي (١٤٢٣)، والنسائي في "الكبرى" (٥٥٩٦)، وابن ماجه (٢٠٤١)، وابن حبان في "صحيحه" (١٤٢)، وأحمد في "المسند" (١١٨٣)، والدارمي في "سننه" (٢٣٤٢)، والبزار في "المسند" (٩٠٥٥)، وأبو يعلى في "مسنده" (٤٤٠٠)، والطبراني في "الكبير" (٧١٥٦)، وعبدالرزاق في "المصنف" (١٢٢٨٨)، والطيالسي في "مسنده" (٩١)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٣٢٧٤)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٥٠٨٩)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٣٢٨٧)، و "صحيح الجامع الصغير" (٣٥١٤).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٥/ ١٠).

(٤) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٣/ ٦٨).

والتأويل[١]. مامەڵەیان لەگەڵ دەقەكاندا یا بەرپەرچدانەوەیان و بەدرۆخستنەوەیانە، یاخود بە گۆڕینی وشە و ماناكانە و ئەوكات گونجاندنیانە لەگەڵ بەرنامەی خۆیان و بە جۆرێك لە جۆرەكان شیكردنەوەیان پێدەكەن بۆ دەقەكان.

ئەنجامی ئەم گومڕاییەش وەكوو (ابن القیم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: فيبقى حائرًا بين أمرين لا بد له من أحدهما: إما أن يسيء الظن بالوحي أو بالعقل، والعقل عنده أصل الوحي، فلا يمكنه أن يسيء الظن به، فيسطو على الوحي تارة بالتحريف والتأويل، وتارة بالتخييل، وتارة بالدفع والتكذيب[٢]. لە ئەنجامدا لە نێوان دوو كاردا گیردەخۆن، وە دەبێت لایەكیان بژاردە بكەن، یا ئەوەتا گومانی خراپ بە وەحی و هەردوو جۆرە دەقەكەی دین كە قورئان و فەرموودەیە ببەن، یاخود گومان بە عەقڵ و نەپێكاندنی بەرن، وە لای ئەوانیش عەقڵ بنەمای وەرگرتنە بۆ وەحی، نابێت شوێنی گومان بێت، ناچار دەگەڕێنەوە بە شاڵاو بۆ سەر دەقەكانی وەحی، تاوەكوو بیگونجێنن، یاخود دەربازیان بێت لێی، بە شێوە و ڕێگەی گۆڕین یاخود ترازاندنی واتاكانیان یاخود گومان و خەیاڵ بۆ دروستكردنیان یاخود پشتگوێخستنیان بە ناچاری، سەرئەنجام: فَجَنَوْا عَلَى الْعَقْلِ وَالشَّرْعِ وَأَغْرَوْا أَعْدَاءَ الشَّرْعِ بِهِ، وَحَالُوا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ تَصْدِيقِ الرُّسُلِ[٣]. تاوانكارییان كرد بەرامبەر بە عەقڵ و شەرع و دوژمنانیان یاخی كرد بەرامبەر بە دین و بوونە هۆكاری بەربەست و ڕێگر لە باوەڕپێكردن و خۆڕادەستكردنی پێغەمبەران.

بۆیە لەم دێڕە شیعرەدا دەڵێت:

وجنوا على الإسلام كل جناية — إذ سلطوا الأعداء بالعدوان

يا محنة الإسلام والقرآن من — جهل الصديق وبغي ذي طغيان[٤]

(١) "جامع المسائل" لابن تيمية (٥/ ٥٧)، و "إعلام الموقعين" لابن القيم (١/ ٥٤).

(٢) "الصواعق المرسلة" لابن القيم (٣/ ٩٨٩).

(٣) "مختصر الصواعق المرسلة" لابن القيم ص١٥٦.

(٤) "نونية ابن القيم" ص٦٦.

واتە: هەموویان بوونە هۆکاری هەموو تاوانکارییەك بۆ سەر ئیسلام، دوژمنیان بە ستەم زاڵ کرد بەسەریدا، هۆکاری بەڵا بوون بۆ سەر ئیسلام و قورئان، لەلایەن دۆستی نەزان و ستەمی تاوانکاران.

دروستبوون و هاتنەدی ئەم بابەتە (تكليف ما لا يطاق) بە هۆکاری ڕای جیاوازیانە لەسەر توانای ئادەمیزاد و کاریگەری لە کارەکاندا (القدرة والاستطاعة)، ئەشعەری و جەبەرییەکان وتیان تواناکان لەگەڵ کارەکاندایە، وە قەدەری و موعتەزیلەکان وتیان لەپێش کارەکاندایە، هەردوولایان لەسەر بنەما عەقڵییەکان نەیانتوانی دەرچن و هەریەکەیان لایەکی گرت.

وە ئەو بنەما عەقڵییەشیان وەك (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت وادەزانن کە: أَنَّ الْقُدْرَةَ نَوْعٌ وَاحِدٌ لَا تَصْلُحُ لِلضِّدَّيْنِ، وَظَنًّا مِنْ بَعْضِهِمْ أَنَّ الْقُدْرَةَ عَرَضٌ فَلَا تَبْقَى زَمَانَيْنِ فَيَمْتَنِعُ وُجُودُهَا قَبْلَ الْفِعْلِ[١].

واتە: باوەڕیان وابوو کە دەبێت تواناکان یەك جۆر بن، دوو جۆری جیاواز لەخۆ ناگرن، گەر لەپێش کارەکان بێت؛ ئەوا نابێت لەگەڵ کارەکاندا ببێت، یاخود وتیان توانا شتێکە دەبێت بوونی هەبێت کە پێی دەوترێت (عرض)، وە هەموو بوونەکانیش یەك شوێن دەگرن لە بووندا، قابیلی ئەوە نین دوو شوێن بگرن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە واقع توانای کارەکان پێش ئەنجامدانی کارەکان بوونی هەیە، وە لەگەڵ کارەکانیشدا هەر بە واقعی بوونی هەیە و ناتوانرێت نکوولّی لێبکرێت، وە ئەمە بە هەست و عەقڵ دەسەلمێنرێت، گەر کەسێك دانیشتبێت هەمان توانا و ئیرادەی هەستانیشی تێدایە.

وە لەمەوە دەڵێن: التَّكْلِيفُ الْوَاقِعُ الَّذِي اتَّفَقَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى وُقُوعِهِ فِي الشَّرِيعَةِ ... هَلْ يُسَمَّى هَذَا أَوْ شَيْءٌ مِنْهُ تَكْلِيفُ مَا لَا يُطَاقُ؟ فَمَنْ قَالَ: بِأَنَّ الْقُدْرَةَ لَا تَكُونُ إلَّا مَعَ الْفِعْلِ يَقُولُ: إنَّ الْعَاصِيَ كُلِّفَ مَا لَا يُطِيقُهُ ... كَمَا أَنَّ مَنْ قَالَ: إنَّهُ لَيْسَ لِلْعَبْدِ إلَّا قُدْرَةٌ وَاحِدَةٌ[٢].

واتە: ئایا یاسا شەرعییەکان داواکارییەکیان تێدایە کە لە توانای ئادەمییدا نەبێت؟ ئەوانەی کە دەڵێن تواناکان لەگەڵ کارەکاندایە؛ دەڵێن: گەر هەرکەسێك فەرمانەکان ئەنجام نەدات خاوەنی توانا نییە بۆیە نەیتوانیوە، بەمەش هەموو تاوانبارەکان داوای کارێکیان لێکراوە کە توانای

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٥/ ١٠).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٢٩٨ - ٣٠٠).

جێبەجێکردنیان نەبووە، وە ئەنجامی ئەم قسەیەش لەکارکەوتنی یاساکانی ئیسلامە و بیروڕای (جبرية)کانە کە دەڵێن هیچ توانایەك لە دەستی ئادەمیدا نییە.

وە قەدەرییەکانیش کە دەڵێن یەك توانا هەیە ئەویش لەپێش کردنی کارەکانەوەیە، دەربارەی (تكليف ما لا يطاق)یش دەڵێن: إنما لا يجوز عليه لما اقتدوا فيه القبح ... تكليف الأعمى بنقط المصحف ... تكليف الزمن بالمشى قبيح[1].

واتە: بە هیچ شێوەیەك دروست نییە و نابێت بۆ خوا داواکارییەك بکات کە لە توانادا نەبێت، ئەمە کارێکی نەشیاوە، وەکوو داواکاری لە نابینایەك بکرێت خاڵ بۆ ئایەتەکانی قورئان دابنێت، یاخود کەسێکی لە جێگا کەوتوو ڕێ بکات.

بەڵام لای ئەهلی سوننەت (تكليف ما لا يطاق) بۆ خوا بەم شێوەیەیە: تجويزه عقلاً ... فيجوز أن يكلف بما لا طاقة للعبد في إيجاده، وإنما لم يفعل ذلك فضلاً منه ورحمة[2]. دروستە (تكليف ما لا يطاق) بۆ خوا بە عەقڵ، دەشێت و دروستە داواکارییەك بکات لە بەندەکانی کە لە توانایاندا نەبێت، بەڵام نایکات لەڕووی بەخشندەیی و بەزەیی خۆیەوەیەتی بۆ بەندەکانی، گەر بڵێین نابێت بیکات ئەوا ناتەواوی دەخەینە پاڵ خوا کە نەتوانێنە، بەڵکوو ستەمکردنیش دەتوانێت بیکات، بەڵام نایکات بە هۆکاری دادپەروەری خۆیەوە، بەم شێوەیە شایستەیە بڕیار بدرێت بۆ خوا.

هۆکاری دروستبوونی ئەو جۆرە بڕیارانەش وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت دەگەڕێتەوە بۆ: فَإِنَّ كَثِيرًا مِنْ نِزَاعِ النَّاسِ سَبَبُهُ أَلْفَاظٌ مُجْمَلَةٌ مُبْتَدَعَةٌ وَمَعَانٍ مُشْتَبِهَةٌ حَتَّى تَجِدَ الرَّجُلَيْنِ يَتَخَاصَمَانِ وَيَتَعَادَيَانِ عَلَى إطْلَاقِ أَلْفَاظٍ وَنَفْيِهَا وَلَوْ سُئِلَ كُلٌّ مِنْهُمَا عَنْ مَعْنَى مَا قَالَهُ لَمْ يَتَصَوَّرْهُ فَضْلًا عَنْ أَنْ يَعْرِفَ دَلِيلَهُ[3].

واتە: ئەم جۆرە وشە و دارشتنانە هۆکاری کێشە و جیاوازی زۆرن لە نێوان خەڵکیدا، هۆکارەکەشی قسەیەکی کورت و داهێنراوە و پێکهاتووە لە چەند واتایەکی لێکچوو، بەو هۆیەوە

---

(١) "شرح الأصول الخمسة" للقاضي عبد الجبار الهمذاني ص٣٩٧.

(٢) "شرح النسفية في العقيدة الإسلامية" للدكتور عبد الملك عبد الرحمن أسعد السعدي ص١١٠.

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٢/ ١١٤).

دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە دوو کەس کێشە لەنێوانیاندا دروستدەبێت، تا ئاستی دروستبوونی کێشە و ستەمکردن لە یەکتری، بە هۆکاری بەکارهێنانی ئەو وشانەوە بەشێوەیەکی گشتی و باوەڕپێبوونی و کردنە بنەما، بەڵام خۆ ئەگەر پرسیار لە هەرکامێکیان بکەیت لە واتای ئەو قسەیەی کە بەکاریدەهێنێت؛ نازانێت ناوەڕۆك و مەبەستی پێی چییە، بەدەر لەوەی کە بەڵگەیەتییەکەی بزانێ.

لەم حاڵەتەشدا پێویستە لە ئاستی ئەم داڕشتنانەدا هەڵوێست بەم شێوەیە بێت کە (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَأَمَّا الْأَلْفَاظُ الَّتِي لَيْسَتْ فِي الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ وَلَا اتَّفَقَ السَّلَفُ عَلَى نَفْيِهَا أَوْ إثْبَاتِهَا فَهَذِهِ لَيْسَ عَلَى أَحَدٍ أَنْ يُوَافِقَ مَنْ نَفَاهَا أَوْ أَثْبَتَهَا حَتَّى يَسْتَفْسِرَ عَنْ مُرَادِهِ، فَإِنْ أَرَادَ بِهَا مَعْنًى يُوَافِقُ خَبَرَ الرَّسُولِ أَقَرَّ بِهِ، وَإِنْ أَرَادَ بِهَا مَعْنًى يُخَالِفُ خَبَرَ الرَّسُولِ أَنْكَرَهُ. ثُمَّ التَّعْبِيرُ عَنْ تِلْكَ الْمَعَانِي إنْ كَانَ فِي أَلْفَاظِهِ اشْتِبَاهٌ أَوْ إجْمَالٌ عُبِّرَ بِغَيْرِهَا أَوْ بَيَّنَ مُرَادَهُ بِهَا بِحَيْثُ يَحْصُلُ تَعْرِيفُ الْحَقِّ بِالْوَجْهِ الشَّرْعِيِّ[١].

واتە: هەموو وشە و داڕشتنێك ئەگەر لە قورئان و فەرموودەدا نەبوو، وە کۆدەنگی زانایانی لەسەر نەبوو بۆ بوونی یا نەبوونی؛ نابێت کەس هەڵگری هیچ شێوازێکی بێت لە ڕووی باوەڕپێبوون و بڕیاردان لەسەر بوون و نەبوونی، تا لە واتا و مەبەستەکەی بەتەواوی تێدەگات، ئەوکات ئەگەر لەگەڵ قورئان و فەرموودەدا گونجا ئەوا باوەڕ و فەرمانی پێدەکات، وە گەر نەگونجا ئەوا هەڵیناگرێت و دژایەتی دەکات، وە گەر ئەو وشە و داڕشتنانە هەندێك شاراوەیی و واتای کورتی لەخۆدەگرت کە واتا حەقەکە نەپێکێت؛ ئەو کات دەبێت ئەو وشە و داڕشتنانە بگۆڕدرێت بۆ داڕشتن و شێوازێك کە واتا شەرعییە حەقەکەی خۆی لەخۆبگرێت.

یەکێك لەو وشە و داڕشتنە کورتانە کە واتای تەواوی شەرعی نادات بەدەستەوە وشەی (تكليف ما لايطاق)ە، واتە داواکارییەك کە قابیلی جێبەجێکردن نەبێت، بۆیە ئەم وشەیە وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَإِذَا عُرِفَ هَذَا فَإِطْلَاقُ الْقَوْلِ بِتَكْلِيفِ مَا لَا يُطَاقُ مِنْ الْبِدَعِ الْحَادِثَةِ فِي الْإِسْلَامِ[٢].

واتە: بەکارهێنانی و بڕیاردان لەسەری بە شێوەیەکی گشتی و ڕەها یەکێکە لە داهێنراو و بیدعەکارییەکانی ناو ئیسلام. کە پێویستی بە شیکردنەوەی تەواو هەیە لەسەری.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٢/ ١١٤).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٣٢٢).

## ڕای فیرەقەكان لەسەر
## (الإستطاعة والتكليف بما لا يطاق)

**ئەم بابەتە یەكێكە لە بابەتە هەستیارەكانی ناو قەدەر كە قسەی لەسەر كراوە:** هذه المسألة من أهم المسائل في باب القدر، لأنها تتعلق بقدرة العبد واستطاعته التي جعلها الله مناط التكليف[1]. **وەكوو (ابن تيمية)ش** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** تَنَازَعَ الْمُتَكَلِّمِينَ ... فِي "اسْتِطَاعَةِ الْعَبْدِ" وَهِيَ قُدْرَتُهُ وَطَاقَتُهُ. هَلْ يَجِبُ أَنْ تَكُونَ مَعَ الْفِعْلِ لَا قَبْلَهُ أَوْ يَجِبُ أَنْ تَكُونَ مُتَقَدِّمَةً عَلَى الْفِعْلِ أَوْ يَجِبُ أَنْ تَكُونَ مَعَهُ وَإِنْ كَانَتْ مُتَقَدِّمَةً عَلَيْهِ[2].

**واتە: ئەم بابەتە لەبەرئەوەی داواكارییە شەرعییەكانی لەسەر بنیادنراوە و باس لە توانای بەندەكان دەكات، لە نێوان فیرەقەكاندا قسەی زۆری لەسەرە، بەتایبەت بابەتی توانای ئادەمیزاد (الاستطاعة)، كە ئایا ئەو توانایە لەگەڵ كاردایە، یا لەپێش كاردایە، یاخود ئەو توانایە لەپێش و لەگەڵیدایە؟!**

✐ ڕا جیاوازەكان:

**ڕای یەكەم: ڕای (الجبرية والجهمية)كانە كە دەڵێن:** ليس للعبد أي استطاعة، لا قبل الفعل ولا معه، بل له قدرة شكلية غير مؤثرة في الفعل أصلاً، وتسمى فعلاً له تجوزًا[3].

**واتە: ئادەمیزاد هیچ توانایەكی نییە لەپێش كارەكان و لەگەڵ كارەكانیشدا، بەڵكوو توانایەكی ڕووكەشی هەیە كە هیچ كاریگەرییەكی لەسەر كارەكانی نییە و بەشێوەی بەرێكاری و (مجاز) پێی دەوترێت كارەكەی، وە گەرنا خاوەنی حەقیقی نییە.**

ڕای ئەمان سەبارەت بە (تكليف ما لا يطاق): فقد جوز الجهم تكليف ما لا يطاق مطلقًا، ومنه تكليف الأعمى البصر، والزمن السير إلى مكة[4]، يَجُوزُ تَكْلِيفُ كُلِّ مَا يُمْكِنُ وَإِنْ كَانَ مُمْتَنِعًا فِي

---

(١) "القضاء والقدر" لعبد الرحمن صالح المحمود ص٢٦٥.

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٣١٨).

(٣) "القضاء والقدر" لعبد الرحمن صالح المحمود ص٢٦٥، و "الملل والنحل" للشهرستاني (١/ ٨٥)، و "البحر الزخار" (١/ ١٢٢)، و "الفرق بين الفرق" لأبي منصور الأسفراييني ص٢١١، و "الإرشاد" للجويني ص٢١٥.

(٤) "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص٢٠٠.

الْعَادَةِ كَالْمَشْيِ عَلَى الْوَجْهِ وَنَقْطِ الْأَعْمَى الْمُصْحَفَ[(١)].

واته: لای جەهمییەکان دروستە داواکارییەك لە تواناداا نەبێت کە هەموو جۆرە داواکارییەك دەگرێتەوە، گەر لە بوونیشدا بوونی نەبێت، وەکوو ڕۆیشتن لەسەر ڕوو، یاخود داواکردن لە نابینا نوقتە و خاڵەکان بۆ قورئان دابنێت، یاخود کەسێکی پەککەوتە بە پێ بچێت بۆ مەککە.

ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە باوەڕیان وایە ئادەمیزاد هیچ کردەوەیەك بەدەست خۆی نییە و (مسيِّر)ە و هەموو کارەکانی بەزۆر پێدەکرێت، بەڵگەیان لەسەر ئەم بۆچوونەش ئەم دوو یاسا عەقڵییەیە:

**یاسای یەکەمی عەقڵییان: قۆرخکردنی مانای توانا بۆ کاتی ئەنجامدانی کارەکان (حصر مفهوم القدرة في الإحداث)[(٢)].**

(**القاضي عبد الجبار الهمذاني**) **دەڵێت**: القُدرةُ لاَ تتَعَلَّق بالشيء إِلَّا على جهة الْحُدُوث فقط[(٣)].

**ئەم یاسایە لای ئەوان دەڵێت: توانا بریتییە لەو توانایەی کە لە کاتی کارکردن و ئەنجامدانی کارەکاندا بوونی هەیە و بەس.**

**بەم یاسایەش دەیانەوێت ئەوە بسەلمێنن کە ئەگەر توانای دروستکردنی کارەکان پەیوەست بێت بە کاتی ئەنجامدانی کارەکانەوە؛ ئەوا دەبێت یا بۆ خوا بڕیار بدرێت، یا بۆ بەندەکانی، ئەگەر بڕیار بدرێت کارەکە خوا دروستی دەکات؛ ئەوە بۆ خوایە و پەیوەندی بە بەندەکانەوە نییە، وە ئەگەر بەندەکان دروستی بکەن؛ ئەوا پەیوەندی بە خواوە نییە، واتە ناشێت کارێك بوونی هەبێت لە نێوان دوو تواناداا، بۆیە قەدەرییەکان دەڵێن ئادەمیزاد دروستی دەکات و پەیوەندی بە خواوە نییە، وە جەبرییەکان دەڵێن خوا دروستی دەکات و پەیوەندی بە ئادەمیزادەوە نییە، بەم یاسایە دەوترێت (استحالة القدرة بين القادرين).**

**وە دەڵێن**: أفعال العباد مخلوقة لله، وهي مع ذلك منسوبة إلى العباد نسبة حقيقية، ولا تعارض بين هذين الأصليين، ... أن الله تعالى هو الخالق لكل شيء، فلا تخرج أفعال العباد عن

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٢٩٧).
(٢) "الخلاف العقدي في باب القدر" للدكتور عبد الله بن محمد القرني ص٨٥.
(٣) "المغني" للقاضي عبد الجبار (٨/ ١٣٢).

هذا العموم[١]. واتە كردەوەكانی ئادەمیزاد دروستكراوی خوایە، لەگەڵ ئەوەشدا دەخرێتە پاڵ بەندەكانی، لەسەر ئەم بنەمایە هیچ دژایەتییەك نییە، بۆیە كردەوەكانی ئادەمیزاد وەكوو هەموو دروستكراوەكانی تر، لە دروستكردن و (مخلوقات)ی ئەو دەرناچێت.

وە گومانیان وایە كە: وظنوا أن تأثير قدرة العبد في فعله لا يكون ثابتًا، إلا إذا كان على سبيل الاستقلال بإحداث الفعل ونقله من العدم إلى الوجود، وهذه هي حقيقة الخلق التي يختص الله بها[٢]. كاریگەری دروستكردنی كارەكان دەبێت سەربەخۆ بێت بە توانایەكەوە و بەشداربووی تری تێدا نەبێت، وە لە نەبوونەوە بێتە بوون، ئەمە بۆخۆی لای ئەهلی سوننەت حەقیقەتی دروستكردنەكە بەس تایبەتە بە خواوە، واتە: استحالة تعلق أفعال العباد بقدرة الله وقدرة العباد[٣]. ئەستەمە كارەكان لە یەك كاتدا پەیوەندییان بە خوا و بەندەكانییەوە هەبێت، لەبەرئەوەی دوو كاریگەری لەسەر یەك كار نییە و نابێت، وەكوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ باسی دەكات كە ئەوان دەڵێن: فَإِنَّ الْأَعْرَاضَ عِنْدَنَا لَا تَبْقَى زَمَانَيْنِ[٤]، فَإِنَّ الصِّفَاتِ فِي الْمَخْلُوقِ لَا تَبْقَى أَيْضًا زَمَانَيْنِ[٥].

واتە: هەموو بوونەوەرێك و بوونێك لە یەك كاتدا دوو شوێن و كاتی نییە، وە هەموو سیفاتێك لە بوونەوەرەكاندا لە یەك كاتدا لە دوو شوێن بوونی نییە، واتە ئەگەر لێرەدا بێت؛ لەوێ نییە، كەواتە توانا لەسەر كاری كردارەكان یا دەبێت بەندەكان خاوەنی ئەو توانا و كارە بن بەشێوەی سەربەخۆی خۆیان، یاخود خوا دەبێت خاوەنی ئەو توانا و كارانە بێت.

بەڵام خۆ دەبینین خوا دروستكاری خۆت و تواناكانتە، كەواتە هەر ئەوە خاوەنی كارەكانیشە بە ئەنجامدانی تۆ، وە دەبینین كردارێك لە نێوان دوو توانا و زیاتریشدا، وەكوو هەڵگرتنی بەردێك یاخود ڕاگرتنی كەسێك بە پێوە كە ناتوانێت.

---

(١) "الخلاف العقدي في باب القدر" للدكتور عبد الله بن محمد القرني ص١٩.

(٢) "الخلاف العقدي في باب القدر" للدكتور عبد الله بن محمد القرني ص٥٤.

(٣) "الخلاف العقدي في باب القدر" للدكتور عبد الله بن محمد القرني ص٨٥.

(٤) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٥/ ٥٣٦).

(٥) "الفتاوى الكبرى" لابن تيمية (٦/ ٦٢٦).

لێرەدا لەوەدا کەوتنە هەڵەوە کە جیاوازییان نەکردووە لە نێوان کار و کارتێکراو، کاری خوا دروستکردنی ئادەمیزادە، وە ئادەمیزادیش بەو توانایانەی کە تیایدا دروستکراوە دەبێتە خاوەن کار: مَنْ قَالَ: إِنَّ الْفِعْلَ هُوَ الْمَفْعُولُ، كَمَا يَقُولُ الْجَهْمُ ... يَقُولُ: إِنَّ أَفْعَالَ الْعِبَادِ هِيَ فِعْلُ اللهِ ... الَّذِينَ يَقُولُونَ: إِنَّ الْخَلْقَ هُوَ الْمَخْلُوقُ، وَإِنَّ أَفْعَالَ الْعِبَادِ خَلْقٌ للهِ، فَتَكُونُ هِيَ فِعْلُ اللهِ وَهِيَ مَفْعُولُ اللهِ[1]. واتە ئەوەی کە دەڵێت کارەکە کارتێکراوەکەیە وەکوو جەهمییەکان، ئەوا دەڵێن کرداری بەندەکان کاری خوایە، وە هەروەها ئەوەشی کە دەڵێت کرداری ئادەمیزاد (خلق) کرداری خوایە (مخلوق)؛ کەواتە کرداری بەندەکان دروستکراوی خوایە و بەم شێوەیەش دەبێت کرداری خوا بێت، ئەمەش هەڵەیە لەبەرئەوەی کرداری دروستکراوەکانی خوایە کە ئادەمیزادە نەك خوا ئەنجامی بدات.

ئەگەر جیاکاری نەبێت لە نێوان دروستکردنی خوا و کاری (مخلوق)دا، وە کاری بەندەکان کاری خوا بێت؛ ئەوا بە نەبوونی ئەو جیاکارییە دەبێتە هۆی: نَفْيَ الْمُبَايَنَةِ يَسْتَلْزِمُ الْحُلُولَ وَالِاتِّحَادَ[2]. تێکەڵبوون و یەکبوون لە نێوان خوا و خەڵکیدا، بگرە لەگەڵ هەموو بوونەوەراندا جیاوازی لە نێوان (خالق) و (مخلوق) نابێت.

هەر کاریگەری ئەم بۆچوونانەیان بووەتە هۆکاری ئەوەی باوەڕیان بە هیچ شتێك لە ناو و سیفاتەکانی خوا نەبێت، لەبەرئەوەی یا دەبێت خوا خاوەنی ئەو ناو و سیفاتانە بێت یا دەبێت (مخلوق) خاوەنیان بێت، بە ڕاستیش دەبینرێت کە دروستکراوەکان خاوەنی ئەو ناو و سیفاتانەن، بۆیە دەبێت خوا خاوەنی نەبێت بەپێی بۆچوونەکانیان، لەگەڵ ئەوەشدا بە حەقیقی خوای پەروەردگار خاوەنیەتی، وە (ابن تيمية)ش رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَأَوَّلُ مَنْ ظَهَرَ عَنْهُ إِنْكَارُ ذَلِكَ هُوَ الْجَهْمُ بْنُ صَفْوَانَ وَأَتْبَاعُهُ فَحُكِيَ عَنْهُمْ أَنَّهُمْ قَالُوا: إِنَّ الْعَبْدَ مَجْبُورٌ وَأَنَّهُ لَا فِعْلَ لَهُ أَصْلًا وَلَيْسَ بِقَادِرٍ أَصْلًا وَكَانَ الْجَهْمُ غَالِيًا فِي تَعْطِيلِ الصِّفَاتِ فَكَانَ يَنْفِي أَنْ يُسَمَّى اللهُ تَعَالَى بِاسْمٍ يُسَمَّى بِهِ الْعَبْدُ[3]، وە دەڵێت: فَقَدْ جَمَعُوا بَيْنَ التَّعْطِيلِ وَالتَّمْثِيلِ مَثَّلُوا أَوَّلًا وَعَطَّلُوا آخِرًا وَهَذَا تَشْبِيهٌ

---

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٢/ ٢٩٦، ٢٩٧).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٥/ ٢٨١).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٤٦٠)، و"الفصل" لابن حزم (٣/ ٢٢).

وَتَمْثِيلٌ مِنْهُمْ لِلْمَفْهُومِ مِنْ أَسْمَائِهِ وَصِفَاتِهِ بِالْمَفْهُومِ مِنْ أَسْمَاءِ خَلْقِهِ وَصِفَاتِهِمْ وَتَعْطِيلٌ لِمَا يَسْتَحِقُّهُ هُوَ سُبْحَانَهُ مِنْ الْأَسْمَاءِ وَالصِّفَاتِ اللَّائِقَةِ بِاَللَّهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى[(١)].

واتە: لەکارخستن و هاوشێوەکردنیان لە نێوان خوا و بەندەکانیدا لە یەك کاتدا کۆکردووەتەوە، یەکەمجار بڕیاری هاوشێوەکردنی نێوان بەندەکان و خواياندا لە ناو و سیفاتەکاندا، وە پاشان لەکارخستنیان ئەنجامدا لە ناو و سیفاتەکانی خوادا، ناو و سیفاتەکانی خوایان بە هاوشێوەی دروستکراوەکانی شێوە کرد و وتیان: ئەگەر یەك جۆر ناو و سیفاتیان هەبێت لە دارشتندا ئەوا لە حەقیقەتی بوونیشدا دەبێت وەکوو یەك وابن، پاش ئەمەش لەکارخستنی ناو و سیفاتەکانی خوایان ئەنجامدا، بە هۆکاری ئەوەی مادام ئادەمیزاد هەیەتی نابێت خوا ببیێت، گەر نا لەیەك دەچن، وە ناشبێت لەیەك بچن.

وە دەڵێت: أَنَّ تَمْثِيلَ الْخَالِقِ بِالْمَخْلُوقِ وَالْمَخْلُوقِ بِالْخَالِقِ فِي الصِّفَاتِ بَاطِلٌ[(٢)].

واتە: لێکچوواندن و هاوشێوەکردنی خوا بە دروستکراوەکانیەوە و دروستکراوەکانی بە خواوە بەتاڵە و نابێت ببێت.

وە دەڵێت: مَعَ الْعِلْمِ بِأَنَّ الِاتِّفَاقَ فِي الِاسْمِ لَا يُوجِبُ مُمَاثَلَةَ الْخَالِقِ بِالْمَخْلُوقِ وَإِنَّمَا يُوجِبُ الدَّلَالَةَ عَلَى أَنَّ بَيْنَ الْمُسَمَّيَيْنِ قَدْرًا مُشْتَرَكًا فَقَطْ؛ مَعَ أَنَّ الْمُمَيِّزَ الْفَارِقَ أَعْظَمُ مِنْ الْمُشْتَرَكِ الْجَامِعِ[(٣)].

واتە: لەگەڵ ئەوەشدا بەشداربوو لە ناودا واتای ئەوە ناگەیەنێت کە خوای گەورە هاوشێوەی دروستکراوەکانیەتی لە ناو و سیفاتدا، بەڵکوو ئەوە دەگەیەنێت کە لە نێوان هاوشێوە ناوەکەدا ڕێژەیەکی بەشداربوویی هەیە، بەڵام ڕێژەی جیاواز و جیاکەرەوە لە نێوانیاندا زۆر گەورەترە تا ئەو ڕێژە بەشداربووە.

**بۆ نموونە:**

- بیستن بۆ خوا و بەندەکانی: لە ناودا هاوشێوەن، بەڵام لە چۆنیەتی و واقعدا زۆر جیاوازترە.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٥/ ٢٧).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٤٣١).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٥/ ٢٠٢).

**- یاخود بوونی خوا و بوونی ئادەمیزاد:** بوونەکان لە ناودا یەك ناون کە بەڵگەیە لەسەر بوون بۆ هەردووکیان، بەڵام جیاوازییەکی گەورە لە نێوان بوونی خوا و ئادەمیزاددا هەیە.

**یاسای دووەمی عەقڵییان: (اتفقوا على الاستدلال بدلالة التمانع بين قدرة الرب وقدرة العبد)**[(١)].

بریتییە لە بەڵگەی نەبوونی دوو توانا لە توانایەك یاخود لە کارێکدا (أدلة التمانع)، توانای خوا و توانای بەندەکەی.بۆ شیکردنەوەی ئەم بەڵگەیە (فخر الدين الرازي) دەڵێت: واحتج الجبرية إذا أراد الله تحريك جسم وأراد العبد تسكينه: فإما أن يمتنعا معاً، وهو محال، ... أو لوقعا معاً، وهو محال، أو يقع أحدهما وهو باطل، لأن القدرتين متساويتان في الاستقلال بالتأثير في ذلك المقدور الواحد[(٢)].

ئیمامی (الرازي) دەڵێت: بۆ نموونە ئەگەر خوا بیەوێت جەستەیەك بجوولێنێت و بەندەکەی بیەوێت نەجوولێت، لەم حاڵەتەدا لەمانە بەدەر نییە:

- یا دەبێت هەردووکیان بێ توانا بن لە هێنانەدی ویستەکەیاندا، کە ئەمەش ئەستەمە دوو خاوەن ئیرادە و توانا دەستەوەستان و بێدەسەڵات بن لە هێنانەدیدا.

- یاخود هەردوو ویستەکە دێتە دی، کە ئەمەش ئەستەمە، لەبەر پێچەوانەی ویستی یەکتری.

- یاخود ویستی یەکێکیان دێتەدی بەسەر ئەویتردا، ئەمەش بەتاڵە، لەبەرئەوەی دوو تواناکە لە ئاستی یەکدان لە سەربەخۆیی توانای کاردا.

ئەمە یاسای بەڵگەی نەگونجاندنە (أدلة التمانع) کە دەیکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی گەر وابێت ئەوا کارەکانی ئادەمیزاد دوو توانای تیادا بەدیدەکرێت، توانای خوا و توانای بەندەکان، وە دەبێت یەك تواناش بوونی هەبێت لە کارکردندا، بەگوێرەی (أدلة التمانع) بیروڕایان لەسەر کرداری ئادەمیزاد دەبێتە دوو بەشەوە: فالجبرية يقولون: استحال دخولها تحت قدرة العباد، فصاروا مضطرين مجبورين في ذلك كالشجرة في تحركها . والقدرية يقولون: لما دخلت تحت

---

(١) "الخلاف العقدي في باب القدر" للدكتور عبد الله بن محمد القرني ص٢٤.

(٢) "محصل أفكار المتقدمين والمتأخرين" للرازي ص٢٨٢، و "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٨٢).

قدرة العباد ... يستحيل دخولها تحت قدرة الله[(١)].

**(الجبرية)كان دەڵێن:** گەر توانای بەندەكان لەگەڵ بوونی توانای خوادا بێت؛ ئەوا ئەستەمە خاوەن توانا بن، لەبەرئەوەی ئەو خوایە و باڵادەستە، وە ئادەمیزاد (مخلوق)ە و بێ دەسەڵاتە، وە گەر وانەبێت ئەوا لە دەسەڵات و توانای خوا دادەبەزێت و ئەوكات شاییستە بەو نییە بڵێین ئادەمیزادیش بەدەسەڵاتە، بۆیە دەبێت ئادەمیزاد بێ توانا و بێ دەسەڵات بن لە كارەكانیاندا، وەكوو درەختێك وابن كە بایەك چۆن بیەوێت دەیشەكێنێتەوە.

وە **(القدرية)كانیش دەڵێن:** گەر سەیر بكەین بە ئاشكرا دەبینین بوونی دەسەڵات لای ئادەمیزاد لەسەر كردنی كارەكانی، بۆیە ئەم توانای ئادەمییە نكوولّی لێ ناكرێت، كەواتە ئەستەمە توانای خوا باڵادەست بێت بەسەریدا، لەبەرئەوەی ئەگەر باڵادەست بێت و ئادەمیزاد بێ دەسەڵات بێت و لە هەمان كاتیشدا خاوەن كردار بێت؛ ئەوا خوا ستەم دەكات لە بەندەكانی، ئەوەش بۆ خوا مەحاڵە، بۆیە دەبێت دەسەڵاتی خوای تیادا نەبێت، بۆیە ئادەمیزاد سەربەخۆ و خاوەن توانای خۆیانن و خۆیان كردەوەی خۆیان دروست دەكەن.

گومان نییە دروستكردن و پێبەخشینی تواناكان و ئامێرەكانی كاركردن و كار بۆ ڕەخساندن و لابردنی ڕێگرییەكان لە ئاستی كارەكاندا؛ ئەمانە هەموویان لە توانا و دروستكردن و دەسەڵاتی خوادان، وە توانا ڕەخساو و دیاریكراوەكان و ئەنجامدان و بەكارهێنانی ئامێرەكان لە توانا و كاری سنووورداری بەندەكاندایە و ڕێژەییشە لە ئاستی بوون و كەسەكاندا، كەواتە بە ئاشكرا دیارە دروستكردنی تواناكان و خاوەنی حەقیقی تواناكان، كە ئەمیان خوایە و بەدیهێنەر و خاوەنی هەموو بوونەكانە، ئەویشیان دیارە بەندەكان و دروستكراوەكانی ئەو خوایەن، لەگەڵ بوونی سنووورداری و ڕێژە و هەموو ناتەواوییەك، كەواتە هەر لە بنەمادا ئەم بەڵگەی (أدلة التمانع)ە هەڵەیە، بۆیە (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** وهذا نقلوه من تقدير ربين وإلهين، وهو قياس باطل، لأن العبد مخلوق لله هو وجميع مفعولاته، ليس هو مثلاً لله ولا نداً[(٢)].

واتە: ئەم پێوانەیەی كە دەیكەنە بەڵگە پێوانەیەكە لە نێوان توانای دوو خوا و داهێنەردا، نەك ببێتە پێوەر لە نێوان (خالق ومخلوق)دا، لەبەرئەوەی بەندەكان خۆیان و كار و كردەوەكانیان

---

(١) "الخلاف العقدي في باب القدر" للدكتور عبد الله بن محمد القرني ص٢٣، و "التمهيد لقواعد التوحيد" لأبي الثناء محمود بن زيد اللامشي ص١٠٠، ١٠١.

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٨٥).

دروستکراوی خوان و لەخۆگری هەموو کەم و کوڕییەکن، بۆیە هاوکێشەیەکی هەڵەیە، وە توانای بەندەکانیش ناچێتە ڕیزی توانای خواوە لە هیچ شتێکدا، وە خواش هیچ هاوشێوە و بەشدارێکی نییە لە هیچ شتێکدا.

کەواتە ئەمە بۆخۆی جۆرێکە لە (شرك) و هاوشێوە بڕیاردان بۆ خوا کە (مخلوق) دەخاتە ڕیزی (خالق)ەوە و پێچەوانە و هەڵوەشاندنەوەی (توحيد الألوهية)ە.

ئەم دوو بەڵگە عەقڵییەی کە باسکرا کۆدەنگی هەموو فیرەقەکانی لە (الجهمية والجبرية والقدرية والمعتزلة والأشاعرة والماتريدية)ی لەسەرە و ناتوانن لێی دەرچن، بەڵام پەیوەستبوویی قسەکە لە یەکتریان جیادەکاتەوە، واتە مەبەست و مانای قسەی بۆچوونەکە هەریەکەیان لایەکی دەخوێننەوە.

## هەڵەکانی ئەم دوو یاسایە[(١)]:

١. توانا لە کاردا تەنها لەکاتی بوونی کارەکەدا نییە (في وقت أحداث الفعل)، بەڵکوو بە ئاشکرا بوونی هەیە لەپێش کارەکاندا، وە هەندێك جار لەکاتی کارەکاندا، وە قابیلی مانەوەیە، وەك ویست و ئیرادەی هەستان لە کەسی لەش ساغ و سەلامەت و بێ کێشەدا، پێش ئەنجامدانی کارەکە بوونی ئیرادە و توانا هەیە، وە لەکاتی ئەنجامدانیشدا بە هەمان شێوە ئیرادە و توانا بوونی هەیە، وە لەدوای کارەکەشدا ئیرادە و تواناکە بوونی هەر دەمێنێتەوە.

٢. ڕیزبەندی لە نێوان توانای (خالق ومخلوق)دا بە یەك ئاست؛ ئەمە شەریك بڕیاردانە بۆ خوا و هیچ شتێك و بوونێك لە ئاستی (خالق)دا نییە.

٣. دروستکردن و هێنانەدی (خلق) خستنە پاڵ (مخلوق)ەوە لە کاتێکدا کە کاری خوایە؛ ئەمەش بۆخۆی هاوبەش بڕیاردانە لە (توحيد الألوهية)دا، لەبەرئەوەی بەس لە توانای خوادایە هێنانەدی و دروستکردنی بوونەوەرەکان و بوونەکان.

٤. یەکسانکردنی پەیوەندییەکانی نێوان توانا و دروستکردن و هێنانەدی لە نێوان (خالق ومخلوق)دا: ئەو توانا و هێنانەدییانەی لە دەسەڵات و پەیوەندی ڕاستەقینەی خوادا هەیە بۆ کارەکانی ئادەمیزاد؛ لە بەندەکانیدا بەو بوون و واقعە نییە، زۆر جیاوازە خاوەندارێتییان و توانای کارکردنیان.

---

(١) درێژەی ئەم باسە لە کتێبی: "الخلاف العقدي في باب القدر" للدكتور عبد الله بن محمد القرني ص٤٥، ٥٤، ٥٩، ٧٤، ٧٨.

بەمانەش هاوشێوەكردن دروست دەبێت لە نێوان خوا و بەندەكانیدا، لە ناو و سیفات و ماف (حقوق)دا، لە ئەنجامدا لەلایەن (جبرية)كانەوە ستەم دەدەنە پاڵ خوا بەوەی كە بەزۆر كار بە بەندەكانی دەكات و بێ دەسەڵاتن و پاشان لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەكات لەسەر ئەو كارانە، وە لەلایەكی تریشەوە (قدرية)كان بێدەسەڵاتی و نەبوونی خاوەنداریێتی بۆ دروستكراوەكانی دەدەنە پاڵی، كە ئەمە ناتەواوییە لە حەقیقەتی خوایەتیدا، بەوەی كە لە بوونەوەردا بوونێك هەیە لەژێر ئیرادە و دەسەڵاتی خوادا نییە و كردەوە و كارێكیش هەیە ئەو دروستی نەكردووە، ئەویش كار و كردەوەی بەندەكانیەتی.

وە لە كۆتاییشدا دوو جۆر دروستكردن و هێنانەدی هەیە، خوایەك كە بەندە و توانا و ئیرادە و ... بوونەوەرەكانی دروستكردووە، وە بەندەكانیش كە خاوەنداریێتی و دروستكاری كردەوەكانی خۆیانن، بەڵام ئەوەی كە لە نەبوونەوە بۆ بوون (من المعدوم إلى الموجود) كارەكان دادەهێنێت؛ بەس خوایە، ئەو توانایە ئادەمیزاد خاوەنی نییە، وە كردنی كارەكانیش ئادەمیزاد بەگوێرەی توانا خاوەنیەتی.

**٥. پەیوەندی نێوان دروستكردنی كارەكان لەلایەن خواوە و ئەنجامدانی لەلایەن بەندەكانیەوە** پەیوەندییەكی نێوان گرێدانی هۆكارەكانە بە كارەكانەوە (الأسباب والمسببات)، وەكوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: أَنَّ قُدْرَةَ الْعَبْدِ مَعَ فِعْلِهِ لَهَا تَأْثِيرٌ كَتَأْثِيرِ سَائِرِ الْأَسْبَابِ فِي مُسَبَّبَاتِهَا[١]. وە ئەو پەیوەندییەش كە لە نێوان هۆكارەكان و كارەكاندا هەیە ئەوەیە كە: وَالْأَسْبَابُ لَيْسَتْ مُسْتَقِلَّةً بِالْمُسَبَّبَاتِ[٢]. هۆكارەكان سەربەخۆ و ناپەیوەندیدار نین لەگەڵ كارەكاندا، وەك: فمن أثبت للنار خاصية الإحراق وَفْقَ السنة الكونية التي خلق الله النار عليها، وكما لا يلزم من إثبات خاصية الإحراق للنار القول باستقلال النار بالإحراق عن قدرة الله، ولا نفي خاصية الإحراق للنار لأجل تعلق قدرة الله بها، فكذلك ... أفعال العباد[٣]. بڕیاری سیفەتی سووتاندن بۆ ئاگر بەپێی ئەو دروستكردنە دەدرێت كە خوا بۆی دروستكردووە، بۆیە ناتوانرێت بوترێت ئاگر خۆی بە سەربەخۆیی خۆی سووتاندنی هەیە بەبێ دروستكردنی ئەو سیفەتە لەلایەن خواوە بۆی، وە

(١) (٢) "مجموع فتاوى" لابن تيمية (٨/ ٤٨٧).

(٣) "الخلاف العقدي في باب القدر" للدكتور عبد الله بن محمد القرني ص٥٤.

ناشورێت سیفەتی سووتاندن لە ئاگردا نییە، بەڵکوو تێیدایەتی بەڵام پێویستی بە سووتەمەنی هەیە بۆ سووتاندن، وە هیچیان سەربەخۆ نین، نە سووتاندن وە نە سووتەمەنی بۆ کرداری سووتاندن، لەبەرئەوەی پەیوەندی بە دروستکردنی خواوە هەیە، کردەوە ئادەمییەکانیش هەر بەو شێوەیەیە، بەبێ دروستکردنی خوا و کارکردنی ئادەمیزاد؛ کردار لە ئادەمیزاددا بوونی نابێت.

وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿أَفَرَءَيۡتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمۡ أَنشَأۡتُمۡ شَجَرَتَهَآ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾﴾ [الواقعة: ٧١، ٧٢]. نابینن ئەو ئاگرەی کە دەیکەنەوە، ئایا ئێوە درەختەکەیتان دروستکردووە بۆ کردنەوەی ئاگرەکە یاخود ئێمە؟ واتە بەبێ درەختەکان بوونی ئاگر نابێت.

کەواتە تایبەتمەندی ئاگرەکە سەربەخۆ نییە تاوەکوو بەبێ درەختەکان بوونی هەبێت، بەڵکوو هۆکارەکەی درەختەکانە، با سیفەتی سووتاندنیش لە ئاگردا هەبێت؛ خۆ بەبێ درەخت و ئاگرگرەکە بوونی نییە.

کەواتە با کردەوە و کار و توانا لە ئادەمیزاددا بوونی هەبێت؛ بەڵام بەبێ ڕەخساندنی خوایی بۆ پێویستییەکانی کارکردن بوونی کردەوەکان نابێت، کەواتە بەبێ هۆکاری ئەم دوو پەیوەندییە لە نێوان (خالق ومخلوق)دا بوونی کارەکان نابێت، بەڵکوو دروستکردن و ڕەخساندنیان دەدرێتە پاڵ خوا، وە ئەنجامدانی کارەکانیش دەدرێتە پاڵ بەندەکانی، ئەمە پەیوەندییەکی (الأسباب والمسببات)ە، بەبێ خستنەپاڵی یەکێکیان بەویتریانەوە دەرناچێت و نایەتە دی، وە کاری خوا کە (خلق)ە نادرێتە پاڵ بەندەکانی، وە کاری بەندەکانی کە کارە (فعل) نادرێتە پاڵ خوا.

ئەو تواناییانەی کە لە ئادەمیدا خوا دروستی کردوون، یاخود ئەو کارانەی کە بەو هۆکار و تواناییانەوە پێیان دەکرێت نادرێتە پاڵ خوا، بەڵکوو بەندەکان خاوەنیانن، هەروەك: كَمَا أَنَّهُ سُبْحَانَهُ لَا يَتَّصِفُ بِمَا خَلَقَهُ فِي غَيْرِهِ مِنْ الطُّعُومِ وَالْأَلْوَانِ وَالرَّوَائِحِ وَالْأَشْكَالِ وَالْمَقَادِيرِ وَالْحَرَكَاتِ وَغَيْرِ ذَلِكَ؛ فَإِذَا كَانَ قَدْ خَلَقَ لَوْنَ الْإِنْسَانِ لَمْ يَكُنْ هُوَ الْمُتَلَوِّنَ بِهِ وَإِذَا خَلَقَ رَائِحَةً مُنْتِنَةً أَوْ طَعْمًا مُرًّا أَوْ صُورَةً قَبِيحَةً ... لَمْ يَكُنْ هُوَ مُتَّصِفًا بِهَذِهِ الْمَخْلُوقَاتِ الْقَبِيحَةِ الْمَذْمُومَةِ الْمَكْرُوهَةِ وَالْأَفْعَالِ الْقَبِيحَةِ[1].

---

(١) "مجموع فتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٢٣).

واتە: ئەگەرچی خوای پەروەردگار وەسف ناكرێت بەو سیفەتانەی كە لە بوونەوەرەكاندا دروستی كردوون لە تام و بۆن و ڕەنگ و شێواز ... ناوترێت ئەو ڕێحانەیە بۆنی خۆشە، خوا بۆنی خۆشە، یا تامی تاڵە، یا شێوازی ئەوە وایە، خوا شێوازی وایە لە ناشرینی و جوانی، بەڵكوو دروستكراوەكان خاوەنی ئەو سیفەتانەن و خواش دروستی كردوون، هەروەها لەناو ئادەمیزادیشدا بەو شێوەیەیە كە خۆیان خاوەنی كردارەكانن.

واتە كردەوەكان ئادەمیزاد خاوەنیانن و ناوترێت خوا نوێژی كرد و ڕۆژووی گرت ... وە تەنانەت: لو كان الله هو الذي تخليق أفعالهم وإيجادها، لصار آمرًا نفسه ناهيًا إياه، ... لأنه هو الذي تولى إيجادها، فكان هو المؤمن والكافر والمطيع والعاصي، وذا محال[(١)]. گەر خوا كاری بەندەكانی دروستكردبێت ئەوا خۆی دەیكات، چ پێویستی بە بەندەكانە؟ وە ئەو كاتەش فەرمان و ڕێگرییەكان بە بەندەكانی ناكات، بەڵكوو فەرمان بە خۆی و ڕێگری لە خۆی دەكات، وە دەبێتە هۆكاری ئەوەی خۆی ئیماندار و بێبڕوا و تاوانبار بێت نەك بەندەكانی، لەبەرئەوەی بە بۆچوونی ئەوان ئەو كردەوانە خۆی دروستی كردووە و خۆی خاوەنیەتی.

٦. هۆكاری دروستبوونی ئەم گومڕاییە دەگەڕێتەوە بۆ: وهؤلاء إنما وقعوا في الحيرة والاضطراب؛ لأنهم رتبوا إثباتهم لتعلق أفعال العباد بقدرة الرب، وقدرة العبد على إدراكهم لكيفية الصلة بين القدرتين، لا على مجرد التسليم بما دلت عليه الضرورة من ثبوتهما[(٢)]. بڕیاردانیان لەسەر كار بۆ ئادەمیزاد بەستووەتەوە بە دەرككردن بەو پەیوەندییانەی كە لە نێوان دەسەڵاتی خوا و بەندەكانیدا هەیە، نەك بڕیاردان لەسەر پەیوەندی ئەو كارە هەریەك بۆخۆی لە دروستكردن و كاركردن پێی لە نێوان (خالق ومخلوق)دا.

بۆیە بنەمای سێیەم لەو بنەمایانەی كە (د. عبد الله بن محمد القرني) باسی كردووە لە "الخلاف العقدي"دا بۆ یەكلابوونەوەیەكی زانستی لەم بارەیەوە ئەوەیە كە: أنه لا يلزم من إثبات تعلق فعل العبد بقدرة الرب وقدرة العبد العلم بكيفية العلاقة بينهما، ويدخل ذلك في عموم التفريق بين الإيمان بأسماء الله وصفاته وبين العلم بكيفيتها، ... فكما أن إثبات أسماء الله تعالى

(١) "الخلاف العقدي" للدكتور عبد الله بن محمد القرني ص٨٠، و "تبصرة الأدلة" لأبي المعين النسفي (٢/ ٥٩٨).

(٢) "الخلاف العقدي في باب القدر" للدكتور عبد الله بن محمد القرني ص٦١.

وصفاته هو إثبات وجود، لا إثبات علم بالكيفية، بل يكفي إثبات التأثير لكل من قدرة الرب وقدرة العبد، والجزم بأن إحداث الفعل وخلقه هو متعلق قدرة الله تعالى، لتفرد الله تعالى بالخلق والإيجاد لجميع المخلوقات، وأن غاية تأثير قدرة العبد أن تكون سببًا في تحقق الفعل، وأن ما وراء ذلك مما لا يمكن لمخلوق إدراكه، وإنما يختص الله تعالى بالعلم به، فهو مما لا يتوقف عليه الإيمان بالقدر(١).

**ئەم بنەمایە دەڵێت: جیاوازی هەیە لە نێوان باوەڕبوون بە بوونی "پەیوەستی کاری بەندەکان بە توانای خواوە" لەگەڵ "هەوڵدان بۆ پێزانین و دەرککردن بەو چۆنیەتی و پەیوەندییەی کە لە نێوان توانای خوا و خەڵکیدا هەیە کە چەندە و ووردەکارییەکانی چۆنە"، واتە بزانین کە چۆن و چەندە یارمەتی و توانای خوا هەیە لە کارێك لە کارەکانی کەسێکدا لەگەڵ هەمان شێوەی توانای کەسەکە و کارەکەی، ئەمەش بۆخۆی زانستێك و نهێنییەکی خوایە لە مامەڵەکردن و ئاڵوگۆڕی لە نێوان بەندەکانیدا کە توانای دەرککردنی تەواو نییە بەسەریدا، خوای گەورەش جَلَّ وَعَلَا دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ﴾ [البَقَرَة: ٢٥٥]. توانای دەرککردنی تەواوتان نییە بەسەر کەمترین و هیچ شتێکی زانستی خوادا.**

**هەروەك چۆن لە ناو و سیفاتەکانی خوادا (الأسماء والصفات) داوای ئیمانپێهێنانی کردووە و بە مەرجی نەگرتووە زانینی چۆنیەتییەکەی؛ بەو شێوەیەش لە قەدەردا داوای باوەڕبوون و ئیمان دەکات بە توانای خوا و ئادەمیزاد لە کارەکاندا و بە مەرجیشی نەگرتووە زانین و دەرکپێکردنی چۆنیەتی و چەندێتی بوونی توانای خوا لە جۆراوجۆری کارەکاندا، لەبەرئەوەی لە توانا و زانستی سنووورداری ئادەمیزاددا نییە.**

**بەڵکوو باوەڕبوون بە توانای خوا و بەندەکان و دڵنیابوون بەسەر ئەوەی کە "هێنانەدی و دروستکردن" لە توانای خوادایە و کاری ئەوە، وە ئەوپەڕی کاریگەری توانای بەندەکان "گرتنەبەری هۆکارەکانە" لە هێنانەدی کارەکاندا، وە ئەوەشی کە ماوە لە پشت ئەمەوە زانین و دەرکپێکردنی لە توانای کەسدا نییە و تایبەتە بە خوا و زانستی خۆیەوە، وە لە کۆتاییشدا ئیمان بە قەدەر ڕانەوەستاوە لەسەر ئەو زانینە و داواکاریشی لەسەر نییە.**

---

(١) "الخلاف العقدي في باب القدر" للدكتور عبد الله بن محمد القرني ص٥٩، ٦٠.

**ڕای دووەم: ڕای (المعتزلة والقدرية والشيعة وطوائف من المرجئة)کانە کە دەڵێن:** أن الله قد مكن الإنسان من الاستطاعة وهذه الاستطاعة قبل الفعل، وهي قدرة عليه وعلى ضده، وهي غير موجبة للفعل، وهذا بإجماع المعتزلة [(١)].

**واتە: خوای پەروەردگار توانای بە ئادەمیزاد بەخشیوە، بوونی ئەو توانایەش پێش کارەکەیە، ئەو توانایەش بۆ چاك و خراپ بەکاردەهێنرێت بە یەك ئاست، وە ئەو توانایەش مەرج نییە هەموو کات هۆکاری هێنانەدی کارەکە بێت.**

**وە هەروەها لای ئەوان:** فالله تعالى عندهم أعطى العباد قدرة عامة على فعل الفعل، والعباد هم الذين يرجحون جانب الخير وجانب الشر، والله عندهم لا يَقْدرُ (لا يُقَدَّر) على ذلك الترجيح[(٢)]. **خوای گەورە توانایەکی گشتی بە "کارکردنی کار" بەخشیوە بە بەندەکانی، بەڵام بەهێزکردن و کاراکردنی لایەنی خێر و شەڕ لای بەندەکانە و خوا لە دانان و توانایدا نییە بەهێزکردنی ئەو لایەنانە،** (سُبْحَانَهُۥ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ).

**پێناسەکەیان دەبێتە دوو بەشەوە:**

١. توانا پێش کارەکە (الاستطاعة قبل الفعل): **هۆکاری ئەم قسەیەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەم یاسا عەقڵییەیان کە دەڵێن:** لذلك قلنا إنها مقدمة على الفعل ليصح من القاعد أن يقدر على القيام، والقائم أن يقدر على القعود، ومن المكلف أن يقدر على الإيمان بدلاً من الكفر، فيقع فعله باختياره لا على جهة الجبر والاضطرار[(٣)].

**واتە: بۆیە دەڵێین تواناکە پێش کارەکەیە لەبەرئەوەی بژاردە و توانای دانیشتوویەك هەبێت بۆ هەستان، وە بۆ بەپێوە بوویەك هەبێت بۆ دانیشتن، وە داواکارێك توانای ئیمانهێنانی هەبێت لە**

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٧١)، و "القضاء والقدر" لعبد الرحمن صالح المحمود ص٢٦٥، ٢٦٦، و "أفعال العباد" لمحمد حسن رباح بخيت ص٩٨، و "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص١٩٨.

(٢) "القضاء والقدر عند السلف" لأبي عبد الرحمن علي بن السيد الوصيفي ص١٨٣.

(٣) "المختصر في أصول الدين" للقاضي عبد الجبار، ضمن "رسائل العدل والتوحيد" دراسة والتحقيق: الدكتور محمد عمارة (١/ ٢١٦).

**بریتی بێباوەڕی، تاوەکوو خاوەن بژاردە و کاری سەربەخۆ بن، نەك زۆرەملێ و بەزۆر پێکردن.**

**وە دەڵێن:** فلو كانت مقارنة لهما لوجب بوجودهما وجود الضدين، فيجب في الكافر وقد كلف الإيمان أن يكون كافرًا مؤمنًا دفعة واحدة، وذلك محال[١].

**واتە: خۆ ئەگەر تواناکان لەگەڵ کارەکاندا بێت؛ ئەوا دەشێت لە یەك کاتدا داواکاری ئیمانهێنان لە بێبڕوایەکدا بێتە هۆکاری بوونی دوو کار: بەوەی کە لە یەك کاتدا بێبڕوا بێت، کە هەر خۆی لەم کاتەدا بێبڕوایە، وە داوای ئیمانداریشی لێبکرێت کە توانای بێبڕواییەکەی ناهێڵێت ئیمان بێنێت، ئەوەش ئەستەمە.**

**لەبەرئەوەی دوو توانا لە یەك کاتدا بە یەك ئاست و دژبەیەك بوونی نییە و ئەستەمە (الجمع بين النقيضين مستحيل).**

**هۆکارێکی تر بۆ ئەم قسەیەیان کە توانا پێش کارە ئەوەیە کە دەڵێن:** لو كانت القدرة مقارنة للمقدور فمعنى ذلك أن تكليف الكافر يكون تكليفاً بما لا يطاق، إذ لو أطاقه لوقع ذلك منه، فلمّا لم يقع، دل ذلك على أنه غير قادر عليه[٢].

**واتە: ئەگەر توانا لەگەڵ کارەکەدا هەبێت؛ ئەوا داواکاری ئیمانهێنان لە کەسێکی بێبڕوادا داواکارییەکە لە دەرەوەی سنووری توانادایە، لەبەرئەوەی ئەو لەکاتی بێبڕواییدا توانای ئیمانهێنانی نییە بۆیە بێبڕوایە، لەبەر ڕێگری توانای بێبڕواییەکەی، ئەوەش هۆکارە بۆئەوەی کە ئەگەر بیتوانیایە ڕووی دەدا تیایدا و ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە توانای بەسەریدا ناشکێت:** حال وجود الفعل يمتنع الترك، فلهذا قالوا: القدرة لا تكون إلا قبل الفعل، وهذا باطل مطلقا، فإن وجود الأمر مع عدم بعض شروطه الوجودية ممتنع، بل لابد أن يكون جميع ما يتوقف عليه الفعل من الأمور الوجودية موجودا عند الفعل، فنقيض قولهم حق، وهو: أن الفعل لابد أن يكون معه قدرة[٣]. **لە کاتی بوونی کارەکەدا نەکردن بوونی نییە، بۆیە دەڵێن: توانای کارکردن لەپێش**

(١) "شرح الأصول الخمسة" للقاضي عبد الجبار الهمذاني ص٣٩٨.

(٢) "شرح الأصول الخمسة" للقاضي عبد الجبار الهمذاني ص٤٠٠، و "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص١٨٦.

(٣) "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص٢١٠.

کارکردندایە، ئەمەش بە گشتی هەڵەیە لەبەرئەوەی نەبوونی چەند مەرجێك لە کاتی جێبەجێکردنی کارێك کە فەرمانی پێکراوە هۆکارە بۆ جێبەجێنەکردن، بەڵکوو دەبێت هەرچی پێویستییەك هەیە بۆ هێنانەدی ئەو کارە بوونی هەبێت لەگەڵ کارەکەدا، کەواتە پێچەوانەی قسەکەیان تەواوە کە دەڵێت: هەموو کارێك دەبێت تواناکەی لەگەڵیدا هەبێت.

واتە با پێویستییەکانی کارکردن لە ئەندامەکانی لاشە و ئیرادە و زانین و توانا و ... بوونی هەبێت؛ هێشتا چەند پێویستییەکی تر دەمێنێت بۆ ئەنجامدانی کارەکە، ئەویش لەگەڵ کارەکەدا بوونی دەبێت، لە خۆشەویستی و حەزلێبوون و ڕاهاتن و کارئاسانی کردن بۆی و بەردەوامی پێدانی و نەهێشتنی ڕێگرییەکان لە ڕێیدا، ئەوکات کارەکان بەتەواوی بۆی ئەنجام دەدرێت.

هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ بە (أَشَجّ عَبْد الْقَيْس)ی فەرموو: «"إِنَّ فِيكَ خَلَّتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللهُ، الْحِلْمُ وَالْأَنَاةُ" قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَنَا أَتَخَلَّقُ بِهِمَا أَمْ اللهُ جَبَلَنِي عَلَيْهِمَا؟ قَالَ: "بَلِ اللهُ جَبَلَكَ عَلَيْهِمَا" قَالَ: الْحَمْدُ للهِ الَّذِي جَبَلَنِي عَلَى خَلَّتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللهُ وَرَسُولُهُ»[(١)].

واتە: تۆ دوو ڕەوشتت تیادایە کە خوا خۆشی دەوێن، ئەویش لەسەرخۆیی و ئارامییە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ئەو دوو ڕەوشتەم دروستکردووە لە خۆمدا یاخود خوا ڕایهێناوم لەسەری؟ فەرمووی: بەڵکوو خوا ڕایهێناوی لەسەری، وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕایهێناوم لەسەر دوو سیفەت کە خوا و پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێت.

تەنانەت خاوەنی ئەو دوو سیفەتە نەیوت و (مناقشة)ی نەکرد لەسەر ئەوەی کە خۆی لە خۆیدا دروستیکردووە، لەبەرئەوەی بە واقع لەخۆیدا دەبینێت کە هەموو هێنانەدی پێویستییەکانی ئەم دوو سیفەتە لە توانای خۆیدا نییە.

بۆیە هۆکاری کەوتنە هەڵەی (معتزلة)کان لەم بوارەدا: اقتصارهم على إثبات أحد نوعي القدرة، وتغافلهم عن القدرة التي تكون مع الفعل، وهي حقيقة القدرة[(٢)]. هەڵەکەیان

(١) رواه البخاري في "الأدب المفرد" (٥٨٥)، ومسلم (١٨)، وأبو داود (٥٢٢٥) واللفظ له، والترمذي (٢٠١١)، وابن ماجه (٤١٨٨)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٢٠٣)، وأحمد في "المسند" (١١١٧٥)، والبزار في "المسند" (٥٣٠٩)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٨٤٨)، والطبراني في "الكبير" (٥٣١٣)، والبيهقي في "الشعب" (٨٠٥٢).

(٢) "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص٢١١.

دەگەڕێتەوە بۆ كورتكردنەوەی تواناكان بۆ یەك جۆر لەو توانایانە، ئەویش بوونی ئەندامەكانی لاشە و سەلامەتییان و بوونی توانایە تیایاندا و ئامادەبوونیانە بۆ كار، ئەمانە توانای پێش كارن، بێئاگا بوون لەو توانایەی كە لەگەڵ ئەنجامدانی كارەكاندا بوونیان هەیە، لە ڕەخساندن و یارمەتی خوایی بۆ ئەنجامدانیان و بەردەوامی پێدان تا كۆتایی كارەكە، كە ئەمە قەدەرێكی كەونییە و ناوەڕۆك و مەبەستی تواناكان لەمەدایە.

ئەمانیش ئەوەندەی خاوەن عەقڵ و تێڕوانینن لە بینینی كار و شتە مادییەكاندا؛ ئەوەندە خاوەن ئیمان و تێڕوانینی دەسەڵاتی خوایی نین تا ناوەڕۆكی كارەكان و نهێنییەكانی ببینن.

**تێبینی:** (معتزلة)كان لەسەر توانایەك كە لەگەڵ كارەكاندا هەبێت دەڵێن: يلزم على القول بمقارنتها للمقدور تكليف ما لا يطاق، وذلك قبيح، ومن العدل أن لا يفعل القبيح[١].

واتە: تواناكان لەگەڵ كارەكاندایە، دەبێتە هۆی بڕیاردان لەسەر داواكاری لەتوانادا نەبوو (تكليف ما لا يطاق)، "لەبەرئەوەی وادەزانن كە توانا لە كاتی كارەكاندا بوو ئەوا لەو كاتەدا توانای هەموو شتێكت هەیە كە بیكەی بە (تكليف ما لا يطاق)يشەوە"، دەڵێن ئەمەش بۆخۆی ناجۆر و نەشیاوە بۆ خوا، وە لە دادپەروەری خوا ئەوەیە كە شتی نەشیاو نەكات.

بەڵام ئەم پێوانەیە هەڵەیە وەكوو هەموو جار دەكەونە ناوی، لەبەرئەوەی مەرج نییە ئەوەی كە بۆ بەندەكان نەشیاو بێت بۆ خواش نەشیاو بێت: وليس ما يستقبح من العبد يستقبح من الله تعالى[٢]، بۆی هەیە خوای گەورە تاقیكردنەوەی بەندەكانی بكات بەوەی كە ویستی لەسەرە، بەڵام بەندەكانی ئەو ماف و توانایانەیان نییە لە نێوان یەكتردا، وە بەندەكان بۆیان نییە لێپرسینەوە لە خوا بكەن، وەكوو خۆی دەفەرمووێت: ﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾﴾ [الأنبياء: ٢٣].

(ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: فَالْقَدَرِيَّةُ مِنْ الْمُعْتَزِلَةِ قَصَدُوا تَعْظِيمَ الرَّبِّ وَتَنْزِيهَهُ عَمَّا ظَنُّوهُ قَبِيحًا مِنْ الْأَفْعَالِ وَظُلْماً؛ فَأَنْكَرُوا عُمُومَ قُدْرَتِهِ وَمَشِيئَتِهِ ... ثُمَّ إنَّهُمْ وَضَعُوا لِرَبِّهِمْ شَرِيعَةً فِيمَا يَجِبُ عَلَيْهِ وَيَحْرُمُ بِالْقِيَاسِ عَلَى أَنْفُسِهِمْ ... شَبَّهُوا فِيهِ الْخَالِقَ بِالْمَخْلُوقِ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا[٣].

---

(١) "شرح الأصول الخمسة" للقاضي عبد الجبار الهمذاني ص٣٩٠. (٣) "مجموع فتاوى" لابن تيمية (١٧/ ٩٩، ١٠٠).

(٢) "الاقتصاد في الاعتقاد" للغزالي ص١١٣، و"أفعال العباد بين الجبر والإختيار" لمحمد حسن رباح بخيت ص٩٨.

واتە: (معتزلة) عەقلانییەکان ویستیان گەورەیی و بێگەردی خوا بسەلمێنن لە هەموو سیفاتێکی ناتەواو و نەشیاو بۆی، بەو هۆکارەوە یاسا و شەریعەتێکیان بۆ دانا کە چی واجبە و دەبێت چی بکات و چ شتێك حەرامە و نەشیاوە کە نەیکات، بە پێوانەیەك لەسەر خۆیان، بۆیە کەوتنە نکوولێکردنی گشت توانا و ویستەکانی خوا و هاوشێوەیان کرد بە دروستکراوەکانیەوە و خۆیان گومڕا کرد و خەڵکیش.

بۆیە بڕیاری (تکلیف ما لا یطاق) لای موعتەزیلەکان ئەوەیە کە: **بۆ خوا نەشیاوە و نابێت بیکات.**

٢. بەشی دووەمی پێناسەکە وشەی (وهي قدرة عليه وعلى ضده وهي غير موجبة للفعل): ئەو توانایەی کە پێش کارەکە بوونی هەیە هۆکارە بۆ هاتنەدی داواکارییەکان لە جێبەجێکردنی فەرمانەکان و نەکردنی ڕێگرییەکان: غير مستلزمة أو موجبة للفعل. لەگەڵ ئەوەشدا مەرج نییە ئەو توانایە هۆکاری هێنانەدی کارەکان بێت.

واتە لەگەڵ کارەکاندا توانایەکی تایبەت بوونی نییە بۆ یارمەتیدانی و توانا بەخشینی، ئەگەر ئەو توانا و یارمەتیدانە لەلایەن خواشەوە بێت.

ئەم قسەیەیان لەسەر بنەمایەکی هەڵەیە کە دەڵێن: إِقْدَارُ اللهِّ لِلْمُؤْمِنِ وَالْكَافِرِ وَالْبَرِّ وَالْفَاجِرِ سَوَاءٌ، فَلَا يَقُولُونَ إِنَّ اللهَّ خَصَّ الْمُؤْمِنَ الْمُطِيعَ بِإِعَانَةٍ حَصَّلَ بِهَا الْإِيمَانَ، بَلْ هَذَا بِنَفْسِهِ رَجَّحَ الطَّاعَةَ، وَهَذَا بِنَفْسِهِ رَجَّحَ الْمَعْصِيَةَ[1].

واتە: توانا و یارمەتییەکانی خوا بۆ بەندەکانی یەکسانە، ئەویش بەخشینی ئەندامەکانی لاشە و ئیرادە و دروستکردنی هۆکارەکانە، ئەو توانایە کە پێی دەوترێت (القدرة المصححة للفعل تكون قبل الفعل). لەبەرئەوە ئەو توانای خوایە بۆ بێبڕوا و ئیماندار و تاوانبار و چاکەکار یەکسانە، ناوترێت خوا یارمەتی ئیمانداری گوێڕایەڵ دەدات بە یارمەتییەك بۆ هێنانەدی ئیمانەکەی، بەڵکوو ئەم بە توانا و هۆکارەکانی خۆیەوە لایەنی ئیمان و خواناسی بەهێزکردووە تا بەدەستی هێناوە، وە ئەویش بە توانای خۆی لایەنی تاوانباری زاڵ و بەهێزکردووە، تا ئەو لایەی بەدەستهێناوە.

(١) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٤٣٤.

**بە کورتی هەڵەکانیان لەمانەدایە:**

**١.** کۆکردنەوەی تواناکان لە یەك تواناداا، ئەویش بوونی ئامێرەکانی کارکردن و سەلامەتییان و بوونی توانایە تیایاندا، بوونی ئەم توانایەش هەموو ئادەمییەك خاوەنیەتی و پێش کار و ئیرادە بوونیان هەیە و لای ئەهلی سوننەت پێی دەوترێت (القدرة المصححة للفعل تكون قبل الفعل) واتە ئەو توانایانەی کە لەپێش کاردا هەیە و هۆکاری بوونی توانایە.

باوەڕنەبوونیان بە توانای دووەم کە لەگەڵ کارەکاندا بەرجەستەیە و بە واقع بوونی هەیە، لە خۆشەویستی و حەزلێکردن و هەوڵدان بۆی و بوونی ئیرادەی بەردەوام و پێبەخشینی توانا و لابردنی کۆسپەکان و کاربۆئاسانکردنی و ڕێنموونی وورد و ... کە ئەمانە هەمووی توانای تایبەتی خوایین بۆ بەندەکانی، بەتایبەت بۆ ئیمانداران و گوێڕایەڵەکانە، ئەمەش لای ئەهلی سوننەت پێی دەوترێت (القدرة مع الفعل المستلزمة للفعل)[1] واتە توانایەك لەگەڵ کارەکاندا کە هۆکاری هێنانەدی کارەکانە.

**٢.** باوەڕبوونیان بەوەی کە ئەو توانایە یەك توانایە بۆ چاك و خراپ، وە یەکسانە بۆ هەموو جۆرەکانی ئادەمیزاد، بە هیچ شێوەیەك توانایەکی تر نییە یارمەتیدەریان بێت، یاخود یارمەتیدەری لایەك بێت و لایەکەی تر نەبێت.

لێرەشدا ئەهلی سوننەت باوەڕیان وایە کە خوای پەروەردگار توانایەکی تایبەتی خۆی هەیە، ئەویش یارمەتیدان و ڕێنموونی و کارئاسانیکردن و ... ئەمانە دەبەخشێتە ئیمانداران، جگە لە بێبڕوایان، لەبەرئەوەی تواناکانی بەخشیوە بە هەموو ئادەمیزاد، بە باوەڕدار و بێبڕواوە، وە لە هەمان کاتدا ئیرادە و ویستی سەربەخۆشی پێبەخشیون تا بەکاریبهێنن بۆ بژاردەکانی خۆیان، لێرەدا ئیماندار توانا و ئیرادە بەکاردەهێنێت و ڕوو دەکاتە باوەڕ و چاکە، بەڵام بێبڕوا تواناکەی هەیە و ئیرادە و ڕێگەی خۆی بەکارناهێنێت بۆ هێنانەدی ئەو ڕێگای ئیمان و باوەڕبوونە، بۆیە لە بەرامبەر ئەمەدا یارمەتی خواییشی پێنادرێت.

وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: أَمَّا الِاسْتِلْزَامُ فَإِنَّمَا يَحْصُلُ بِوُجُودِ الْإِرَادَةِ مَعَ الْقُدْرَةِ لَا بِنَفْسِ مَا يُسَمَّى قُدْرَةً وَالْإِرَادَةُ لَيْسَتْ جُزْءًا مِنْ مُسَمَّى الْقُدْرَةِ ، وَهَذَا الْقَوْلُ هُوَ الْمُوَافِقُ لِلُغَةِ

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ٧١).

الْقُرْآنِ، بَلْ وَلُغَاتِ سَائِرِ الْأُمَمِ هُوَ أَصَحُّ الْأَقْوَالِ(١).

**واتە: توانای پەیوەستبوو بە کردارەکانەوە بریتییە لە "ئیرادە لەگەڵ توانادا" ، نەك توانایەکی ڕووت بەبێ ئیرادە تیایدا، ئەم قسەیە گونجاوە لەگەڵ بەکارهێنانی زمانەوانی و قورئاندا، وە تەنانەت زمانەکانی دونیاش، بۆیە ئەمە ڕاست و دروستترین قسەیە لەسەری.**

**کەواتە دەڵێین:** وَحِينَئِذٍ فَنَقُولُ: أَنْتَ قَادِرٌ مُتَمَكِّنٌ خَلَقَ فِيكَ الْقُدْرَةَ عَلَى الْإِيمَانِ، وَلَكِنْ أَنْتَ لَا تُرِيدُ الْإِيمَانَ، فَإِنْ قَالَ لَهُ: قُلْ لَهُ يَجْعَلُنِي مُرِيدًا لِلْإِيمَانِ. قَالَ لَهُ: إِنْ كُنْتَ تَطْلُبُ مِنْهُ ذَلِكَ فَأَنْتَ مُرِيدٌ لِلْإِيمَانِ، وَإِنْ لَمْ تَطْلُبْ ذَلِكَ فَأَنْتَ كَاذِبٌ فِي قَوْلِكَ، ... فَإِنْ قَالَ: فَكَيْفَ تَأْمُرُنِي بِمَا لَمْ يَجْعَلْنِي مُرِيدًا لَهُ، لَمْ يَكُنْ هَذَا طَلَبًا لِلْإِرَادَةِ، بَلْ كَانَ هَذَا مُخَاصَمَةً(٢).

**واتە: تۆ خاوەن توانایت بۆ هێنانەدی ئیمان، لەبەرئەوەی توانای پێبەخشیویت، بەڵام تۆ ئیرادە و ویستی ئیمانت نییە، گەر پێی وتی: دە پێی بڵێ با ئیرادەی ئیمانم پێببەخشێت. تۆش پێی بڵێ: ئەگەر تۆ داوای دەکەیت ئەوا تۆ ئیمانت دەوێت، وە ئەگەر ناتەوێت ئەوا درۆ دەکەیت، وە گەر وتی: چۆن پێم دەڵێیت داوای ئیرادەیەك بکەم کە ئیرادەی پێنەداوم لەسەری؟ بڵێ: ئەمە بۆخۆی داواکاری ئیرادە نییە، بەڵکوو دژایەتیکردنە لەسەری و وەڵامی نییە، لەبەرئەوەی تۆ بە واقع بۆ شتەکانی تر خاوەن ئیرادەیت و بوونی هەیە تیاتدا و بەکاری دەهێنیت.**

**ئەمان دەڵێن خوا هیچ یارمەتییەکی تایبەتی نییە بۆ ئیماندار بۆ هێنانەدی ئیمانەکەی، بەڵام:** وَهَذَا الْقَوْلُ فَاسِدٌ بِاتِّفَاقِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ الْمُثْبِتِينَ لِلْقَدَرِ، فَإِنَّهُمْ مُتَّفِقُونَ عَلَى أَنَّ اللهَ عَلَى عَبْدِهِ الْمُطِيعِ نِعْمَةً دِينِيَّةً، خَصَّهُ بِهَا دُونَ الْكَافِرِ، وَأَنَّهُ أَعَانَهُ عَلَى الطَّاعَةِ إِعَانَةً لَمْ يُعِنْ بِهَا الْكَافِرَ. كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِۚ لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ٧﴾ [الحجرات: ٧]. فَالْقَدَرِيَّةُ يَقُولُونَ: إِنَّ هَذَا التَّحْبِيبَ وَالتَّزْيِينَ عَامٌّ فِي كُلِّ الْخَلْقِ، وَهُوَ بِمَعْنَى الْبَيَانِ وَإِظْهَارِ دَلَائِلِ الْحَقِّ. وَالْآيَةُ تَقْتَضِي أَنَّ هَذَا خَاصٌّ بِالْمُؤْمِنِ، وَلِهَذَا قَالَ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ﴾.

(١) (٢) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ٧١، ٧٢).

وَالْكُفَّارُ لَيْسُوا رَاشِدِينَ. وَقَالَ تَعَالَى: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجٗا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِۚ كَذَٰلِكَ يَجۡعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ١٢٥﴾ [الأنعام: ١٢٥]. ... قَالَ تَعَالَى: ﴿مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا ١٧﴾ [الكهف: ١٧][1].

واتە: کۆدەنگی ئەهلی سوننەت لەسەر ئەوەیە کە خوای گەورە بەهرەیەکی دینی بەخشیوە بە بەندەیەکی گوێڕایەڵی، بەڵام بە بێبڕوای نەداوە، بۆیە دەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَ﴾، خوای پەروەردگار ئیمانی لە دڵتاندا خۆشەویستکردووە و ڕازاندوویەتییەوە، وە بێبڕوایی و تاوان و سەرپێچی فەرمانەکانیشی لە دڵتاندا بێزاندووە، بۆیە دەفەرموێت ئەمانە کامڵەکانن.

بەڵام قەدەرییەکان دەڵێن: ئەم ڕازاندنەوە و خۆشەویستییە بریتییە لە ڕوونکردنەوە و دەربڕینی بەڵگەکانی حەق کە ئەویش گشتییە و بۆ هەموو کەسە، بەڵام ئایەتەکە باسی تایبەتمەندی دەکات بۆ ئیمانداران بێجگە لە بێبڕوایان، بۆیە لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ﴾، ئەوانە کامڵەکانن، وە کەسی بێبڕواش کامڵ نییە. بەڵام خۆ مەبەستی ئایەتەکەش گشتییە نەك تایبەت بە بڕواداران.

## تێبینییەك لەسەر ئەم یارمەتیدانی خواییە بۆ باوەڕداران:

(ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: لِأَنَّ الْقُدْرَةَ الَّتِي تَخُصُّ الْفِعْلَ لَا تَكُونُ لِلتَّارِكِ وَإِنَّمَا تَكُونُ لِلْفَاعِلِ، وَالْقُدْرَةُ لَا تَكُونُ إِلَّا مِنَ اللهِ، وَمَا كَانَ مِنَ اللهِ لَمْ يَكُنْ مُخْتَصًّا بِحَالِ وُجُودِ الْفِعْلِ[2].

واتە: ئەو توانا بەخشینەی خوا بۆ کارەکان بۆ کەسی پشتهەڵکەر لە فەرمانەکانی خوا نییە، بەڵکوو بۆ کەسی ئیمانداری گوێڕایەڵە، ئەم تواناییانەش بەس لەلایەن خواوەیە، وە ئەوەی کە لەلایەن خواوە بێت تایبەت نییە بە کاتی بوونی کارەکانەوە.

---

(١) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٤٣٤.

(٢) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ٤٧).

بۆ زیاتر ڕوونكردنەوە دەڵێت: الِاسْتِطَاعَةُ الْمَنْفِيَّةُ فِي قَوْلِ الْخَضِرِ لِمُوسَى ﴿إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾﴾ [الكهف: ٦٧]. فَإِنَّ هَذِهِ الِاسْتِطَاعَةَ الْمَنْفِيَّةَ لَوْ كَانَ الْمُرَادُ بِهَا مُجَرَّدَ الْمُقَارَنَةِ فِي الْفَاعِلِ وَالتَّارِكِ لَمْ يَكُنْ فَرْقٌ بَيْنَ هَؤُلَاءِ الْمَذْمُومِينَ وَبَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَلَا بَيْنَ الْخَضِرِ وَمُوسَى؛ فَإِنَّ كُلَّ أَحَدٍ فَعَلَ أَوْ لَمْ يَفْعَلْ لَا تَكُونُ الْمُقَارَنَةُ مَوْجُودَةً قَبْلَ فِعْلِهِ وَالْقُرْآنُ يَدُلُّ عَلَى أَنَّ هَذِهِ الِاسْتِطَاعَةَ إنَّمَا نُفِيَتْ عَنْ التَّارِكِ لَا عَنْ الْفَاعِلِ فَعُلِمَ أَنَّهَا مُضَادَّةٌ لِمَا يَقُومُ بِالْعَبْدِ مِنْ الْمَوَانِعِ الَّتِي تَصُدُّ قَلْبَهُ عَنْهُ إرَادَةُ الْفِعْلِ وَعَمَلُهُ وَبِكُلِّ حَالٍ فَهَذِهِ الِاسْتِطَاعَةُ مُنْتَفِيَةٌ فِي حَقِّ مَنْ كُتِبَ عَلَيْهِ أَنَّهُ لَا يَفْعَلُ بَلْ وَقُضِيَ عَلَيْهِ بِذَلِكَ ... أَنَّ إطْلَاقَ الْقَوْلِ بِأَنَّ الْعَبْدَ لَا يَسْتَطِيعُ غَيْرَ مَا فَعَلَ، وَلَا يَسْتَطِيعُ خِلَافَ الْمَعْلُومِ الْمُقَدَّرِ، وَإِطْلَاقَ الْقَوْلِ بِأَنَّ اسْتِطَاعَةَ الْفَاعِلِ وَالتَّارِكِ سَوَاءٌ وَأَنَّ الْفَاعِلَ لَا يَخْتَصُّ عَنْ التَّارِكِ بِاسْتِطَاعَةٍ خَاصَّةٍ عُرِفَ أَنَّ كِلَا الْإِطْلَاقَيْنِ خَطَأٌ وَبِدْعَةٌ[1].

واتە: ئەو توانایەی كە (خضر) عليه السلام بە (موسى) عليه السلام دەڵێت تۆ توانای ئارامگرتنت نییە ﴿إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا﴾؛ گەر مەبەست پێی توانایەك بێت كە بوونی نییە لە هەموو كەسدا ئەوەی كە بیەوێت و ئەوەی نەیەوێت؛ ئەوا هیچ جیاوازییەك لە نێوان (خضر) و (موسى)دا نەدەبوو، وە جیاوازی لە نێوان لۆمەكراوەكان و ئیماندارانددا نەدەبوو، وە بە كردن و نەكردنی هیچ جیاوازییەك نەدەبوو وەكوو پێش كارەكە.

بەڵام قورئان بەڵگەكاری دەكات لەسەر ئەوەی ئەم توانای یارمەتیدانە خواییە بۆ كەسی پشتهەڵكەر نییە، بەڵكوو بۆ كەسی گوێڕایەڵی جێبەجێكارە، لەبەرئەوەی ئەم ئارامگرتنە پێچەوانەی ئەو كار و مەبەستانەیە كە دڵی كەسی پشتهەڵكەری سەرقاڵ كردووە لە كاركردن، ئەمە بووەتە هۆكاری لادانی دڵی و ڕێگری لە كارپێكردنی، وە بڕیاردان لەسەر ئەوەی توانای كەسی جێبەجێكار و كەسی تاوانبار یەكن و یارمەتیدانی تایبەت نییە بۆ جێبەجێكار؛ هەردوو ئەم قسانە هەڵە و بیدعەن، وە گەر بڵێین كەسێك توانای نییە بێجگە لەوەی كە دەیزانێ یا توانای بەسەریدا دەشكێت؛ دیسان هەڵەیە.

---

(١) "مجموع الفتاوى لابن تيمية (٨/ ٢٩١، ٢٩٢).

**ئەویش بۆ (موسى) ﷺ:** ذَلِكَ أَنِّي أَعْمَلُ بِبَاطِنِ عِلْمٍ عَلَّمَنِيهِ اللهُ، وَلَا عِلْمَ لَكَ إِلَّا بِظَاهِرٍ مِنَ الْأُمُورِ، فَلَا تَصْبِرْ عَلَى مَا تَرَى[(١)]، وَلَمْ تُخْبَرْ بوجه الحكمة فيه، ولا طريق الصواب[(٢)]. **(خضر) ﷺ کارەکانی بە خوێندنەوەی ناوەڕۆکی بابەتەکان بوو، کە خوا زانای کردبوو بەسەریدا، بەڵام (موسى) ﷺ هۆکاری نەزانینی زانستی غەیب بوو، بەڵکوو زانستی ڕووکەشی کارەکان زانستی (موسى) ﷺ بوو، وە لە کاتێکیشدا ئاگادار نەکرێیتەوە بە ڕووە دانایی و دروستەکەی؛ ئیتر تۆ چۆن ئارام دەگریت؟! ئەمە هۆکاری نەبوونی ئارامگرتن بوو لە دڵی (موسى)دا ﷺ.**

**ڕای سێیەم: ڕای (الأشاعرة ومن وافقهم وطائفة من أهل الكلام)ە[(٣)] کە دەڵێن:** قال (أبو الحسن الأشعري): إن الاستطاعة تحدث مع الفعل، تنتفي بانتفائه فهي لا تسبق الفعل ولا تبقى بعده[(٤)]. **وە دەڵێن:** أن الاستطاعة مع الفعل مقارنة له، لايجوز أن تتقدمه ولا تتأخر عنه[(٥)].

**واتە: توانای کارەکان لای ئەشعەرییەکان لەگەڵ کارەکاندایە و ناکەوێتە پێش و پاشیەوە و قابیلی مانەوەش نییە لەپاش خۆی، ئەویش بەم بەڵگە عەقڵییە کە دەڵێن:** أَنَّ الْقُدْرَةَ عَرَضٌ فَلَا تَبْقَى زَمَانَيْنِ فَيَمْتَنِعُ وُجُودُهَا قَبْلَ الْفِعْلِ[(٦)]. **واتە توانا بوونە و هیچ بوونێکیش دوو کات قابیلی مانەوە نییە.**

**بۆچی لای ئەشعەرییەکان نابێت توانا پێش کارەکە بوونی هەبێت؟ دەڵێن لەبەرئەوەی:** لو بقيت القدرة لاستحال عدمها، وإلا اجتمع الضدان معا[(٧)]. **ئەگەر توانا بمێنێتەوە دەبێتە هۆکاری مانەوەی بەردەوامی توانا و کۆبوونەوەی دوو دژبەیەك، واتە لە یەك کاتدا تواناکان بوونیان دەبێت**

---

(١) "تفسير الطبري" (١٥/ ٣٣٣). (٢) "تفسير القرطبي" (١١/ ١٧).

(٣) "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص١١٥، و "أفعال العباد" لمحمد حسن رباح بخيت ص٩٦.

(٤) "اللمع في الرد على أهل الزيغ والبدع" لأبي الحسن الأشعري ص٩٤، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٧١).

(٥) "تمهيد الأوائل وتلخيص الدلائل" للباقلاني ص٢٧٨، و "الإنصاف" للباقلاني ص٤٦، و "الإرشاد" للجويني ص٢١٩.

(٦) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ٤٧).

(٧) "الإرشاد" للجويني ص٢١٧، و "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص١١٦.

لەپێش كارەكان و لەگەڵ كارەكانیشدا، ئەمە بۆخۆی پێچەوانەی یاسای (العرض لا تبقى زمانین)ە كە بە واتای ئەوە دێت شتەكان دوو بوونیان نابێت.

وە هەر یاسای ئەشعەرییەكان دەڵێت: الْقُدْرَةُ الْقَدَرِيَّةُ الْمُوجِبَةُ لِلْفِعْلِ الَّتِي هِيَ مُقَارِنَةٌ لِلْمَقْدُورِ لَا يَتَأَخَّرُ عَنْهَا(١). ئەو توانایەی كە هۆكاری هێنانەدی و دروستكردنی كارەكانە دەبێت بوونی لەگەڵ كارەكاندا بێت و لێی دوانەكەوێت، ئەگەر نا كارەكان نایەنە دی.

ئەم توانایانەی ئەشعەرییەكان بڕیاری لەسەر دەدەن كەوا توانایەكی قەدەری كەونییە و هۆكاری هاتنەدی كارەكانە و لێیان نابێتەوە و دواش ناكەوێت، (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەربارەی ئەوە دەڵێت: هِيَ الْكَوْنِيَّةُ الَّتِي هِيَ مَنَاطُ الْقَضَاءِ وَالْقَدَرِ وَبِهَا يَتَحَقَّقُ وُجُودُ الْفِعْلِ(٢). واتە ئەم توانایە كە لەگەڵ كارەكاندا هەیە توانا كەونییەكانە و ناوەڕۆكی حەقیقەتی ئەو كارانەیە كە پەیوەندی بە بابەتی قەزاوقەدەرەوە هەیە، ئەم توانایانە هۆكاری ڕاستەقینەی هاتنەدی كارەكانن و نهێنی قەدەرەكانی خوایە لە بەڕێوەبردنی (مخلوقات)دا.

كەواتە ئەشعەرییەكان باوەڕیان بە تواناكانی قەدەری كەونی هەیە و باوەڕیان بە كاریگەری تواناكانی قەدەری شەرعی نییە، بەم بیروڕایە ئەشعەرییەكان هەوڵیاندا بۆ گونجاندن و ڕێككەوتنێك كە دروستی بكەن لە نێوان ئەو دوو قەدەرەدا تاوەكوو دەرچن لە بیروڕای قەدەرییەكان و جەبەرییەكان لەسەر بوونی تواناكان بۆ ئادەمیزاد؛ بەڵام بەم هەوڵە نەزۆكە بیروڕای (نظرية الكسب) دروست بوو لای (أبي الحسن الأشعري) و ئەشعەرییەكان بە گشتی: يقوم مذهب الأشاعرة في أفعال العباد على محاولة التوفيق بين أصلين متناقضين:

**أحدهما:** نفي تأثير قدرة العبد في فعله ... معارض لإثبات خلق الله لأفعال العباد.

**وثانيهما:** إثبات قدرة العبد على فعله، استنادًا إلى ضرورة إثبات أصل التكليف ... نتيجة للتناقص بين إثبات القدرة للعبد وبين نفي تأثيرها في فعله فقد اضطرب أئمة الأشاعرة في بيان حقيقة الكسب ... وللخروج من هذا الإشكال أثبت الباقلاني التأثير لقدرة العبد في صفة فعل

---

(١) "مجموعة الرسائل والمسائل" لابن تيمية (٥/ ١٥٠)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٢٩).

(٢) "مجموع فتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٧٣).

العبد ... وأما الرازي فأنكر القول بالكسب وصرح بالجبر، وأما الجويني فأنكر الكسب أيضًا[١].

**واته: ئەشعەرییەکان لەم نێوەندەدا کەوتنە هەوڵدان بۆ گونجاندنی دوو بنەمای دژ بە یەك:**

**یەکەم: ئەشعەرییەکان بۆ دەرچوون لە قسەی قەدەرییەکان وتیان: توانای ئادەمیزاد هیچ کاریگەرییەکی لەسەر کارەکان نییە، لەبەرئەوەی گەر بڵێن توانای ئادەمیزاد کاریگەری هەیە لە کارەکانیا بۆخۆی پێچەوانەی بڕیاردانە لەسەر ئەوەی کە خوا کاری بەندەکانی دروستکردووە.**

**دووەمیش: ئەشعەرییەکان لە هەمان کاتیشدا بۆ دەرچوون لە قسەی جەبەرییەکان دەیانەوێت بیسەلمێنن بوونی توانای ئادەمیزاد لە کارەکانیاندا تاوەکوو بیسەلمێنن کە (تکلیف) و داواکارییە شەرعییەکانی خوا هەیە بەسەر ئادەمیزادەوە و توانای جێبەجێکارییان هەیە بۆی و کاریگەری هێنانەدییان هەیە بۆی، ئەم هەوڵدانەیان دژایەتی ئەو بیروڕایانەیان دەکات کە دەڵێن تواناکانی ئادەمیزاد کاریگەرییان نییە لەسەر هێنانەدی کارەکان، ئەشعەرییەکان بە هۆکاری کەوتنە ناو ئەم بیروڕا دژ بە یەکانەوە زاناکانیان هەوڵی چوونەدەرەوە و ڕزگاربوونی مەزهەبەکەیان دا، بەڵام ئاڵۆزتر بوو، بۆیە ئیمامی (الرازي) دژایەتی (نظرية الكسب)ی (أبي الحسن الأشعري) کرد و بە تەواوی بڕیاری بیروڕای جەبەرییەکانی دا، بەڵام ئیمامی (الجويني) دژایەتی (نظرية الكسب)ی کرد و بڕیاری کاریگەری تواناکانی دا لە کارەکاندا بە هاوشێوەی (معتزلة)کان، وە هەروەها ئیمامی (أبو بكر الباقلاني)ش.**

**زانایانی شوێنکەوتووانی بیروڕای ئەشعەری هەوڵی گونجاندنیان دا بۆ قەدەری شەرعی و کەونی بەم شێوەیە:** أرادوا التوسط بين الجبرية والقدرية، فأثبتوا القدرة للعبد في مقابل إنكار الجبرية ... ونفوا تأثير قدرة العبد في فعله في مقابل إثبات القدرية[٢].

**واته: ویستیان نێوانگیر بن لە نێوان بیروڕای جەبەرییەکان و قەدەرییەکاندا، هەستان بە بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە توانا هەیە بۆ ئادەمیزاد لە کارەکانیاندا لە بەرامبەر دژایەتی جەبەرییەکاندا، وە لەلایەکی تریشەوە دژایەتی کاریگەری توانای ئادەمیزادیان کرد لە کارەکانیاندا**

(١) "الخلاف العقدي" لدكتور عبد الله بن محمد القرني ص٩٩، ١٠٠.

(٢) "الخلاف العقدي" لدكتور عبد الله بن محمد القرني ص١٠٢.

**لە بەرامبەر دانپیانانی قەدەرییەكاندا، لێرەدا (نظرية الكسب) دروست بوو:** إثبات قدرة العبد ... مع نفيهم لتأثير قدرة العبد[1]. **ئەم بیردۆزەی (أبي الحسن الأشعري) دەڵێت: ئادەمیزاد خاوەن توانایە بۆ كارەكانی و ئەو توانایەش هیچ كاریگەرییەكی نییە لەسەر هێنانەدی كارەكان.**

**ئەم بیروڕایە كۆكردنەوەی دوو كاری دژبەیەكە و بە واتای بوون و نەبوونە (جمع بين النقيضين والنفي والإثبات)، بۆیە بوو بە مەخسەری مێژوو بەوەی لەناو زانایاندا بڵاوە كە دەڵێن: یەكێك لە سێ شتە سەرسوڕهێنەرەكان كە هیچ واتا و بنەمایەكی نییە بیردۆزی (كسب)ی ئەشعەرییە، وەكوو (ابن تيمية)** رَحِمَهُ ٱللَّهُ **دەڵێت:** يَقُولُونَ: ثَلَاثَةُ أَشْيَاءَ لَا حَقِيقَةَ لَهَا: طَفْرَةُ النِّظَامِ وَأَحْوَالُ أَبِي هَاشِمٍ وَكَسْبُ الْأَشْعَرِيِّ[2].

**بۆیە زانا شوێنكەوتووەكانی ئەم مەزهەبە بە ناچاری و بە هەرشێوەیەك بێت دەرچوون لەم ڕایەی مەزهەبی (أبي الحسن الأشعري)، هەروەك (قاضي أبو بكر الباقلاني) دان دەنێت بە كاریگەری تواناكان لە كارەكاندا، بەڵام بەناوی سیفەتەكانی كارەوە كە چاكە یان خراپە، وەكوو دەڵێت:** قدرة العبد وإن لم تؤثر في وجود ذلك الفعل، إلا أنها أثرت في صفة من صفات ذلك الفعل، ... أما كونها طاعة أو معصية فهو صفة واقعة بقدرة العبد. هذا تلخيص مذهب القاضي على أحسن الوجوه[3].

**واتە: ئەگەر توانای بەندەكان كاریگەری نەبێت لەسەر كردارەكان؛ بەڵام خۆ كاریگەری هێنانەدی وەسفێك لە وەسفەكان بۆ كارەكان دروست دەكات كە كاری چاكن یاخود كاری خراپن. بەڵام ئەم بیروڕایەی (الباقلاني) دەربازبوون نییە لە (خلاف).**

**وە ئیمامی (الرازي) بەتەواوی دژایەتی (نظرية الكسب) دەكات و بە ئاشكرا دەڵێت:** التحقيق يظهر أن الكسب اسم بلا مسمى[4]. **واتە لە ئەنجامی وردبوونەوەدا دەركەوت كە (الكسب) ناوێكی بێ ناونراوە و واتایەكە هیچ نادات بەدەستەوە.**

---

(١) "الخلاف العقدي" لدكتور عبد الله بن محمد القرني ص٨٦.

(٢) "مجموع فتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٢٨)، و "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٢/ ٢٩٧).

(٣) "المطالب العالية من العلم الإلهي" لفخر الدين الرازي (٩/ ١٠).

(٤) "محصل أفكار المتقدمين والمتأخرين من العلماء والحكماء والمتكلمين" للرازي ص٢٨٨.

**وە بە ئاشكرا بانگەوازی بۆ بیروڕای (الجبرية)كان دەكات كە دەڵێن هیچ بژاردە و ئیرادەیەك بۆ ئادەمیزاد نییە، بەڵكوو:** فالإنسان مضطر في صورة مختار[١]. **ئادەمیزاد زۆرلێكراوێكە لە شێوازی بژاردەكردندا.**

**وە دەڵێت:** إن الإنسان مضطر في إختياره، وأنه ليس في الوجود إلا الجبر[٢]. **ئادەمیزاد لە بژاردەكانیدا زۆرلێكراوە و هیچ شتێك نییە لە بووندا بێجگە بەزۆرەملێكردن نەبێت.**

**وە بۆ دەربازبوون لە جەبەرییەكان دەڵێن:** مختار في أفعاله، مضطر في إختياره[٣]. **واتە ئادەمیزاد لە كاریدا بژاردەیە و لە بژاردەكانیشیدا زۆرلێكراوە.**

**بۆیە بەمە دەوترێت (الجبر المتوسط) بیروڕای بەزۆرپێكردنی ناوەند، واتە جەبەری تەواو (الجبرية المحضة) نین، لەبەرئەوەی ئەشعەرییەكان دەڵێن توانا هەیە لەسەر كارەكان و جەبەرییەكان وانالێن.**

**وە تەنانەت ئیمامی (الرازي) سەلماندنی بوونی خوای بەستووەتەوە بە بیروڕای (الجبري)یەوە، وەكوو دەڵێت:** فثبت إما القول بالجبر وإما القول بنفي الصانع[٤]. **واتە سەلماندمان كە دەبێت باوەڕبوون بێت بە بیروڕای جەبەرییەكان، یاخود باوەڕنەبوون بە دروستكاری بوونەوەر. بەڵگەشی بۆ ئەم بابەتە (أدلة التمانع)ەكەیە كە لەمەوپێش باسمانكرد، كە دەڵێت:** إذا أراد العبد تسكين الجسم أو أراد الله تحريكه فإمّا أن لا يقعا معاً، وهو محال، أو يقع أحدهما دون الآخر، وهو باطلٌ[٥]. **واتە ئەگەر خوا بیەوێت لاشەیەك بجوولێنێت و بەندەكەشی بیەوێت بیوەستێنێت: یا دەبێت هیچیان نەبێت كە ئەمە مەحاڵە، یاخود دەبێت یەكێكیان زاڵ بێت بەسەر ئەویتردا، كە بێگومانیش بەندەكان ناتوانن، كەواتە دەبێت خوا هەبێت.**

---

(١) "المطالب العالية من العلم الإلهي" لفخر الدين الرازي (٩/ ٢٥٨).

(٢) "المباحث المشرقية في علم الإلهيات والكبيعيات" لفخر الدين الرازي ص٥٤٤.

(٣) "موقف البشر تحت سلطان القدر" لمصطفى صبري ص٥٥.

(٤) "المطالب العالية من العلم الإلهي" لفخر الدين الرازي (٩/ ١٦، ١٧).

(٥) "محصل أفكار المتقدمين والمتأخرين من العلماء والحكماء والمتكلمين" للرازي ص٢٨٢.

**وە ئیمامی (أبو المعالي الجويني) كە ناسراوە بە (إمام الحرمين) بەتەواوی لە مەزهەبی ئەشعەری دەردەچێت و دەڵێت:** فمن أحاط بذلك كله ثم استراب ... فهو مصاب في عقله، أو مستقر على تقليده مصمم على جهله، ففي المصير على أنه لا أثر لقدرة العبد في فعله قطع طلبات الشرائع، والتكذيب بما جاء به المرسلون[١].

**واتە: ئەوەی بەدواداچوون بكات لەو بارەیەوە و پاشان باسی (نظرية الكسب) بكات؛ یا عەقڵی تێكچووە، یاخود سوورە لەسەر شوێنكەوتەی كوێرانە، یا بەردەوامە لەسەر نەفامی، وە بە وتنی نەبوونی كاریگەری تواناكانی ئادەمیزاد لەسەر كارەكانی؛ هەڵوەشاندنەوەی شەریعەت و بەدرۆخستنەوەی پەیامی پێغەمبەرانە.**

**ئەگەرچی پێشوەختە لەسەر ئەم بیروڕایە بوو، وە لە كتێبی "الإرشاد"دا دەڵێت:** أن القدرة الحادثة لا تؤثر في مقدورها أصلاً[٢]. **توانای كار كاریگەری نییە لەسەر كار بە هیچ شێوەیەك.**

**لێرەدا هۆكاری ئەم جیاوازییانە دەگەڕێتەوە بۆ گومانە بنەما عەقڵییەكانی ئەم فیرەقە عەقڵییانە، بە ئەشعەرییەكانیشەوە كە كۆدەنگن لەسەری:** أصل الشبهة للمخالفين لأهل السنة في أفعال العباد يعلم أن الأساس الذي يلزم من قال به أن يقول بقوله القدرية أو الجبرية هو حصر تعلق القدرة بإحداث الفعل، وأنه لا يمكن التخلص من هذا اللازم إلا بالتخلص من هذا الأساس الباطل[٣]. **بنەمای ئەو گومانانەی كە فیرەقەكانی دژ بە ئەهلی سوننەت لەسەریەتی لە بوونی توانای بەندەكان بەسەر كارەكاندا یاسای: (حصر القدرة في إحداث الفعل)ە، واتە باوەڕبوونە بە بوونی توانایەك لە كاتی كردنی كارەكاندا كە جەبەری و قەدەرییەكانی لەسەرە و لە ئەنجامدا باوەڕبوونە بە یەك توانا كە لە یەك لاوە بێت، یا دەبێت لای ئادەمیزادەوە بێت یاخود لای خواوە، لەم قسەیە ڕزگاربوون نییە تاوەكوو لەو یاسا و بنەما بەتاڵە ڕزگاریان نەبێت، بۆیە لە كۆتاییدا پرسیارێك دروستدەبێت كە ئەشعەرییەكان وەڵامیان پێ نادرێتەوە، ئەویش ئەوەیە كە:** إذا

---

(١) "العقيدة النظامية في الأركان الإسلامية" للجويني ص١٨٥، ١٨٦.

(٢) "الإرشاد إلى قواطع الأدلة في أصول الاعتقاد" للجويني ص٢١٠.

(٣) "الخلاف العقدي" لدكتور عبد الله بن محمد القرني ص٤١.

نفوا التأثير لقدرة العبد في فعله لم يمكنهم التفريق بين قولهم وقول الجبرية[١]. واتە: ئەگەر باوەڕتان بە کاریگەری تواناکانی ناو کارەکان نییە؛ جیاوازیتان لەگەڵ جەبەرییەکاندا چییە لەو پەیوەندی و پەیوەستبوونانەی ئەم قسەی جەبەریانە دروستیدەکات؟ هەر ئەوەندەیان پێیە کە بڵێن: ئێمە دەڵێین توانا و ئیرادە هەیە بۆ ئادەمیزاد لەسەر کارەکانی، بەڵام کاریگەری نییە لەسەر کارەکانی، وە جەبەرییەکان دەڵێن: توانا و ئیرادە و کار نییە بۆ ئادەمیزاد، بەڵام لە کۆتایی و ئەنجامی قسەی ئەشعەرییەکانیشدا هەمان بیروڕای جەبەرییەکان دروستدەبێت[٢].

هەر بەدوای ئەشعەرییەکانیشدا قوتابخانەی دووەمی بەناوی ئەهلی سوننەت لەدوای ئەشعەرییەکان بە هەمان شێوە نەیانتوانی لە زەلکاوی ئەم یاسا عەقڵییانە دەرچن، کە بناغەکەی فەلسەفەیەکی عەقڵی ڕووتە بەبێ بوون جێگابوونەوە لە واقعدا.

ئەویش قوتابخانەی (أبو المنصور الماتريدي)ە کە پێیان دەوترێت ماتۆریدییەکان، خاوەنی ئەم مەدرەسەیە کە دەزانێت ئەشعەرییەکان ڕزگاریان نەبووە لە کەوتنە ناو بیروڕای جەبەرییەکان؛ هەستا بە گونجاندنێکی تری عەقڵی بۆ نێوان (خلق الله وأفعال العباد)، بەوەی کە خوا ئادەمیزاد و بوونەوەرەکانی دروستکردوون بە هەموو پێویستییەکانیانەوە و ئادەمیزادیش خاوەن کار و کردەوەی خۆیانن.

ئەشعەری و ماتۆریدییەکان باوەڕیان وایە کە: إثبات الإرادة لازم لإثبات القدرة، ونفي الإرادة لازم لنفي القدرة[٣]. بە بوونی ئیرادە لە کاردا دەبێت توانا هەبێت، وە بە نەبوونی ئیرادە نەبوونی توانایە.

بەڵام بە پێچەوانەی ئەمانەوە قەدەری و جەبەرییەکان ئیرادە و توانایان بۆ خوا و ئادەمیزاد نەهێشت لە کردارەکاندا: التزمت القدرية بنفي إرادة الله لأفعال العباد؛ لكونهم قد نفوا تعلق قدرة الله بأفعال العباد، كما التزمت الجبرية بنفي اختيار العبد وإرادته لأفعاله تبعاً لكونهم قد نفوا تأثير قدرة العبد في فعله[٤]. قەدەرییەکان ئیرادەی خوایان دەرکرد لە کردەوەی ئادەمیزاددا،

(١) "الخلاف العقدي" لدكتور عبد الله بن محمد القرني ص٤٠.

(٢) "موقف البشر تحت سلطان القدر" لمصطفى صبري ص٥٥.

(٣) (٤) "الخلاف العقدي" لدكتور عبد الله بن محمد القرني ص١١٦.

**بۆیە توانای خواشیان لێ دەركرد، هەروەكوو چۆن جەبەرییەكان ئیرادەی ئادەمیزادیان لە كاردا دەركرد، بۆیە توانای ئادەمیزادیشیان تیادا دەركرد.**

**بەڵام ماتۆریدییەكان بە یەك هەڵوێستی لەگەڵ ئەشعەریدا پێچەوانەی ئەم بنەمایە بوونەوە بە بڕیاردان بە بوونی ئیرادە و توانای ئادەمیزاد لە كارەكاندا:** لكنهم خالفوهم فأثبتوا للعبد إرادة جزئية هي متعلق التكليف، ... بخلاف الإرادة الكلية[١]. **بەڵام لەگەڵ قەدەری و جەبەرییەكان جیابوونەوە بە دابەشكردنی ئیرادە بۆ دوو بەش: ئیرادەی گشتی و ئیرادەی تایبەت:** الإرادة الكلية والإرادة الجزئية[٢]، عند الماتريدية لها معنيان، إرادتهم الكلية وهي عندهم مخلوقة لله، أما إرادتهم الجزئية فغير مخلوقة، وأمرها بأيديهم، وهي ما يملكونه من أفعالهم المنسوبة إليهم[٣]. **وتیان: ئیرادە گشتییەكە بەدەست خوایە و دروستكراوی ئەوە و ئیرادە تایبەت و بەشە كەمەكە لە دەستی ئادەمیزاددایە و خۆیان كرداری خۆیان بەو هۆیەوە دروستدەكەن و لەو ڕووەوە بە هۆكاری ئەو ئیرادە تایبەتە داواكارییە شەرعییەكان** (التكليف الشرعي) **ڕوودەكەنە ئادەمیزاد. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بۆچوون و بڕیارە بۆ دابەشكردنی توانای ئادەمیزاد بە كارێكی واقعی و بوون دانانێن، بەڵكوو بە شێوەی ڕەچاوكراو:** مع ذلك أمراً إعتبارياً لا وجود له[٤]. **واتە لە بووندا جێگەی نابێتەوە، بەڵام بە شێوەیەكی ڕەچاوكراو بڕیاری لەسەر دەدەن.**

**وە (محمد سعيد رمضان البوطي) پشتگیری ئەم بۆچوونەی (ماتريدية)كان دەكات لە كتێبی "الإنسان مسير أم مخير" دەڵێت:** أن قصد الإنسان بمعناه الكلي الذي يعبَّر ... إلا أن استعمالاته الجزئية بمعنى ...[٥].

**واتە: ئیرادەی ئادەمیزاد بە شێوەی گشتییە كە دەری دەبڕێت، بەڵام لە ئاستی بەكارهێنانەكاندا خاوەن ئیرادەی تایبەت و بەشێكی كەمە.**

---

(١) "الخلاف العقدي" لدكتور عبد الله بن محمد القرني ص١١٦.

(٢) "موقف البشر تحت سلطان القدر" لمصطفى صبري ص٥٦.

(٣) "موقف البشر تحت سلطان القدر" لمصطفى صبري ص٥٦، ٥٧.

(٤) "موقف البشر تحت سلطان القدر" لمصطفى صبري ص٧٢.

(٥) "الإنسان مسير أم مخير" للبوطي ص٥٨، ٨٠.

**بەڵام کەوتنە ناو هەڵەوەی ئەشعەری و ماتۆریدییەکان دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری:** قد جمعوا بين ما لزم الطائفتين من تلك اللوازم، بحيث أصبحوا جبريين في القدرة قدريين في الإرادة، فالذي يلزم الجبرية من الشناعة في قولهم بنفي تأثير قدرة العبد في فعله لازم للماتريدية، والذي يلزم القدرية من الشناعة في نفيهم لخلق الله لأفعال العباد لازم للماتريدية ... وافقوا القدرية والجبرية في أصل شبهتهم، وهي ما اتفقوا عليه من دعوى استحاله الجمع بين إثبات خلق الله لأفعال العباد وبين إثبات نسبة الأفعال إلى العباد(١). **ئەشعەری و ماتۆریدییەکان لە ئەنجامدا چوونەوە سەر بیروڕای هەردوو فیرەقە جیاوازەکە، قەدەرییەکان و جەبەرییەکان، لە تواناڈا چوونەوە سەر جەبەرییەکان، کە توانای کارەکان لە دەستی ئادەمیزاددا نییە، وە لە ئیرادەدا چوونەوە سەر قەدەرییەکان، کە ئیرادە و کار لە توانای ئادەمیزاددا هەیە.**

**ئەشعەری و ماتۆریدییەکان ویستیان لە بۆچوونی قەدەری و جەبەرییەکان هەڵبێن، بەڵام بە ناڕاستەوخۆ و پێچ و پەنا لە کۆتاییدا کەوتنەوە ناو بیروڕای هەردووکیان، لەبەرئەوەی بەرنامەیان یەك سەرچاوە بوو، بەڵام قسەکانیان جیاواز بوو، ئەویش بنەما عەقڵییەکان بوون، گرنگ ئەوەیە کە لەسەر بەرنامەی ئەهلی سوننەت نەبوون.**

**بۆیە:** إذا أرادوا الخروج عما ذهبت إليه القدرية والجبرية من اللوازم الباطلة فليس لهم إلا أن يثبتوا خلق الله لأفعال العباد، مع إثبات نسبة الأفعال إلى العباد، ... متحققةً بقدرتهم وإرادتهم، وَفْقَ ما جعله الله من توقف المسببات على أسبابها(٢). **هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ دەرچوون لە بیروڕای هەڵەی ئەو دوو فیرەقە گومڕایە، بێجگە لە بڕیاردان نەبێت بەوەی کە خوای گەورە کاری بەندەکانی دروستکردووە و بەندەکانیش خاوەنی کاری خۆیانن بە بوونی ئەو توانا و ئیرادانەیانەوە کە پێیان بەخشراوە.**

**ئەوەی ئەشعەرییەکان و ماتۆریدییەکانی خستووەتە هەڵەوە بێئاگاییانە لە "بوونی توانایەك لەپێش کارەکاندا":** الْقُدْرَةُ الْمُصَحِّحَةُ لِلْفَعْلِ الَّتِيْ بِمَعْنَى الصِّحَّةِ وَالْوُسْعِ، وَالتَّمَكُّنِ وَسَلَامَةِ

(١) "الخلاف العقدي" لدكتور عبد الله بن محمد القرني ص١٢٠.

(٢) "الخلاف العقدي" لدكتور عبد الله بن محمد القرني ص١٢١.

الْآلَاتِ، وَهِيَ مَنَاطُ الْأَمْرِ وَالنَّهْيِ، فَهَذِهِ الْقُدْرَةُ لَابُدَّ أَنْ تَتَقَدَّمُ عَلَى الْفِعْلِ، وَلاَ تَكُوْنُ مَعَهُ[(١)].
**ئەو توانایەی كە پەیوەندی بە قەدەری شەرعییەوە هەیە لە بوونی توانای لاشە و سەلامەتی و كاربۆئاسانی و ئیرادە ... كە هۆكاری جێبەجێكردنی فەرمانە شەرعییەكانە، ئەمە بۆخۆی دەبێت لەپێش كارەوە بێت، نابێت تەنها لەگەڵ بوونی كارەكاندا بێت، ئەگەر ئەم توانایە تەنها لەگەڵ كارەكاندا بێت ئەوا:** أَنْ يَكُونَ كُلُّ عَبْدٍ لَمْ يَفْعَلْ مَا أُمِرَ بِهِ قَدْ كُلِّفَ مَا لَا يُطِيقُهُ إِذَا لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ قُدْرَةٌ إِلَّا مَعَ الْفِعْلِ[(٢)]. **هەركەسێك هەركارێكی ئەنجام نەدا تاوانبار نابێت، لەبەرئەوەی توانا لەگەڵ كارەكاندایە، ئەمانیش باوەڕیان وایە كە توانا لەپێش كارەكانەوە بوونی نییە، ئەمەش دەبێتە هۆكاری داواكاری جێبەجێنەكراو، لەبەر نەبوونی توانای پێش كارەكە بەسەریدا، ئەمەش بۆخۆی هۆكاری لەكارخستنی جێبەجێكردنی دین و نەمانیەتی، ئەمە دەچێتەوە سەر بیروڕای جەبەرییەكان كە دەڵێن: ئادەمیزاد هیچ بژاردە و توانایەك لە بوونیدا نییە، وەك:** ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾ [آل عمران: ٩٧]. فَأَوْجَبَ الْحَجَّ عَلَى الْمُسْتَطِيعِ، فَلَوْ لَمْ يَسْتَطِعْ إِلَّا مَنْ حَجَّ لَمْ يَكُنِ الْحَجُّ قَدْ وَجَبَ إِلَّا عَلَى مَنْ حَجَّ، وَلَمْ يُعَاقَبْ أَحَدٌ عَلَى تَرْكِ الْحَجِّ. وَهَذَا خِلَافُ الْمَعْلُومِ بِالِاضْطِرَارِ مِنْ دِينِ الْإِسْلَامِ[(٣)]. **كەواتە هەركات ئەوەی لەناو جێبەجێكردنی حەجدا بێت ئەوكات توانای هەیە بەسەریدا و ئەوكاتەیش كە چووە ناو ئەنجامدانیەوە فەرزە لەسەری، ئەوەشی كە هەڵنەستا بە ئەنجامدانی و نەیكرد تاوانبار نابێت، كەواتە ڕای ئەشعەرییەكان هەڵەیە لە تێگەیشتنی توانای ئادەمیزاددا و دەگەڕێتەوە سەر هەمان بیروڕای جەبەرییەكان و هەمان ئەنجامی بیروڕاكانیان دروستدەكات.**

**بۆیە بە بیروڕای ئەشعەرییەكان دەڵێن:** سموا مذهب الأشعري بالجبر المتوسط[(٤)]. **جەبەرییەكی ناوەند، وە بیروڕای جەبەرییەكانیش بەم هۆكارەوە سەر دەردەكات لە بیروڕای**

---

(١) "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص٢٢٥.

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٦٠)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٣١٧، ٣١٨).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٢٧٤)، و "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ٤٢)، و "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٤٨٩، و "الفصل" لابن حزم (٣/ ٤٢).

(٤) "موقف البشر تحت سلطان القدر" لمصطفى صبري ص٥٦.

تێکەڵبوونی خوا بە (مخلوقات)ەوە (الاتحاد والحلول)، لەبەرئەوەی گەر هیچ توانایەك نەبێت بێجگە لە توانای خوا؛ ئەوا هیچ بوونێکیش نییە بەڕاستی بێجگە لەو، کەواتە توانا و بوونی ڕەها (مطلق) هەر خوایە، کەواتە (مخلوقات) تێکەڵی (خالق)ە.

**بیروڕای ئەشعەرییەکان لە (التكليف ما لا يطاق)دا:**

لەسەر بنەمای بوونی توانا لە کاردا کە قەدەری کەونییە، دەشێت ڕاستەوخۆ بڕیار بدرێت لەسەر بوونی داواکارییەکی بێ توانایی لە جێبەجێکردندا، لەبەرئەوەی توانایەك نییە پێش کارەکان: فبناء على قولهم أن القدرة مقارنة لمقدورها فقد قالوا بجواز التكليف بما لا يطاق[1].

لەسەر بنەمای ئەوەی کە دەڵێن توانا بەس لەگەڵ کارەکاندا بوونی هەیە، بڕیاری ئەوەش دەدەن کە دروستە داواکارییەك کە قابیلی جێبەجێکردن نەبێت بوونی هەبێت.

بەڵام بیروڕای ئەشعەرییەکان لەبەرئەوەی هەڵقولاوی نێوان دوو فیرەقی پێچەوانە بەیەکە و دەیەوێت نەکەوێتە هەڵەکانی هیچ کامیانەوە؛ دەبینین یان خاوەنی ڕایەکی لەرزۆك و ئاڵۆزە، یاخود هەرجارەی دەکەوێتە ناو بیروڕای لایەکیانەوە بە شێوەیەك لە شێوەکان، وە لە ئەنجامدا بۆ گەیشتن بە حەقەکە ناگاتە بەرنامەی ئەهلی سوننەت و ڕزگاریشی نابێت لەوان، لەبەرئەوەی لە بنەمادا لە قوتابخانەی ئەواندا پەروەردە بووە، پاشان هاتووەتە دەرەوە و بەردەوام کاریگەرییەکانی لەسەر ماوە تا بوونەتە خاوەنی ئەم بیروڕایانە.

**بۆ ئەم بابەتەش دەڵێن: (التكليف ما لا يطاق) سێ جۆرە[2]:**

١. أن يمتنع الفعل لعلم الله بعدم وقوعه، ... كمن مات كافرًا: داواکارییەك هەیە توانای جێبەجێکردنی نییە بە هۆکاری ئەوەی خوا دەزانێت کە نابێت، یا هەواڵ دەدات، یا ویستی وایە.

وەکوو هەواڵ دەدات بە (أبو لهب) کە ئیمان ناهێنێت و بە بێبڕوایی دەمرێت، لەگەڵ ئەوەشدا داوای ئیمانی لێدەکات، ئەم جۆرە داواکارییە هەیە کە نایەتە دی و خاوەنەکەی توانای نابێت جێبەجێی بکات، بە هۆکاری پێشەنگی کردەوەکانی و بژاردەی ڕێگەی دژ بە ڕێگەی ئیمان.

(١) "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص١١٧، و "التمهيد" للباقلاني ص٢٩٣، و "الإرشاد" للجويني ص٢٢٦.

(٢) "القضاء والقدر" لعبد الرحمن بن صالح المحمود ص٢٧٦، و "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص١١٧، و "التمهيد" للباقلاني ص٢٤٩، و "الإرشاد" للجويني ص٢٢٦، و "شرح المواقف" ص٣٣٢، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٢٩٥).

**٢. دەشێت ئەو داواكارییە هەبێت، ئەگەر نەشهێتە دی:** نجوزه وإن لم يقع بالاستقراء. **دروستە لای ئەشعەرییەكان كە داواكارییەك هەبێت لە سنووری جێبەجێكردندا نەبێت، وە هەر بە سروشتی خۆی نەیەتە دی و نەشبووبێت، وەكوو داواكاری فڕین بە ئاسماندا بەبێ هیچ هۆكارێك.**

**٣. هەر نابێت ئەو داواكارییە بوونی ببێت:** ما يمتنع أو مستحيل لذاته كالجمع بين الضدين. **لەبەر لەخۆگرتنی دوو شتی جیاواز، وەك: شەو بكرێت بە ڕۆژ، یا هەڵگێڕانەوەی حەقیقەتەكان** (قلب الحقائق)، **وەك: ئاو بكرێت بە ئاگر.**

## بەرنامەی ئەهلی سوننەت لەم دوو بابەتەدا

## (الإستطاعة والتكليف بما لا يطاق)

**بەرنامە و بیروڕای ئەهلی سوننەت لە توانا و دەسەڵات لە بوون و كارەكانی ئادەمیزاددا بەم شێوەیە:**

**- الاستطاعة نوعان**[(١)]**:**

**الأولى:** استطاعة من جهة الصحة والوسع والتمكن، وسلامة الآلات، وهي التي تكون مناط الأمر والنهي، وهي مصححة للفعل، فهذه الاستطاعة لا يجب أن تقارن الفعل، بل تكون قبله متقدمة عليه، وهذه الاستطاعة المتقدمة صالحة للضدين.

**الثانية:** الاستطاعة التي يجب معها وجود الفعل، وهذه هي الاستطاعة المقارنة للفعل الموجبة له، هي الكونية، وهي مناط القضاء والقدر.

**بوونی توانا بۆ كاركردن لای ئەهلی سوننەت دوو جۆرە:**

**یەكەم: تواناییەك هەیە لەپێش ئەنجامدانی كارەكاندا، ئەویش بە پێدان و دروستكردنی ئەندامەكانی لاشە و عەقڵ و بوونی ئیرادە و پێویستییەكانی كاركردن، كە ئەم پێویستییانە بە هەموو**

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/٣٧٣)، و "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/٦٠)، و "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٣٢٧، و "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص١١٨، و "القضاء والقدر" لعبد الرحمن بن صالح المحمود ص٢٦٨.

ئادەمیزاد بەخشراوە، جگە لە ڕێژەیەکی کەم نەبێت، وە خاوەنین و ئامادەکاری کارکردنیان تێدایە.

بوونی ئەم توانایانە دەبێتە هۆکاری نەمانی هیچ پاساوێك بۆ ئادەمیزاد، تاوەکوو بیەوێت نەچێتە ژێر باری جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خواوە و هەڵگری دینەکەی نەبێت، وە دەبێتە (حجة) و بەڵگەی خوایی بەسەر بەندەکانیەوە.

ئەمە پەیوەستە بە جۆری قەدەری شەرعییەوە و خاڵی هێنانەدی فەرمانەکانی خوایە، بۆیە دەبێت و پێویستە ئەم توانایانە و پێویستییەکانی هێنانەدی بوونیان بکەوێتە پێش بوونی کارەکانەوە، لەبەرئەوەی هۆکاری کارپێکردنن، کە پێی دەوترێت (الاستطاعة الشرعية)[١]، ئەم توانا شەرعییانە: مُتَقَدِّمَةٌ عَلَى الْفِعْلِ وَمُقَارِنَةٌ لَهُ أَيْضًا وَتُقَارِنُهُ أَيْضًا اسْتِطَاعَةٌ أُخْرَى لَا تَصْلُحُ لِغَيْرِهِ[٢]. لەپێش کارەکەوە بوونیان هەیە، وە بوونیشیان دەمێنێتەوە لەگەڵ کارەکاندا، وە لەگەڵ ئەویشدا چەند توانایەکی تریش بەدوای ئەم توانایانەدا دێن وەکوو تەواوکار و پەیوەستبوو پێوەی بۆ درێژەپێدان و ئەنجامدانی کارەکان، بۆیە دەبینیت لەگەڵ داواکاری کارە شەرعییەکاندا هەموو توانا و پێویستییەکانی دەخوێنرێتەوە و پاساو و عوزرەکانی نەتوانین تیایاندا ڕەچاو دەکرێت، بۆیە مەرج نییە بە بوونی ئەم توانایە بوونی کارەکە هەبێت، وە دەشێت بەردەوامیش نەبێت تا کاتی کارەکە: فَإِنَّ الِاسْتِطَاعَةَ الشَّرْعِيَّةَ قَدْ تَكُونُ مَا يُتَصَوَّرُ الْفِعْلُ مَعَ عَدَمِهَا وَإِنْ لَمْ يَعْجَزْ عَنْهُ[٣]. ئەم توانا شەرعییانە دەشێت ببێتە هۆکاری بوون، یاخود هەر بە نەبوونی بمێنێتەوە با تواناش هەبێت لە ئاستیدا، وەکوو نەخۆشێك دەتوانێت بە پێوە نوێژ بکات لەگەڵ بوونی زیانێك پێی، یاخود حەجێك بکرێت لەگەڵ زیانێکی ماڵی و جەستەیی پێی، ئەمانە لە شەرعدا بە بوونی توانای تەواو ناونابرێت: فَالشَّارِعُ لَا يَنْظُرُ فِي الِاسْتِطَاعَةِ الشَّرْعِيَّةِ إِلَى مُجَرَّدِ إِمْكَانِ الْفِعْلِ، بَلْ يَنْظُرُ إِلَى لَوَازِمِ ذَلِكَ، فَإِنْ كَانَ الْفِعْلُ مُمْكِنًا مَعَ الْمَفْسَدَةِ الرَّاجِحَةِ لَمْ تَكُنْ هَذِهِ اسْتِطَاعَةٌ شَرْعِيَّةٌ[٤]. بۆیە شەرع تەنها سەیری بوونی کارەکە ناکات، بەڵکوو سەیری ئەو پێویستییانەشی دەکات کە پێی ئەنجام دەدرێت، بۆیە

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٣٠).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٧٢).

(٣) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٤٩٢.

(٤) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٤٩٢، و"مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٤٣٩).

ئەگەر توانا هەبێت بەسەر كارەكاندا لەگەڵ زیانێكی زۆر بۆ خاوەنەكەی؛ ئەوا ئەم داواكاری و توانایە شەرع داوای ناكات و بە توانای ئەنجامدانی كارەكەی دانانێت، بۆیە لەم بوارەدا خوا دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ﴾ [البَقَرَة : ١٨٥]، وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖ﴾ [الحَج : ٧٨]، وە دەفەرموێت: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ﴾ [المَائِدَة : ٦]، وە دەفەرموێت: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا﴾ [البَقَرَة : ٢٨٦]. هەموو ئەمانە باس لە كارئاسانی و نەویستنی قورسایی و خوێندنەوەی تواناكان دەكات.

هەر لەبەر ئەمەیە كە خوای پەروەردگار ڕێگەپێدراوەكانی پێخۆشە، وەكوو چۆن داواكارییەكانی پێخۆشە (الرخصة والعزيمة)، وەكوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ اللهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ، كَمَا يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى عَزَائِمُهُ، أَوْ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ تُؤْتَى مَعْصِيَتُهُ»[1].

واتە: خوای گەورە پێی خۆشە ڕێگەپێدراوەكان جێبەجێبكرێت هەروەكوو چۆن پێی خۆشە داواكارییەكانی جێبەجێبكرێت.

لەبەرئەوە جیاوازی هەیە لە نێوان توانایەكی بە مەرج گیراو و توانایەكی پەیوەستبوو پێوەی (الاستطاعة المشروطة والاستطاعة المقارنة): الِاسْتِطَاعَةُ الْمُقَارِنَةُ تَدْخُلُ فِيهَا الْإِرَادَةُ الْجَازِمَةُ، ... إِذَا اجْتَمَعَتِ الْإِرَادَةُ الْجَازِمَةُ وَالْقُوَّةُ التَّامَّةُ، لَزِمَ وُجُودُ الْفِعْلِ[2]. توانای پەیوەستبوو پێوەی واتە كارێك توانات بەسەریدا بشكێت، ئەمە ئیرادەی تیادایە، وە كارەكەش لە تواناتدایە بۆیە دەبێتە ئەوەی كارەكە بوونی ببێت، بەڵام توانای بە مەرج گیراو لە فەرمانە شەرعییەكاندا توانایەكە مەرجی تیادایە بۆ هاتنەدی: أَمَّا الِاسْتِطَاعَةُ الْمَشْرُوطَةُ فِي التَّكْلِيفِ، فَلَا يُشْتَرَطُ فِيهَا الْإِرَادَةُ حَيْثُ

---

(١) رواه ابن خزيمة في "صحيحه" (٢٠٢٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٥٤)، وأحمد في "المسند" (٥٨٦٦) وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، ورواه البزار في "المسند" (٥٩٩٨) واللفظ له، والطبراني في "الأوسط" (٥٣٠٢)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٦٤٧٢)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٣٣٦٩)، والبيهقي في "الشعب" (٣٦٠٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (٦/ ١٩١)، والبغوي في "شرح السنة" (٤/ ٥٢)، وصححه الألباني في "الإرواء" (٥٦٤)، و "صحيح الجامع الصغير" (١٨٨٥، ١٨٨٦).

(٢) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٤٩٢.

أَنَّ اللهَّ تَعَالَى يَأْمُرُ بِالْفِعْلِ مَنْ لَا يُرِيدُهُ[(١)]. واتە توانا بە مەرج گیراوە شەرعییەکان مەرج نییە لەگەڵ بوونی ئیرادە بوونی کارەکە بێتە دی، لەبەرئەوەی ئەگەری بوونی ئەوەی هەیە کە خوا فەرمان بکات بە یەکێك و ئەو کەسەش نەیەوێت جێبەجێی بکات، وەکوو بە مەرجگرتنی نیەتپاکی لە کاردا (الإخلاص) و کەسێکیش نەیەوێت و گرنگی پێنەدات لەبەر مەبەستێکی تری.

هەروەك ئەو هەموو فەرمانەی خوا کە هەیە بۆ جێبەجێکردن و ئەنجامیش نادرێت، بە هۆکاری نەبوونی ئیرادەیەکی پەیوەستبووەوە پێوەی لەلایەن خاوەنەکەیەوە: إِنَّمَا يَنْتَفِي وُجُودُ الْفِعْلِ لِعَدَمِ كَمَالِ الْقُدْرَةِ أَوْ لِعَدَمِ كَمَالِ الْإِرَادَةِ وَإِلَّا فَمَعَ كَمَالِهَا يَجِبُ وُجُودُ الْفِعْلِ الِاخْتِيَارِيِّ[(٢)]. هۆکاری نەکردنی کارێك دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار: یا لەبەر نەبوونی توانای تەواوە بەسەر کارەکاندا، یاخود لەبەر نەبوونی ئیرادەی تەواوە لەناو کارەکاندا، گەر نا بە بوونی تەواوی ئەو دووانە کارەکە دێتە دی.

لەبەرئەوە مەرج نییە بە بوونی ئیرادە بوونی توانا هەبێت، وە هەروەها بە بوونی توانا بوونی ئیرادە هەبێت، قەدەرییەکان لەمەدا کەوتوونەتە هەڵەوە کە دەڵێن: مەرجە بە بوونی توانا بوونی ئیرادە هەبێت، بەڵکوو دەڵێن تەواوکاری یەکن و بەبێ یەك نابن.

**دووەم:** توانایەك لەگەڵ کارەکاندا، بە بوونی بوونی کارەکان دەبێت و هۆکاری هاتنەدییانە و پەیوەندی بە قەدەری کەونییەوە هەیە و لەخۆگری هەموو وردەکارییەکانی ناو قەدەرە.

ئەم توانایە توانا و یارمەتی خواییە بۆ یارمەتیدان و پاراستن و بەردەوامی ئیرادە و گەیشتنە ئەنجامی کارەکان، وە بەپێچەوانەشەوە نەبوونی ئەم یارمەتییە دەبێتە هۆکاری ئاسان نەکردنی کار و نەپاراستن و نەرەخساندنی کاریش بۆ کەسی خۆی، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿مَا كَانُوا۟ يَسْتَطِيعُونَ ٱلسَّمْعَ وَمَا كَانُوا۟ يُبْصِرُونَ ۝٢٠﴾ [هُود: ٢٠]، وە دەفەرموێت: ﴿وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَٰفِرِينَ عَرْضًا ۝١٠٠ ٱلَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِى غِطَآءٍ عَن ذِكْرِى وَكَانُوا۟ لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا ۝١٠١﴾ [الكهف: ١٠٠، ١٠١]. توانای بیستن و بینینیان نەبوو، دۆزەخ پشانی ئەوانە دەدرێت کە پەردە بەسەر چاوەکانیانەوەیە لە ئاستی ئیماندا.

---

(١) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٤٩٢.

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٠/ ٢٧٢).

ئەمە باس لـە نەبوونی توانای ئەندامەکانی جەستە و هۆکارەکان ناکات، بەڵکوو خاوەنی بیستن و بینین و ئیرادە و توانان ...، بەڵام: وَقَدْ أَخْبَرَ أَنَّهُ لَا يَسْتَطِيعُ ذَلِكَ، وَهَذِهِ الِاسْتِطَاعَةُ هِيَ الْمُقَارِنَةُ لِلْفِعْلِ الْمُوجِبَةُ لَهُ[(١)]. هەواڵ دەدات بە نەتوانینی بیستن و بینینیان، نەك نەتوانینی ئەندامەکان و نەبوونی توانا تیایاندا بۆ بینین و بیستن ...، ئەمە توانایەکە لـەگەڵ کارەکاندا بوونی هەیە و خۆیان بەکاریان نەهێناوە و خواش یارمەتی نەداون، بۆیە ئەو توانایانە بۆ ئەو ڕێگایە کار ناکات، وە ئەم توانا خواییەش خوای گەورە لـەگەڵ کردارەکاندا بە زانایی و حیکمەتی خۆی بەکاری دێنێت لـەگەڵ بەندەکانیدا، دەسەڵاتێك نییە بتوانێت بۆخۆی دروستی بکات، ئەوەی بەدی بکرێت لـەم توانایەدا ئەوەیە کە کردەوە لای ئادەمیزادە و بەڕێوەبردن لای خوایە: فكما أن الله تعالى لا ينسب إليه فعل العبد لأنه يعاقبه عليه؛ فكذلك العبد لا ينسب إليه الخلق لأنه لا يقدر عليه[(٢)]. هەروەك چۆن کاری ئادەمیزاد نادرێتە پاڵ خوا لـەبەرئەوەی لـێپرسینەوەی لـەسەرە، ئاواش دروستکردن و هێنانەدی خوایی نادرێتە پاڵ ئادەمیزاد، لـەبەرئەوەی لـە توانایدا نییە.

بۆیە لـە قورئاندا هەر دارشتنێك هەبێت کە باس لـە تواناکانی خوا بکات لـە کەوندا بۆ هێنانەدی و دروستکردن و گۆڕانکاری و باڵادەستی و دەسەڵاتی ڕەها و هەتا دوایی، مەبەست بەم قەدەرە کەونییەیە.

بەرنامەی ئەهلی سوننەت توانیویەتی هەموو حەقەکان لـەخۆبگرێت و بەتاڵەکان ڕەتبکاتەوە بەگوێرەی بەڵگەکانی قورئان و فەرموودە، بۆیە باوەڕی بە بوونی توانایەك هەیە لـەپێش کارەکاندا، هەروەکوو چۆن قەدەرییەکان دەڵێن، بەڵام پاڵپشتی ئەو یارمەتییە خواییەش هەیە لـەگەڵ کارەکاندا، وە باوەڕیشی بە توانایەك هەیە لـەگەڵ کارەکاندا، هەروەکوو چۆن جەبەرییەکان وادەڵێن، بەڵام لـەگەڵ بەکارهێنانی تواناکانی پێشوەختە کە خوا بۆی ڕەخساندووە، بە هۆکاری کۆکردنەوەی هەردوو تواناکە؛ ئەوکات دەتوانرێت وەکوو خۆی حەق بەم دوو بابەتە بدرێت، بەم شێوەیە دەتوانین هەموو دەقەکانی قورئان و فەرموودە لـەخۆبگرین، هەریەك بخەینە ڕیزبەندی خۆیەوە بەبێ ئەوەی هیچ دژایەتی و پێچەوانەییەك دروستببێت لـە نێوان دەقەکاندا و لـەگەڵ

---

(١) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/ ٦١)، و"مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٣١٩).

(٢) "القضاء والقدر عند السلف" لأبي عبد الرحمن علي بن السيد الوصيفي ص١٨٢.

بەدەستەوەدانی مانا و واتای زۆر گونجاو و حەقیقی و بە پشتیوانی تێگەیشتنەکانی عەقڵی تەواو بۆی، وە گونجاو لەگەڵ واقعی ژیاندا.

بیروڕاو بەرنامەی ئەهلی سوننەت لە قەدەردا وایە کە قەدەر پێکهاتووە لە دوو بەشی سەرەکی، ئەوانیش قەدەری شەرعی و قەدەری کەونین، کە هەریەك بۆخۆی واتا و مەبەست و ناوەڕۆکێکی تایبەتی خۆی هەیە.

**قەدەری شەرعی** بریتییە لە فەرمانەکانی قورئان و فەرموودە، کە هەمووی شوێنی خۆشەویستی و ڕازیبوون و ئیرادە و ویستی خوایە لەسەری (المحبة والرضا والإرادة والمشيئة).

وە **قەدەری کەونیش** کە مەبەست پێی بوونی یاسا و بەرنامەی خوایی تایبەتە بە خۆی بۆ بەڕێوەبردنی هەموو بوونەوەرەکانی، کە لەم قەدەرەدا دەشێت لە کەون و بووندا هەبێت خوای گەورە خۆشەویستی و ڕازیبوون و ئیرادە و ویست (المحبة والرضا والإرادة والمشيئة)ی لەسەر بێت، وەکوو پێغەمبەران و خواناسی و چاکە و مەلائیکەکان، وە لە بوونیشدا هەیە کە شوێنی ئیرادە و ویستی خوا (الإرادة والمشيئة)ی لەسەرە و بەڵام پێخۆشبوون و ڕازیبوون (المحبة والرضا)ی خوای لەسەر نییە، وەکوو (إبليس، کافر، معصية ...).

بەگوێرەی ئەم دوو قەدەرە توانا و ئیرادەکانیش بەسەریاندا دابەشدەکرێت، توانای پێش کارەکان (الاستطاعة قبل الفعل) قەدەری شەرعییە و توانای کاتی کارەکانیش (الاستطاعة مع الفعل) قەدەری کەونییە، بۆیە هەموو وشەکانی ناو قورئان ئەم دوو قەدەرە لەخۆدەگرن، بەڵام جیاکردنەوەیان لە یەکتری بە مەبەستی باسەکە دەردەکەوێت کە کەونییە یاخود شەرعییە، وەکوو وشەی (القضاء والحكم والإرادة والكتابة والأمر والإذن والجعل والكلمات والبعث والإرسال والتحريم ...)[1]، هەریەك لەم وشانە هەردوو قەدەرەکە لەخۆدەگرێت بەگوێرەی لەخۆگرتنی بابەتەکە، بۆیە هۆکاری گومڕایی فیرقەکان جیانەکردنەوەی قەدەری شەرعی بووە لە قەدەری کەونی، تێکەڵکردنی وشەی (المحبة والرضا) بە (الإرادة والمشيئة) بووە بە یەکتر، ئەوەی خوا پێی خۆشە و پێی ڕازییە، کە ئەمە قەدەری شەرعییە، وە ئەوەشی کە ویست و ئیرادەی لەسەرە، کە ئەمەش قەدەری کەونییە.

---

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص٢٨٠.

**جەبەرییەكان** دەڵێن ئەوەی كە خوا ویست و ئیرادەی لەسەرە ئەوە پێی خۆشە و پێی ڕازییە، واتە باوەڕیان بە قەدەری كەونی هەیە و باوەڕیان بە قەدەری شەرعی نییە، وەكوو موشریكەكانی پێش ئیسلام كە ئەمەیان دەكردە بەڵگە بۆ وەرنەگرتنی ئیسلام و دەیانوت: ﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأۡسَنَاۗ قُلۡ هَلۡ عِندَكُم مِّنۡ عِلۡمٖ فَتُخۡرِجُوهُ لَنَآۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَخۡرُصُونَ ١٤٨﴾ [الأنعام: ١٤٨]، ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ نَّحۡنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ فَهَلۡ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٣٥﴾ [النحل: ٣٥].

پاساوی موشریكەكان لە وەرنەگرتنی دیندا ئەوەبوو كە بە قەدەری كەونی خۆیان دەپەڕاندەوە و دەیانوت ئەگەر خوا ویستی لێ نەبووایە ئێمە و باو و باپیرانمان هیچ شتێكمان بێجگە لەو نەدەپەرست، وە تەنانەت یاسای حەرام و حەڵاڵیشمان دانەدەنا، واتە مادام لە بووندا هەیە كەواتە دەشێت پێی خۆشبێت و پێی ڕازیبێت، خوای گەورەش دەفەرموێت: هەر بەم شێوەیە پێش خۆیان ئەم درۆیانەیان دەكرد تاوەكوو سزای ئێمەیان چەشت، ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ ئایا هیچ زانیارییەكی خواییتان لایە لەسەر ئەوەی كە خوا ئەم كار و كردەوەیەی ئێوەی پێخۆشە پێی ڕازییە؟! كەواتە ئێوە شوێنكەوتەی گومانی خۆتانن، بەڵكوو مەبەستتان درۆكردن و خۆپەڕاندنەوەیە.

وە **قەدەرییەكانیش** قەدەری شەرعییان دەكردە بەڵگە بۆ ڕزگاربوون لە قەدەری كەونی و دەیانوت ئەوەی هەیە لە قەدەری شەرعیدا هەر ئەوەیە كە خوا ویست و ئیرادەی لەسەرە، وە ئەوەی كە لە باسی قەدەری كەونیدا هەیە لە دروستكردن و بەڕێوەبردنی خوایی بوونی نییە، بەڵكوو ئادەمیزاد بۆخۆی دروستی دەكات و هۆكاری بەڕێوەبردنی كارەكانی خۆیانن، واتە مانای (المحبة والرضا والإرادة والمشيئة) لای ئەمانیش هەر یەكێكە، خوا بە هیچ شێوەیەك كەس گومڕا ناكات و هیدایەتیشی نادات، ئادەمیزاد خۆی ئەو كارانە دەڕەخسێنێت و كاری خۆی دروستدەكات، وە هیچ شتێك لەسەر ئادەمیزاد نەنووسراوە كە بێتە دی، (ئەبو هورەیرە) ﵁ دەیگێڕێتەوە كە موشریكەكان هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ دژایەتی قەدەریان كرد، ئەم ئایەتەیان

لەسەر هاتە خوارەوە: ﴿إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٖ ۝٤٧ يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ۝٤٨ إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ ۝٤٩﴾ [القمر: ٤٧ - ٤٩][1].

واتە: ڕۆژێك دەبێ لەسەر ڕوو ڕادەكێشرێن بۆ دۆزەخ و پێیان دەوترێت بچەشن سزای سەختی ناو دۆزەخ، ئێمە هەموو شتێكمان بە دانان و قەدەری تایبەت دروستكردووە، واتە لە سزای ئەوەی كە باوەڕتان بە قەدەر نەبوو ﴿وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ۝٣﴾ [الأعلى: ٣].

بۆ ڕوونبوونەوەی ئەم بابەتە و بردنەوە سەر بناغەی بۆچوونەكان؛ (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دابەشكردنێكی هەیە بۆ جۆری فیرەقەكانی ناو قەدەر، دەڵێت: وَالطَّائِفَتَانِ تَظُنُّ أَنَّ مُلَاحَظَةَ الْأَمْرِ وَالْقَدَرِ مُتَعَذِّرٌ كَمَا أَنَّ طَائِفَة تَجْعَلُ ذَلِكَ مُخَالِفًا لِلْحِكْمَةِ وَالْعَدْلِ. وَهَذِهِ الْأَصْنَافُ الثَّلَاثَةُ هِيَ: الْقَدَرِيَّةُ الْمَجُوسِيَّةُ وَالْقَدَرِيَّةُ المشركية؛ وَالْقَدَرِيَّةُ الإبليسية[2].

واتە: قەدەرییەكان و جەبرییەكان كە سەرەكیترینی فیرەقەكانی ناو قەدەرن توانای وەرگرتن و باوەڕبوونیان نییە بە قەزا و قەدەر و قەدەری شەرعی بەیەكەوە، بۆیە بە گشتی لە باسی قەزا و قەدەردا دەبن بە سێ بەشی جیاوازەوە:

**یەكەم: القدرية المجوسية:** قەدەرییەكانن كە دەڵێن خوا ئادەمیزادی دروستكردووە و ئادەمیزادیش كردەوەی خۆی دروستدەكات، توانای خوای تێدا نییە و لە خوێندنەوەی قەدەردا هەموو تێڕوانینەكانیان لەسەر هۆكار و كارە دونیاییەكانە و دەڵێن قەدەرە كەونییەكان (عدالة) و دادپەروەری تێدا نییە و دەبێتە هۆكاری ستەم، بەم هۆكارەوە كەوتوونەتە واتاكردن و ڕاڤەكردنی دەقەكانی قورئان و فەرموودە بە (تحريف والتأويل)، ئەمان باوەڕیان بە جێبەجێكردنی شەرع هەیە و باوەڕیان بە ووردەكارییەكانی باسی قەدەر نییە.

**دووەم: القدرية المشركية:** مەبەست بەوانەیە كە هەمان بۆچوونی موشریكەكانی سەردەمی پێش هاتنی ئیسلامیان هەیە بۆ قەدەر، كە دەڵێن كار بەدەست ئێمە نییە و هەمووی بەدەست خوایە

---

(١) رواه مسلم (٢٦٥٦)، والترمذي (٢١٥٧)، وابن ماجه (٨٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٦١٣٩)، وأحمد في "المسند" (٩٧٣٦)، والبيهقي في "الشعب" (١٨٠)، وابن بطة في "الإبانة" (١٤٢٩)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٩٤٦)، والفريابي في "القدر" (٢٤٥).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٠/ ٧١٨).

﴿لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا﴾ [الأنعام : ١٤٨]، ئادەمیزاد خاوەنی هیچ بژاردە و كارێك نییە لە كارەكانیدا، ئەمانەش پێیان دەوترێت جەبەرییەكان، ئەمان باوەڕیان بە قەدەر هەیە و باوەڕیان بە جێبەجێكردنی شەرع نییە و قسەكەیان پاساوە بۆ وەرنەگرتنی دین.

سێیەم: القدرية الإبليسية: ئەمانە وەكوو ئیبلیس باوەڕیان بە قەدەری شەرعی و كەونی هەیە بە شێوەیەكی سەرەتایی و ڕووكەش، بەڵام پێی ڕازی نین و دەكەونە ڕەخنەگرتن و دەڵێن هەردوو قەدەرەكە پێچەوانە و دژبەیەكن و ناگونجێن، بۆیە لە ئەنجامدا لە هەردوو قەدەرەكە دەردەچن وەكوو ئیبلیس، نە فەرمانی خوا جێبەجێ دەكەن، نە باوەڕیان بە قەدەرە، بۆیە ئیبلیس ڕەخنەی لە قەدەر گرت و وتی: ﴿رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِي﴾ [الحجر : ٣٩]. خوایە تۆ سەرت لێشێواندم، وە بۆ فەرمانە شەرعییەكەش: ﴿ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ ۖ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ ۖ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿٧٦﴾﴾ [ص : ٧٥]. بۆ سوجدە نابەیت و فەرمان دەشكێنیت؟ كەوتە ڕەخنەگرتن لە فەرمانەكەی خوا بەوەی كە خوا چاك و خراپی نەخوێندووەتەوە، وتی من باشترم تاوەكوو ئادەم.

قەدەری یەكەم كە كەونییەكەیە عەقڵانییەكان پێوەی تووشبوون و ناتوانن تەسلیمی بن، وە قەدەری دووەم كە شەرعییەكەیە: مَا يُبْتَلَى بِهِ السَّالِكُونَ أَهْلُ الْإِرَادَةِ وَالْعَامَّةِ[(١)]. ئەهلی تەسەوف و عیبادەت پێوەی تووشبوون و ناتوانن (المتابعة)ی تیادا ئەنجام بدەن، تا دەگەنە دەرچوون لە شەرع (سقوط الأمر)، وە قەدەری سێیەمیش كە (إبليس)ییەكەیە و دەرچوونە لە هەردووكی، كەسانی ئەهلی تاوان و شەهەوات لە شاعیران و نەفامان ... پێوەی تووشبوون، هیچیان ناتوانن بە یەك جار هەردوو قەدەرەكە لەخۆبگرن و (ملحد) و بێبڕوا بوون، یەكەمیان قسەكانیان بەشێوەی مەجووسییەكان دەشكێتەوە كە دەڵێن دوو خوا هەیە، خوای خێر بەناوی (أهرمن) و خوای شەڕیش بەناوی (یزدان)[(٢)]، وە ئێمە كردەوەكانمان دروست دەكەین و خواش ئێمەی دروستكردووە، دووەمیشیان وەكوو موشریكەكان پاساو بە قەدەری كەونی دەهێننەوە بۆ وەرنەگرتنی دین، سێیەمیشیان وەكوو (إبليس) شوێنكەوتەی حەز و ئارەزووەكانیانن وەكوو (الحرية والإباحية)كانی ئەمڕۆ.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٠/٧١٨).
(٢) "تفسير الرازي" (١٣/٨٩).

بەڵام ئەهلی سوننەت توانیویەتی هەموو دین لەخۆبگرێت، وە باوەڕی بە هەردوو توانا و هەردوو قەدەرەکە ببێت، وە هەریەکەیان لە شوێنی خۆی بەکاربهێنێت لە جێبەجێکردنی فەرمانە شەرعییەکان و باوەڕبوون بە دەسەڵات و قەزا و قەدەری بەڕێوەبردنی خوایی لە کەوندا، وەکوو چۆن لەم بەڵگانەدا لەگەڵ یەکدا باسکراون:

١. قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ﴾ [الأعراف: ٥٤].

واتە: ئەوەی دروستکار و بەڕێوەبەری بێت هەر خوایە.

(ٱلۡخَلۡقُ) بۆ قەدەری کەونی، (وَٱلۡأَمۡرُ) بۆ قەدەری شەرعی.

٢. قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾﴾ [التكوير: ٢٨، ٢٩].

واتە: ئەم پەیامەی خوا بۆ کەسانێکە کە دەیانەوێت چاکە بکەن و بە ڕێگەی ڕاستدا بڕۆن، وە هیچ یارمەتییەکیش نییە بۆ سەر ئەو ڕێگایە بێجگە لە یارمەتی خوا نەبێت.

(لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ) بۆ قەدەری شەرعی و بوونی بژاردە بۆ ئادەمیزاد، (وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ) بۆ قەدەری کەونی و دەسەڵاتی خوایی.

٣. قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٩٩﴾﴾ [يونس: ٩٩].

واتە: گەر خوا ویستی لێبێت هەموو سەرزەوی ئیمان دەهێنن، بەڵام ئایا ئەی (محمد) ﷺ تۆ دەتەوێت بە زۆرەملێ هەمووی ئیمان بێنێت؟!

(وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًا) بۆ قەدەری کەونی، (أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ) بۆ قەدەری شەرعی.

٤. بۆ قەدەری شەرعی: قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ﴾ [الكهف: ٢٩]. بۆ قەدەری کەونی: قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٩﴾﴾ [النحل: ٩].

واتە: ئەوەی دەیەوێت با ئیمان بێنێت، وە ئەوەی دەیەوێت با بێبڕوا بێت، وە گەر خوای گەورە ویستی لێبوایە هەمووتانی هیدایەت دەدا.

٥. بۆ قەدەری شەرعی: قَالَ تَعَالَى: ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٢٩﴾﴾ [الإنسان: ٢٩]، ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾﴾ [المدثر: ٣٧]. بۆ قەدەری كەونی: قَالَ تَعَالَى: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ [فاطر: ٨]، ﴿وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾ [البقرة: ١٠٥].

واتە: ئەوەی دەیەوێت دەتوانێت ڕێگەی خوایی بگرێت، وە ئەوەی دەیەوێت با بەرەوڕووی ئیمان بڕوات، گەرنا با پشتی تێبكات، وە خوای پەروەردگاریش ئەوەی بیەوێت گومڕای دەكات و ئەوەشی بیەوێت هیدایەتی دەدات.

٦. قال رسول الله ﷺ: «أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ»[1].

واتە: پەنا ئەگرم بە فەرموودە و وتە تەواوەكانی لە شەڕی ئەوەی كە دروستی كردوون.

(أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ) بۆ قەدەری كەونی، (مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ) بۆ قەدەری شەرعی.

٧. بۆ قەدەری كەونی: قَالَ تَعَالَى: ﴿وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ﴾ [الزمر: ٦٩، ٧٥]. واتە: خوا بە فەرمانی خۆی یەكلای كردووەتەوە نێوانیان. بۆ قەدەری شەرعی: قَالَ تَعَالَى: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾ [الإسراء: ٢٣]. واتە: خوا فەرمان و یاسای شەرعی وایە كە بەس خوا بپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار مەدەن.

٨. بۆ قەدەری كەونی: قَالَ تَعَالَى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ﴾ [المائدة: ١]. واتە: خوا بە ویستی خۆی حوكم دادەڕێژێت. بۆ قەدەری شەرعی: قَالَ تَعَالَى: ﴿وَلَا يُشْرِكُ فِى حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا﴾ [الكهف: ٢٦]. واتە: هیچ هاوبەش و هاوەڵێك بۆ خوا بڕیار مەدەن.

---

(١) رواه مسلم (٢٧٠٨)، والترمذي (٣٤٣٧)، والنسائي في "الكبرى" (١٠٣١٨)، وابن ماجه (٣٥٤٧)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٢٥٦٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٥٦٦)، ومالك في "الموطأ" (٣٤)، وأحمد في "المسند" (٢٧١٢٠)، والدارمي في "سننه" (٢٧٢٢)، والبزار في "المسند" (٩٠٦٦)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٦٨٨)، والطبراني في "الكبير" (٦٠٣)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٩٢٦٠)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٩٤٠٩).

**٩. بۆ قەدەری کەونی:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً﴾ [الإسراء: ١٦]. **واته: گەر بمانەوێت شارێك لەناو ببەین. بۆ قەدەری شەرعی:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ﴾ [البقرة: ١٨٥]. **واته: خوا لە یاسا و شەرعەکەیدا دەیەوێت کارئاسانیتان بۆ بکات، ویستی کارقورسی نییە پێتان.**

**١٠. بۆ قەدەری کەونی:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغۡلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِيٓ﴾ [المجادلة: ٢١]. **واته: خوا خۆی بڕیاری داوە دەبێت دینی خۆی و پێغەمبەرانی سەربخات. بۆ قەدەری شەرعی:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ﴾ [البقرة: ١٨٣]. **واته: لە یاسا و شەرعی خوادا بەڕۆژووبوونتان لەسەر فەرز کراوە.**

**١١. بۆ قەدەری کەونی:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٨٢﴾ [يس: ٨٢]. **واته: خوا هەر کارێکی لە کەوندا بوێت، ئەوا بە فەرمانی (ببە) ئەبێت و دروستی دەکات. بۆ قەدەری شەرعی:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ﴾ [النحل: ٩٠]. **واته: لە شەرعی خوادا فەرمان بە دادپەروەری و چاکە کراوە.**

**١٢. بۆ قەدەری کەونی:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا﴾ [النحل: ٧٢]. **واته: لە کەوندا خوا خێزانی لە خۆتان دروستکردووە. بۆ قەدەری شەرعی:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلۡكَعۡبَةَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ﴾ [المائدة: ٩٧]. **واته: لە شەرعدا خوا کەعبەی کردووەتە ماڵی خۆی و تاوانی تێدا حەرام کردووە.**

**١٣. بۆ قەدەری کەونی:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱللَّهُ يُؤۡتِي مُلۡكَهُۥ مَن يَشَآءُ﴾ [البقرة: ٢٤٧]. **واته: لە کەوندا خوا بە ویستی خۆی دەسەڵات دەداتە هەرکەسێك کە بیەوێت. بۆ قەدەری شەرعی:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ﴾ [الحشر: ٧]. **واته: لە شەرعی خوادا هەرکات پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدان جێبەجێی بکەن.**

## كورتە و كۆكراوەی بابەتەكە

**لە بیرورِای (معتزلة وقدرية)كاندا: داواكارییەك كە توانای جێبەجێكردنی نەبێت نییە و نابێت بۆ خوا ببێت، وەكوو خۆیان دەڵێن:** وتكليف مالا يطاق قبيح، والله تعالى لا يفعل القبيح[١]، إنه يقبح على الله تعالى عقلاً أن يكلف بما لا يطاق، وأن تكليفه عبث لأنه يعلم أنه لا قدرة على تنفيذ ما كلف به[٢].

**واتە: داواكارییەك لە توانای جێبەجێكردندا نەبێت بۆ خوا دروست نییە و نەشیاوە و لە عەقڵدا جێگەی نابێتەوە، لەبەرئەوەی جێبەجێ ناكرێت و قابیلی جێبەجێكردن نییە.**

**ئەم بیرورِا عەقڵییەی موعتەزیلەكان دەگەڕێتەوە بۆ پێوانەی كارەكانی خوا بە كارەكانی ئادەمیزادەوە، لە ئەنجامی هاوشێوە و پێوانەكردندا كەوتنە باوەڕنەبوون و لەكارخستنی سیفات و كار و كامڵییەكانی خوا، وەكوو (ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت:** فروا من التشبيه فوقعوا في التعطيل. كل معطل مشبه ولا يستقيم له التعطيل إلا بعد التشبيه[٣]. **وە (ابن تيمية)ش رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت:** وَالْقَدَرِيَّةُ مُشَبِّهَةُ الْأَفْعَالِ: قَاسُوا أَفْعَالَ اللَّهِ عَلَى أَفْعَالِ خَلْقِهِ[٤].

**واتە: ویستیان لە هاوشێوەكردن رِزگاریان بێت، بەڵام كەوتنە باوەڕنەمان بە سیفاتەكانی خوا، لەبەرئەوە هەموو لەكارخەرێكی سیفاتەكانی خوا (المعطلة) هاوشێوەكارە (المشبهة)، بەو هۆكارەوە لەكارخستنی بۆ دەرەخسێت، قەدەرییەكان هاوشێوەكاری كارەكانی خوان بە بەندەكانیەوە، پێوەریان تیایدا كاری بەندەكانیەتی.**

**بۆیە بەم پێوەرەیان هەرشتێك بۆ ئادەمیزاد نەبوو و نەشیاو بێت؛ بۆ خواش نەبوو و نەشیاوە، (تكليف ما لا يطاق)یش لای قەدەرییەكان بۆ خوا نەشیاوە و بوونی نییە، لەبەرئەوەی لای ئادەمیزاد لە تواناد نییە و نەشیاوە و بوونی نییە.**

---

(١) "شرح الأصول الخمسة" للقاضي عبد الجبار الهمذاني ص٣٩٦.

(٢) "أفعال العباد بين الجبر والاختيار" لمحمد حسن رباح بخيت ص١٠٦، ينظر: "الإقتصاد في الاعتقاد" ص١١٢، و "معالم أصول الدين" للرازي ص٩١، و "المواقف" ص٣٣١، و "التفسير الكبير" للرازي (٢/ ٤٥).

(٣) "الصواعق المرسلة" لابن القيم (١/ ٢٤٤).

(٤) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ١٥٣).

**بەڵگەکانیان لەسەر نەبوونی (تكليف ما لا يطاق) بۆ خوا:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ [البَقَرَة: ٢٨٦].

واتە: خوای پەروەردگار داواکاری لەسەر ئەوە نییە کە لە توانای بەندەکانیدا نەبێت.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ﴾ [التَّغَابُن: ١٦].

واتە: بە گوێرەی تواناتان خواپەرستی بکەن.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ﴾ [المَائِدَة: ٦].

واتە: ویستی خوا لەسەر بوونی قورسایی نییە لە دیندا.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ [الحَج: ٧٨].

واتە: لە دیندا داواکارییەك نییە کە لە توانای جێبەجێکردندا نەبێت.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ﴾ [البَقَرَة: ١٨٥].

واتە: خوا ویستی کارئاسانی پێتانە و بارقورسی ناوێت لێتان.

بەم بەڵگانە (معتزلة)کان ئەوە دەسەلمێنن کە داواکاری لە تواناندا نەبوو نییە بۆ خوا و ناشبێت ببێت بۆی و لە دینیشدا نییە.

– لە بیروڕای (الجهمية والجبرية والأشاعرة) ئەم جۆرە داواکارییە دروستە و بۆ خوا دەشێت کە بیکات (أن تكليف ما لا يطاق جائز)[1]، بەم بەڵگانە:

١. ﴿رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ﴾ [البَقَرَة: ٢٨٦].

واتە: خوایە بارقورسییەك مەدە بەسەرماندا کە لە تواناماندا نەبێت هەڵگرتنی.

**دەڵێن:** إذ لو لم يكن جائزاً لما حسن طلبه بالدعاء من الله تعالى[2]. واتە ئەگەر (تكليف ما لا يطاق) دروست نەبوایە و لە مافی خوادا نەبوایە؛ ئەوا لە قورئاندا داینەدەنا کە داوای لێبکرێت ئەو داواکاری نەتوانینی جێبەجێکردنە دانەنێت و بەندەکان نەخاتە ژێر بارییەوە.

---

(١) "التفسير الكبير" للرازي (٧/ ١٢٨).

(٢) "التفسير الكبير" للرازي (٧/ ١٢٨).

٢. ﴿أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ [البَقَرَة: ٣١].

خوا فەرمانی دا بە مەلائیکەکان کە ناوی ئەمانەم پێبڵێن لە دروستکراوەکانی و لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان نەیاندەزانی و هیچ شارەزاییەکیان لەسەر نەبوو، ئەمە بۆخۆی داواکارییەکە کە جێبەجێکردنی لە تواناادا نییە.

٣. خوای گەورە زانستی بەسەر بێبڕوایاندا هەیە کە بە بێبڕوایی دەمرن، کەچی داوای ئیمانی لە هەندێکیان دەکرد، وەکوو دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٦﴾ [البَقَرَة: ٦]، وە دەفەرموێت: ﴿لَقَدۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَىٰٓ أَكۡثَرِهِمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٧﴾ [يسٓ: ٧]. واتە بێبڕواکان پێیان ڕاگەیەنیت و ڕانەگەیەنیت باوەڕ ناهێنن، وە بڕیار و فەرموودەی خوا بەتەواوی هاتە دی بەسەریاندا کە ئیمان ناهێنن، لەگەڵ ئەوەشدا داوای ئیمانی لێ دەکردن، وە بە هۆکاری کارەکانیانەوە توانای ئیمانهێنانیان نەمابوو، ئایا ئەمە (تكليف ما لا يطاق) نییە؟!.

٤. خوای گەورە داوای ئیمانهێنانی لە (أبو لهب) کرد کە باوەڕبهێنێت و موسوڵمان بێت، لە کاتێکدا قورئان دەربارەی ئەو لە سوورەتێکدا باسی ئەوەی تێدایە کە باوەڕ ناهێنێت و دەچێتە دۆزەخەوە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ ٣﴾ [المَسَد: ٣]. ئایا ئەمە دوو شتی دژبەیەك نین و بوونی داواکارییەك نییە کە لە توانای (أبو لهب)دا نەبێت لەسەر موسوڵمانبوونی؟!.

٥. ﴿وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡ﴾ [البَقَرَة: ١٢٩]. واتە پیاوی چەند ژنە ناتوانێت دادپەروەربێت لەگەڵ خێزانەکانیدا. ئایا ئەمە بوونی داواکارییەکی لەتواناادا نەبوو نییە؟!.

ئەمانە جەبەری و ئەشعەرییەکان دەیکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی (تكليف ما لا يطاق) دەبێت و دەشێت بۆ خوا هەبێت.

– **بیروڕای ئەهلی سوننەت:** هەر بۆخۆی دارشتنی ئەم وشەیە و بەکارهێنانی بەشێوەی ڕەها بە بیدعە و هۆکاری گومڕایی دەزانێت، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: فَإِطْلَاقُ الْقَوْلِ بِتَكْلِيفِ مَا لَا يُطَاقُ مِنْ الْبِدَعِ الْحَادِثَةِ فِي الْإِسْلَامِ[1]. واتە وشەی (تكليف ما لا يطاق) و بڕیاردان

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٣٢٢).

لەسەری بە ڕەهایی بۆ خوا یەکێکە لەو قسانەی کە بیدعە و داهێنراوە لە ئیسلامدا، بەتایبەت لەسەر دەستی فیرەقەکان، وە پێویستی بە شیکردنەوە هەیە لەسەری، وە دەڵێت: مَسْأَلَةُ "تَكْلِيفِ مَا لَا يُطَاقُ" فَإِنَّ الطَّاقَةَ هِيَ الِاسْتِطَاعَةُ وَهِيَ لَفْظٌ مُجْمَلٌ. فَالِاسْتِطَاعَةُ الشَّرْعِيَّةُ الَّتِي هِيَ مَنَاطُ الْأَمْرِ وَالنَّهْيِ لَمْ يُكَلِّفْ اللهُ أَحَدًا شَيْئًا بِدُونِهَا فَلَا يُكَلِّفُ مَا لَا يُطَاقُ بِهَذَا التَّفْسِيرِ وَأَمَّا الطَّاقَةُ الَّتِي لَا تَكُونُ إلَّا مُقَارِنَةً لِلْفِعْلِ فَجَمِيعُ الْأَمْرِ وَالنَّهْيِ تَكْلِيفُ مَا لَا يُطَاقُ بِهَذَا الِاعْتِبَارِ[١].

واتە: وشەی (الاستطاعة) وشەیەکی کورتە، لە دوو مەبەستدا خۆی دەبینێتەوە:

١. ئەگەر مەبەست پێی ئەو توانایانە بێت کە لەپێش کارەکانەوە بوونی هەیە و فەرمانە شەرعییەکانی پێ جێبەجێ دەکرێت؛ ئەوا بەم مەبەستە هیچ داواکارییەك نییە لە شەرعدا توانای جێبەجێکردنی نەبێت، واتە (تكليف ما لا يطاق) لە قورئان و سوننەتدا بوونی نییە.

٢. وە ئەگەر مەبەست پێی ئەو توانایانە بێت کە لەگەڵ کارەکاندا بوونی هەیە و لە دەسەڵاتی خوادایە و خوا دەیبەخشێت و یارمەتی بەندەکانی دەدات لەسەر ئەنجامدانی؛ ئەوا ئەم توانایە (تكليف ما لا يطاق)ە و بوونی هەیە، لەبەرئەوەی توانای دروستکردن و هێنانەدییەکانی لە دەسەڵاتی ئادەمیزاددا نییە.

٣. بەڵام ئەم (تكليف ما لا يطاق)ەش وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت دەبێتە دوو بەشی سەرەکییەوە: تَكْلِيفُ مَا لَا يُطَاقُ وَهُوَ عَلَى ضَرْبَيْنِ: **أَحَدُهُمَا**: تَكْلِيفُ مَا لَا يُطَاقُ لِوُجُودِ ضِدِّهِ مِنْ الْعَجْزِ وَذَلِكَ مِثْلُ أَنْ يُكَلَّفَ الْمُقْعَدُ الْقِيَامَ، وَالْأَعْمَى الْخَطَّ وَنَقْطَ الْكِتَابِ، وَأَمْثَالَ ذَلِكَ فَهَذَا مِمَّا لَا يَجُوزُ تَكْلِيفُهُ وَهُوَ مِمَّا انْعَقَدَ الْإِجْمَاعُ عَلَيْهِ ... (وَتَكْلِيفِ الْإِنْسَانِ الطَّيَرَانَ وَنَحْوِ ذَلِكَ، فَهَذَا غَيْرُ وَاقِعٍ فِي الشَّرِيعَةِ عِنْدَ جَمَاهِيرِ أَهْلِ السُّنَّةِ الْمُثْبِتِينَ لِلْقَدَرِ)[٢]، **وَالثَّانِي**: تَكْلِيفُ مَا لَا يُطَاقُ لَا لِوُجُودِ ضِدِّهِ مِنْ الْعَجْزِ مِثْلَ أَنْ يُكَلَّفَ الْكَافِرُ الَّذِي سَبَقَ فِي عِلْمِهِ أَنَّهُ لَا يَسْتَجِبُّ التَّكْلِيفَ كَفِرْعَوْنَ وَأَبِي جَهْلٍ وَأَمْثَالِهِمْ فَهَذَا جَائِزٌ[٣]... (لِلِاشْتِغَالِ بِضِدِّهِ، كَاشْتِغَالِ الْكَافِرِ بِالْكُفْرِ، فَإِنَّهُ هُوَ الَّذِي صَدَّهُ عَنِ الْإِيمَانِ، وَكَالْقَاعِدِ فِي حَالِ قُعُودِهِ، فَإِنَّ اشْتِغَالَهُ بِالْقُعُودِ يَمْنَعُهُ أَنْ يَكُونَ

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٣٠).
(٢) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ١٠٤).
(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٠٢).

قَائِمًا. وَالْإِرَادَةُ الْجَازِمَةُ لِأَحَدِ الضِّدَّيْنِ تُنَافِي إِرَادَةَ الضِّدِّ الْآخَرِ، وَتَكْلِيفُ الْكَافِرِ الْإِيمَانَ مِنْ هَذَا الْبَابِ. وَمِثْلُ هَذَا لَيْسَ بِقَبِيحٍ عَقْلًا عِنْدَ أَحَدٍ مِنَ الْعُقَلَاءِ ... فَإِنَّهُ لَا يُقَالُ لِلْمُسْتَطِيعِ الْمَأْمُورِ بِالْحَجِّ إِذَا لَمْ يَحُجَّ إِنَّهُ كُلِّفَ بِمَا لَا يُطِيقُ، وَلَا يُقَالُ لِمَنْ أُمِرَ بِالطَّهَارَةِ وَالصَّلَاةِ فَتَرَكَ ذَلِكَ كَسَلًا أَنَّهُ كُلِّفَ مَا لَا يُطِيقُ[(١)].

واتە: ئەم جۆرە داواکارییە کە پێی دەوترێت (تكليف ما لا يطاق) دەبێتە دوو بەشەوە:

**یەکەم:** داواکارییەك کە لە توانای جێبەجێکردندا نەبێت بە هۆکاری نەتوانینەوە، وەکوو داوا لە کەسێکی لە قاچ کەوتوو بکەین لەسەر زەوی هەستێت، یاخود نابینایەك بنووسێت، یاخود کەسێك بفڕێت بە ئاسماندا، ئەم جۆرە داواکارییانەش لە شەرعدا بوونی نییە بە کۆدەنگی هەموو زانایانی ئەهلی سوننەت و داواکردنیشی دروست نییە.

**دووەم:** داواکارییەك کە هۆکاری نەهاتنەدییەکەی نەتوانین نییە، بەڵکوو بوونی سەرقاڵییە بە پێچەوانە و دژەکەیەوە، وەکوو ئەوانەی کە لە عیلمی خواییدا هەبوون کە ئیمان ناهێنن، وەکوو فیرعەون و ئەبو جەهل و ئەبو لەهەب ... ئەمانە بە هۆکاری گرتنەبەر و سەرقاڵبوونیان بە بیروباوەڕەوە نەیانتوانیوە بەرامبەرەکەی وەربگرن کە ئیمانە.

هەروەك کەسێکی دانیشتوو لە یەك کاتدا توانای بەپێوەبوونی نییە، بە هۆکاری سەرقاڵبوونی و لەخۆگرتنی دانیشتنەکەی توانای ئەنجامدانی بەپێوەبوونەکەی نییە لە هەمان کاتدا، ویست و ئیرادە و ئەنجامدانی کارێك بێ توانات دەکات لە ویستی ئەنجامدانی کاری پێچەوانەکەی، بۆیە داواکاری ئیمانیش لە بیروایان بەم شێوەیەیە، ویست و ئیرادەیان لەسەر بیروایی و سەرقاڵبوون و ڕاهاتن پێوەی هۆکار بووە بۆ ئەوەی کە نەتوانن ئیمان وەرگرن، بەتایبەتیش ئیمان کە هەموو ویست و کارەکانی پێچەوانەی ڕاهاتوویی ئەم کەسە بووە.

ئەمە لەعەقڵدا جێگەی دەبێتەوە و دژایەتی ناکرێت، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: هَذَا لَا يَدْخُلُ فِيمَا لَا يُطَاقُ، وَهَذَا هُوَ الْأَشْبَهُ بِمَا فِي الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ وَكَلَامِ السَّلَفِ[(٢)]. ئەمە پێی ناوترێت داواکارییەك کە لە توانای جێبەجێکردندا نەبێت، هەر ئەم مەبەستەیە کە قورئان و

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٠١، ٣٠٢)، و"منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ١٠٤، ١٠٥).

(٢) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ١٠٥).

فەرموودە ئاماژەی پێدەکەن بۆ بێبڕوایی و نەتوانینی ئیمانهێنان و گەڕانەوەیان.

لەبەرئەوە بە کەسێك کە توانای حەجی هەبێت و نەیکات، یاخود توانای دەستنوێژ و نوێژی هەبێت و بە تەممەڵی نەیانکات پێیان ناوترێت داواکارییەکیان لێ کراوە کە لە توانایاندا نەبووە (تكليف ما لا يطاق).

کەواتە هەموو تواناکان و هۆکارەکانی هەیە بەڵام لەبەر سەرقاڵبوون و بەکارهێنانیان لە دژەکەیدا؛ توانای وەرگرتنی ئەم لایەیان نییە، ئەمەش وەڵامە بۆ ئەو پرسیارانەی کە بێبڕوایان و مولحیدان دەیکەن کە دەڵێن: دە با خوا هیدایەتی ئێمەش بدات و ئیماندار بین!

* **تێبینییەك لەسەر قسەی (معتزلة)ەکان کە دەڵێن:** تكليف مالا يطاق قبيح، والله تعالى لا يفعل القبيح[1].

بەڵگەی عەقڵییان لەسەر ئەوەیە کە (تكليف ما لا يطاق) نەشیاوە، خواش شتی نەشیاو ناکات، لەبەرئەوە نابێت بیکات، هەموو پێوەریان بۆ دین بۆ ئەم جۆرە یاسا عەقڵییەیان دەگەڕێتەوە هەر لە ناو و سیفات و ئەحکام و قەدەر ... ئەمەش هەڵەیە وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: ثُمَّ أَخَذُوا يَقِيسُونَ ذَلِكَ عَلَى مَا يَحْسُنُ مِنْ الْعَبْدِ وَيَقْبُحُ فَجَعَلُوا يُوجِبُونَ عَلَى اللهَّ سُبْحَانَهُ مَا يُوجِبُونَ عَلَى الْعَبْدِ وَيُحَرِّمُونَ عَلَيْهِ مِنْ جِنْسِ مَا يُحَرِّمُونَ عَلَى الْعَبْدِ وَيُسَمُّونَ ذَلِكَ الْعَدْلَ وَالْحِكْمَةَ مَعَ قُصُورِ عَقْلِهِمْ عَنْ مَعْرِفَةِ حِكْمَتِهِ[2]. پێوانەیان بۆ ئەو بوارانە پێوانەیە لەسەر بەندەکانی، چی لای ئادەمیزاد باش بێت یاخود خراپ و نەشیاو بێت هەروایشی بڕیار دەدەن بۆ خوا، ئەمە ناو دەبەن بە دادپەروەری و دانایی بەڵام بە پێوەری کورتبینی عەقڵیان، وە گومانیش نییە پێوانە و هاوشێوەی (خالق) ناکرێت بە (مخلوق)، نە لە (توحيد)دا، نە لە (تشريع)یشدا، وە بگرە لە بوون و هەموو شتێکی تریشدا، هەر لەم بابەتەدا (تكليف ما لا يطاق) بۆ ئادەمیزاد نەشیاوە و لە تواناشیدا نییە، بەڵام بۆ خوا لە توانایدا هەیە و دەشتوانێت بیکات، بەڵام بە هۆکاری بەزەیی و دادپەروەری خۆیەوە نایکات، نەك بڕیاری بۆ بدرێت کە نابێت بیکات یا ناتوانێت بیکات ... هەموو ئەم بڕیار و قسانە بۆ (مخلوق)ە نەك بۆ (خالق).

---

(١) "شرح الأصول الخمسة" للقاضي عبد الجبار الهمذاني ص٣٩٦.

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٩١).

پاشان قسەیەكی تریان ئەوەیە كە دەڵێن: كردنی ئەم جۆرە داواكارییە دەبێتە گاڵتە و بێ سوودە ئەگەر بشكرێت (أنَّ تكليفة عبث)، لەبەرئەوەی خوا خۆی دەزانێ كە نایەتەدی.

ئەم قسە و دارشتنەشیان هەڵەیە، بەڵكوو زۆر جار مەبەست بەم جۆرە داواكارییانەی كە "نایەنە دی یاخود نابێت بێنە دی" هێنانەدی كارەكە نییە، بەڵكوو مەبەست تیایاندا پێشینەی كارەكانە لە نییەت و ئامادەیی بۆ ئەو كارە و گرتنەبەری سەرەتای كارەكان تا كەوتنە سەر كارەكە، ئەوەندە مەبەستە لێرەدا، نەك هێنانەدی كارەكە.

وەكوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: النَّوْعُ الثَّالِثُ: أَنْ يَأْمُرَ الشَّارِعُ بِشَيْءٍ لِيَمْتَحِنَ الْعَبْدَ هَلْ يُطِيعُهُ أَمْ يَعْصِيهِ، وَلَا يَكُونُ الْمُرَادُ فِعْلَ الْمَأْمُورِ بِهِ، كَمَا أَمَرَ إبْرَاهِيمَ بِذَبْحِ ابْنِهِ فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ حَصَلَ الْمَقْصُودُ فَفَدَاهُ بِالذَّبْحِ، وَكَذَلِكَ حَدِيثُ أَبْرَصَ وَأَقْرَعَ وَأَعْمَى ... فَالْحِكْمَةُ مَنْشَؤُهَا مِنْ نَفْسِ الْأَمْرِ لَا مِنْ نَفْسِ الْمَأْمُورِ بِهِ، وَهَذَا النَّوْعُ وَالَّذِي قَبْلَهُ لَمْ يَفْهَمْهُ الْمُعْتَزِلَةُ؛ وَزَعَمَتْ أَنَّ الْحُسْنَ وَالْقُبْحَ لَا يَكُونُ إلَّا لِمَا هُوَ مُتَّصِفٌ بِذَلِكَ بِدُونِ أَمْرِ الشَّارِعِ[(١)].

واتە: تاقیكردنەوەی خواییە بۆئەوەی دەركەوێت كە ئایا بەندەكەی جێبەجێی دەكات یاخود نا، نەك مەبەست لە كارەكە بێت، وەكوو تاقیكردنەوەی (إبراهيم) عَلَيْهِ السَّلَامُ بە سەربڕینی كوڕەكەی، كاتێك لەسەر ڕوو ڕایخست و ئامادە بوو بۆ ئەنجامدانی؛ فەرمانەكەی لەسەر هەڵگیرا و لە بریتی شتێكی بۆ نارد كە قابیلی سەربڕین بێت، ئەویش بەرانێك بوو.

وە هەروەها وەكوو تاقیكردنەوەی كابرای بەڵەك و كەچەڵ و نابیناكە، كە نابیناكە لە تاقیكردنەوەكە دەرچوو.

یاخود وەكوو فەرزكردنی پەنجا نوێژ لە سەرەتاوە، ئەگەرچی هەر لە سەرەتاوە ئیرادەی خوا لەسەر پێنج نوێژ بووە، بەڵام كە ڕووداوەكە بەو شێوەیە بووە لەبەر هەندێك هۆكار و حیكمەتی دەرەكی تیایدا، بۆیە هەموو ئەو بەڵگانەی كە (معتزلة)ەكان كردوویانەتە بەڵگە، بەڵێ بۆ قەدەری شەرعی ڕاستە و دروستە كە (تكليف ما لا يطاق)ی تیادا نییە، بەڵام بۆ قەدەری كەونی دەشێت ببێت و مەبەستی جێبەجێكردنیشی نەبێت.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٤٣٦).

- **تێبینییەکیش لەسەر بەڵگەی ئەشعەری و جەبەرییەکان لەسەر بوونی (تکلیف ما لا یطاق) بۆ خوا کە هەیە و دەتوانێت بیکات:**

❁ **ئایەتی یەکەم کە دەیکەنە بەڵگە:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ﴾ [البَقَرَة: ٢٨٦].

ئەشعەرییەکان دەڵێن مەبەست بەم ئایەتە ئەوەیە کە دەشێت خوا داواکارییەك بکات لە توانای جێبەجێکردندا نەبێت، هەر لەبەرئەوەیە لەم ئایەتەدا بە شێوەی دوعا داوا لە خوا کراوە کە نەیکات، کەواتە دیارە ئەو داواکارییە بوونی هەیە.

ئەوەش تەفسیرێکی هەڵەیە بۆ ئایەتەکە، بەڵکوو مەبەست پێی وەکوو (ابن كثير) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: لَا تُكَلِّفْنَا مِنَ الْأَعْمَالِ الشَّاقَّةِ وَإِنْ أَطَقْنَاهَا، كَمَا شَرَعْتَهُ لِلْأُمَمِ الْمَاضِيَةِ قَبْلَنَا مِنَ الْأَغْلَالِ وَالْآصَارِ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ[1].

واتە: بە شێوەی دوعا خوا دایناوە داوابکرێت کە خوای گەورە کاری بارقورسیمان بەسەردا نەدات وەکوو گەلانی پێش ئێمە، ئەگەرچی لە تواناماندا هەیە جێبەجێکردنیشی.

هەروەك کەسێك بە کەسێك کە ڕقی لێیەتی دەڵێت: توانای بینینی تۆم نییە، ئەگەرچی بە واقیعیش دەتوانێت بیبینێت، کەواتە مەبەست پێی داواکارییەکی قورسە نەك قابیلی جێبەجێکردن نەبێت کە پێی دەوترێت (تکلیف ما لا یطاق).

❁ **ئایەتی دووەم کە دەیکەنە بەڵگە:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَـٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٣١﴾﴾ [البَقَرَة: ٣١].

**ئەشعەرییەکان دەڵێن:** مەلائیکەکان ناو و دروستی ئەو کارانەیان نەدەزانی کە خوا داوای لێکردوون هەواڵی پێبدەن، کەواتە ئەمە بەڵگەیە لەسەر فەرمانێك لە توانای جێبەجێکردندا نەبێت (تکلیف ما لا یطاق).

تەفسیریان بۆ ئەم ئایەتەش هەڵەیە وەکوو (الشوكاني) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: هَذَا مِنْهُ تَعَالَى لِقَصْدِ

---

(١) "تفسير ابن كثير" (١/ ٧٣٨).

التَّبْكِيتِ لَهُمْ مَعَ عِلْمِهِ بِأَنَّهُمْ يَعْجِزُونَ عَنْ ذَلِكَ[(١)].

واتە: ئەمە جۆرێکە لە شێوازی سەرزەنشتیکردن و ڕەتدانەوەیان، نەك داواکارییەك کە لە توانای جێبەجێکردندا نەبێت، لەبەرئەوەی لە سەرەتاوە وەك ڕەخنە دەیانوت: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٠]. واتە ئەوە کەسانێك لەسەر زەویدا نیشتەجێ دەکەیت کە خراپە و خوێنڕشتن ئەنجامدەدەن؟ لەگەڵ ئەوەشدا هەموو سەرزەوی پێکنەهاتوون لەوانە، بەڵکوو پێغەمبەران و ساڵحان و خواناسان و ئیماندارانی زۆریشی تێدایە.

پاشان ئەمە فەرمان و داواکارییەك نییە لە مەلائیکەکان کە پاداشت و سزای لەسەربێت، بەتایبەت ئەوان کە (مسَیَّر)ن نەك (مخَیَّر).

۞ **بەڵگەی سێیەمان:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٣١]، ﴿لَقَدۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَىٰٓ أَكۡثَرِهِمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٧﴾ [يسٓ : ٧]. هەموو ئەو بەڵگانەی کە بۆ بێبڕوایان و فیرعەون و ئەبو لەهەب و ئەبو جەهلە ئەوان دەیکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە داوای ئیمانیان لێکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا خوا عیلمی هەبووە بەسەریاندا کە ئیمان ناهێنن، ئایا ئەمە داواکارییەك نییە کە بۆیان جێبەجێ نەکرێت؟

لە وەڵامدا مەبەست لەم بەڵگانە ئەوە نییە کە نەتوانن ئیمان بێنن، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە کە سەرقاڵبوون بە کار و کردەوەی بێبڕواییەوە و دەقیان پێوە گرتووە و ئەمە بووەتە هۆکار و ڕێگر بۆ وەرنەگرتنی ڕێگە ڕاستەکە، وە سروشتی خێر و شەڕیش وایە کە لایەکیان بگرێت لایەکەی تری بۆ وەرناگیرێت، نەك نەتوانێت، بەڵکوو توانا وجوودی هەر هەیە.

۞ **بەڵگەی چوارەمیان:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡ﴾ [البَقَرَةِ: ١٢٩].

ئەم ئایەتەش ئەشعەرییەکان دەیکەنە بەڵگە لەسەر (تكليف ما لا يطاق) بەوەی کە هیچ پیاوێك ناتوانێت دادپەروەری دروستکات لە نێوان خێزانەکانیدا.

(١) "فتح القدير" للشوكاني (١/ ٧٧).

بۆ وەڵامی ئەمەش وەکوو (الطبري) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: لَنْ تُطِيقُوا أَيُّهَا الرِّجَالُ أَنْ تُسَوُّوا بَيْنَ نِسَائِكُمْ وَأَزْوَاجِكُمْ فِي حُبِّهِنَّ بِقُلُوبِكُمْ حَتَّى تَعْدِلُوا بَيْنَهُنَّ فِي ذَلِكَ[1].

واتە: مەبەست لە ئایەتەکە بۆ کەسێك کە زیاد لە یەك هاوسەری هەبێت "نەبوونی توانای یەکسانی خۆشەویستی دڵییە بۆ یەکێکیان جیا لەویتریان"، واتە ناتوانن وەکوو یەك خۆشتان بوێن، نەك نەتوانینی یەکسانی و دادپەروەری مامەڵە و بژێوی ژیان و پێویستییە دونیاییەکان، بەڵکوو ئەمە لە توانادا هەیە، بەڵام یەکسانییە دڵییەکە لە توانادا نییە.

کەواتە بە دڵنیاییەوە خوای پەروەردگار داواکارییەکی نییە بۆ بەندەکانی کە توانای جێبەجێکردنی نەبێت، لەگەڵ ئەو هەموو پاداشت و بوونی پاساو و خوێندنەوەیەدا بۆ کارەکان، وەکوو دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ﴾ [البَقَرَة : ١٨٥]، ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ [البَقَرَة : ٢٨٦]، ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ [الحَجّ : ٧٨]. وە پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ اللهَ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ، وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ»[2]. وە دەفەرموێت: «إِنَّ اللهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ، كَمَا يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى عَزَائِمُهُ، أَوْ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ تُؤْتَى مَعْصِيَتُهُ»[3]. وە دەفەرموێت: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّغِيرِ حَتَّى يَكْبَرَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ، أَوْ يُفِيقَ»، قَالَ أَبُو بَكْرٍ فِي حَدِيثِهِ: «وَعَنِ الْمُبْتَلَى حَتَّى يَبْرَأَ»[4].

هەموو ئەم بەڵگانە خوێندنەوەی نەتوانین و پاساو و عوزرەکانە بۆ نەتوانینی هێنانەدی فەرمانەکان و تاوانبار نەبوونیان، کە لە شەرعی خوادا هەموو ئەمانە ڕەچاو کراون و کێشانە بۆ تواناکانی ئادەمیزادی تیادا کراوە، کەواتە بە هیچ شێوەیەك (تكليف ما لا يطاق) لە قەدەری کەونی و شەرعیدا بەو شێوە ڕەهاییە بوونی نییە، وە بگرە بەکارهێنانی ئەو سەردێڕەش بە ڕەهایی بەکارهێنانێکی بیدعەکارییانەیە و کاری فیرقە گومڕاکانە و دەرگای قسە و سەرقاڵبوونێکی نەزۆك دەکاتەوە لە دیندا.

---

(١) "تفسير الطبري" (٧/ ٥٦٦).

(٢) رواه ابن ماجه (٢٠٤٣)، وسبق تخريجه ص١٨٩.

(٣) رواه ابن خزيمة في "صحيحه" (٢٠٢٧)، وسبق تخريجه ص٢٢٨.

(٤) رواه أبو داود (٤٣٩٨)، وسبق تخريجه ص١٨٩.

لە كۆتایی ئەم بابەتەشدا دەركەوت كە ئادەمیزاد خاوەنی هەموو جۆرە توانایەكی پێشوەختەی كارەكانە، وە بە بەكارهێنانی ئەو توانایانە بۆ خێر هەموو دەرگایەكی خوایی بۆ دەكرێتەوە بۆ ئەنجامدان و هێنانەدی هەموو ئەو ڕێگایانەی كە ئادەمیزاد بە بژاردەی خۆی بەكاری دەهێنێت، وە بە بەكارهێنانی بۆ ڕێگەی شەڕ ئەو یارمەتییە خواییانەی لەسەر دادەخرێن و دەچێتە سەر سروشتی ئەو ڕێگا شەڕانەی كە خۆی بژاردەی كردووە، وە نەفس و شەیتان و چواردەور و هۆكارەكانی تر زاڵ دەبێت بەسەریدا و ڕێگاكانی تری شەڕی لەسەر دەكرێتەوە تاوەكوو دووردەكەوێتەوە و نوقم دەبێت تیایاندا، تەنینی ئەم ڕێگایەش بەو شێوازە؛ دادوەری خواییە لە سزادانی و هاتنەبەری ئەو ڕێگایانەی كە بە ویست و ئیرادەی خۆی بژاردەی كردووە، وە خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ﴾ [الرعد : ١١]. واتە خوای گەورە كەسانێك ناگۆڕێت تا خۆیان خۆیان نەگۆڕن، وە دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ [البقرة : ٢٦٤]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ [المائدة : ٥١]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ [المنافقون : ٦]. خوای پەروەردگار ستەم لە كەس ناكات و هیدایەتی بێبڕوایان و ستەمكاران و تاوانباران نادات تا خۆیان نەگەڕێنەوە.

  

# بــابەتــی شــەشــەم

## ڕێــنــمــوونــی و گــومــڕاییکــردن

## (الهداية والضلال)

خوای پەروەردگار ئادەمیزادی بە دەروون پاکی (فطرة) هێناوەتە بوون، بەبێ زانینی هیچ کارێکی شەڕ و کردنی تاوانێك، لەگەڵ پێدانی ژیری بۆ یەکلاکردنەوە و ناسین و هێنانەدی پێویستییەکانی ژیانی، ئەم دەروون پاکی و ژیری پێبەخشینە لەگەڵ بوونی ئیرادە و ویستی خۆی هۆکاری بەڕێوەبردنی ژیانیەتی، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ۝٣﴾ [الأعلى : ٣]. خوا ئادەمیزادی وا نەخشاندووە کە هەموو پێویستییەکانی دێنێتە دی و زەرەرۆمەندییەکانی لێ دەرەوێنێتەوە، وە دەفەرمویێت: ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ﴾ [الروم : ٣٠]. واتە خوای پەروەردگار ئادەمیزادی بە ناخ پاکی دروستکردووە و هێناویەتییە دی.

(ابن عاشور) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: الْفِطْرَةَ هِيَ النِّظَامُ الَّذِي أَوْجَدَهُ اللهُ فِي كُلِّ مَخْلُوقٍ، ... وَتَصْرِيحٌ بِأَنَّ اللهَ خَلَقَ النَّاسَ سَالِمَةٌ عُقُولُهُمْ مِمَّا يُنَافِي الْفِطْرَةَ مِنَ الْأَدْيَانِ الْبَاطِلَةِ وَالْعَادَاتِ الذَّمِيمَةِ، وَأَنَّ مَا يَدْخُلُ عَلَيْهِمْ مِنَ الضَّلَالَاتِ[1].

واتە: (فطرة) ئەو یاساو ناخ پاکییە خواییەیە کە بوونەوەرەکانی لەسەر دروستکردووە و ڕاهێناوە، بە پێدانی ژیرییەکی تەواو و ناخێکی پاك، کە دەبێتە هۆکاری وەرنەگرتنی هیچ شتێك لە ئایینە بەتاڵ و کار و هەڵسوکەوتە خراپەکان و گومڕاییەکان.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: «مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلَّا يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ البَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ»، ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا﴾ [الروم : ٣٠] الآيَةَ»[2].

---

(١) "التحرير والتنوير" لابن عاشور (٢١/ ٩٠ – ٩٢).

(٢) رواه البخاري (١٣٥٨)، ومسلم (٢٦٥٨)، وابن حبان في "صحيحه" (١٢٨)، وأحمد في "المسند" (٧٧١٢)، والبزار في =

واته: خوای پەروەردگار هەموو منداڵێکی لەسەر دەروون و ناخ پاکی دروستکردووە، (کاریگەرییەکانی چواردەوری دەیگۆڕێت)، باوك و دایکیان دەیانکەن بە جوولەکە و گاوور و ئاگرپەرست، پاشان (ئەبو هورەیرە) ﷺ ئەو ئایەتەی کردە بەڵگە لەسەری: ﴿فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَا﴾.

وە لە فەرموودەیەکی قودسیدا خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: «...وَإِنِّي خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمُ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ ...»(١).

واته: من بەندەکانم بە پاکی دروستکردووە، بەڵام شەیتانەکانی جن و ئادەمی بردوونی بە لاڕێداو لە دینەکەیان لایانداوە.

لە ڕاستیشدا بەو شێوەیە دەبینین کە لەدایکبوون و هاتنەدی ئادەمیزاد و سەردەمی منداڵی هیچ کار و کردەوە و بۆچوون و بەرنامەیەکی تاوان و هەڵە و خراپەکاری پێ نییە و هەر بەو پاکییە ماوەتەوە، پاشان چواردەور و کاریگەری گەورەکانی لەسەر دەبێت و لاساییان دەکاتەوە، خۆ ئەگەر چواردەوری لەسەر پاکییەکە مابوونەوە و کامڵتر بوون؛ ئەوا ئەمیش زۆر بە ئاسانی وەریدەگرێت و کامڵتر دەبێت، هیچ پێچەوانەییەکی ناخی و دژایەتی عەقڵی ناچەشێت لەسەری، بە دەروونی پاك و دەموچاوی ڕوونترەوە دەبینرێت، بەڵام گەر چواردەوری بە پێچەوانەی (فطرة)ەکەیەوە بوو؛ ئەوا دەبێت باجی گەورەکان و چواردەوری بدات، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿وَلَا يَلِدُوٓاْ إِلَّا فَاجِرٗا كَفَّارٗا ٢٧﴾ [نوح: ٢٧]. گەلی (نوح) هیچ نەوەیەکیان نابێت بێجگە لە نەوەیەکی تاوانبار یاخود بێبڕوا نەبێت.

ئەمە بە شێوەیەکی گشتی، وە دەشێت بە هەندێ هۆکار بە پێچەوانەوە بێت، خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَمُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتِ مِنَ ٱلۡحَيِّ﴾ [الأنعام: ٩٥]. بۆیە دەشێت لە پاك پیس دروستبێت و لە پیسیش پاك دروستبێت، لەگەڵ ئەم هێنانەدییە بە دەروونی پاکەوە و

= "المسند" (٤٥١٥)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٣٩٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٩٩٤).

(١) رواه مسلم (٢٨٦٥)، والنسائي في "الكبرى" (٨٠١٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٥٣)، وأحمد في "المسند" (١٧٤٨٤)، والطبراني في "الكبير" (٩٨٧)، والطيالسي في "مسنده" (١١٧٥)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٣٨٧٥)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٥٨٦).

پێدانی عەقڵ و ژیری؛ خوای پەروەردگار کردوویەتی بە خاوەنی ئیرادە و ویستی تایبەتی خۆی، کە هیچ توانا و زۆرەملێییەك لە کردارەکانیدا بەدی ناکرێت، وەکوو دەفەرموێت: ﴿فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ [الكهف: ٢٩]، ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ ۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿١٩﴾﴾ [المزمل: ١٩]، ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾﴾ [النبأ: ٣٩]، ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ [البقرة: ٢٨٦]، ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ﴾ [التغابن: ١٦]، ﴿لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ﴾ [البقرة: ٢٥٦].

بە شێوەیەکی گشتی تێگەیشتنی ئەم دەقانە ئەوە دەگەیەنێت کە ئادەمیزاد کراوەتە خاوەنی ئیرادە و ویستی تایبەتی خۆی، بەزۆرپێکردنی نییە لەلایەن خواوە و بەرپرسیارە لە بژاردەی کردەوەکانیشی.

وە لەسەروو ئەمانەشەوە خۆشەویستی بۆ کاری خێر و چاکە و سوودمەندییەکانی ئادەمیزاد و هێنانەدی حەقەکان و ماف و سەروەرییەکان ... ڕاهێنان و یارمەتییەکی خوایی هەیە لە پشتیانەوە بۆ ئادەمیزاد لەسەری و بگرە عورف و بوونە عادەتێکی ژیانی سەر زەوییە لە نێوان ئادەمیزاددا، وە پێچەوانەکەی نەکردووە بە عورف کە ئەویش شەڕ و خراپە و ستەم و بێبڕوایی و زەوتکردنی مافەکانە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ [الحج: ٤١]، ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ [آل عمران: ١٠٤]. فەرمانکردنی بە ڕێگەی خێر و چاکە بە (معروف) ناوی بردووە، واتە دیار و ناسراوی نێو ئادەمیزاد، وە خراپەشی بە (منکر) پێچەوانە و دژایەتی نێو ئادەمیزاد ناوبردووە.

**بۆیە پێناسەی (معروف ومنکر):**

- ﴿وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾: وهو ما عرف بالعقل والشرع حسنه.

- ﴿وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ وهو ما عرف بالشرع والعقل قبحه[١].

واتە: ئەوەی کە بە عەقڵ دەزانرێت چاکە و شەرعیش بە چاکی دەزانێت، وە ئەوەی کە بە عەقڵ دەزانرێت خراپە و شەرعیش بە خراپەی دەزانێت.

(١) "تفسير السعدي" ص١٤٢.

وە هەر بە ڕوونتر لە ئایەتێکی تردا ئەو ناسراویەی ڕێگە چاکەکە بە (العرف) ناودەبات و دەفەرمویێت: ﴿خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ﴾ [الأعراف: ١٩٩]. واتە لێبوردەیی وەرگرە و فەرمان بە عورف (العرف) بدە، واتە ئەو ڕاهاتن و عادەتەی لەنێو ئادەمیزاددا هەیە لەسەر ڕێگەی چاك و خێر و سوودمەندییەکان، ئایەتەکە وشەی (العرف)ی بەکارهێناوە، واتە عورفی نێوان ئادەمیزاد، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمویێت: «الْخَيْرُ عَادَةٌ، وَالشَّرُّ لَجَاجَةٌ»(١).

واتە: خێر و چاکە عادەتی نێو ئادەمیزادە و شەڕیش چوونە ناویەتی و دروستکردنیەتی لە خۆتدا.

لەبەرئەوە دەبینین دروستکردنی هەموو دەوڵەت و یاسا و ڕێسای ژیان لەلایەن ئادەمیزادەوە لەسەر بنەماکانی خێر و چاکە و ڕاست و دروستەکانە لەسەر زەوی، ئەگەرچی ئاشنا نەبن بە دین و خاوەن هیچ دینێکیش نەبن، ئەمە ڕاستی پێویستییەکانی ژیان و ناخی ڕاهاتووی ئادەمیزادە لەسەری.

کەواتە ئەگەر ئادەمیزاد دروستکرابێت بە (فطرة)ی پاك و پێدانی عەقڵ و ژیری و خاوەنداریێتی ئیرادە و ویستی سەربەخۆی خۆی و ژیانیشی وا چنرابێت کە ڕاهاتبێت لەسەر خێر و چاکە و ڕاستییەکان ... ئەوا باوەڕبوون بە خوا و پەرستنی و شوێنکەوتەی بەرنامەکەی ڕێگە و هۆکارێکە بۆ کامڵبوون و تۆخبوونەوەی (فطرة)ەکەی لەسەر ڕێگە و کارە خێرەکان.

(حکیم بن حزام) ﷺ بە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ أُمُورًا كُنْتُ أَتَحَنَّثُ أَوْ أَتَحَنَّتُ بِهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ مِنْ صِلَةٍ وَعَتَاقَةٍ وَصَدَقَةٍ، هَلْ لِي فِيهَا أَجْرٌ؟ قَالَ حَكِيمٌ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «أَسْلَمْتَ عَلَى مَا سَلَفَ لَكَ مِنْ خَيْرٍ»(٢).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چەند کار و کردەوەیەکم دەق پێوە گرتبوو لەپێش ئیسلامدا لە هاتووچۆکردنی کەس و کار و بەندە ئازادکردن و خێر و خێرات، ئایا پاداشتی تێدایە بۆم،

(١) رواه ابن ماجه (٢٢١)، وابن حبان في "صحيحه" (٣١٠)، والطبراني في "الكبير" (٩٠٤)، والبيهقي في "الشعب" (٨٢٩٤)، وأبو نعيم في "الحلية" (٥/ ٢٥٢)، وحسنه الألباني في "الصحيحة" (٦٥١)، و "صحيح الجامع الصغير" (٣٣٤٨).

(٢) رواه البخاري (٢٢٢٠)، ومسلم (١٢٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٢٩)، وأحمد في "المسند" (١٥٣١٨)، والطبراني في "الكبير" (٣٠٨٦)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٤٣٦٤)، والبغوي في "شرح السنة" (٢٧).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: موسوڵمان بوویت لەسەر کردەوە چاکەکانی پێشووت.

واتە هۆکاری موسوڵمانبوونت پێشینەی ئەو کارە چاکانەت بووە، ئەو کار و کردەوە خێر و چاکەیە گەیاندوویەتییە خێر و چاکە گەورەکە کە دینی ئیسلامە، چاکەش چاکە ڕادەکێشێت، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ٦٠﴾ [الرحمن : ٦٠].

مەبەست لەو هەموو کارئاسانی و پێبەخشینی هۆکارانە بۆ ئادەمیزاد، لە ڕۆشنکردنەوەی ڕێگە و والاکردنی ڕێگەی چاك و خراپە بۆی، بۆ ئەوەیە کە بەڵگەکاری لەسەر بکرێت و هیچ پاساو و نەزانینێکی بۆ نەمێنێتەوە لەسەر پەیامەکەی و ناردنی پێغەمبەران ﷺ، وەکوو دەفەرموێت: ﴿رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِ﴾ [النساء : ١٦٥]. واتە پێغەمبەرانمان ناردووە بە موژدەدەر و ئاگادارکەرەوە لەسەر ئادەمیزاد، تاوەکوو خەڵکی هیچ پاساوێکیان بۆ نەمێنێتەوە لای پەروەردگاریان.

ئەم بەرچاوڕۆشنییە لەسەر ڕێگەی خێر و چاکە بە عەقڵ و ژیری و (فطرة)ی پاك و ژیانی ڕۆژانە؛ بە شێوەیەکی گشتی دەرکی پێدەکرێت، وە گەر خاوەنەکەی ڕووبکاتە دینیش ئەوا زانستی تەواوی پێدەبەخشرێت، بۆیە هیچ پاساو و خۆ بێئاگاییکردنێك بۆ ئادەمیزاد نەماوەتەوە لەگەڵ هەبوونی توانای تەواو بۆ ئەنجامدانیان، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ ١٠﴾ [البلد : ١٠]. أي: طريقي الخير والشر، بينا له الهدى من الضلال، والرشد من الغي[1]. واتە ڕێنموونی ڕێگەی خێر و شەڕمان کردووە و هیدایەت و گومڕاییمان بۆ یەکلا کردووەتەوە.

وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا هَدَيۡنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرٗا وَإِمَّا كَفُورًا ٣﴾ [الإنسان : ٣]. واتە ئێمە ڕێنموونی تەواومان بەخشیوە بە ئادەمیزاد، لەپاش ئەمە یا بڕوادارە یاخود بێبڕوا.

وە دەفەرموێت: ﴿فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ٨﴾ [الشمس : ٨]. والإلهام: هو التعريف والإفهام للشيء، أو التمكين من فعله أو تركه[2]. واتە پێناسە و تێگەیشتن و توانامان بەخشیوە بە ئادەمیزاد لەسەر کردەوەی چاك و خراپ.

---

(١) "تفسير السعدي" ص٩٢٤.

(٢) "تفسير الوسيط" للطنطاوي (١٥/ ٤١٢).

وە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ۝٣﴾ [الأعلى : ٣]. ڕێنموونی بەخشیوە بە بوونەوەرەکان بۆ هێنانەدی سوودمەندییەکانیان و خۆپاراستن لە زیانبەخشییەکانیان.

ئەم زانستە بەبێ هیچ هۆکارێکی فێربوون ئادەمیزاد خاوەنیەتی، بۆیە منداڵ هەر لە سەرەتای بوونیەوە دەست بۆ دەمی دەبات و هاوار دەکات بۆ حەز و سوودەکانی.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ۝٥٠﴾ [طه : ٥٠]. قَالَ الْحَسَنُ وَقَتَادَةُ: أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ صَلَاحَهُ، وَهُدَاهُ لِمَا يُصْلِحُهُ[1]. واتە خوای ئێمە هەموو پێویستییەك و مافێکی داوە بە دروستکراوەکانی و ڕێنموونی کردوون.

**لە ئەنجامدا دەڵێین:** ئەگەر خوای پەروەردگار (فطرة)ی پاك و عەقڵ و ژیری تەواو و توانا و ئیرادە و ڕێنموونی بۆ چاکە و خراپەی بەخشییێت بە ئادەمیزاد، وە بە واقعحالێش چاکە و خێرەکان سوودمەندی ژیانی خۆی و چواردەوری تێدابێت و کامڵتر بێت پێی؛ ئەوا کاتێك ئەچێتە سەر ڕێگەی خێر و چاکە و خواناسی، بێگومان بژاردەی ئەو ڕێگە سروشتییەی کردووە کە لەگەڵ (فطرة) و ژیان و بوونی خۆیدا گونجاوە، بۆیە خوای پەروەردگاریش پشتیوان و یارمەتیدەر و سەرپەرشتیکاری دەبێت.

وە گەر پێچەوانەکەشی بێت ئەوا دژایەتی (فطرة) و عەقڵ و واقعی ژیانی کردووە، بەدەر لەوەی کە پێچەوانە و نامۆی ژیانی چواردەوریەتی، وە جۆرێك لە ئەرك و زەحمەت و ماندووبوونی دەروونی و عەقڵی و سروشتی ژیانی خۆی هەست پێدەکات لەکاتی ئەنجامدانی کارەکانی سەر بەم ڕێگایە، بۆیە دەبینین خوای پەروەردگار لەم ئایەتەدا ئاماژەیەك بۆ ئەو واقعە دەکات و دەفەرموێت: ﴿لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡ﴾ [البقرة : ٢٨٦]. [لَهَا مَا كَسَبَتْ] أَيْ: مِنْ خَيْرٍ، [وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ] أَيْ: مِنْ شَرٍّ[2]، والإنسان يفعل الخير بطبعه وتكون فيه لذته. ولا يحتاج إلى تكلف في فعل الخير، لأنه يعلم أن كل أحد يرتاح إليه ويراه بعين الرضا وأما الشر فإنه يعرض للنفس بأسباب ليست من طبيعتها ولا من مقتضى فطرتها ومهما كان الإنسان شريرا فإنه لا يخفى عليه

(١) "تفسير البغوي" (٥/ ٢٧٦).
(٢) "تفسير ابن كثير" (١/ ٧٣٧).

أن الشر ممقوت عند الناس وصاحبه مهين عندهم[(١)]، وقال (الزمخشري): فإن قلت: لم خص الخير بالكسب، والشر بالاكتساب؟ قلت: في الاكتساب اعتمال، ... ولما لم تكن كذلك في باب الخير وصفت بما لا دلالة فيه على الاعتمال[(٢)]. **واتە ئادەمیزاد کارە خێرەکانی بۆ خۆیەتی و کارە شەڕەکانی لەسەریەتی و دەبێت باجی بدات، لەم ئایەتەدا بۆ کاری شەڕ ئاماژەی بە وشەی (اكتسبت) کردووە، بەڵام بۆ خێرەکە بە وشەی (كسبت)، ئەمە ئاماژەیە بۆئەوەی خێرکردن و کاری چاکە ئاسانکاری هەیە لە هێنانەبوونیدا، بۆیە لەڕووی زمانەوانیشەوە بە وشەیەکی چوار پیتی (كسبت) دایڕشتووە، بەڵام شەڕ و کاری خراپە لەبەرئەوەی دژایەتی ناخ و عورف و شەرعی خوا دەکات؛ هەست بە بوونی جۆرێك لە زۆرەملێکردن دەکات لەگەڵ خودی خۆی و چواردەوریدا، بۆیە لەڕووی زمانەوانیشەوە بە وشەیەکی شەش پیتی (اكتسبت) دایڕشتووە، وەکوو بڵێیت کاری خێر ئەنجام دەدات بەو شێوە ئاسان و ئاساییەی کە ڕاهاتووە لەسەری و نامۆ نییە، وە کاری شەڕیش دروستدەکات و دەیهێنێتە دی لەبەرئەوەی جۆرێك لە زۆرەملێکردن و نامۆیەتی دەچێژێت تیایدا.**

**لە کۆتایی ئەم پێشەکیەدا دەمانەوێت بچینە ناو ووردەکاری ئەم دوو ڕێگایەوە تاوەکوو بزانین تا چ ڕادەیەك ئادەمیزاد دەتوانێت هیدایەتی خوایی وەربگرێت و لە ڕێگە گومڕاییەکان بەدووربێت، وە چەندەش خاوەنی بژاردە و کرداری خۆیەتی.**

## پلەکانی ڕێنموونی

### مراتب الهداية

**بابەتی هیدایەت و گومڕایی ناوەڕۆکی باسەکانی قەدەرە، لەبەرئەوە گەورەترین نیعمەتی خوایی بەسەر بەندەکانیەوە هیدایەتی هاتنەناو دینەکەیەتی، وە گەورەترین بەڵا و زەرەرۆمەندی گومڕاییە لە دینەکەیدا.**

**بۆ زیاتر شارەزابوون بەسەر بابەتی هیدایەت و مەبەست و جۆری بەکارهێنانەکانی لە قورئان و سونەتدا، پێویستە وردەکارییەکانی هیدایەت بخەینە ڕوو، بۆیە هیدایەت و ڕێنموونی خوایی بۆ بەندەکانی لە قورئان و سوننەتدا بە شیکردنەوەی زانایانی ئەهلی سوننەت لە چوار پلە**

---

(١) "تفسير الوسيط" للطنطاوي (١/ ٦٦٠).

(٢) "الكشاف" للزمخشري (١/ ٣٣٢).

پێکهاتووە[(١)]:

## پلەی یەکەم: ڕێنموونی و هیدایەتی گشتی (الهداية العامة).

ئەو ڕێنموونی و ڕاهێنانەیە بۆ هەموو بوونەوەرێك کە چۆن بژێت و پێویستییەکانی دەستەبەر بکات و هەوڵ بۆ مانەوەی خۆی بدات، لەگەڵ هۆکارەکانی خۆپاراستن لە زەرەرۆمەندییەکانی و بەرەنگاربوونەوەیان، ئەوە لە تەواوی دروستکردنی خواییە بۆ دروستکراوەکانی، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾﴾ [الأعلى: ٣]. ئەو پەروەردگارەیە کە (مخلوقات)ی وا دروستکردووە کە بەردەوام لە هەوڵدابن بۆ هێنانەدی پێویستییەکانی و بەدواداچوون بۆی و ڕزگاربوونی زیانەکانی و دوورکەوتنەوەی لێی، ئەم غەریزانەی کە تیایدا چاندووە بۆ هەموو گیانلەبەر و بوونێکە لە ئادەمیزاد و بوونەوەرەکانی تریش بۆ هێنانەدی و مانەوەیان لە ژیاندا، ئەمە داهێنانی ئەو خوایەیە کە خاوەن توانا و زانستە، وەکوو خۆی دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٩٦﴾﴾ [الأنعام: ٩٦].

ئەم جۆرە دروستکردن و ڕێنموونییە هەموو بوونەوەرەکان بەشدارن تیایدا و ڕێنموونی یارمەتیدانێکی گشتییە و بەڵگەیە لەسەر خوایەتی و پەروەردگاری و خاوەنیەتی خوا بۆ دروستکراوەکانی، وە ئەم ڕێنموونییە بەردەوام لە قورئاندا لەگەڵ وشەی (رَب)دا هاتووە، واتە پەروەردگار و سەرپەرشتیکار، وەك دەفەرموێت: ﴿رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾﴾ [طه: ٥٠]. ئەو پەروەردگارەمان کە هەموو بوونێکی بێ ناتەواوی دروستکردووە و پاشان هەموو ڕێنموونییەکی پێویستی پێبەخشیوە.

وە دەفەرموێت: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ﴿١﴾ ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾﴾ [الأعلى: ١ - ٣]. لەپاش پەروەردگاری (ربك) باسی (قدَّرَ فَهَدَى)ی کردووە کە مەبەست پێی ڕاهێنان و ڕێنموونیکردنە، یاخود دەفەرموێت: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾﴾ [العلق: ١]. لەپاش وشەی (رَب) کە (الربوبية)ە ئەوکات دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ﴿٥﴾﴾ [العلق: ٤، ٥].

---

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص١٧٩، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٨/ ١٧١)، و "شرح أصول اعتقاد" للالكائي (٣١)، و"شرح العقيدة الطحاوية" لصالح آل الشيخ (١/ ٢٨٩).

واتە ئادەمیزادم فێری خوێندنەوە و زانست کردووە، بەردەوام لەپاش وشەی دروستکردن (رب وخلق) باسی ڕێنموونی و هیدایەتی کردووە، هەر ئەم وشانەشە دەبنە بەڵگە لەسەر پایەکانی قەدەر کە بریتین لە (العلم والكتابة والخلق والمشيئة)، وشەی (الذي علم) بۆ (العلم)ە، وە وشەی (قدر فهدى) بۆ (الكتابة)یە، وە وشەی (الذي خلق) بۆ (الخلق)ە، وە وشەی (ما يشاء) بۆ (المشيئة)یە وەکوو دەفەرمویت: ﴿كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴿٤٠﴾﴾ [آل عمران : ٤٠]. ئەمە هەموو پایەکانی قەدەرە کە لەو ڕووەوە دەتوانین لە قەدەری خوا بۆ دروستکراوەکانی تێبگەین کە خوا زانستی بەسەریاندا هەیە و دایڕشتوون و دروستیکردوون و هەمووی لەژێر ویست و ئیرادەی ئەودان.

وە لەلایەکی تریشەوە ئەم جۆرە هیدایەتە گشتییە پەیوەندی بە (توحید الربوبیة)ەوە هەیە و سەلماندنی خوایەتی خۆیەتی بۆ دروستکراوەکانی، وەکوو (ابن تیمیة) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: وفي إثبات الربوبية بهذه الطريقة فوائد عظيمة، منها: أن ذلك تعريف للإنسان بحال نفسه ونوعه وجنسه، ... ومنها: أن ذلك يبين فقره وحاجته، وأنه مربوب مقهور مدبَر، ومنها: أن ذلك يثبت القدر، وأنه خالق الحيوان وأفعالهم[(١)].

واتە: بۆ سەلماندنی (توحید الربوبیة) بەم شێوە ڕێگایە کە خوایەتی و دروستکردن و بەڕێوەبردنی پەروەردگارە، ئەم سوودانەی هەیە: لەوانە باس و پێناسەکردنی ئادەمیزادە بە خۆی و هاوشێوە و جۆری دروستکراوەکانی تر کە (مخلوق)ی خوان و هەر ئەو پەروەردگاریانە. وە یەکێکی تر لە تێگەیشتنەکانی (توحید الربوبیة): دەربڕینی پێویستی و هەژارییە لەلایەن ئادەمیزادەوە کە بوونێکی دروستکراو و بێدەسەڵاتە و بەردەوام پێویستی بە خوا هەیە، وە یەکێکی تر لە تێگەیشتنەکان: باوەڕبوونە بە قەزا و قەدەری خوا بەسەر بەندەکانی و دروستکراوەکانیەوە، کە دروستکار و هێنەرەدی گیانلەبەران و کردەوەکانیانە.

ئادەمیزاد لەم هیدایەت و ڕێنموونییەدا (فطرة)ی پاك و عەقڵ ژیری و ئیرادە و ویستی پێبەخشراوە و هەموو ئامادەکارییەکی بۆ کراوە و هەموو پێویستییەکی بۆ جێبەجێکردنی کارەکانی پێبەخشراوە.

ئەم جۆرەی یەکەمی هیدایەت گشتییە بۆ هەموو بوونەوەرەکان و هەموو جۆرەکانی

(١) "جامع المسائل" لابن تيمية (٦/ ٧٩).

ئادەمیزاد، وە پەیوەندی بە سەلماندنی خوایەتی خواوە هەیە بۆ (مخلوقات)ی.

پلەی دووەم: هیدایەت و ڕێنموونی بانگەوازیكردن و ڕوونكردنەوە بۆ بەندەكانی (هداية الإرشاد والدعوة والبيان).

ئەم ڕێنموونی و هیدایەتە تایبەتترە لەوەی پێشوو، ئەم جۆرەیان تایبەتە بە ئادەمیزادەوە، مەبەست تێیدا بانگەوازیكردنیان و ڕێنموونییانە بۆ ڕێگەی حەق و بانگخوازی، ئەمە بەڵگەی خواییە بەسەر بەندەكانیەوە و هیچ سزا و لێپرسینەوەیەك لەگەڵ بەندەكانی ناكات تا ناردنی پێغەمبەران و دابەزینی پەیامەكەی نەبێت بۆ سەریان، وە پاشان ئەم جۆری ڕێنموونی و هیدایەتە موڵكی زانایان و بانگخوازان و هەموو كەسێكە كە توانای ڕێنموونی و گەیاندنی پەیامەكەی خوای هەبێت.

مەرج نییە لەم جۆرە هیدایەت و ڕێنموونییەدا وەرگرتن و قبوڵبوون و شوێنكەوتەیی حەق بێتە دی، با پێغەمبەران و پەیامەكەشی نێردرابن، بەڵكوو ئەوەیان پلەی سێیەمی هیدایەتە نەك ئەم جۆرەیان، لەبەرئەوەی لەدوای زۆری پێغەمبەران و بوونی پەیامەكانی خواش؛ هێشتا خەڵكانێكی زۆر هەر بێبڕوا بوون و ڕێگەی گومڕاییان هەڵبژاردووە، خوای گەورە جَلَّ وَعَلَا دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾﴾ [الإسراء: ١٥]، ﴿قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ﴾ [الملك: ٩]، ﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ﴾ [النساء: ١٦٥].

هەموو ئەم دەقانە ئەوە دەگەیەنن كە لەم ڕێنموونییەدا هەموو پێویستییەكانی گەیاندن و ڕێنموونی بەخشراوە بە ئادەمیزاد بۆ نەمانی هیچ پاساوێكیان، وە هیچ لێپرسینەوە و سزایەكیان لەسەر نییە لە دونیا و ئاخیرەتدا، تاوەكوو هەموو پێویستییەكانی ئەم هیدایەتە نەیەتەدی كە ئەمانەن:

١. ناردنی پێغەمبەران: قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا كُلَّ مَا جَاءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا وَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ فَبُعْدًا لِّقَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٤٤﴾﴾ [المؤمنون: ٤٤]. أَيْ: مُتَرَادِفِينَ يَتْبَعُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا غَيْرَ مُتَوَاصِلِينَ[١]، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: يَعْنِي يَتْبَعُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا[٢].

---

(١) "تفسير البغوي" (٣/ ٣٦٦).

(٢) "تفسير ابن كثير" (٥/ ٤١٤)، و"تفسير الطبري" (١٧/ ٤٩).

واتە: ئێمە پێغەمبەرانمان بە شوێنی یەكدا ناردووە و دوابەدوای یەك، هەر گەلێك پێغەمبەرەكەی بۆ هاتبێت بە درۆیان خستووەتەوە، ئێمەش لەناومان بردوون یەك بەدوای یەك، تا بوونەتە باس و سەرگوزەشتەی دوای خۆیان.

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ۝٧﴾ [الرَّعۡد: ٧]. هەموو گەلێك پێغەمبەرێكی ڕێنموونیكارمان بۆ ناردووە.

**٢. دابەزینی پەیامەكانی خوا:** قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖ﴾ [النُّور: ٣٤]، ﴿أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ۝٥١﴾ [العَنكَبُوت: ٥١]، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ [النِّسَاء: ١٧٤].

واتە: ئێمە پەیامان بە تۆدا ناردووە بۆ خەڵكی بە شێوەی ڕوونكردنەوەیەكی ڕاست و دروست. وە دەفەرموێت: ئایا لەوە زیاتر بەڵگەكاری بەس نییە كە ئێمە پەیامان بە تۆدا ناردووە تاوەكوو بەسەریاندا بخوێنیتەوە، كە ئەمە بەزەیی خواییە بەسەر بەندەكانیەوە بۆ ڕوونبوونەوەی حەق و نەمانی بەتاڵ، وە هۆكاری یادخستنەوەیەكی بەسوودە بۆ كەسانی باوەڕهێنەر بە حەق. وە دەفەرموێت: ئەی خەڵكینە، ڕوونكەرەوە و یەكلاكەرەوەتان لەلایەن خواوە بۆ هاتووە تا ببێتە بەڵگە بەسەرتانەوە.

ئەم دوو پێویستییە هەردووكی ڕێنموونییە بە ئایەتە خوێندراوە و بیستراوەكانی خوا بە ڕێگەی پێغەمبەران، هیچ سزا و هەڕەشەیەك نایەتە سەریان هەتاوەكوو هەموو هۆكارەكانی ڕوونكردنەوەی تەواو نەدرێت بە كەسەكان و ئەم ڕێنموونییەیان بەتەواوی لەسەر كراوە نەبێت، وەكوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوۡمَۢا بَعۡدَ إِذۡ هَدَىٰهُمۡ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ﴾ [التَّوۡبَة: ١١٥]. واتە هیچ گەلێك گومڕا ناكرێت تاوەكوو ڕوونكردنەوەی پێویستیان بۆ خۆپاراستن پێنەگەیەنرێت.

وە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡ﴾ [إبۡرَاهِيم: ٤]. واتە هەر پێغەمبەرێك نێردرابێت بە زمانی گەلەكەی خۆی نێردراوە، تاوەكوو ڕوونكردنەوەی تەواویان بداتێ لەسەر دینی خوا.

ئەم ڕێنموونییە لە توانای ئادەمیزاددا هەیە وەکوو گەیاندن و ڕوونکردنەوە و شیکاری بۆیان، خوای پەروەردگار بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٥٢﴾ [الشورى : ٥٢]. واتە لە توانای تۆدا هەیە هیدایەت و ڕێنموونی خەڵکی بکەیت بۆ ڕێگەی ڕاست، وە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّكَ لَتَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٧٣﴾ [المؤمنون : ٧٣]. واتە ئەی (محمد) ﷺ تۆ هیدایەتدەر و بانگخوازیانی بۆ ڕێگەی ڕاستی خوایی، وە دەفەرموێت: ﴿فَذَكِّرۡ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٞ ٢١ لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ ٢٢﴾ [الغاشية : ٢١، ٢٢]. واتە تۆ ئەی (محمد) ﷺ بیریان بخەرەوە، کاری تۆ بیرخستنەوەیە، بە زۆرەملێکردن نییە، وە دەفەرموێت: ﴿فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٩٢﴾ [المائدة : ٩٢]. واتە گەر پشتتان هەڵکرد؛ ئەوە بزانن کە لەسەر پێغەمبەرەکەمان تەنها گەیاندنە و بەس.

**٣. ڕێنموونی و هیدایەت بە بەڵگە کەونییەکان و نیشانە بینراوەکانی بوونەوەر (الآيات الكونية المشهودة):**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَا تُغۡنِي ٱلۡأٓيَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ ١٠١﴾ [يونس : ١٠١]. أَمْرٌ لِلْكُفَّارِ بِالِاعْتِبَارِ وَالنَّظَرِ فِي الْمَصْنُوعَاتِ الدَّالَّةِ عَلَى الصَّانِعِ وَالْقَادِرِ عَلَى الْكَمَالِ[1].

واتە: خوای پەروەردگار فەرمان دەکات بە بێبڕواکان کە سەیری ئاسمان و زەوی بکەن و پەندی لێوەرگرن، کە هەمووی دەبێتە بەڵگە لەسەر بوونی خوای پەروەردگاری بوونەوەرەکان، ئەگەرچی ئەم بەڵگانە سوودی نییە بۆ کەسانی بێبڕوا.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي مَدَّ ٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۡهَٰرٗاۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ٣﴾ [الرعد : ٣].

واتە: ئەو خوایەیە کە زەوی لەبارکردووە بۆ ژیان و شاخەکانی تیادا چەقاندووە و ڕووبار و کانی تیادا دروستکردووە و لە هەموو بەرهەمێك دوو جۆری هێناوەتە دی و شەو و ڕۆژی

(١) "تفسير القرطبي" (٨/ ٣٨٦).

بەسەردا دەهێنێت، تاوەکوو ئەمانە ببنە بەڵگە و نیشانەی دەسەڵاتی خوا بۆ کەسانێك کە بیر دەکەنەوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٧﴾﴾ [الحديد: ١٧].

واتە: بزانن کە خوای پەروەردگار زەوی زیندوو دەکاتەوە لەپاش مردنی، ئەمە بەڵگە نییە بۆ باوەڕبوون بە پەروەردگاری بوونەوەرەکان و زیندووبوونەوە؟! ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ نەبوونی عەقڵ لەو کەسەدا کە هیدایەت وەرناگرێت[١]، لەبەرئەوەی دەفەرموێت ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بەڵکوو عەقڵ بەکاربهێنن و سوودمەند بن لێی.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿أَوَلَمْ يَنظُرُوا۟ فِى مَلَكُوتِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ﴾ [الأعراف: ١٨٥].

واتە: ئەوە بێبڕوایان دەسەڵاتی خوا نابینن لە ئاسمان و زەوی و ئەوەی تیایدا دروستکردووە؟! تا ببێتە تێڕوانین و پەندوەرگرتن و هۆکاری گەڕانەوەیان بۆلای خوا[٢].

(ابن القيم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: فَإِنَّهُ سُبْحَانَهُ أَمر عباده أن يتدبروا آياته المتلوة المسموعة والمرئية المشهودة بِمَا تكون تذكرة لمن كَانَ لَهُ قلب[٣]، وە دەڵێت: نَظَرُ الْفِكْرِ وَالِاعْتِبَارِ إِلَى آيَاتِهِ الْمَشْهُودَةِ، وَفِي آيَاتِهِ الْمَسْمُوعَةِ. وَكُلٌّ مِنْهُمَا دَاعٍ قَوِيٌّ إِلَى مَحَبَّتِهِ سُبْحَانَهُ. لِأَنَّهَا أَدِلَّةٌ عَلَى صِفَاتِ كَمَالِهِ، وَنُعُوتِ جَلَالِهِ، وَتَوْحِيدِ رُبُوبِيَّتِهِ وَإِلَهِيَّتِهِ[٤].

واتە: خوای پەروەردگار فەرمان دەدات بە بەندەکانی کە تێبڕوانن لە ئایەتە بیستراوەکانی کە قورئانە و ئایەت و بەڵگە بینراوەکانی کە دروستکراوەکانیەتی، تاوەکوو ببێتە بیرکەوتنەوە بۆ کەسێك کە خاوەن دڵ بێت، هەریەك لەم دوو جۆرە ئایەت و نیشانانە هۆکار و کاریگەر و بانگخوازێکن بۆ خۆشەویستی خوا، وە دەبێتە بەڵگەی تەواو لەسەر سیفاتە کامڵەکانی و وەسفە

---

(١) "تفسير السعدي" ص٨٤٠.
(٢) "تفسير ابن كثير" (٣/ ٥١٧).
(٣) "مفتاح دار السعادة" لابن القيم (١/ ١٦٩).
(٤) "مدارج السالكين" لابن القيم (٣/ ٤٠، ٤١).

بەرزەکانی خوایەتی و بێهاوتایی ئەو لە خاوەنیەتی و بەڕێوەبردنی دروستکراوەکان و شایستەبوونی پەرستنی بێ هاوبەش بڕیاردان، ئەمانە هەمووی بەڵگەن لەسەر دوو جۆری تەوحید ئەوانیش: (توحيد الربوبية والألوهية)ن.

ئادەمیزادیش لەم هیدایەتەدا گەر (فطرة)یان بە پاکی بمێنێتەوە و تێك نەدرێن و عەقڵیشیان بە گومانەکان نەشێوێنن و ڕێڕەو و ئاڕاستەی سرووشتی خۆیان تێك نەدەن؛ ئەوا زۆر بە ئاسانی باوەڕ بە خوای خۆیان دێنن و پەیوەست دەبن بە دینەکەیەوە، بەڵگەش لەسەر ئەمە هەموو پێشەوا و سەرکردەکانی خەڵکە لە دینی هەڵە و دەسەڵاتی دونیا، گەر بە هەر هۆکارێك بوونیان نەمابێت ئەوا چینەکانی خوارەوە بە ئاسانی دینە حەقەکەیان وەرگرتووە، هەروەك نەمانی سەرکردەکانی (مجوس) و گاوورەکان و جوولەکەکان و هیندۆس ... هەموو ئەو بیروباوەڕانەی کە کاتی خۆی تیایاندا بڵاوبوو ئیسلام ڕای ماڵی و خەڵکانی گشتی ئەو ناوچانە ئیسلامیان تێدا جێنشین بووە تاوەکوو ئێستاش، بۆیە لە قورئاندا هەموو سکاڵاکانی خەڵکی لە دوارۆژدا گوێڕایەڵیکردنی گەورەکانە کە دەڵێن: ﴿رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾﴾ [الأحزاب: ٦٧]. واتە خوایە ئێمە گوێڕایەڵی گەورە و دەسەڵاتدارەکانی خۆمانمان کرد و گومڕا و سەرلێشێواویان کردین.

کەواتە بە بوونی هۆکارەکانی ڕێنموونی و هیدایەتی گشتی و مانەوەیان بە سەلامەتی و نەبوونی ڕێگری لە گەیاندنی ڕێنموونی و هیدایەتی دووەم لە پەیام و بانگەوازی پێغەمبەران بە خەڵکی؛ ئەم هۆکارانە هەمووی بووەتە هۆکاری وەرگرتنی دین و هەڵگرتنی و بگرە بانگەوازکاری بۆی.

بەڵام کاتێك کە خەڵکی گوێڕایەڵی سەرکردە دینی و دونیاییە گومڕاکانیان کردووە، یاخود سوور بوون لەسەر ڕێچکەی پڕ هەڵە و گومڕایی باو و باپیرانیان، ئەمانە بوونەتە هۆکاری نەتوانینی وەرگرتنی هیدایەتی خوایی، وەکوو خوای پەروەردگار بۆمان باس دەکات کە دەفەرموێت: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهۡتَدُونَ ﴿٢٢﴾﴾ [الزخرف: ٢٢]. واتە: دەڵێن خوایە ئێمە شوێنکەوتەی باو و باپیرانمان بووین، ئەوکات ئەمەش بووەتە هۆکاری گومڕایی و نقومبوون لە سەرلێشێواویدا و دوورکەوتنەوە لە هیدایەت و نەمانی سەرپەرشتیکردنی تایبەتی خوایی و نەمانی پەیوەستبوون بە دینەکەیەوە و بەردان و ترازان لە شوێنپێی هەڵگرتنی پێغەمبەران.

وەك گەلی (ثمود) كە خوای گەورە جَلَّوَعَلَا دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّواْ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ﴾ [فُصِّلَت : ١٧]. گەلی (ثمود) هیدایەت و ڕێنموونیمان بۆ ناردن، بەڵام ئەوان گومڕایی و بێبڕواییان هەڵبژارد بەسەر ڕێگەی خوادا.

وە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُواْ لِيُؤْمِنُواْ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٣﴾﴾ [يُونُس : ١٣]. چەندەها گەلانمان لەپێش ئێوەدا لەناوبردووە بە هۆكاری ستەمكارییان لە وەرنەگرتنی پەیامی خوا بە ڕێگەی پێغەمبەران، هەر بەو شێوەیە تۆڵەمان لە گەلانی ستەمكار كردووەتەوە.

**پلەی سێیەم:** ڕێنموونی و هیدایەتی خستنە دڵ و بەردەوامی پێبەخشین (هداية التوفيق والإلهام).

ئەم پلەی هیدایەتەیان تایبەتیترە لەوەی پێشوو، لەبەرئەوەی پلەی دووەم مەرج نییە بێتە دی و سەربگرێت، لەبەرئەوەی هۆكارە، بەڵام ئەم پلەیەیان دێتە دی و هیچ ڕێگرییەك نییە لە نەهاتنەدیدا، وە لەلایەن خواوەیە، هیدایەتی پێشتر گشتی بوو بۆ هەموو ئادەمیزاد، بەڵام ئەم هیدایەتەیان تایبەتە بە بڕواداران و شوێنكەوتووانی دینی خواوە، ئەگەرچی پلەی دووەم بناغەیە بۆ ئەم هیدایەتە و هۆكاری هاتنەدی ئەم جۆرەیانە.

ئەم هیدایەتەیان وەكوو (ابن القيم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: هذه المرتبة تستلزم أمرين، **أحدهما:** فعل الرب تعالى وهو الهدى، **والثاني:** فعل العبد وهو الاهتداء، وهو أثر فعله سبحانه فهو الهادي والعبد المهتدي، قال تعالى: ﴿وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ﴾ [الإِسۡرَاء : ٩٧] ... وقال تعالى: ﴿إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَىٰهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَن يُضِلُّ﴾ [النَّحۡل : ٣٧]، وهذا صريح في أن هذا الهدى ليس له صلى الله عليه وسلم ولو حرص عليه ولا إلى أحد غير الله[١].

واتە: ئەم پلەیە دوو كار لەخۆدەگرێت: **یەكەم:** كاری خوا كە هیدایەتدەرە. **دووەم:** كاری بەندەكەی كە گرتنەبەری هۆكارەكانی هیدایەتە كە خوا ڕەخساندوویەتی بۆی، خوای پەروەردگار

---

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص٨٠، ٨١.

دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِ﴾، واتە ئەوەی خوا هیدایەتی بدات ئەوە هیدایەتدراوە، هیدایەتی خواییش بۆ کەسێك نییە کە ڕێی هیدایەتی نەگرتبێت، بۆیە خوا دەفەرموێت: ﴿إِن تَحۡرِصۡ عَلَىٰ هُدَىٰهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَن يُضِلُّ﴾، واتە ئەی (محمد) ﷺ هەرچەندە هەوڵ بدەیت خوا هیدایەتی کەسی گومڕا نادات.

ئەم ئایەتە بە ئاشکرا ئاماژەیە بۆئەوەی ئەم هیدایەتە تەنانەت بۆ پێغەمبەریش ﷺ نییە هەرچەندە کۆششیش بکات، ئەوەبوو نەیتوانی هیدایەتی (أبو طالب)ی مامی بدات، هەرچەندە هەوڵیشی دا لەگەڵی لە سەرەمەرگیشیدا، ئەوەبوو خوای گەورە جَلَّ وَعَلَا پێی فەرموو: ﴿إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ﴾ [القصص: ٥٦]. واتە ئەوەی تۆ خۆشت بوێت ناتوانی هیدایەتی بدەیت، بەڵکوو خوا خۆی ئەوەی ویستی لێیەتی هیدایەتی دەدات.

بێگومان دوو هیدایەت پێش ئەم هیدایەتە هەیە، گەر بەواندا تێپەڕنەبێت ناگاتە ئەمە، وە بە هۆکارەکانی عەقڵ و ئیرادە و بژاردەی سەربەخۆی خۆی و پاشان ڕەخساندنی هۆکارەکانی گەیاندنی؛ پاساوی وەرنەگرتنی دینەکەی لەسەر هەڵدەگرێت، وە گەر پێشی نەگەیشت یاخود هۆکار هەبوو لە ڕێگەدا بۆ پێنەگەیاندنی دینەکە، وەك شێتی و منداڵی و خەڵەفاوی؛ ئەوا ئەمانەی داناوە بە خاوەن پاساو و عوزری تەواو، کە خاوەنەکانیان ناچنە ژێر باری لێپرسینەوەوە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا﴾ [البقرة: ٢٨٦]، وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّغِيرِ حَتَّى يَكْبَرَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ، أَوْ يُفِيقَ»، قَالَ أَبُو بَكْرٍ فِي حَدِيثِهِ: «وَعَنِ الْمُبْتَلَى حَتَّى يَبْرَأَ»[1].

واتە: بەگوێرەی توانا داواکاری خوایی لەسەر بەندەکانیەتی، وە هەر لەبەر ئەمە یاسا و حوکمی شەرعی لەسەر خەوتوو و منداڵ و شێت هەڵگیراوە.

بۆیە گەر سەیری ئەو ئایەتانەی قورئان بکەین کە پەیوەندییان هەیە بەم هیدایەتە خواییەوە، دەبینین ئەو کەسانەی کە تایبەتن بەم یارمەتیدانە خواییەوە کەسانی خاوەن بنەما و پێشینەی خێر و گوێڕایەڵ و وەرگری دینن و هەموو هۆکار و ڕێگای وەرگرتنیان گرتووەتەبەر، پاش ئەمانە ئەوکاتە

---

(١) رواه أبو داود (٤٣٩٨)، والترمذي (١٤٢٣)، والنسائي في "الكبرى" (٥٥٩٦)، وسبق تخريجه ص١٨٩.

بەرهەمەکەی هاتووەتە دی، کە ئەویش گەیشتنە بە هیدایەتەکەی خوا، هەروەك بوونی کاریگەری هەموو هۆکارەکانی چواردەور لە هێنانەدی ئەنجامەکانیاندا، وەك ئاگر کە هۆکاری سووتاندنە، ئاگر هەبوو سووتاندنیش دەبێت، وە ئاو کە هۆکاری تێرئاوییە و خاك هۆکاری کشتوکاڵە و هەوڵدان هۆکاری بەدەستهێنانی ڕۆزییە و ژنهێنان هۆکاری منداڵبوونە و خواردن هۆکاری وزەی لەشە، بەو شێوەیەش کاری چاکە و گرتنەبەری ڕێگاکانی هۆکاری هیدایەتە، وە کاری خراپ و گرتنەبەری هۆکار و ڕێگاکانی هۆکاری گومڕاییە، ئەمە یاسای خواییە لەسەر هۆکار و هێنانەدی کارەکان (الأسباب والمسببات).

وەك بۆ ئەم هیدایەتە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾﴾ [الليل: ٥ - ١٠]. واتە ئەو کەسەی ببەخشێت و دوورکەوێتەوە لە تاوان و باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێت؛ ئەوکات ئێمە ڕێگەی کارە خێرەکانی بۆ ئاسان دەکەین و پشتیوانی دەبین، وە بە پێچەوانەشەوە بە هۆکاری کارنەکردن و باوەڕنەبوون بە ڕۆژی دوایی؛ ڕێگەی خراپە و تاوانباری بۆ ئاسان دەکەین.

وە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ الَّذِينَ آمَنُوا إِلَىٰ صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴿٥٤﴾﴾ [الحج: ٥٤]. واتە خوای پەروەردگار هیدایەتدەری ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان هێناوە بە ڕێگەی ڕاستی خۆی.

وە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ ﴿١٧﴾﴾ [محمد: ١٧]. واتە ئەوانەی کە هیدایەتیان وەرگرتووە هیدایەتی زیاتریان پێدەبەخشرێت، یارمەتی دەدرێن بۆ هەموو ڕێگەکانی خێر و خواپەرستی.

هیدایەتی یەکەم لە بەخشینی (فطرة)ی پاك و عەقڵ و ئیرادە و هیدایەتی دووەمیش لە ناردنی پێغەمبەران و دابەزینی بەرنامەکانی خوا و گەیشتنی بانگخوازان پێی، ئەم دوو هیدایەتە پەیوەندی بە قەدەری شەرعییەوە هەیە لە بوونی توانا و ئیرادەی پێشوەختە لەسەر کارەکان، بەڵام هیدایەتی سێیەم لە خستنە ناو دڵ و ڕازاندنەوەی و یارمەتیدان و سەرپەرشتی و پێبەخشینی بەردەوام، پەیوەندی بە قەدەری کەونییەوە هەیە کە لە دەسەڵاتی خوادایە، وەکوو (ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَاَللَّهُ سُبْحَانَهُ تَفَضَّلَ عَلَى بَنِي آدَمَ بِأَمْرَيْنِ؛ هُمَا أَصْلُ السَّعَادَةِ: أَحَدُهُمَا: أَنَّ كُلَّ مَوْلُودٍ

يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، ... الثَّانِي: أَنَّ اللهَّ تَعَالَى هَدَى النَّاسَ هِدَايَةً عَامَّةً، بِمَا جَعَلَ فِيهِمْ مِنْ الْعَقْلِ، وَبِمَا أَنْزَلَ إلَيْهِمْ مِنْ الْكُتُبِ، وَأَرْسَلَ إلَيْهِمْ مِنْ الرُّسُلِ[1].

واته: خوای پەروەردگار بە بەزەیی و بەخشندەیی خۆی دوو کاری بەخشیوە بە ئادەمیزاد کە بنەمان بۆ هەموو کامەرانییەك: یەکەم: دروستکردنی ئادەمیزاد لەسەر بنەمای پاکی (فطرة)، دووەمیش: پێبەخشینی عەقڵ و ناردنی پێغەمبەران و پەیامەکانی.

لەڕووی سەرەتاوە هیدایەتی یەکەم و دووەم بنەما و بناغەن بۆ سێیەم، وە لەڕووی هاتنەدی هیدایەت و ڕزگاربوون لە گومڕایی و چوونە ناو بازنەی سەرپەرشتی تایبەتی خواییەوە و گەیشتن بە هەموو کامەرانییەکان، هەموو ئەمانە پەیوەستن بە هیدایەتی سێیەمەوە کە گرنگترین هیدایەتە و لە دەستی خوادایە و لە دەسەڵاتی کەسدا نییە لە بەخشین و ڕێژەی یارمەتی و چۆنیەتییەکانی، ئەوەتا پێغەمبەران ﷺ لەگەڵ ئەو هەموو ڕێز و پلەیەیان، وە پێویستبوونی ئەو کەسانە بۆ پشتیوانی بانگەوازییەکەیان بۆ دینی خوا؛ هێشتا نەیانتوانیوە کەسە زۆر نزیکەکانی خۆیان بهێننە سەر ڕێگەی هیدایەت، پێغەمبەری ئیسلام ﷺ نەیتوانی ببێتە هیدایەتدەری مامەکان (أبو طالب وأبو لهب)، وە (نوح) ﷺ نەیتوانی ببێتە هیدایەتدەری کوڕەکەی، وەکوو خوای پەروەردگار بۆمان باس دەکات: ﴿يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٤٢﴾ [هود : ٤٢]، وە لەگەڵ پێغەمبەر (لوط)دا ﷺ نەیانتوانی ببنە هیدایەتدەری خێزانەکانیان: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمۡرَأَتَ نُوحٖ وَٱمۡرَأَتَ لُوطٖ﴾ [التحريم : ١٠]، وە (إبراهيم) ﷺ نەیتوانی ببێتە هیدایەتدەری باوکی: ﴿أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنۡ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ لَأَرۡجُمَنَّكَۖ وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيّٗا ٤٦﴾ [مريم : ٤٦].

لێرەدا چۆن هیدایەت و یارمەتی خوایی تایبەت هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە ڕێگەی ڕاست دەگرنە بەر و سەرپەرشتییان دەکات و دەیانپارێزێ لە هەموو ڕێگری و کەوتنە ناو گومڕاییەکەوە بە دەستی نەفس و شەیتان و خراپەکانی دەورروبەر؛ ئاواش بە پێچەوانەوە ئەوانەی ڕێگەی خراپە و تاوان و لادان لە دینی خوایان هەڵبژارد بە هەمان شێوە لەپاش نەمانی هیچ هیوایەکی گەڕانەوە تیایاندا و دوورکەوتنەوەی تەواو لە هەموو ڕێگەکانی هیدایەت؛ گومڕایان دەکات و هەموو ڕێگەکانی گومڕاییان بەسەردا واڵا دەکات، بە ڕێگەی زاڵبوونی نەفس و شەیتان و خراپەکارانی

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٢٠٥)، (١٤/ ٢٩٥).

هاوشێوەی چواردەوری لە جیهانی جن و ئینس و ئەنجام و سزا و هاتنەدی پاشکۆی کارەکانیان.

کەواتە لە هەردوو حاڵەتەکەدا بۆ خێر و بۆ شەڕیش خوای پەروەردگار ئەنجام و ڕێگەی کارەکان دێنێت بەسەریاندا، بە هۆکاری بژاردەی ئادەمیزاد خۆیانەوە، بۆیە گەر سەیری دەقەکانی قورئان بکەین لە باسەکانی کاری خێر و شەڕ و هیدایەت و گومڕایی و موژدە و هەڕەشەکاندا؛ هەست بە جۆرێك لە ئالۆزی تێگەیشتن دەکەین، لەلایەك هەڕەشە لەسەر گومڕایی و کاری شەڕ و لەلایەکیش نەتوانینی وەرگرتنی هیدایەت و گرتنەبەری ڕێگاکەی و لەلایەکیش ویست و ئیرادەی گشتی خوا لەسەر کارەکان و دەستەوەستاوی ئادەمیزاد لە ئاستیدا و چەندەها پرسیاری تر دروست دەبێت لای خوێنەری سەرەتا لەو بابەتەدا.

بەڵام بە هۆکاری ئەوەی شێوازی دارشتنی قورئان تایبەتمەندترە و شێوازی تایبەتی خۆی هەیە، دەبینین لە شوێنێکدا بە گشتی باسی تواناکان دەکات و لە شوێنێکی تردا بە تایبەت، وە لەلایەك بە شێوەی دەربڕینی توانا و دەسەڵاتی خوایی و لەلایەکی تریش بوونی توانای ئادەمیزاد بەسەر کار و هۆکارەکاندا، وە لەلایەك دەرەنجام و پاداشتی کارەکان لە سزا و پاداشت، وە لەلایەك کار و جۆرەکانی و کاریگەرییەکانی، ئەمانە هەمووی بوونی هەیە، بەڵام لە شێوازی قورئاندا لێدەرکردن (حذف) و باسنەکردن و پەڕاندن بە هۆکاری پێش و پاش باسکردنی لە بابەتەکانی ڕابوردوو و داهاتوودا زۆرە، لەبەرئەوەی قورئان لەخۆگری باشترین دەربڕین و شێوازی ڕەوانبێژی و دارشتن و دووبارە نەبوونەوە و پێدانی شتی تازەیە بە بیسەر ...، لەبەرئەوە پێویستی بە ئاگالێبوونی تەواوە بەسەر قورئاندا بە ڕێگەی پشتبەستن بە تەفسیری بەهێزی زانایان و شیکار و ئاگالێبوونی ووردی بەلاغی و زمانەوانی ... بەم شێوەیە زیاتر ئەم گرێیانە دەکاتەوە، تەنانەت بگرە ئەم ئالۆزی تێگەیشتنانە و شارەزانەبوون لە یەکلاکردنەوەیدا بووەتە هۆکاری گومڕایی هەموو فیرەقە گومڕاکانی ناو دین و دەرەوەی دین.

بۆ زیاتر واڵابوونی بابەتەکە لەسەر هۆکارەکانی هیدایەت و یارمەتیدانی ڕێگای ڕاست، وە هەروەها هۆکارەکانی گومڕایی و پشتیوانییەکان و دەرهاویشتەکانی ئەم ڕێگایە، وە سەلماندنی بوونی بژاردە و خاوەن ئیرادەیی لە ئادەمیزاددا، وە ڕوونکردنەوە لەسەر کاری تەواوی هەردوو ڕێگاکە و دەسەڵاتی خوا لە هەردوولادا، پێویستمان بە شیکاری دەقەکانی قورئان هەیە لەسەری:

## بـژاردەی ڕێـگـەی خـێر و پـشتیـوانی و پـاداشتی خـوایی بـۆی

**- ئەو بەڵگانەی باس لە بوونی بژاردە و توانین دەکات لە ئادەمیزاددا:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٢٩﴾﴾ [الإنسان: ٢٩].

واتە: ئەوەی دەیەوێت با هۆکارە دینییەکان بگرێتە بەر بۆ لای خوا.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾﴾ [النبأ: ٣٩].

واتە: ئەوەی دەیەوێت دەیگەیەنێتە لای خوا.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾﴾ [المدثر: ٣٧].

واتە: هەرکەسێك لە ئێوە کە دەیەوێت دەتوانێت کارەکان بگرێتە بەر یاخود نا.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾﴾ [التكوير: ٢٨].

واتە: ئەم قورئانە بۆ کەسێکە کە بیەوێت ڕاستبێتەوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾﴾ [عبس: ١١، ١٢].

واتە: ئەم قورئانە بیرخەرەوەیە بۆ کەسێك کە بیەوێت بیری بکەوێتەوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا ﴿٦٢﴾﴾ [الفرقان: ٦٢].

واتە: ئەوەی دەیەوێت ئەم قورئانە بیرخەرەوەیەتی و هۆکاری سوپاسگوزاریشە.

ئەم ئایەتانە هەمووی باس لە بژاردەی سەربەخۆی ئادەمیزاد دەکات لە کارەکانیدا و هیچ بەزۆرپێکردنێکی لەسەر نییە، دەتوانێت بەو بژاردە و توانایانەی کە پێی بەخشراوە ڕێگەی ڕاستی خوایی بگرێت.

**- وە تەنانەت پێغەمبەرانیش ئاگادار دەکاتەوە کەوا هیچ زۆرەملێیەکتان نییە بەسەر خەڵکەوە و تەنها گەیاندنتان لەسەرە:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿٤١﴾﴾ [الزمر: ٤١].

واتە: ئەی (محمد) تۆ سەرپەرشتیکار نیت بەسەریانەوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٖ﴾ [ق: ٤٥].

واتە: تۆمان نەناردووەتە سەریان کە بەزۆر کاریان پێ بەکەی.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗا ٨٠﴾ [النساء: ٨٠].

واتە: تۆمان بە پارێزەر دانەناوە لـەسەریان.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ ٢٢﴾ [الغاشية: ٢٢].

واتە: تۆمان بە زۆرەملێکار نەناردووەتە سەریان.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٥٤﴾ [العنكبوت: ١٨].

واتە: ئەوەی لـەسەر پێغەمبەرانە تەنها گەیاندنی ڕوون و ئاشکرایە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَا عَلَيۡنَآ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ١٧﴾ [يس: ١٧].

واتە: هیچ لـەسەر ئێمە نییە تەنها گەیاندن نەبێت.

ئەم بەڵگانە باس لـەوە دەکەن کەوا لـەسەر پێغەمبەر ﷺ زۆرەملێکردن نییە تاوەکوو ئیمان بێنن، بەڵکوو تەنها گەیاندن و ڕوونکردنەوەی لـەسەرە بۆیان.

**- بۆ توانای هێنانەدی کارە خێرەکان و ڕێگە ڕاستەکە لەلایەن ئادەمیزادەوە دەفەرموێت:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدۡخِلَنَّهُمۡ فِي ٱلصَّٰلِحِينَ ٩﴾ [العنكبوت: ٩].

واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێنا و کردەوەی چاکیان کرد دەیانخەینە ڕیزی ساڵحانەوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ٨٩﴾ [آل عمران: ٨٩].

واتە: ئەوانەی تۆبەیان کرد و پاشان ڕێگەی چاکەیان گرتە بەر، خوای گەورە لـێبوردە و بەبەزەییە بۆیان.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ بِٱلۡحُسۡنَى ٣١﴾ [النجم: ٣١]، ﴿وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ٦﴾ [الليل: ٦].

واتە: ئەوانەی باوەڕیان بە خوا و ڕۆژی دوایی هێنا پاداشتی خۆیان وەردەگرن.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱجۡتَنَبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعۡبُدُوهَا وَأَنَابُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ﴾ [الزمر: ١٧].

واتە: موژدە بۆ ئەوانەی کە گەڕانەوە بۆلای خوا و دوورکەوتنەوە لـە بتپەرستی.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ [الشورى: ٣٨].

واته: ئەوانەی کە وەڵامی بانگەوازەکەی خوایان دایەوە و دەستیان کرد بە نوێژکردن.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩﴾ [الشمس: ٩]، ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ۝١٤﴾ [الأعلى: ١٤]، ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝١﴾ [المؤمنون: ١].

واته: بەڕاستی ڕزگاریان بووە ئەوانەی کە ئیماندارن و نەفسیان پاککردەوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَن يُنِيبُ ۝١٣﴾ [الشورى: ١٣]، ﴿وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَنۡ أَنَابَ ۝٢٧﴾ [الرعد: ٢٧].

واته: ئەوەی بگەڕێتەوە بۆلای خوا هیدایەتی دەدات.

**- بۆ یارمەتیدان و پشتیوانی بەندەکانی بۆ کاری خێر و هیدایەتی زیاتر (التوفيق والإلهام الإلهي) دەفەرموێت:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ۝١٧﴾ [محمد: ١٧].

واته: ئەوانەی کە ڕێگەی هیدایەتیان گرتەبەر خوای گەورە هیدایەتیان بۆ زیاد دەکات و هەموو ڕێگەکانی خواپەرستییان بۆ واڵا دەکات.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَأَمَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنۡ أَمۡرِنَا يُسۡرٗا ۝٨٨﴾ [الكهف: ٨٨]، ﴿فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ۝٦ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ ۝٧﴾ [الليل: ٥ - ٧].

واته: ئەو کەسەی باوەڕبێنێت و کرداری چاك بکات، پاداشتی دەدرێتەوە و ڕێگەی کارەکانی بۆ ئاسان دەکەین.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ۝٤﴾ [الطلاق: ٤].

واته: ئەوەی لە خوا بترسێت ئەوا خوای پەروەردگار ڕێگەی کار و کردەوەکانی بۆ ئاسان دەکات.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٖ وَهُوَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡ كَفَّرَ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَأَصۡلَحَ بَالَهُمۡ ۝٢﴾ [محمد: ٢].

واتە: ئەوانەی کە باوەڕیان هێنا و کرداری چاکیان ئەنجامدا و باوەڕیان بەوە هێنا کە بۆ (محمد) ﷺ هاتووە، کە حەقە و لەلایەن خواوەیە، بەو هۆکارەوە تاوانەکانیان دەسڕینەوە و کار و پێویستییەکانیان بۆ ئەنجام دەدەین.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ [الأحزاب: ٧١].

واتە: ئەوەی گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە سەرکەوتن و ڕزگاربوونێکی گەورەی بەدەستهێناوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا﴾ [الأنعام: ١٦٠].

واتە: ئەوەی چاکەیەك بکات بە دە هێندە پاداشتی دەدرێتەوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَا﴾ [العنكبوت: ٦٩].

واتە: ئەوەی لەپێناوی ئێمەدا تێبکۆشێت ڕێگاکانی هیدایەتی بۆ واڵا دەکەین.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ٧٢﴾ [التوبة: ٧٢].

واتە: وادەی خواییە بۆ ئیماندارانی پیاو و ژن، بەهەشتێك کە ڕووبارەکان بەژێریاندا دەڕۆن و خانوو و ماڵی پاك و بێگەرد بۆ هەتا هەتایی، وە موژدەی ڕازیبوونی خواییش بۆیان کە لە هەمووی گەورەترە، ئەمەیە ڕزگاربوون و سەرفرازی تەواو.

## بژاردەی ڕێگەی شەڕ و پشتیوانی و سزای خوایی بۆی

**- بۆ بژاردەی شەڕ و توانینی لە ئادەمیزاددا:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِنَّا هَدَيۡنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرٗا وَإِمَّا كَفُورًا ٣﴾ [الإنسان: ٣].

واتە: ئێمە ڕێگەمان پشانی ئادەمیزاد داوە، یا سوپاسگوزارە یاخود بێبڕوایە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَٰهُ بَيۡنَهُمۡ لِيَذَّكَّرُواْ فَأَبَىٰٓ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورٗا ٥٠﴾ [الفرقان: ٥٠].

واتە: ئەم هەموو دروستکراوانەمان کردووەتە بەڵگە بۆ بیرخستنەوەی ئادەمیزاد، بەڵام

زۆربەیان بژاردەی بێبڕوایی دەکەن.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿وَإِذَا عَلِمَ مِنْ ءَايَٰتِنَا شَيْـًٔا ٱتَّخَذَهَا هُزُوًا﴾ [الجاثية: ٩].

واتە: ئەگەر ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە دەیکەنە گاڵتەوگەپ.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا﴾ [الأنبياء: ٣٦]، ﴿وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِى وَمَآ أُنذِرُواْ هُزُوًا ﴿٥٦﴾﴾ [الكهف: ٥٦].

واتە: ئەی پێغەمبەر گەر بێبڕوایان بتبینن دەست دەکەنە گاڵتە و ڕابواردن، وە هەروەها چی ئایەت و هەڕەشەکانمانە بە گاڵتە دەیگرن.

**- بۆ دانپیانانی خۆشیان لەسەر بژاردەی ڕێگەی شەڕیان دەڵێن:**

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾﴾ [الأنعام: ٢٧].

واتە: کاتێك دەبرێنە بەر دۆزەخ دەڵێن: خۆزگایا بگەڕاینایەتەوە بۆ دونیا و ئایەتەکانی خوامان بەدرۆ نەخستایەتەوە و باوەڕمان پێبهێنایە.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿قَالُواْ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾﴾ [المؤمنون: ١٠٦].

واتە: لە دوارۆژدا دەڵێن: خوایە نەگبەتی و خراپەی خۆمان زاڵ بوو بەسەرماندا و کەسانێکی گومڕا بووین.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿قَالُواْ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿١٤﴾﴾ [الأنبياء: ١٤].

واتە: دەڵێن هاوار بۆ ئێمە، ئێمە کاتی خۆی کەسانێکی ستەمکار بووین.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾﴾ [الأحزاب: ٦٧].

واتە: خوایە ئێمە گوێڕایەڵی گەورەکانمان کرد و گومڕایان کردین لەسەر ڕێگەی ڕاست.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿وَقَالُواْ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾﴾ [الملك: ١٠].

واتە: ئەگەر ئێمە بمانبیستایە و عەقڵمان بەکاربهێنایە ئێستا لە دۆزەخییەکان نەدەبووین.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾﴾ [المدثر: ٤٥،٤٦].

واتە: ئێمە لەگەڵ بێبڕوایان ڕۆژی دواییمان بەدرۆ دەخستەوە و گاڵتەمان پێدەهات.

**- لە سزا و تۆڵەی گرتنبەر و بژاردەی ڕێگەی شەڕدا دەفەرموێت:**

❁ قَالَ تَعَالَى: ﴿وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾﴾ [الشَّمس: ١٠].

واتە: زەرەرۆمەندی بۆ ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی پیس کردووە کاتێك بە پاکی پێیدراوە.

❁ قَالَ تَعَالَى: ﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾﴾ [الشَّمس: ٨]. یارمەتی نەفسی داوە بۆ تاوان، ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾﴾ [التّوبة: ١٢٥].

واتە: ئەوانە دڵیان نەخۆشە، واتە بێبڕوان، پیسی بەسەر پیسیدا زیاد دەکەن بۆ خۆیان و بە بێبڕوایی دەمرن.

❁ قَالَ تَعَالَى: ﴿أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا﴾ [فاطر: ٨].

واتە: ئەوانەی کردەوەکانی خۆیان دەڕازێننەوە و بەرگی حەقی بەسەردا دەکەن و پاشان بە چاکی دەزانن.

❁ قَالَ تَعَالَى: ﴿فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ﴾ [النّحل: ٦٣].

واتە: ئەوانەی کە شەیتان کردەوەکانیان بۆ دەڕازێنێتەوە، ئەمڕۆ شەیتان سەرپەرشتیکاریانە.

❁ قَالَ تَعَالَى: ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٢٤﴾﴾ [النّمل: ٢٤].

واتە: شەیتان کردەوەکانیان بۆ دەڕازێنێتەوە و لایداون و هیدایەت وەرناگرن.

❁ قَالَ تَعَالَى: ﴿قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ وَلَـٰكِن كَانَ فِى ضَلَـٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٢٧﴾﴾ [ق: ٢٧].

واتە: شەیتانەکەی هاوەڵی و سەرپەرشتیکاری دەڵێت: خوایە من گومڕام نەکردووە بەڵکوو خۆی لە گومڕاییەکی دووردا بووە.

❁ قَالَ تَعَالَى: ﴿وَقَالَ ٱلشَّيْطَـٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَـٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾﴾ [إبراهيم: ٢٢].

واته: كاتێك لێدەبنەوە لە لێپرسینەوە و دەخرێنە دۆزەخ هەموویان لۆمەی شەیتان دەكەن، ئەویش لە شوێنێكی بەرزدا دەڵێت: خوا وادەی حەقی پێدان و ئێوەش پەیمانتان پێدا، بەڵام پەیمانەكەتان شكاند، منیش هیچ بەزۆرپێكردن و دەسەڵاتێكم بەسەر ئێوەدا نەبوو، بێجگە لەوەی كە بانگەوازی ئێوەم كرد و ئێوەش وەڵامی منتان دایەوە، لەبەرئەوە لۆمەی من مەكەن، بەڵكوو لۆمەی خۆتان بكەن، من بە فیریاتان ناكەوم و ئێوەش فریای من ناكەون، هەرچەندە ئێوە منتان كردبووە هاوبەشی خوا، من لەو هاوبەش بڕیاردانەتان بێبەریم.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٢٩﴾﴾ [فُصِّلَتْ: ٢٩].

واته: بێبڕوایان دەڵێن: خوایە ئەوانەمان پشانبدە كە گومڕایان كردووین لە جنۆكە و ئادەمیزادەكان، تا بیانخەینە ژێر پێمانەوە و زەلیل بن.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يَـٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِى عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِى﴾ [الفُرْقَان: ٢٨، ٢٩].

واته: هاوار بۆ من، خۆزگە فلانە كەسم نەكردایە بە هاوەڵی خۆم، ئەو گومڕای كردم لەسەر ڕێگە ڕاستەكە پاش ئەوەی كە پەیامی خوام بۆ هاتبوو.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَـٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ﴾ [الجَاثِيَة: ٢٣].

واته: نابینیت ئەوانەی كە حەز و ئارەزووەكانیان كردووەتە خوا بەسەر خۆیانەوە، گومڕا بوون لەدوای ئەوەی كە هەموو زانیارییەكیان پێگەیشتووە.

**- لەسەر كاریگەرییەكانی دەوروبەریش لە پشتیوانی گومڕایی دەفەرموێت:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ﴾ [الأعْرَاف: ٦٦].

واته: كۆمەڵی بێبڕوای چواردەوری دەیانوت ... .

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦ﴾ [الأعْرَاف: ٨٠].

واته: گەلی (لوط) هەموویان پشتیوانی یەكتر بوون.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ نُوحٍ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦ﴾ [يُونُس: ٧١].

واته: گەلی (نوح)یش هەموویان لەسەر گومڕایی بوون.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَإِبْرَٰهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ﴾ [العنكبوت: ١٦].
واتە: گەلی (إبراهیم) بە تێکڕا لەسەر گومڕایی بوون.

بەم بەڵگانە ڕوونبووەوە کە پشتیوانی ڕێگەی شەڕ نەفس و شەیتان و چواردەور هۆکاری ڕازاندنەوە و پشتیوانین، وە هەمووشیان لە دوارۆژدا دان دەنێن بەم ڕاستیانەدا کاتێك کە هەموو شتێك یەکلایی دەبێتەوە.

**- خاوەنی هەردوو ڕێگاکە و بەڕێوەبردنیان و ڕەخساندنی هەموو هۆکارەکانیان هەر خوای پەروەردگارە:**

✍ بۆ ڕێگە خێرەکە دەفەرموێت:

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ [البقرة: ٢٥٧].
واتە: خوای گەورە سەرپەرشتیکاری باوەڕدارانە، ڕزگاریان دەکات لە تاریکییەوە بۆ ڕووناکی.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴿٧﴾﴾ [الحجرات: ٧].
واتە: خوای پەروەردگار ئیمانی لاتان خۆشەویست کردووە و ڕازاندوویەتییەوە لە دڵتاندا و بێبڕوایی و تاوانی لە دڵتاندا ناشرین کردووە و بێزاندوویەتی.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يَهْدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٦﴾﴾ [المائدة: ١٦].
واتە: خوای پەروەردگار بە دینەکەی هیدایەتی ئەوانە ئەدات کە شوێنکەوتەی ڕەزامەندی ئەون بە هۆکاری گرتنەبەری ڕێگاکەی، وە ڕزگارکاریانە لە تاریکییەوە بۆ ڕووناکی، وە بە ویستی خۆی ڕێنموونیکاریانە بۆ ڕێگە ڕاستەکەی خۆی.

❁ (موسی) عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ﴿إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٦٢﴾﴾ [الشعراء: ٦٢]. واتە خوام لەگەڵە و ڕێنموونیم دەکات، وە (إبراهیم) عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ﴿إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾﴾ [الصافات: ٩٩].
واتە من دەگەڕێمەوە بۆلای خوا، ئەو ڕێنموونیکارمە، وە بە ئیماندارانی دەفەرموێت: ﴿سَيَهْدِيهِمْ

﴿وَيُصۡلِحُ بَالَهُمۡ ٥﴾ [محمد : ٥]. واته هیدایەتی ئیمانداران دەدەم و سەرپەرشتیکاریان دەبم. بۆ هەموویان ئاماژە بە یارمەتی و هیدایەتی تایبەتی خوایی دەکات.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ١٢٣﴾ [طه : ١٢٣].

واته: ئەوەی شوێنکەوتەی هیدایەتەکەی من بێت گومڕا و زەرەرۆمەند نابێت.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ١٩﴾ [الجاثية : ١٩]، ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٦٨﴾ [آل عمران : ٦٨]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ [الحج : ٣٨]، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ١٢٨﴾ [النحل : ١٢٨]، ﴿فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٣٨﴾ [البقرة : ٣٨].

واته: خوای پەروەردگار سەرپەرشتیکاری تایبەتی خواناسان و ئیمانداران و چاکەخوازانە و پاراستنی تایبەتی هەیە بۆیان، لەگەڵ موژدەی پاراستنیان لە هەموو خەم و پەژارەیەك.

✐ بۆ ڕێگەی شەڕەکەش دەفەرموێت:

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿قُلۡ مَن كَانَ فِي ٱلضَّلَٰلَةِ فَلۡيَمۡدُدۡ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ مَدًّا﴾ [مريم : ٧٥].

واته: ئەوەی بژاردەی ڕێگەی شەڕە ئەوە خوای پەروەردگار ڕێگاکەی بۆ دەڕەخسێنێت و درێژەپێدەری دەبێت، وەکوو سزایەك بۆی.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ [إبراهيم : ٢٧].

واته: خوای گەورە ستەمکاران گومڕا دەکات.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ٨ وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ٩ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ ١٠﴾ [الليل : ٨ – ١٠].

واته: ئەوەی باوەڕی بە ڕۆژی دوایی نەبێت ڕێگەی تاوانی بۆ ئاسان دەکرێت.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ﴾ [النجم : ٣١].

واته: سزای خراپەکاران دەداتەوە بە هۆکاری کردەوە خراپەکانیان.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُۚ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُواْ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُم مُّهۡتَدُونَ ٣٠﴾ [الأعراف : ٣٠].

واته: کۆمەڵێك شایستەن گومڕابن، لەبەرئەوەی شەیتانەکانیان دەکردە کاربەڕێوەبەریان بێجگە لە خوا و وا گومانیان دەبرد کە هیدایەتدراوی ڕاستین.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيۡطَٰنٖ مَّرِيدٖ ٣ كُتِبَ عَلَيۡهِ أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهۡدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ٤﴾ [الحج: ٣، ٤].

واتە: لەناو خەڵكاندا كەسانێك هەیە كە بەرپەرچی دینی خوا دەدەنەوە بەبێ هیچ زانستێك، وە شوێنكەوتەی هەموو شەیتان و گومڕاكارێكن لە ئادەمیزاد و جنەكان، ئەوانەی كە بەو شێوەیەن لەسەرمان نووسیون كە گومڕا دەبن و بەرەو سزا دەبرێن.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ مُّرۡتَابٌ ٣٤﴾ [غافر: ٣٤].

واتە: خوای پەروەردگار گومڕاكاری ئەوانەیە كە زیادەڕەوون و بەردەوامن لەسەر گومڕایی.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ٥﴾ [الصف: ٥].

واتە: خوای پەروەردگار هیدایەتی تاوانباران نادات.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿كَيۡفَ يَهۡدِي ٱللَّهُ قَوۡمٗا كَفَرُواْ بَعۡدَ إِيمَٰنِهِمۡ﴾ [آل عمران: ٨٦].

واتە: چۆن خوای پەروەردگار هیدایەتدەری كەسانێكە كە لەپاش ئیمان بێبڕوا بوون؟

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٦٧﴾ [المائدة: ٦٧]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١﴾ [المائدة: ٥١].

واتە: خوای گەورە هیدایەتی كەسانی ستەمكار و بێبڕوا نادات.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةِۢ بِمِثۡلِهَا وَتَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖ﴾ [يونس: ٢٧].

واتە: ئەوانەی كە تاوانیان كردووە سزایان هاوشێوەی تاوانەكانیانە و تاڵاو و زەلیلییان بەسەردا دێنین.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لِيَجۡزِيَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ﴾ [إبراهيم: ٥١].

واتە: خوا سزا و پاداشتی هەموو كردارێكی خاوەن كار بە خێر و شەڕ دەداتەوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡسِبُونَ ٱلۡإِثۡمَ سَيُجۡزَوۡنَ بِمَا كَانُواْ يَقۡتَرِفُونَ ١٢٠﴾ [الأنعام: ١٢٠]، ﴿هَلۡ تُجۡزَوۡنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ٥٢﴾ [يونس: ٥٢].

واتە: سزای تاوانباران دەدرێتەوە بە هۆكاری درووێنەی كارەكانیانەوە ، ئایا هیچ سزایەك هەیە

بۆیان بێجگە لە هۆکاری کردارەکانیان نەبێت؟!

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١١﴾﴾ [النساء: ١١١].

واتە: ئەوەی تاوان بکات ئەوا تاوانی بەسەر نەفسی خۆیدا هێناوە، وە خواش زانا و دانایە بەسەریاندا.

✍ بۆ هەردوو ڕێگاکەش بەیەکەوە دەفەرموێت:

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿قُلْ مَن كَانَ فِى ٱلضَّلَٰلَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ مَدًّا ... وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ هُدًى﴾ [مريم: ٧٥، ٧٦].

واتە: بۆ تاوانباران ڕێگەیان بۆ دەرەخسێنرێت، وە بۆ هیدایەتدراوان هیدایەتی زیاتریان پێدەدرێت.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴿٢٧﴾﴾ [الرعد: ٢٧].

واتە: خوای گەورە ئەوەی کە ویستی لەسەربێت گومڕای دەکات بە هۆکاری خراپەکانیانەوە و ئەوەشی کە ویستی لەسەر بێت هیدایەتی دەدات بە هۆکاری چاکەکانیانەوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا﴾ [الأنعام: ١٢٥].

واتە: ئەوەی خوا ویستی لەسەرە هیدایەتی بدات سنگی بۆ دەکاتەوە، وە ئەوەشی کە ویستی لەسەرە گومڕای بکات سنگ تەنگ و نا ئارامی دەکات لە ئاست بیستنی فەرموودەکانی خوادا.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُ﴾ [الأعراف: ٣٠].

واتە: کۆمەڵێك هیدایەت دران، وە کۆمەڵێکیش شایستەن کە گومڕایی بێت بەسەریاندا.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾﴾ [البقرة: ٢٦].

واتە: زۆرێك لە ئاستی ئەو دینە گومڕا دەبن، وە گومڕاش نابن بێجگە لە تاوانباران نەبێت، وە زۆرێکیش بەم دینە هیدایەت وەردەگرن.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًاۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۖ ﴾ [فَاطِر: ٨].

واتە: ئەوەی کردەوە خراپەکانی بە چاکە دەبینێت و دەیڕازێنێتەوە؛ ئەوە بزانێت کە خوای گەورە ئەوەی ویستی لەسەر گومڕایی بێت گومڕای دەکات و ئەوەشی کە ویستی لەسەر هیدایەتی بێت هیدایەتی دەدات.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٦﴾ ﴾ [المَائِدَة: ١٦].

واتە: بە هۆکاری ئەو دینەوە ئەوەی شوێنکەوتەی بێت هیدایەتی دەدەین بۆ ڕێگەی ڕاست و ڕزگاری دەکەین لە تاریکییەوە بۆ ڕووناکی.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦٓ أَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذۡنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابِۭ بَـِٔيسِۭ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴿١٦٥﴾ ﴾ [الأَعۡرَاف: ١٦٥].

واتە: کاتێك یادی خوایان لەبیرکرد ئەوانەی ڕێگرییان ئەکرد لە خراپە ڕزگارمان کردن، وە ستەمکارانمان بە سزای خراپ گەیاند بە هۆکاری تاوانەکانیانەوە.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضۡلِلۡهُ وَمَن يَشَأۡ يَجۡعَلۡهُ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٣٩﴾ ﴾ [الأَنۡعَام: ٣٩].

واتە: ئەوەی ویستی خوای لەسەربێت بە هۆکاری پێشینە و بژاردەی کردەوەکانیان گومڕایان دەکەین، وە بە هۆکاری ویست و ئیرادەی چاکیان دەیانخەینە سەر ڕێگە ڕاستەکەی خوا.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ ﴾ [النَّحۡل: ٣٦].

واتە: کەسانێك هەن کە شایستەی هیدایەتن و خوا هیدایەتیان دەدات، وە کەسانێکیش هەن کە شایستەن گومڕابن خواش گومڕایان دەکات.

هەموو ئەم دەقانە بەڵگە بوون لەسەر بژاردەی ڕێگەی خێر و هیدایەت و یارمەتی خوایی بۆی، وە هەروەها بەڵگەش بوون لەسەر ڕێگەکانی خراپە و گومڕاییکردنی خواییش وەك بژاردەی خۆیان و سزا و تۆڵە سەندنەوە لێیان، هیچ شتێك ئەنجامی ئەو دوو ڕێگایە دروست ناکات بێجگە لە ئیرادە و بژاردەی ئادەمیزاد خۆی نەبێت بۆ کارەکانی.

## چۆنیەتی پەیوەندی نێوان
## توانای خوا و توانای بەندەکان لە کارکردندا
### كيفية الصلة بين
### قدرة الله تعالى وقدرة العباد في الأفعال

لەپاش ئەو ڕوونکردنەوانەی کە درا لەسەر ڕێگەی هیدایەت و گومڕایی و هۆکارەکانی و ئەنجامەکانی، هێشتا پرسیار لەبن نەهاتووە و دێتە پێشەوە و دەوترێت: ئایا ڕێژەی پەیوەندی نێوان توانای خوا و بەندەکان لە تاك تاکی کارەکاندا لەسەر هەردوو ڕێگاکە چەندە و چۆنە؟! واتە جیاوازییەکی زۆر دەبینرێت لە ڕیزی هیدایەتدراوەکاندا، یەکێك ڕێژەیەکی دیاریکراوی پێوە دیارە کە خوا ڕێنموونی و هیدایەتی پێبەخشیوە و کارئاسانی بۆ کردووە و یەکێکی تریش ڕێژە و چۆنیەتییەکی تر لە بواری تێگەیشتن و کارکردندا، وە هەروەها لە ڕێگە گومڕاکەشدا کەسێك ئاستێکی دیاریکراوی هەیە و کەسێکی تریش چۆنیەتییەکی جیاواز لە نێوان دژایەتی و کارکردن و بانگەوازیکردن بۆی ... .

بە کورتی چۆنیەتی ئەم پەیوەندییە زۆرجار پرسیار دروستدەکات کەسێك لە گومڕاییەوە دەگەڕێتەوە، وە کەسێکیش هەڵدەگەڕێتەوە لە ئیمان، وە کەسێکیش کاڵبوونەوەی پێوە دیارە لە هەردوو ڕێگاکەدا، گۆڕانکارییەکی زۆر دەبینرێت لە پلەکانی ئیمان و گومڕاییدا، ئاخۆ ئەم پەیوەندییانە دەبێت بزانرێت یاخود نهێنییەکی خواییە وەکوو کارەکانی تر، لە ڕزق و ڕۆزی و ئەجەل و شێوازی دروستکردن و بوونیان لە شوێنێك و دایك و باوکی جیاواز بەبێ دەسەڵاتی کەسەکان تیایاندا؟!

**لە وەڵامدا:**

بیرکردنەوە لەسەر ئەم بابەتە و ڕۆچوون تیایدا و هەوڵدان بۆ زانینی؛ ئەمانە هۆکاری گومڕایی فیرەقەکانە لە بابەتی قەدەردا، ویستوویانە ڕێژەی سەربەخۆیی لە توانای کردنی کارەکاندا یەکلابکەنەوە لە نێوان کاری پەروەردگار و کرداری بەندەکانیدا، تاوەکوو بڕیاری کۆتایی لەسەر قەدەر بدەن، بۆ یەکلانەبوونەوەیان لەسەر ئەم بابەتە لە دوو خاڵدا خۆی دەبینێتەوە[١]:

**یەکەم:** دەبێت توانای کەسەکان هەبێت لە کارەکانیاندا، **ئەگەر بڵێین:** دەبێت توانای

(١) "الخلاف العقدي في باب القدر" لدکتور: عبد الله بن محمد القرني ص٦٠ – ٦٢.

بەندەکان سەربەخۆبن لە کارەکانیاندا بەبێ بوونی هیچ توانایەکی تر لەسەری؛ ئەوا ئەمە بۆخۆی ئەستەمە لە عەقڵدا وەربگیرێت، لەبەرئەوەی توانای خوا لە دروستکردنی خۆیدا و تواناکانی و هۆکارەکانی و هەڵگرتنی ڕێگرییەکانی ڕێگای و پێویستییەکانی ئەنجامدانیدا بە ڕوونی دەبینرێت، کە ئەمانە هیچی لە توانای بەندەکاندا نییە و قابیلی هیچ نکوولّییەکیش نییە.

**وە گەر بڵێین:** توانایەك هەیە بۆ بەندەکان، بەڵام هیچ کاریگەرییەکی لەسەر دروستکردنی کارەکان نییە، ئەمەش بگرە زیاتر ئەستەمە لە عەقڵدا وەربگیرێت، لەبەر بوونی واقعی توانا و ئیرادە و کاریگەری لەسەر ئەنجامدانی کارەکان. ئەم دوو حاڵەتە لە نێوان فیرقەکاندا ماوەتەوە بەبێ یەکلابوونەوە، وە جیاوازییەکی زۆریان هەیە لە ڕا و بۆچوون بۆ ڕزگاربوونیان لەسەری، بەڵام نەگەیشتنە ئەنجام و نەیانتوانی یەکلا ببنەوە.

**دووەم:** تێگەیشتنیان لەسەر توانا (القدرة) کە قابیلی دابەشبوون نییە لە نێوان خوا و بەندەکاندا، ئەگەر توانا لە هێنانەدی کارەکان لە نەبوونەوە بۆ بوون بۆ بەندەکان بێت؛ ئەوا خاوەنی حەقیقی بەس بەندەکانە و پەیوەندی بە خواوە نییە، لەبەرئەوەی ئەگەر پەیوەندی بە توانای خواوە هەبێت دەبێت بە هەندە و ڕێژەی توانای بەندەکان بوونی هەبێت لە هێنانەدی کارەکاندا، ئەمەش بۆخۆی ئەستەمە کۆببێتەوە، لەبەر یاسای (أدلة التمانع بين القدرتين)(١)، واتە بەڵگەکانی ئەستەمبوونی دوو توانای هاوسەنگی بەرامبەر یەك لە توانایەکدا، کە یەکێکیان گەر بیەوێت بجووڵێت و ئەویتریشیان نەیەوێت، ئەمە توانای لایەك دێتەدی، یاخود لایەکەی تر، یاخود هەردووکیان، یاخود هیچیان، ئەمەنەش دیسان هیچیان نابێت بێتە دی.

ئەم یاسایەشیان (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ بەرپەرچیان دەداتەوە بەوەی کە دەڵێت: وهذا نقلوه من تقدير ربين وإلهين، وهو قياس باطل، لأن العبد مخلوق لله هو وجميع مفعولاته، ليس هو مثلاً لله ولا نداً(٢). ئەمە کێشانەیەکی هەڵە و بەتاڵە لەوەی کە ئێوە توانای (خالق ومخلوق) دەخەنە پێوانە و ڕیزی یەکەوە کە بۆخۆی دەرناچێت، لەبەرئەوەی ئێوە دەڵێن (مخلوق) خاوەن توانایە وەکوو (خالق)، ئەمەش دەبێتە شەریك و هاوبەش بڕیاردان بەوەی کە وەکوو یەك پێوانەی دەکەن.

---

(١) (٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (١/٨٢)، و "محصل أفكار المتقدمين والمتأخرين من العلماء والحكماء والمتكلمين" للرازي ص٢٨٢.

بەهەرحاڵ ئەمەش خاڵی گومڕایی و ناکۆکی و یەکلانەبووەوەی نێوان فیرەقەکانی قەدەرە.

وەڵامی دروست بۆ ئەم بابەتە وەڵامی (أهل السنة)یە کە دەڵێت: پەیوەندی توانای بەندەکان بە کارەکانیانەوە پەیوەندییەکی هۆکارییە بە کارەکانیانەوە (العلاقة السببية بين الأسباب والمسببات) نەك پەیوەندییەکی سەربەخۆ بە خۆی[1].

وەکوو هەموو پەیوەندییەکانی هۆکارەکان بە کارەکانەوە لە بوونەوەردا بۆ بێجگە لە ئادەمیزاد چۆنە بۆ ئادەمیزادیش هەر بەو شێوەیە، چۆن ئاگر خوا دروستی کردووە بۆ سووتاندن سەربەخۆ نییە و بوونیشی نییە بەبێ هۆکارەکانی سووتان لە دار و گژوگیای وشك و نەوت و غاز، هەروەك کشتوکاڵ بەبێ باران و کێڵان و تۆو بوونی نییە، وە بوونی منداڵ بەبێ ژنهێنان، وە فێربوونی زانست بەبێ خوێندن و مامۆستا و کتێب و گرتنەبەری قۆناغەکانی فێربوون نایەتە دی؛ هەر بەو شێوەیەش توانا و کارەکانی ئادەمیزاد نایەتە دی بەبێ هۆکارەکانی.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: الَّذِي عَلَيْهِ السَّلَفُ وَأَتْبَاعُهُمْ وَأَئِمَّةُ أَهْلِ السُّنَّةِ وَجُمْهُورُ أَهْلِ الْإِسْلَامِ الْمُثْبِتُونَ لِلْقَدَرِ الْمُخَالِفُونَ لِلْمُعْتَزِلَةِ إثْبَاتَ الْأَسْبَابِ وَأَنَّ قُدْرَةَ الْعَبْدِ مَعَ فِعْلِهِ لَهَا تَأْثِيرٌ كَتَأْثِيرِ سَائِرِ الْأَسْبَابِ فِي مُسَبَّبَاتِهَا؛ وَاَللَّهُ تَعَالَى خَلَقَ الْأَسْبَابَ وَالْمُسَبَّبَاتِ. وَالْأَسْبَابُ لَيْسَتْ مُسْتَقِلَّةً بِالْمُسَبَّبَاتِ؛ بَلْ لَا بُدَّ لَهَا مِنْ أَسْبَابٍ أُخَرَ تُعَاوِنُهَا وَلَهَا مَعَ ذَلِكَ أَضْدَادٌ تُمَانِعُهَا وَالْمُسَبَّبُ لَا يَكُونُ حَتَّى يَخْلُقَ اللهُ جَمِيعَ أَسْبَابِهِ وَيَدْفَعَ عَنْهُ أَضْدَادَهُ الْمُعَارِضَةَ لَهُ وَهُوَ سُبْحَانَهُ يَخْلُقُ جَمِيعَ ذَلِكَ بِمَشِيئَتِهِ وَقُدْرَتِهِ كَمَا يَخْلُقُ سَائِرَ الْمَخْلُوقَاتِ[2].

واتە: ڕاوبۆچوونی هەموو زانایانی ئیسلام لەسەر داننانە بە بوونی هۆکارەکان (الأسباب)، لەبەرئەمە توانای ئادەمیزاد بۆ کارەکانی وەکوو کاریگەری هۆکارەکانە بۆ بوونی کارەکان، وە هۆکارەکان سەربەخۆ نین لە کارەکان، بگرە ئەو هۆکارانەش هێشتا پێویستییان بە هۆکاری تر هەیە بۆ هێنانەدی، وە لەگەڵ ئەمانەشدا هێشتا ڕێگر و دژ و پێچەوانەکانی بوونی هەیە و پێویستی بە هەڵگرتن و نەمان هەیە، وە کارەکانیش نایەنەدی تاوەکوو خوای پەروەردگار هەموو هۆکارەکانی بۆ نەڕەخسێنێت و ڕێگر و دژەکانی هەڵنەگرێت لە ڕێیدا، ئەمانە هەموویان بە ویست

(١) "الخلاف العقدي في باب القدر" لدكتور: عبد الله بن محمد القرني ص٥٣.

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٤٨٧).

و توانای خوا دەبێت، وەکوو هەموو دروستکراوەکانی خوا لە بووندا.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: إِذَا كَانَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَدْ جَعَلَ فِي الْجَمَادَاتِ قُوًى تَفْعَلُ، وَقَدْ أَضَافَ الْفِعْلَ إِلَيْهَا وَلَمْ يَمْنَعْ ذَلِكَ أَنْ يَكُونَ خَالِقًا لِأَفْعَالِهَا، فَلَأَنْ لَا يُمْنَعُ إِضَافَةُ الْفِعْلِ إِلَى الْحَيَوَانِ وَإِنْ كَانَ اللهُ خَالِقَهُ بِطَرِيقِ الْأَوْلَى. فَإِنَّ الْقَدَرِيَّةَ لَا تُنَازِعُ فِي أَنَّ اللهَ خَالِقُ مَا فِي الْجَمَادَاتِ مِنَ الْقُوَى وَالْحَرَكَاتِ[١].

واتە: خۆ ئەگەر خوای پەروەردگار لە بوونەوەرە بێگیانەکانیدا توانای کارکردنی دروستکردبێت، ئەمە لە کاتێکدا دەتوانرێت توانا و کردارەکانیش بخرێتە پاڵ بێگیانەکان (وەك: گیاکە ڕووا، درەختەکە هاتە بەرهەم)، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ڕێگرییەك نییە دیسان دروستکردنەکە بدرێتە پاڵ خوا (وەك: ئەو گیایە خوا ڕوواندی، یاخود خوا درەختەکەی هێنایە بەرهەم)، گەر بۆ بێگیانەکان بەو شێوەیە بێت (کە قەدەرییەکان دژایەتی ئەمە ناکەن بۆ بێگیانەکان)؛ ئەوا بۆ گیانلەبەران لەپێشترە کە کارەکان بخەینە پاڵیان و لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە دروستکار و هێنەرەدییانە، وەکوو بڵێین: (کردەوەکانی ئادەمیزادە و لەگەڵ ئەوەشدا خوا دروستی کردوون)، چ جیاوازییەك هەیە لە نێوان بێگیان و گیانلەبەراندا لەم بوارەدا؟

وە لەلایەکی تریشەوە هەروەك چۆن دەرك ناکرێت بەو پەیوەندییەی کە لە نێوان دروستکردنی خوا و توانای بوونەوەرە بێگیانەکاندا هەیە، بە هەمان شێوەش نازانرێت و دەرك ناکرێت بە چەند و چۆنیەتی ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوان توانا و دروستکردنی خوا و توانا و کاری ئادەمیزاددا هەیە، لەبەرئەوە هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوانیاندا، دانانی جیاوازی لەو نێوەندەدا پێیدەوترێت (السفسطة العقلية) واتە سەرلێشێواوی عەقڵی.

یەکێك لە بنەماکانی ئەهلی سوننەت باوەڕبوونە بەوەی هیدایەت و گومڕایی و تاوان و عیبادەت بە ویستی خوایە و ئادەمیزاد هۆکارە لە بوونیدا و لێپرسراوە لەسەری، ئەمە یەکێکە لە بنەما یەکلاکراوەکانی ئەهلی سوننەت و کۆدەنگی لەسەرە (من الأصول القطعية عند أهل السنة)[٢].

---

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ٢٤٣، ٢٤٤).

(٢) "الإيمان بالقضاء والقدر" لمحمد بن إبراهيم الحمد ص١٨٩.

**یاسایەکی بنەمایی کە کۆدەنگی زانایانی عەقڵی لەسەرە ئەوەیە کە:** والقاعدة التي يتفق عليها العقلاء أن القطعيات لا تتناقض في نفسها وإن بدت لنا متناقضة[1]. **واتە هەموو ئەو بنەمایانەی کە یەکلاکراونەتەوە هیچ دژایەتی و پێچەوانەییەك لەخۆ ناگرێت، ئەگەر بە شێوەی دژ و پێچەوانەش بینرا ئەوا دەوترێت ئەو پێچەوانەییە هۆکاری ناتەواوی دەرکپێکردنمانە، بۆیە دەبێت هەڵوێستمان لێرەدا ڕاوەستان بێت لەسەر ئەو بنەمایانە و باوەڕمان پێبێت و هیچ شتێك لەو بارەیەوە ڕەد نەکەینەوە ئەگەر زانیاریشمان بەسەریدا نەشکێت، وە ئەو بنەمایەی پێشووش یەکێکە لەو یەکلاکراوانەی ناو دین لە بەرنامەی ئەهلی سوننەتدا.**

**لەناو ژیانی ئادەمیزادیشدا ئەگەر کەسێك هەڵکەوتووبێت لە کارێکدا یاخود لە زانستێکدا یا لە پیشەیەکدا یا لە هەر بوارێکی ژیاندا؛ وە ئەم کەسە کارێك بکات یان شتێك بڵێت و عەقڵی خەڵکانی تر دەرکی پێ نەکەن و لێی تێنەگەن؛ ئەوا نابێتە ڕەخنە و هەڵە و ناتەواوی بۆ ئەو کار و قسەیە و خاوەنەکەی، لەبەر تایبەتمەندی و زانایی و کامڵی خاوەنەکەی بەسەر نهێنییەکانی ئەو پیشە و زانستەدا، ئەمە لە کاری ئادەمیزاددا بەو شێوەیەیە کە بنەما لە کاری ئادەمیزاددا لەخۆگر و پڕ ناتەواوییە، ئیتر دەبێت لە کاری پەروەردگاری هەموو بوونەوەردا چۆن بێت؟!**

**وە لە کۆتاییشدا وەڵامی بەرنامەیی شەرعی (المنهجي) لای ئەهلی سوننەت بۆ ئەم بابەتە بەم شێوەیەیە:**

**بابەتەکانی قەزاوقەدەر پەیوەندی بە سیفاتەکانی خواوە هەیە، لەبەرئەوە قەدەر توانا و دەسەڵاتی خوایە** (القدر قدرة الله)**، وە دەسەڵاتیشی وەکوو هەموو ناو و سیفاتەکانی خوا مانا و واتای دیارە و چۆنیەتییەکەی نادیارە و ئیمانهێنانیش پێی واجبە و پرسیار و ڕۆچوونیش لەو بارەیەوە بیدعەیە لە دیندا:** «الْمَعْنَى مَعْلُومٌ وَالْكَيْفُ مَجْهُولٌ وَالْإِيمَانُ بِهِ وَاجِبٌ وَالسُّؤَالُ عَنْهُ بِدْعَةٌ»[2].

**لەبەرئەوە پرسیار لەبارەی هیدایەت و گومڕاییەوە لە نێوان بەندەکانیدا و چۆنیەتی و وردەکارییەکانی بابەتێکی غەیبییە و دەرك ناکرێت بە نهێنییەکانی، ئایا هیدایەت لەکوێدا دادەنێت**

(١) "الإيمان بالقضاء والقدر" لمحمد بن إبراهيم الحمد ص١٨٩.

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٧/ ٤٢٤).

و بە کێی دەبەخشێت و کێ گومڕا دەکات و چەند و چۆنیەتی لەم بارەیەوە پەیوەندی بە عیلم و حیکمەتی خواوە هەیە، هەروەك چۆن خۆی دەزانێت کە کێ دەکات بە پێغەمبەر و پەیام بۆ کێ دەنێرێت، وەکوو دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ﴾ [الأنعام: ١٢٤]. واتە خوا خۆی زانایە بەسەر ئەوەی پەیامەکەی بە کێدا دەنێرێت، وە دەفەرموێت: ﴿أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ٥٣﴾ [الأنعام: ٥٣]، ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ١٢٥﴾ [النحل: ١٢٥]. خوای گەورە خۆی زانایە بەسەر سوپاسگوزاراندا، وە زانایە بەسەر کەسێکدا کە گومڕا دەبێت، یاخود هیدایەت وەردەگرێت.

وە دەشێت زانینی ئەم بابەتانە سوودمەندی تێدا نەبێت بۆ خاوەنەکەی، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: وَلَيْسَ اطِّلَاعُ كَثِيرٍ مِنَ النَّاسِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ عَلَى حُكْمِ اللهِ فِي كُلِّ شَيْءٍ نَافِعًا لَهُمْ بَلْ قَدْ يَكُونُ ضَارًّا. قَالَ تَعَالَى: ﴿لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ﴾ [المائدة: ١٠١]. وَهَذِهِ الْمَسْأَلَةُ: مَسْأَلَةُ غَايَاتِ أَفْعَالِ اللهِ وَنِهَايَةِ حِكْمَتِهِ مَسْأَلَةٌ عَظِيمَةٌ، لَعَلَّهَا أَجَلُّ الْمَسَائِلِ الْإِلَهِيَّةِ[١].

واتە: لەبەرئەوەی گەر پێشی بوترێت زۆرجار بۆی وەرناگیرێت و لێی تێناگات، وە دەبێتە جۆرێك لە بەلاَ و ناجێگیری بۆی، بۆیە لەم کاتەدا نەزانین چارەسەرە بۆ ئەو کەسە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ئەی ئیمانداران پرسیار لە شتێك مەکەن گەر بۆتان ڕوونبێتەوە و زەرەرۆمەند بن لێی. وە ئەم بابەتی قەدەرە مەبەستەکان تیایدا زانینی کارەکانی خوایە، وە دەرککردنە بە زانینی کۆتایی حیکمەتەکانی پەروەردگار لە بووندا، لەبەرئەمانە گرنگترین بابەتە کە پەیوەندی بە خواوە هەبێت.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: وَاللهُ تَعَالَى غَنِيٌّ عَنِ الْعِبَادِ، إِنَّمَا أَمَرَهُمْ بِمَا يَنْفَعُهُمْ، وَنَهَاهُمْ عَمَّا يَضُرُّهُمْ فَهُوَ مُحْسِنٌ إِلَى عِبَادِهِ بِالْأَمْرِ لَهُمْ، مُحْسِنٌ لَهُمْ بِإِعَانَتِهِمْ عَلَى الطَّاعَةِ ... فَأَمْرُهُ لَهُمْ إِرْشَادٌ وَتَعْلِيمٌ وَتَعْرِيفٌ بِالْخَيْرِ، فَإِنْ أَعَانَهُمْ عَلَى فِعْلِ الْمَأْمُورِ كَانَ قَدْ أَتَمَّ النِّعْمَةَ عَلَى الْمَأْمُورِ، وَهُوَ مَشْكُورٌ عَلَى هَذَا وَهَذَا، وَإِنْ لَمْ يُعِنْهُ وَخَذَلَهُ حَتَّى فَعَلَ الذَّنْبَ كَانَ لَهُ فِي ذَلِكَ حِكْمَةٌ أُخْرَى[٢].

---

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ٣٩)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٨١).

(٢) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ٣٨).

واته: خوای پەروەردگار پێویستی بە بەندەکان نییە و فەرمانەکانی مایەی سوودمەندییانە و ڕێگرییەکانی بۆ زیان نەبوونیانە لەسەریان، وە بە هەموو شێوەیەك چاکەی بۆ بەندەکانیەتی و یارمەتییەکانیشی هەر چاکە و تەواوکاری نیعمەتەکانیەتی، وە گەر یارمەتیشی نەبێت بۆیان و تووشی تاوانیان بکات ئەوەش بۆخۆی حیکمەتێکی تری تێدایە کە بەندەکەی پێویستیەتی، بۆیە لەژێر باری حیکمەتەکانی خوا شاراوەیی زۆرە.

گرتنەبەری هۆکارەکانی هیدایەت و گومڕایی دەبێتە ئەنجامی هیدایەت و گومڕایی، وە زۆرجاریش بەبێ هۆکار هیدایەت و ڕێگە خێرەکە دەبەخشێت، ئەگەرچی دەشێت هەر نهێنییەکی ووردی خۆی تێدا بێت، لەگەڵ ئەوەشدا بەبێ بوونی ئەو نهێنییەش چاکە و بەخشندەیی خۆیەتی و پرسیار ناکرێت کە چۆن و بۆ دەیبەخشێت، وەکوو دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ﴾ [الحديد: ٢١]. واتە پلەوپایەکان موڵکی خوان و بە ویستی خۆی دەیبەخشێت، وە دەفەرموێت: ﴿يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾﴾ [آل عمران: ٧٤]. واتە خوا بە ویستی خۆی خەڵکانێك تایبەتمەند دەکات بە ڕەحمەتی خۆیەوە، هەر ئەو خاوەن بەخشینە بەبەهاکانە، وەکوو (قاضي عبد الجبار المعتزلي) وتی: أَرَأَيْتَ إِنْ مَنَعَنِي الْهُدَى، وَقَضَى عَلَيَّ بِالرَّدَى، أَحْسَنَ إِلَيَّ أَمْ أَسَاءَ؟ فَقَالَ لَهُ الْأُسْتَاذُ أَبُو إِسْحَاقَ: إِنْ كَانَ مَنَعَكَ مَا هُوَ لَكَ فَقَدْ أَسَاءَ، وَإِنْ كَانَ مَنَعَكَ مَا هُوَ لَهُ فَيَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَنْ يَشَاءُ[(١)]. واتە ئەگەر خوا گومڕایی دا بەسەر مندا و ڕێگەی هیدایەتی پێ نەدام، چاکەی لەگەڵ کردووم یان خراپە؟ (أبو اسحاق)ی زانای ئەهلی سوننەتیش وتی: ئەگەر حەقی خۆت بێت و پێی نەدابیت ئەوا خراپەی لەگەڵ کردوویت، وە ئەگەر ئەوەی کە موڵکی خۆی بێت و پێی نەدابیت ئەوا ویستی خۆیەتی کە بەخشندەیی خۆی بە کێ دەبەخشێت و چۆنی دەبەخشێت. دیارە مەبەستی لەوەیە کە ئەگەر خۆم ئیمان و هیدایەتم نەویست و ڕێگەی هیدایەتم نەگرتە بەر بۆ هیدایەتم پێنابەخشێت؟!

کەواتە بابەتی قەزا و قەدەر پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە خوای پەروەردگارەوە هەیە لە زانست و حیکمەت و توانا و دەسەڵات و دروستکردن ... کە پەیوەندی بە خوایەتی خواوە هەیە لە هەرسێ بەشەکەی تەوحیددا، ئەمەش هۆکاری ڕاستی ئەوەیە کە خوای پەروەردگار قەزا و قەدەری

(١) "لوامع الأنوار البهية" للسفاريني (١/ ٣٣٩)، و"تفسير القرطبي" (١١/ ٢٧٩).

بەجیا و سەربەخۆ وەك پایەكانی تری ئیمان باس نەكردووە، بەڵكوو بە باس و ناوەكانی خۆی و كارەكانیەوە پەیوەستی كردووە، بەڵام لە سوننەتدا بە بەشێكی سەربەخۆ باسی كردووە، بۆ ڕوونبوونەوە و گرێدانی قورئان و سوننەت بەیەكەوە كە تەواوكاری یەكن، وە لەلایەكی تریشەوە تاقیكردنەوەیە بۆ خەڵكی لەسەر وەرگرتنی سوننەت و پەیوەستبوون پێوەی لەو بوارانەی كە قورئان بۆی بەجێهێشتووە، تاوەكوو ئیمانداران پەیوەست بن بە گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەرەكەیەوە، وەكوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾ [النساء: ٥٩].

## پلەی چوارەم: ڕێنموونی بۆ ڕێگەی بەهەشت یا دۆزەخ (الهداية إلى طريق الجنة أو النار).

پلەی چوارەمی ئەو هیدایەتەی كە ئاماژەی پێكراوە لە قورئاندا كۆتا ڕێنموونییە بۆ ئادەمیزاد، لە دواڕۆژدا كەسانی گرتنەبەری ڕێگای شەڕ و گومڕایی ڕێنموونی دەكرێن بۆ دۆزەخی پڕ لە سزایان، وەكوو چۆن لە دونیادا بەگوێرەی كار و گرتنەبەری ڕێگاكانیان یارمەتی دەدران و كاریان بۆ ئاسان دەكرا لەسەر ڕێگە شەڕەكەی خۆیان كە بژاردەیان كردبوو؛ ئاواش لە ئەنجام و كۆتاییدا ڕێنموونی ڕێگای پاداشتی كاری خێر و سزای كارە خراپەكانیان بۆ دەكرێت.

- **بۆ ڕێگەی چاكەكاران دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهۡدِيهِمۡ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمۡۖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ٩﴾ [يونس: ٩].

واتە: بە هۆكاری بوونی ئیمانەوە خوای گەورە پاداشتی دانەوە بەوەی لە دونیادا بە گرتنەبەری ڕێگەی ڕاست و لە دواڕۆژیشدا بە گرتنەبەری ڕێگەی گەیاندن بە بەهەشتی نەبڕاوە[1]، بۆیە لە ڕۆژی دواییدا خۆشیان دەڵێن: ﴿وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ﴾ [الأعراف: ٤٣]. واتە سوپاس و ستاییش بۆ ئەو خوایەی كە ڕێنموونی كردین بۆ ئەم ڕێگەیە، گەر ئەو نەبوایە ئێمە ئەم ڕێگەیەمان نەدەگرتە بەر.

---

(١) "تفسير السعدي" ص٣٥٨.

- **وە بۆ شەهیدانیش دەفەرموێت:** ﴿وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٤﴾ سَيَهۡدِيهِمۡ وَيُصۡلِحُ بَالَهُمۡ ﴿٥﴾﴾ [محمد: ٤، ٥].

(ابن القيم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: فهذه هداية بعد قتلهم سيهديهم إلى طريق الجنة ويصلح حالهم في الآخرة بإرضاء خصومهم وقبول أعمالهم[١].

واتە: ئەوانەی شەهید بوون لە پێناوی خوادا، هیدایەت دەدرێن لەپاش كوژرانیان بە هیدایەتێك بۆ ڕێگەی بەهەشت و كارئاسانی دواڕۆژیان، بە وەرگرتنی كردەوەكانیان لەلایەن خواوە و ڕازیكردنی خاوەن مافەكان لەسەریان.

- **بۆ ڕێگەی گومڕایان دەفەرموێت:** ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٢٣﴾﴾ [الصافات: ٢٢، ٢٣].

واتە: ئەوانەی بێبڕوان و هاوشێوەیانن لە كار و كرداردا (وەك موشریكین و دووڕووەكان و تاوانباران) كۆیان بكەنەوە لەگەڵ ئەوانەی كە پەرستوویانن بەرەو سزای دۆزەخ بیانبەن[٢].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ لَمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ طَرِيقًا ﴿١٦٨﴾ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ﴾ [النساء: ١٦٨، ١٦٩].

واتە: ئەو بێبڕوایانەی كە كار و كردەوەی بێبڕواییان ئەنجامداوە لە ستەم و تاوان، دوورن لە لێخۆشبوون و هیدایەت بۆ ڕێگەی ڕاست بێجگە لە ڕێگەی دۆزەخ نەبێت، لەبەر بژاردەی خۆیان و بەردەوامییان لەسەر ئەو ڕێگایە تا مردن، وە دڵنیاین كە خوا ستەم لە بەندەكانی ناكات وەكوو خۆی دەفەرموێت: ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلۡعَبِيدِ ﴿٤٦﴾﴾ [فصلت: ٤٦]. كەواتە ئەوانە شایستەی تەنها ئەو ڕێگایەن كە خۆیان بژاردەیان كردووە بۆ خۆیان[٣].

زانایان هەموو ئەو هیدایەتانەی كە لە قورئاندا باسكراوە دابەشی دەكەن بەسەر ئەم چوار جۆرەدا كە باسكران، هەریەكەیان پلەیەك لە پلەكانی ڕێنموونی و هیدایەتی تایبەت بە خۆی و

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص٨٤.
(٢) "تفسير السعدي" ص٧٠١.
(٣) "تفسير السعدي" ص٧٥١.

خاوەنەکەی لەخۆدەگرێت، ئەگەر ئاشنا ببیت بەسەر ئەم چوار جۆرەدا ئەوکات تێدەگەیت لە شێوازی داڕشتنی قورئان و مەبەستەکانی و جیاکردنەوەی جۆری هیدایەتەکان و گرێدانیان بەیەکەوە، وە شارەزا دەبیت لە تێگەیشتنی قورئان و پارێزراو دەبیت لە ڕێگەکانی گومڕایی.

  

# هـۆكـارەكـانی هـيدايـەت

## أسباب الهداية

**يەكەم: هۆكارەكانی هيدايەتی گشتی ( أسباب الهداية العامة ).**

**١. مانەوەی سروشتی ئادەميزاد (فطرة) بە پاكی:**

ئادەميزاد بە سروشتی پاكی لەدايكبوويی خۆی (فطرة) باوەڕبوون بە داهێنەر و دروستكاری خۆی و بوونەوەر لە ناخيدا چەسپيوە كە (توحيد الربوبية)ە، وە خۆشەويستی خوا و ملكەچبوون بۆی يەكێكە لە ئاسوودەييەكانی نەفسی و داواكاری دڵی، كە ئەمەش (توحيد الألوهية)ە، ئەم هەستانە وەكوو (القرطبي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: كَمَا خَلَقَ أَعْيُنَهُمْ وَأَسْمَاعَهُمْ قَابِلَةً لِلْمَرْئِيَّاتِ وَالْمَسْمُوعَاتِ، فَمَا دَامَتْ بَاقِيَةً عَلَى ذَلِكَ الْقَبُولِ وَعَلَى تِلْكَ الْأَهْلِيَّةِ أَدْرَكَتِ الْحَقَّ[1].

واتە: وەكوو چۆن چاو و گوێ هۆكاری بينين و بيستنە؛ ئاواش سروشتی پاكی گەر بە پاكی مابێتەوە قابيلی وەرگرتنی ئەو حەق و ئيمانەيە، بۆيە دەبينيت گەر منداڵ درۆ يا تاوان يا ناخ پيسی تيادا بێت سەرشۆڕ و ئازار و خەجاڵەتی دەروونی دەچەشێت، ئەم سروشتە لە ناخيدا چێنراوە بەبێ فێربوون، بۆيە زۆر ڕوونترە لە زانستی بيركاری كە تێيدا يەك و يەك دەكاتە دوو، وە يەك نيوەی دووە، كە ئەمە پێويستی بە فێربوونە، بەڵام ئەويان پێويستی پێی نييە و هەڵگری پێچەوانەی ئەو سروشتەش نييە، وە بگرە ناسينی خوا و خۆشەويستی بۆی لە هەموو زانستێك و شارەزابوونێك لە سروشتيدا ڕۆچووترە، خۆ ئەگەر ئەم سروشتەی بە پاكی بمێنێتەوە و پيس نەكرێت و تێك نەدرێت؛ ئەوا والآيە بۆ ئيسلام، بۆيە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ [الرُّوم : ٣٠]. واتە هەموو ڕووت بكەرە ئەو دينە بۆ جێبەجێكردنی ئەم فەرمانەمان، ئەوە ئەو سروشتە پاكەيە كە خوا خەڵكی لەسەر دروستكردووە، گۆڕانكاری لەم سروشتە پاكەدا نييە، مەگەر ئەوەی لەم بنەمايە دەرچێت بە هۆكاری تێكدانی ئەو پاكييەوە، وەكـوو پێغەمبەريش ﷺ دەفەرموێت: «كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الـفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ، أَوْ يُنَصِّرَانِهِ،

---

(١) "تفسير القرطبي" (١٤/ ٢٩).

**أَوْ يُمَجِّسَانِهِ ...»[(١)].**

**واتە: هەموو منداڵێك بە پاكی (فطرة) لەدایك بووە، بەڵام باوك و دایك گۆڕانكارییان بەسەردا دێنن و دەیانكەن بە جوولەكە و گاوور و ئاگرپەرست. "گەرنا كەس ناتوانێت دروستكراوی خوا لە شێوەی خۆی بگۆڕێت، وە ئەوەی كە فەرمانمان پێكردیت بۆ ڕووكردنە ئەو دینە ئەوە گونجاوە لەگەڵ سروشتتدا"[(٢)].**

**(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت:** وَلَا يَلْزَمُ مِنْ كَوْنِهِمْ مَوْلُودِينَ عَلَى الْفِطْرَةِ أَنْ يَكُونُوا حِينَ الْوِلَادَةِ مُعْتَقِدِينَ لِلْإِسْلَامِ بِالْفِعْلِ، فَإِنَّ اللهَّ أَخْرَجَنَا مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِنَا لَا نَعْلَمُ شَيْئًا، وَلَكِنْ سَلَامَةُ الْقَلْبِ وَقَبُولُهُ وَإِرَادَتُهُ لِلْحَقِّ: الَّذِي هُوَ الْإِسْلَامُ بِحَيْثُ لَوْ تُرِكَ مِنْ غَيْرِ مُغَيِّرٍ لَمَا كَانَ إِلَّا مُسْلِمًا[(٣)].

**واتە: مەبەست بە (فطرة) ئەوە نییە كە لەدایكبووین بە موسوڵمانی لەدایكبووین، بەڵكوو ئێمە كاتێك لەدایكبووین هیچمان نەزانیوە، بەڵام لەگەڵ لەدایكبووندا خاوەنی سەلامەتی دڵ و وەرگرتن و ویستی حەق بووین، ئەمەش هۆكارە بۆ وەرگرتنی ئیسلام، وە گەر بەو شێوەیە بمێنێتەوە و گۆڕانكاری بەسەردا نەیەت هەر موسوڵمان دەردەچێت.**

**بە بەڵگەی ئەوەی كە بێبڕوایی و گومڕایی پێویستی بە گەورەبوون و فێربوونی دەرەكی و ڕاهێنان هەیە لەسەری، وە گەر ئەو سروشتە بەهێزبكرێت بە زانستی دینی لە سەرەتاوە و بێئاگایی و كەمتەرخەمی تیایدا بڕەوێتەوە؛ ئەوا دڵنیایی زیاتر و پەیوەستبوونی تەواوی تیادا دروست دەبێت كە خاوەنەكەی بە متمانەیەكی تەواو و قۆناغبڕینێكی بەردەوامەوە دەمێنێتەوە.**

(١) رواه البخاري (١٣٨٥)، واللفظ له، ومسلم (٢٦٥٨)، وأبو داود (٤٧١٤)، والترمذي (٢١٣٨)، وابن حبان في "صحيحه" (١٢٩)، وأحمد في "المسند" (٧١٨١)، والبزار في "المسند" (٧٧٢٦)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٣٠٦)، والطبراني في "الكبير" (٨٣٠)، والطيالسي في "مسنده" (٢٤٨٠)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (١٣٥٦)، والبيهقي في "الشعب" (٨٥)، وابن بطة في "الإبانة" (١٤٧٨)، والآجري في "الشريعة" (٤٠٠)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٩٩٥)، وأبو نعيم في "الحلية" (٩/ ٢٦)، والبغوي في "شرح السنة" (٨٤)، والفريابي في "القدر" (١٦٠).

(٢) "تفسير السعدي" ص٦٤٠.

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ٢٤٧).

**٢. باوەڕبوون (الإیمان):**

بوونی ئیمان و باوەڕ هۆكارێكی سەرەكییە بۆ چوونە ناو هیدایەت و كامڵبوون تیایدا، وە ئیمانیش بە دوو هۆكار دروست دەبێت، یەكەم بە تێڕوانین لە دروستكراوەكانی خوا لە كەوندا، یاخود ووردبوونەوە و تێگەیشتن لە ئایەتەكانی خوا لە قورئاندا.

**بۆ تێڕوانین لە بوونەوەر و دەسەڵاتی خوا لە دروستكردندا وەكوو دەفەرموێت:** ﴿أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ﴾ [الإسراء: ٩٩]. واتە ئەوە سەیری ئەوە ناكەن كە خوا دروستكاری ئاسمان و زەوییە و بەتوانایە لە دروستكردنی هاوشێوەیاندا، وە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْاْ إِلَى ٱلْأَرْضِ كَمْ أَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿٧﴾﴾ [الشعراء: ٧]. واتە نابینن لە زەویدا چەندەها هاوشێوە و هاوجۆر میوە و ڕووەكمان دروستكردووە، وە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْاْ كَيْفَ يُبْدِئُ ٱللَّهُ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١٩﴾﴾ [العنكبوت: ١٩]. واتە ئەوە نابینن چۆن لە سەرەتاوە خوا دروستی كردوون و پاشان دروستیان دەكاتەوە؟ ئەمە لای خوا ئاسانە، وە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُواْ فِىٓ أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآئِ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾﴾ [الروم: ٨]. واتە ئەوە لە ناخی خۆتاندا بیرناكەنەوە كە خوا ئاسمان و زەوی و چیش لە نێوانیاندایە دروستیكردووە؟ بەڵام زۆریان بێبڕوان بە گەڕانەوەیان بۆ لای خوا.

چەندەها ئایەتی تریش لەم شێوەیەیە داوای سەیركردن و تێڕوانین دەكات لە دروستكراوەكانی چواردەوری، لە ئاسمان و زەوی كە خاوەنێكی هەیە و بەتوانایە لە دروستكردنی جۆرەها بوونەوەری تر، یاخود بەتوانایە لە زیندووكردنەوەی ئادەمیزاد، بۆیە باوەڕ بێنن بەو و بە گەڕانەوە بۆلای.

**وە بۆ تێڕوانین لە ئایەتەكانی قورئانیش دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾﴾ [الإسراء: ٩]. واتە ئەم قورئانە هیدایەتدەرە بۆ چاكترین ڕێگا و موژدەیە بۆ ئیمانداران، وە دەفەرموێت: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ

﴿أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ٢٤﴾ [محمد: ٢٤]. واتە ئەوە بیر لە ووردەكارییەكانی قورئان ناكەنەوە؟ یاخود چەندەها قوفڵ لەسەر دڵتان دراوە، وە دەفەرمویێت: ﴿وَلَقَدۡ ضَرَبۡنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ٢٧﴾ [الزمر: ٢٧]. واتە لەم قورئانەدا بۆ ئادەمیزاد چەندەها نموونەمان گێڕاوە، وە دەفەرمویێت: ﴿وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنًا لِّكُلِّ شَيۡءٍ وَهُدًى وَرَحۡمَةً وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ٨٩﴾ [النحل: ٨٩]. واتە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە تا ڕوونكەرەوە بێت بۆ هەموو شتێك و هۆكاری هیدایەت و بەزەیی و موژدەی خوا بێت بۆ موسوڵمانان، وە دەفەرمویێت: ﴿هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوۡعِظَةٌ لِّلۡمُتَّقِينَ ١٣٨﴾ [آل عمران: ١٣٨]. واتە ئەم قورئانە شیكەرەوە و ڕوونكەرەوە و هۆكاری هیدایەت و ئامۆژگارییە بۆ خواناسان.

هەموو ئەم ئایەتانە ئاماژە بەوە دەكەن كە تێڕوانین و تێگەیشتن و بیستنی تەواو لەم ئایەتە قورئانیانە یارمەتیدەر و هۆكاری ئیمان و باوەڕبوونە بە خوا و پەیوەستبوونە بە دینەكەیەوە و موژدەبەخش و ئامۆژگاری و چاوكراوەییە بۆ باوەڕداران.

نەگرتنەبەری ئەو دوو ڕێگایە (دروستكراوەكانی و ئایەتەكانی) بۆ ئیمان هۆكاری ژیان تاڵی و كوێریەتی دڵی و نابینایی دواڕۆژیەتی، وەكوو دەفەرمویێت: ﴿وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ١٢٤ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرًا ١٢٥ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَاۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ ١٢٦﴾ [طه: ١٢٤ - ١٢٦]. واتە لە دواڕۆژدا كوێر دەبێت و دەڵێت: خوایە بۆ منت لەم ڕۆژەدا كوێركردووە و نابینام، كاتی خۆی لە دونیادا من دەمبینی، پێی دەڵێن: بەم شێوەیە ئایەتەكانی خوات بۆ دەهات لەبیرت دەكرد، ئەمڕۆش بەم شێوەیە لەبیر دەكرێی، (الجزاء من جنس العمل)[1] سزاكان بە هاوشێوەی كار و كردەوەكانە.

گومان نییە لەوەی كە گومڕایی پەردەیەكی ئەستوورە بەسەر دڵەكانەوە و ڕێگرییەكی گەورەیە لەڕێی ئیماندا، وەكوو خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ١٢﴾ [المطففين: ١٢]. واتە كەسێك باوەڕ بەم قورئانە ناهێنێت كە لەوپەڕی تاوان و ستەمكاریدا بێت، وە

(١) "تفسير ابن كثير" (١/ ١٧٩).

دەفەرمویت: ﴿وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾﴾ [البَقَرَة : ٩٩]. واتە بێبڕوا بەم قورئانە تەنها لەلایەن تاوانبارانەوەیە، وە دەفەرمویت: ﴿وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَـٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾﴾ [البَقَرَة : ١٠٨]. واتە ئەوەی ئیمان بگۆڕێتەوە بە بێبڕوایی ئەوە گومڕایە لەسەر ڕێگەی ڕاست، وە دەفەرمویت: ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى تَكْذِيبٍ ﴿١٩﴾﴾ [البُرُوج : ١٩]. واتە بێبڕوایان لەناو درۆدا دەژین، وە دەفەرمویت: ﴿وَلَـٰكِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾﴾ [الأَنعَام : ٣٣]. هەموو بێبڕوایان هۆکاری بێبڕواییان تاوانباری و گومڕایی و درۆ و ستەمکارییە و دژایەتیکردنی حەقەکانە، بە پێچەوانەشەوە ئیمان هیدایەت و چاوکراوەیی و کردەوەی چاکە، وەکوو دەفەرمویت: ﴿فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ﴾ [البَقَرَة : ٢١٣]. واتە خوا هیدایەتدەری ئیماندارانە بۆ گەیشتن بەو حەقەی کە جیاوازییان لەسەر دروستکردووە، وە دەفەرمویت: ﴿وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ﴾ [التَّغَابُن : ١١]. واتە ئەوەی ئیمان بە خوا بهێنێت دڵی هیدایەتدراوە، وە دەفەرمویت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَـٰنِهِمْ ﴾ [يُونُس : ٩]. واتە ئیماندارانی خاوەن کردەوەی چاك بە هۆکاری ئیمانیانەوە خوا هیدایەتی بەردەوامیان پێدەبەخشێت.

٣. نیەت پاکی و ویستەکان (صدق النية والإرادة):

نیەتپاکی و ڕاستگۆیی لە کارەکاندا لەگەڵ بوونی ویست و ئیرادەی دروست، هۆکارە بۆ ئیمان و باوەڕهێنان، بۆیە هەموو کارەکان بە دڵ دەکرێن و بەگوێرەی بەهێز و لاوازی و مەبەستی دڵەکان کارەکان دەڕەخسێت.

لەبەرئەوە هیدایەتیش تا چەندێك ڕاستگۆ بێت لەگەڵیدا تا ئەو ڕێژەیە بۆی وەردەگیرێت، وە چەندەش ویستی لەسەر بێت ئەوەندەی بۆ دەکرێت، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمویت: ﴿ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾﴾ [الإِسرَاء : ١٩]. واتە ئەوەی ویست و ئیرادەی دوارۆژی بێت و کۆششی بۆ بکات ئیماندارە و ئەوانە هەوڵدانەکانیان پاداشت دەکرێت، وە دەفەرمویت: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَـٰلَهُمْ ﴾ [هُود : ١٥]، ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْـَٔاخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ﴾ [الشُّورَى : ٢٠]. واتە هەتانە

ویست و ئیرادەی دونیا و نیعمەتەکانی هەیە، وە هەشتانە ویست و ئیرادەی ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوەی دونیای بوێت دەیدەینێ، وە ئەوەشی کە دوارۆژی بوێت بە زیادەوە پێی دەبەخشین.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ اللهَ لَا يَنْظُرُ إِلَى أَجْسَادِكُمْ، وَلَا إِلَى صُوَرِكُمْ، وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ»[(١)]. واتە خوا سەیری ڕووکەشتان ناکات، بەڵکوو سەیری دڵتان دەکات، بەگوێرەی ڕاست و دروستی نیەتەکان ڕێگەی هیدایەت بۆ ئادەمیزاد والآ دەبێت و کارئاسانی بۆ دەکرێت.

**٤. بەکارهێنانی عەقڵ و بیرکردنەوە (التعقل والتفكر):**

لە بەخشندەیی خوای پەروەردگار بۆ ئادەمیزاد پێدانی عەقڵ و بیرکردنەوەیە لەگەڵ بەکارهێنانی بیستن و بینین بۆ تێگەیشتن لە خوا و بوونی و دەسەڵاتی و کارکردن و بەندایەتی بۆی، وە مەبەستیش لە پێدانی ئەم هۆکارانە بە ئادەمیزاد جیابوونەوەیەتی لە گیانلەبەرانی تر، بە مەبەستی هێنانەدی پێویستییەکانی و جێبەجێکردنی کارەکانی، وە دانانی هەموو شتەکان لە شوێنی خۆیدا و بەشێوەیەکی دروست بەکارهێنان و بەڕێوەبردنی بوونەوەرەکانی ژێردەستی، وە بۆ هێنانەدی باشترین بەرپرسیارێتی لە ئاستی پێویستدا.

وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾﴾ [الإسراء: ٣٦]. واتە ئادەمیزاد بەرپرسیارە لە ئاستی بەخشینی بیستن و بینین و دڵ، وە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٩﴾﴾ [السجدة: ٩]. واتە هۆکاری بەخشینی بیستن و بینین و زمان و دڵ سوپاسگوزارییە لەلایەن ئادەمیزادەوە، وە بەکارهێنانیەتی، وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٢٢﴾﴾ [الأنفال: ٢٢]. واتە: خراپترین بوونەوەر لەسەر زەویدا ئەوانەن کە کەڕ و لاڵن و بووەتە هۆکاری بێ عەقڵییان.

تەنانەت دۆزەخییەکان دان دەنێن بەم سوودنەبینینە لە ئەندامەکانی کارکردندا و دەڵێن: ﴿وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾﴾ [الملك: ١٠]. واتە: ئەگەر بمانبیستایە و عەقڵمان

---

(١) رواه مسلم (٢٥٦٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٩٤)، وأحمد في "المسند" (٧٨٢٧)، والطبراني في "الكبير" (٣٤٥٦)، والبيهقي في "الشعب" (١٠٦٣٧)، وأبو نعيم في "الحلية" (٧/ ١٢٤)، والبغوي في "شرح السنة" (٤١٥٠).

بەكاربهێنایە لە كەسانی ناو دۆزەخ نەدەبووین.

هەموو بوونێك دانراوە تاوەكوو ببێتە بەڵگە بۆ عەقڵ و ژیری لای ئادەمیزاد و سوودمەند بێت لێی، وەكوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾﴾ [الرعد : ٤].

عەقڵ هۆكاری بیركردنەوەیە، بۆیە قورئان وتوویژەكانی هەمووی لەگەڵ عەقڵە، وەكوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ وَلَهُ اخْتِلَافُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٨٠﴾﴾ [المؤمنون : ٨٠]. واتە هەر خوایە دەیژیێنێت و دەیمرێنێت و دروستكاری جیاوازییەكانی شەو و ڕۆژە، ئەوە عەقڵتان پێ ناشكێت؟ وە دەفەرموێت: ﴿هُدًى وَذِكْرَىٰ لِأُولِي الْأَلْبَابِ ﴿٥٤﴾﴾ [غافر : ٥٤]. واتە ئەم قورئانە هیدایەت و بیرخستنەوەیە بۆ خاوەن عەقڵەكان، وە دەفەرموێت: ﴿لِأُولِي الْأَبْصَارِ﴾ [آل عمران : ١٣]. بۆ ئەوانەی كە دەبینن و خاوەنی بینینن، وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِأُولِي النُّهَىٰ ﴿٥٤﴾﴾ [طه : ٥٤]. واتە بۆ كەسانی خاوەن عەقڵی تەواو، وە دەفەرموێت: ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ [النور : ٦١]، ﴿لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ [الزخرف : ١٠]، ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ [الجمعة : ١٠]. بەڵكوو ببێتە هۆكاری بیركردنەوە و بینین و عاقڵبوون و هیدایەت و ڕزگاربوون.

كەواتە بەكارهێنانی ئەم ئەندامانە هۆكارن بە گەیشتن بە فەرموودەكانی خوا، لەبەرئەوە عەقڵ بە تەنیا گومڕا دەبێت و (فطرة)ش بە تەنیا لادەدات، وە عەقڵیش چاوڕۆشنی و ڕێنموونی و سەرپەرشتیكار دەبێت بۆ هێنانەدی زانستی تەواو بەسەر فەرموودەكانی خوادا.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: بَلْ الْعَقْلُ شَرْطٌ فِي مَعْرِفَةِ الْعُلُومِ ... لَكِنَّهُ لَيْسَ مُسْتَقِلًّا بِذَلِكَ؛ ... بِمَنْزِلَةِ قُوَّةِ الْبَصَرِ الَّتِي فِي الْعَيْنِ؛ ... إذَا اتَّصَلَ بِهِ نُورُ الشَّمْسِ وَالنَّارِ. وَإِنْ انْفَرَدَ بِنَفْسِهِ لَمْ يُبْصِرْ الْأُمُورَ الَّتِي يَعْجِزُ وَحْدَهُ عَنْ دَرْكِهَا[(١)].

واتە: بوونی عەقڵ مەرجە بۆ ناسینی زانستەكان، بەڵام سەربەخۆ نییە، لەبەرئەوە عەقڵ لە شوێنی چاوە، وە فەرمـوودەی خواییش لە شوێنی ڕووناكییە، گەر چاو ڕووناكـی نەبێت ناتـوانێت

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٣٣٨، ٣٣٩).

**ببینێت، با بوونیشی هەبێت و توانای بینینیشی هەبێت.**

**بەکارهێنانی عەقڵ لە بیرکردنەوەدا باشترین کار و هۆکاری سوودمەندییە، وەکوو (ابن القیم)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** أصل الْخَيْر وَالشَّر من قبل التفكّر فَإِن الْفِكر مبدأ الْإِرَادَة ... وأنفع الْفِكر الْفِكر فِي مصَالح الْمعَاد وَفِي طرق اجتلابها وَفِي دفع مفاسد الْمعَاد وَفِي طرق اجتنابها فَهَذِهِ أَرْبَعَة أفكار هِيَ أجلّ الأفكار[1].

**واتە: بنەمای هەموو خێر و شەڕێك بیرکردنەوەیە، لەبەرئەوەی بیرکردنەوە سەرەتای دروستبوونی ئیرادە و ویستەکانە، وە باشترین بیرکردنەوەش بیرکردنەوەیە لە سوودمەندییەکانی دواڕۆژ و ڕێگاکانی، وە زەرەرۆمەندییەکانی و گرتنەبەری ڕێگاکانی خۆپاراستن لێی،** ئەمانە چوار **جۆری بیرکردنەوەن کە باشترین جۆری بەکارهێنانی عەقڵە لە بیرکردنەوەدا.**

**٥. نەبوونی ڕێگری و بەربەرستەکان (الخلو من الموانع العائقة):**

**ڕێگر و بەربەستەکان هۆکاری وەرنەگرتنی هیدایەتن، هەر لە (هاوبەش بڕیاردان و بێبڕوایی و دووڕوویی و ستەم و شوێنکەوتەی هەواوئارەزووەکان و تاوان و پێشخستنی عەقڵ و ...)، هەریەکە لەمانە بۆخۆی کاری لەسەر کراوە و بووەتە ڕێگە و پێگەی کەسەکان، لەبەرئەوە خاوەنەکەی بە هۆکاری ئەمانەوە و سەرقاڵبوون پێیانەوە توانای وەرگرتنی هیدایەت و ڕێگەکەیان نەماوە، گەر بەم شێوەیەش بن ئەنجامەکەی دەرچوون و دوورکەوتنەوەیە لە هیوای وەرگرتنی ڕێگە حەقەکە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٦٧﴾ [المَائِدَة : ٦٧]. **واتە بە دڵنیاییەوە خوا هیدایەتی کەسانی بێبڕوا نادات، وە دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١﴾ [المَائِدَة : ٥١]، ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ١٠٨﴾ [المَائِدَة : ١٠٨]. **واتە خوا هیدایەتی کەسانی ستەمکار و تاوانبار نادات، وە دەفەرموێت:** ﴿أَفَرَءَيۡتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلۡمٖ﴾ [الجَاثِيَة : ٢٣]. **واتە ئەوەی حەز و ئارەزووەکانی کردووەتە خوایەك بەسەر خۆیەوە و گومڕای کردووە سەرەڕای بوونی ئەو هەموو زانستە لەسەری، وە دەفەرموێت:** ﴿وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلٗا مُّبِينٗا ٣٦﴾ [الأحزَاب : ٣٦]، ﴿وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ١١٦﴾ [النِّسَاء : ١١٦].

---

(١) "الفوائد" لابن القيم ص١٩٨.

واتە ئەوەی سەرپێچی خوا بکات و هاوبەشی بۆ بڕیار بدات ئەوە لە گومڕاییەکی زۆر دوور و ئاشکرادایە.

هەموو ئەم ئایەتانە ئاماژەن بۆ بوون و ڕێگرییەکان لە وەرگرتنی هیدایەت و ڕێنموونی دینیدا.

**٦. نەگرتنەبەری ڕێگەی دوژمنانی هیدایەتی خوا (عدم الاستجابة لأعداء هدى الله):**

خۆبەدەستەوەنەدان و گوێڕایەڵی نەکردنی دوژمنانی ڕێگەی هیدایەت بۆخۆی پارێزراوییە و ئەمەش دەبێتە هۆکارێکی ئاسان بۆ وەرگرتنی ڕێگەکەی خوا.

وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا﴾ [الأنعام: ١١٢]. واتە بۆ هەموو پێغەمبەرێك دوژمنێکی زۆر لە خراپەکاران هەبووە، لە ئادەمیزاد و جنەکان، کار و کردەوەیان قسەی بریق و باق و ڕازاندنەوە بووە بۆ دژایەتیکردنی ئەو پێغەمبەرە.

وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾﴾ [البقرة: ١٦٨]. واتە شوێنکەوتەی بەرنامە و هەنگاوەکانی شەیتان مەبن، ئەو دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە.

وە دەفەرموێت: ﴿قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾﴾ [الأعراف: ١٦]، ﴿قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾﴾ [الحجر: ٣٩]. واتە شەیتان سوێند دەخوات کە لەسەر ڕێگە ڕاستەکە دانیشێت و خەڵکانی لەسەر گومڕا بکات و بەردەوام بۆیان بڕازێنێتەوە.

وە دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِي ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِي﴾ [الفرقان: ٢٧ - ٢٩]. واتە ڕۆژێك دەبێت ستەمکار دەستی خۆی بگەزێت و بڵێت خۆزگایە ڕێگەکەی پێغەمبەرم بگرتایە و خۆزگایە فڵانە کەسم نەکردایەتە هاوەڵم، ئەو بووە هۆکاری گومڕاییم.

وە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾﴾ [الأحزاب: ٦٧]. شوێنکەوتەی ستەمکاران دەڵێن: خوایە ئێمە گوێڕایەڵی گەورەکانمان بووین و گومڕایان کردین.

وە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ﴾ [البَقَرَة : ١٧٠]، ﴿إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾﴾ [الزُّخرُف : ٢٣]. واتە ئەگەر پێیان بڵێیت شوێنکەوتەی بەرنامەکەی خوا بن، دەڵێن بەڵکوو ئێمە شوێنکەوتەی ڕێگەی باو و باپیرانمانین، ئەوانمان بینیوە لەسەر ئەم ڕێبازە و ئێمەش شوێنکەوتەیانین.

وە پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: «الْمَرْءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلْ»[١].

واتە: هەموو کەسێك لەسەر دینی هاوەڵەکەیەتی، با هەریەك لە ئێوە بزانێت کێ هاوەڵیەتی. واتە هاوەڵ و ڕەفیق دین بە هاوەڵەکەی دەگۆڕێت.

بە خۆپاراستن و دوورکەوتنەوە لێیان و وەڵامنەدانەوەی ئەم دوژمنە جۆراوجۆرانە؛ ڕێگەی هیدایەت متمانە و مسۆگەری زیاترە بۆ وەرگرتنی.

**دووەم: هۆکارە تایبەتییەکانی هیدایەت (أسباب الهداية الخاصة).**

بۆ وەرگرتنی هیدایەتی زیاتر هەندێك هۆکاری تایبەت هەیە بۆ کەسی ئیماندار کە دەیگەیەنێت بە پلەیەکی زیاتری هیدایەت، لەوانە:

**١. بەردەوامی و مانەوە (الإستقامة):**

قورئان وشەی (الإستقامة) زۆر بەکاردەهێنێت، کە لە زمانی قورئان و بەکارهێنانیدا واتە مانەوە لەسەر ئیسلام و بەردەوامی لەسەر هیدایەت، بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و نزیکنەبوونەوە لە ڕێگرییەکانی، وەکوو خوای گەورە جَلَّوَعَلَا دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ [الأنعَام : ١٥٣].

بنەمای (استقامة) مانەوەیە لەسەر بیروباوەڕی پاك بەبێ هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا (التوحيد)، وە دەستگرتنە بە ڕێگا و بەرنامە حەقەکەوە و ئارامگرتنە لەسەری، وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَتَوَاصَوْاْ

---

(١) رواه أبو داود (٤٨٣٣)، والترمذي (٢٣٧٨)، وأحمد في "المسند" (٨٠٢٨)، والحاكم في "المستدرك" (٧٣١٩)، والطيالسي في "مسنده" (٢٦٩٦)، والبيهقي في "الشعب" (٨٩٩٠)، وابن وضاح في "البدع" (١٢٦)، وابن بطة في "الإبانة" (٣٥٤)، وأبو نعيم في "الحلية" (٣/ ١٦٥)، البغوي في "شرح السنة" (٣٤٨٦)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٩٢٧)، و "صحيح الجامع الصغير" (٣٥٤٥).

بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾ [العَصر : ٣].

وە باشترین ڕێنموونیش بۆ مانەوە و (استقامة) قورئانە، وەكوو خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَهۡدِي لِلَّتِي هِيَ أَقۡوَمُ ﴾ [الإسراء : ٩]. واتە ئەم قورئانە یارمەتیدەرە بۆ تەواوترین بارودۆخ و ڕاسترین ڕێگا كە ڕێگای ئیمانە بە خوا و پێغەمبەرانی و كاری خواپەرستی و بەردەوامییە لەسەری، بۆیە دەفەرمویێت: ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٢٧ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ٢٨﴾ [التكوير : ٢٧، ٢٨]. واتە ئەم قورئانە یادخەرەوەیەكە بۆ گشت خەڵكی، بەتایبەت بۆ ئەوانەی كە دەیانەوێت مانەوەیان لەسەر دینەكە مسۆگەر بێت.

مانەوە و (استقامة)ی بەردەوام لەسەر حەقەكە بە ڕێكی و دروستی لە دینی خوادا كارێكی قورسە، لەبەرئەوە پاداشتیشی گەورەیە، خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ٣٠﴾ [فصلت : ٣٠]. كلیلی دەرگای (استقامة) بوونی تەوحیدێكی پاكی بێ هاوبەش بڕیاردانە و مانەوەیە لەسەر ئەو بیروباوەڕە و شوێنكەوتن و پەیوەستبوونە بە ڕێگاكەیەوە، ئەگەر وا بن ئەوا مەلائیكەكان دەبارێنە سەریان و موژدەی نەبوونی هیچ خەم و خەفەتێكیان پێدەدەن: قَالَ عَطَاءٌ: لَا تَخَافُوا رَدَّ ثَوَابِكُمْ فَإِنَّهُ مَقْبُولٌ، وَلَا تَحْزَنُوا عَلَى ذُنُوبِكُمْ فَإِنِّي أَغْفِرُهَا لَكُمْ[(١)].

واتە: مەترسن لە كردەوەكانتان، وەرگیراوە و پاداشتی مسۆگەرە، مەترسن لە تاوانەكانتان، من لە هەمووی خۆش بووم.

كاری دینی بەردەوام و قۆناغ بڕین تیایدا ئەوەندە گرنگە خوای گەورە فەرمانی داوە بە پێغەمبەرەكەی بە (استقامة)، وەكوو دەفەرمویێت: ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُۖ وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ﴾ [الشورى : ١٥]. واتە بمێنەرەوە لەسەر ئەو دینە و شوێنكەوتەی هەوا و ئارەزووەكانیان مەبە، وە ژیانی پێغەمبەریش ﷺ باشترین نموونەی (استقامة)و مانەوەی دینییە، وە هەر بەو شێوەیەش فەرمانی بووە بۆ هاوەڵانی ، هەروەكوو (سُفْيَان بْن عَبْد الله الثَّقَفِيّ) ﷛ دەڵێت: «قُلْتُ: يَا رَسُولَ الله، قُلْ لِي فِي

---

(١) "فتح القدير" للشوكاني (٤/ ٥٩٠).

الْإِسْلَامِ قَوْلًا لَا أَسْأَلُ عَنْهُ أَحَدًا بَعْدَكَ قَالَ: " قُلْ: آمَنْتُ بِالله، فَاسْتَقِمْ "»[(١)].

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا شتێکم پێبڵێ کە لەپاش تۆ پرسیار لە کەس نەکەم، فەرمووی: بڵێ ئیمانم بە خوا هێناوە، پاشان بەردەوام بە لەسەری. بەو واتایەی کە کەسێکی عەقیدە پاك و جێبەجێکاری دین بە وەکوو خۆی[(٢)].

٢. **خواپەرستن (التقوى):**

پەیوەستبوونی تەواوی دینی هۆکارێکی ترە بۆ هیدایەتی تەواوتر، لەبەرئەوەی خواپەرستی بریتییە لە ڕێککردنی پەیوەندی نێوان خۆت و خوا و پاشان خەڵکی، بۆیە دەبینین زۆری وشەی (تقوى) و داڕێژراوەکانی پەیوەست دەکات بە لایەنە ڕەوشتی و کۆمەڵایەتییەکانەوە، تاوەکوو خۆی بپارێزێت لەو کار و گوفتارانەی کە زیانی بۆ خۆی و چواردەوری هەیە، پرسیار لە (أبو هريرة) ﷺ کرا دەربارەی چۆنیەتی خواپەرستی، فەرمووی: هَلْ وَجَدْتَ طَرِيقًا ذَا شَوْكٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَكَيْفَ صَنَعْتَ؟ قَالَ: إِذَا رَأَيْتُ الشَّوْكَ عَدَلْتُ عَنْهُ أَوْ جَاوَزْتُهُ أَوْ قَصَّرْتُ عَنْهُ، قَالَ: ذَاكَ التَّقْوَى[(٣)]. واتە ئەگەر بە زەوییەکدا بڕۆیت دڕکاوی بێت چی دەکەیت؟ وتی: خۆم ئەپارێزم و ئاگادار دەبم و بەملاولادا بە تێپەڕاندنی، وتی: (تقوى) و خواپەرستیش بەردەوام بەو شێوەیەیە. وە وشەی (تقوى)ش واتە خۆپاراستن.

بگرە هەموو قورئان بۆ ئەم بابەتە و پێویستییەکانی هاتووە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ ٱلْكِتَـٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾﴾ [البَقَرَة : ٢]. واتە ئەمە کتێبێکە گومانی تێدا نییە و هۆکاری خۆپاراستن و خواپەرستییە، وە دەفەرموێت: ﴿هَـٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾﴾ [آل عِمرَان : ١٣٨]. واتە ئەم قورئانە ڕوونکەرەوەیەکی تەواو و هۆکاری هیدایەتە و ئامۆژگارییەکی تەواوە بۆ خواناسان، تا خۆیان بپارێزن لە سزای خوا و لێپرسینەوەی.

---

(١) رواه مسلم (٣٨)، والنسائي في "الكبرى" (١١٤٢٥)، وابن حبان في "صحيحه" (٩٤٢)، وأحمد في "المسند" (١٥٤١٦)، والطبراني في "الكبير" (٦٣٩٨)، والطيالسي في "مسنده" (١٣٢٧)، والبيهقي في "الشعب" (٤٥٧٢)، وابن بطة في "الإبانة" (١٥٤)، والبغوي في "شرح السنة" (١٦).

(٢) بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەر تێگەیشتنی وشەی (الإستقامة) و ئەو باسەی ئەم بابەتە بەرنامەییە هەڵدەگرێت بگەڕێرەوە بۆ نووسینێکی شيخ الإسلام (ابن تيمية) بەناوی "الإستقامة" کە ڕوونکردنەوەیەکی زۆری تێدایە لەسەری.

(٣) "فتح القدير" للشوكاني (١/ ٤٠).

وە داواكراوە بە بەجێهێنانی تەواو لەم بوارەدا، وەكوو دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ [آل عمران: ١٠٢]. واتە ئەی باوەڕداران خواپەرستی ئەنجام بدەن بە تەواوی و بە بەردەوامی تا مردن، دەبێتە متمانە و مسۆگەری مانەوەی ئیمان.

**٣. تێكۆشانی بەردەوام (المجاهدة):**

لە هۆكارە تایبەتییەكانی هیدایەت جیهاد و تێكۆشانە دژ بە نەفس و هەوا و ئارەزووەكان، یاخود لەگەڵ بیروڕاكاندا، یاخود بانگەوازییە بۆ ڕێگەی ئەو دینە، هەرجۆرێك بێت لە جۆرەكانی تێكۆشان لەپێناوی خوادا هۆكاری بەدەستهێنانی هەموو جۆرەكانی تری هیدایەت و دیندارییە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩﴾ [العنكبوت: ٦٩]. واتە ئەوانەی تێكۆشان و جیهاد لە پێناوی ئێمەدا دەكەن ئەوانە هیدایەتدراوی ڕێگەكانی ئێمەن، وە خوا لەگەڵ چاكەكاراندایە. تەنانەت تێكۆشانەكەی خستۆتە پاڵ خۆی لەگەڵ هیدایەتی ڕێگەكانی، وشەی (فينا، سبلنا) ئاماژەیە بۆ سەرپەرشتی تایبەتی خۆی بۆ ئەم كارانە و خاوەنەكانی.

ئەم جیهاد و تێكۆشانە لەپێناوی خوادا هەردوو جۆرە سەرەكییەكەی عیبادەت دەگرێتەوە، عیبادەتی جەستەیی و عیبادەتی ماڵی (العبادات البدنية والعبادات المالية)، وەكوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٤١]. واتە تێبكۆشن لەپێناوی خوادا بە خۆتان و ماڵتانەوە.

بەڵام ئەم تێكۆشانە دەبێت لە خۆیەوە دەستپێبكات و جێبەجێكاری بێت، پاشان كار لە دەرەوەی خۆی بكات، وەكوو (ابن القيم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: وَلَا يتَمَكَّن من جِهَاد عدوه فِي الظَّاهِر إِلَّا من جَاهد هَذِه الْأَعْدَاء بَاطِنا فَمن نصر عَلَيْهَا نصر على عدوه وَمن نصرت عَلَيْهِ نصر عَلَيْهِ عدوه [(١)]. واتە ناتوانێت كار لە دەرەوەی خۆی بكات تاوەكوو كار لەسەر دوژمنە ناوەڕۆكییەكانی خۆی نەكات، ئەوەی بەسەر دوژمنەكانی ناخی خۆیدا زاڵ بوو ئەوا بەسەر دوژمنانی دەرەوەی خۆیدا زاڵ دەبێت.

(١) "الفوائد" لابن القيم ص٥٩.

وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «الْمُجَاهِدُ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ فِي اللهِ»[(١)]. واتە تێکۆشان و موجاهید ئەو کەسەیە کە جیهاد لەگەڵ نەفسی خۆیدا دەکات لەپێناوی خوادا.

وە یارمەتیدەری ئەم جیهادەش عیلم و زانستی شەرعی و دوعا و پشتبەستنە بە خوا و ترسانی بەدەوامە لە خوا و زیکرکردن و پەیوەستبوونی بەردەوامە بە پەروەردگار و دینەکەیەوە.

ئەمانە هەندێك لایەنی سەرەکی بوون لە هۆکارەکانی هێنانەدی ڕێگەی هیدایەت.

  

(١) رواه الترمذي (١٦٢١)، والنسائي في "الكبرى" (١١٧٩٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٧٠٦)، وأحمد في "المسند" (٢٣٩٦٥)، والطبراني في "الكبير" (٧٩٧)، والبغوي في "شرح السنة" (٢٦١٧)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٦٦٧٩).

# هـۆکـارەکـانی گـومـڕایـی

## أسباب الضلال

گومڕایی سزایەکی خواییە لەسەر ئادەمیزاد، بە هۆکاری گرتنەبەری ڕێگاکانی گومڕایی و پشتهەڵکردن لە حەق و ڕێگە ڕاستەکەی خوای خۆی، خوای پەروەرگار دەفەرمویت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ۝٦﴾ [الانفطار: ٦]. واتە ئەی ئادەمیزاد چی یاخی کردوویت لە خوای خۆت؟ هەموو هۆکارەکانی گومڕایی پێشخستنی حەز و ئارەزووەکانە لەگەڵ بەکارنەهێنانی عەقڵ و دەرنەچوون لە کاریگەرییەکانی چواردەور ... .

لەگەڵ ئەوەشدا خوا پێویستی بە خۆت و کردەوە و کارت نییە و لە هەموو حاڵەتێکدا بەس تۆ لە پێویستی بەردەوامدای بە خوا، وەکوو دەفەرمویت: ﴿مَّا يَفۡعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمۡ إِن شَكَرۡتُمۡ وَءَامَنتُمۡ﴾ [النساء: ١٤٧]. واتە خۆ ئەگەر ئێوە ئیمان بێنن و سوپاسگوزاری خوا بن؛ خوا چ پێویستییەك و مەبەستێکی هەیە لە سزادانی ئێوە؟.

لەگەڵ پێدانی ووردەکاری تەواو بەسەر ڕێگای خێر و شەڕدا، وەکوو (ابن القیم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: وَالله تَعَالَى قد بَين فِي كِتَابه سَبِيل الْمُؤمنِينَ مفصّلة وسبيل الْمُجْرمين مفصّلة وعاقبة هَؤُلَاءِ مفصّلة وعاقبة هَؤُلَاءِ مفصّلة وأعمال هَؤُلَاءِ وأعمال هَؤُلَاءِ: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلِتَسۡتَبِينَ سَبِيلُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ۝٥٥﴾ [الأنعام: ٥٥]. [1].

واتە: خوای پەروەردگار هەردوو ڕێگەی چاك و خێر و ساڵحان و ڕێگەی شەڕ و تاوانبارانی بە دووروودرێژی ڕوونکردووەتەوە، بە خۆیان و کردەوە و ئەنجامەکانیانەوە، بۆئەوەی لای ئادەمیزاد هیچ بەڵگەیەك نەمێنێت بۆیان و چاوکراوە بن لەسەر کاریان، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە پێویستی پێت نییە و کەچی لێت وەردەگرێت و تۆ پێویستت بەوە و ئەو داوات لێدەکات و پاداشتت دەداتەوە و تۆ سوودمەند دەبیت.

---

(١) "الفوائد" لابن القيم ص١٠٨.

**هۆکاری یەکەم: بەکارنەهێنانی پێبەخشراوەکانی بۆ بەدەستهاتنی حەق (عدم استخدام مواهبه في طلب الحق).**

ئەندامەکانی کارکردن لە ئادەمیزاددا کە جیای کردووەتەوە لە گیانلەبەران لە بیستن و بینین و قسەکردن و عەقڵی تێگەیشتن؛ هۆکارێکی سەرەکین بۆ دۆزینەوەی حەق و ڕاستییەکان و دوورکەوتنەوە لە بەتاڵ و شەڕەکان، بەڵام گومڕاکاران سوودمەند نین لەم هۆکارانە تاوەکوو ڕۆژێك پێی بگەنە هیدایەت و سوودمەندییەکانیان، بۆیە گەر سەیری قورئان بکەین دەبینین هەموو لۆمەکان لەسەریان بەکارنەهێنانی ئەو پێبەخشینانەی خوایە بۆخۆیان.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ [الحج: ٤٦]. واتە بۆ ناگەڕێن بەسەر زەویدا تاوەکوو دڵێکتان بۆ دروستبێت کە شتی پێ تێبگەن و گوێیەکتان بۆ دروستبێت کە پێی ببیستن.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِي آذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُولَٰئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾﴾ [فصلت: ٤٤]. واتە ئەوانەی باوەڕناهێنن گوێیان نابیستێت، وە چاویان کوێرە لە ئاستیدا، وەکوو ئەو کەسانەن کە لە شوێنی دوورەوە بانگیان لێبکرێت و هیچ تێنەگەن.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى الْهُدَىٰ لَا يَسْمَعُوا ۖ وَتَرَاهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿١٩٨﴾﴾ [الأعراف: ١٩٨]. واتە ئەگەر بانگی ئەو موشریکانە بکەیت بۆ ڕێگەی خوا نابیستن، وە دەبینیت کە سەیرت دەکەن، بەڵام حەقیقەتی تۆ نابینن و پێغەمبەرایەتیت تیادا بەدی ناکەن.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿١٨﴾﴾ [البقرة: ١٨]. واتە بێبڕوایان کەڕ و کوێر و لاڵن، ناگەڕێنەوە بۆ حەق و دینەکەی خوا.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَافِرِينَ عَرْضًا ﴿١٠٠﴾ الَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِي غِطَاءٍ عَن ذِكْرِي وَكَانُوا لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا ﴿١٠١﴾﴾ [البقرة: ١٠٠، ١٠١]. واتە لە ڕۆژی دواییدا دۆزەخمان بۆ کەسانێك سازاندووە و پیشانیان دەدەین کە پەردەیەك بەسەر چاویاندا هاتبوو لە ئاستی یادەکانی مندا و نەیاندەتوانی بانگەوازی خوا ببیستن.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَٰئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا ﴿٣٦﴾﴾ [الإسراء: ٣٦].

واته: هەموو ئەو ئەندامانەی كە پێمان بەخشیون لێپرسراون لە ئاستیاندا، هەر لە بیستن و بینین و دڵ و زمان و ئەندامەكانی تر.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا ﴿٢٤﴾﴾ [محمد: ٢٤].

واته: ئەوە بۆ تێڕوانینتان نییە بۆ قورئان؟ یاخود دڵەكانتان چەندەها قوفڵی لەسەرە!

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾﴾ [الأنعام: ١١٠].

واته: دڵ و چاویان هەڵدەگێڕینەوە لە سزای ئەوەی هەر لە یەكەم ساتەوە ئیمانیان پێنەهێنا، هەر بەو شێوەیە دەیانهێڵینەوە لە گومڕاییەكی كوێرانەدا.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ الْمَلَـٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ الْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا لِيُؤْمِنُوٓا﴾ [الأنعام: ١١١].

واته: ئەگەر مەلائیكەكان دابەزێنە سەریان و مردووەكان زیندوو بكرێنەوە و هەواڵیان بدەنێ لەسەر ڕاست و دروستی ئەوەی كە بۆ پێغەمبەران هاتووە، هەر ئیمان ناهێنن.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿خَتَمَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ وَعَلَىٰٓ أَبْصَـٰرِهِمْ غِشَـٰوَةٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٧﴾﴾ [البقرة: ٧]. واته خوای گەورە مۆری لەسەر دڵ و بیستنی داون و پەردەی هێناوە بەسەر چاویاندا و لە دواڕۆژیشدا سزای سەختیان بۆ هەیە، وە دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴿٣٥﴾﴾ [غافر: ٣٥]. واته هەر بەو شێوەیە مۆرێكی كاریگەرمان ناوە بەسەر هەموو دڵێكی خۆبەگەورەزانی ستەمكاردا، وە دەفەرموێت: ﴿بَلْ طَبَعَ اللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥٥﴾﴾ [النساء: ١٥٥]. واته بە هۆكاری بێبڕواییانەوە خوای گەورە دڵی مۆر كردوون و تەنها كەمێكیان ئیمان دێنن، وە دەفەرموێت: ﴿كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾﴾ [المطففين: ١٤]. واته پەردەیەكی ڕەشمان داوە بەسەر دڵیاندا لە ئەنجامی كردارەكانیان، وە دەفەرموێت: ﴿وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾﴾ [الأعراف: ١٠٠]. واته دڵیان مۆركاری دەكەین لەبەرئەوەی نابیستن.

ئەم ئایەتانە هەمووی هەڕەشەیە لەسەر گومڕاکاران کە خوای پەروەردگار بە هۆکاری کردەوەکانیانەوە ئەندامەکانی بیستن و بینین و دڵەکانیان دادەخات و نیشانە و کارێکیان بەسەردا دەدات کە بە هیچ جۆرێك سوودمەند نەبن لێی، وەکوو ئەوە وایە کە هەر نەیانبێت.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَـٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَـٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾﴾ [الأعراف : ١٧٩]. واتە کەسانێکی زۆرمان داناوە بخرێنە دۆزەخەوە لە جن و ئادەمیزاد، کە خاوەنی دڵێکن سوودمەند نین پێی و هیچی پێ تێناگەن، وە چاوەکانیان هیچی پێ نابینن، وە گوێیەکانیان هیچی پێ نابیستن، ئەوانە وەکوو گیانلەبەران وان، بەڵکوو سەرلێشێواوترن، لەبەرئەوەی گیانلەبەران بەگوێی خاوەنەکانیان دەکەن لە ڕۆیشتن و وەستان و پێویستییەکانیدا، بەڵام ئەمان بەگوێی پێغەمبەرەکانیان ناکەن لە سوودمەندییەکاندا.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾﴾ [البقرة : ٦]. واتە بێبڕوایان ئاگاداریان بکەیتەوە و نەکەیتەوە باوەڕ ناهێنن.

**هۆکاری دووەم: بێبڕوایی (الكفر).**

گرتنەبەری ڕێگاکانی بێبڕوایی و کارکردن لەسەری هۆکارێکی سەرەکییە بۆ نەتوانینی وەرگرتنی ئیمان و ڕێگەکانی هیدایەت و سەرئەنجام گومڕابوون، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ:

**یەکەم:** سەرقاڵبوون و کارکردن لەو ڕێگایەدا کە دەبێتە هۆی نەڕەخساندنی بواری تر، بگرە هەر توانای وەرگرتنی نامێنێت، ئەمە سروشتی دروستکراوی ئادەمیزادە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ﴾ [الأحزاب : ٤]. واتە دوو دڵمان لە ناخی کەسێکدا دروست نەکردووە، یەك دڵ بەکاردەهێنرێت بۆ یەك کار و ڕێگا.

**دووەم:** بۆخۆی ڕێگاکانی بێبڕوایی و ئیمان دژی یەکن، دوو دژیش لە یەك کاتدا کۆنابێتەوە و کاری لەسەرناکرێت.

لە بەرنامەی ئەهلی سوننەتدا بێبڕوایی چەند جۆرێکە و هەموویشیان هۆکاری وەرنەگرتنی ڕێگەکەی خوان و نەتوانینی وەرگرتنی هیدایەتن، ئەو جۆرانەش پێویستیان بە شیکردنەوەی تەواو هەیە تاوەکوو ڕێگەکانی گومڕایی دەرکەوتووتر بێت.

# جـۆرەکـانی بێبـڕوایـی
## أنواع الكفر

**جۆری یەکەم: بێبڕوایی بەدرۆخستنەوە (كفر التكذيب):**

ئەم بێبڕواییە یەکێکە لە جۆرەکانی بێبڕوایی بیروباوەڕی (كفر الاعتقادي)، ئەم جۆرە بێبڕواییە بەدرۆزانینە.

یەکێك لەوانە بەدرۆزانینی پێغەمبەران و پەیامەکانیانە بە دڵ و زمان (القلب واللسان).

جۆرێکی تریان بە زمانە (التكذيب باللسان)، بەڵام بە دڵ باوەڕی پێیەتی، ئەم بەدرۆخستنەوەیەی دینی خوا و پێغەمبەران دەبێتە دوو بەشەوە، یەکەم بە شێوەی گشتی و دووەم بە شێوەی تایبەتە (المطلق والمقيد)، بە شێوە گشتییەکە ئەوەیە کە باوەڕی بە هەموو پەیامەکانی خوا و پێغەمبەرانی نییە: ﴿مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيۡءٖ﴾ [الأنعام: ٩١]. دەڵێت: ڕاست نییە خوا هیچ شتێکی بۆ ئادەمیزاد نەناردووە.

بە شێوە تایبەتەکەشی باوەڕپێنەبوون و دژایەتی (واجب)ێك یان (فرض)ێك لە پایە و حەڵاڵ و حەرامەکانی ئیسلام دەکات، بەڵگەش لەسەر بێبڕوایی بۆ ئەم بەدرۆخستنەوە و باوەڕپێنەبوونە کە جۆرێکە لە جۆرەکانی بێبڕوایی و دەرچوون لە دین، فەرموودەی خوای پەروەردگارە کە دەفەرمویت: ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓۚ أَلَيۡسَ فِي جَهَنَّمَ مَثۡوٗى لِّلۡكَٰفِرِينَ ٦٨﴾ [العنكبوت: ٦٨]. واتە کێ لەوە ستەمکارترە کە بەناوی خواوە قسە دەکات و گومڕایی و بەتاڵەکانی دەداتە پاڵ خوا، یاخود باوەڕی بەوە نییە کە بۆ پێغەمبەر (محمد) ﷺ هاتووەتە خوارەوە، یەکەمیان درۆ هەڵبەستە بەناوی خواوە و دووەمیان بەدرۆزانینیەتی، هەردوو جۆرەکە بێبڕواین، لەبەرئەوە فەرمووی: ئەوە ئایا دۆزەخ شوێنی بێبڕواکان نییە؟!

**جۆری دووەم: بێبڕوایی وەرنەگرتن و لووت بەرزی لە ئاستیدا، لەگەڵ ئەوەشدا بە ڕاستی دەزانێت (كفر الإباء والإستكبار مع التصديق):**

ئەم جۆرەیان فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی وەردەگرێت، بەڵام جێبەجێی ناکات بە جۆرێك لە ڕەخنەگرتن لێی و پشت تێکردنی و لووت بەرزی لە ئاستی جێبەجێکردنیدا، باوەڕپێنەبوونەکەی بە ئاشکرا دەرنابڕێت، بەڵکوو بە کردار دەیسەلمێنێت کە من جێبەجێی ناکەم،

وەكوو بێبڕوایی (إبليس) كە بەرامبەر فەرمانەكەی خوا وەستایەوە بە ڕەخنەگرتن و خۆبەگەورە زانین لە ئاستیدا: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾﴾ [البَقَرَة : ٣٤]. واتە بە مەلائیكەكانمان وت كە سوجدە بۆ ئادەم ببەن، واتە دان بە پلەوپایەیدا بنێن و سەری بۆ نەوی بكەن، هەموو مەلائیكەكان جێبەجێیان كرد بێجگە لە (إبليس) كە لووت بەرزی نواند و خۆی بە گەورە زانی و فەرمانەكەی جێبەجێ نەكرد و بوو بە یەكێك لە بێبڕواكان، وە وتی: ﴿أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾﴾ [الأعرَاف : ١٢]، ﴿هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ﴾ [الإسرَاء : ٦٢]. واتە من باشترم لە ئادەم، منت لە ئاگر دروستكردووە و ئەوت لە خۆڵ دروستكردووە، وە وتی ئەمەیە كە ڕێزیت بەسەر مندا بەرزكردووەتەوە؟! ئەمانە هەمووی هەڵوێستەكانی (إبليس)ە كە بووە هۆكاری بێبڕوایی و خوای پەروەردگار لە بەهەشت دەری كرد و بەنەفرەتی كرد تا ڕۆژی قیامەت، وەكوو دەفەرموێت: ﴿فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٧٨﴾﴾ [صٓ : ٧٧، ٧٨].

هەروەك بێبڕوایی موشریكەكان كە باوەڕیان بەوە هەبوو كە خوا هەیە، وە خاوەن و دروستكاری بوونەوەرە، لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕیان بە پەیامەكەی و پێغەمبەرەكەی نەبوو، وەكوو خوای پەروەردگار دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾ [الزُّمَر : ٣٨].

یاخود وەك بێبڕوایی فیرعەون كە خوای پەروەردگار دەربارەی دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ فَقَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾﴾ [المؤمنون : ٤٥ - ٤٧]، واتە (موسا) و (هاروون)مان ڕەوانە كرد بۆ فیرعەون و دەسەڵاتەكەی، بەڵام خۆیان بە گەورەتر زانی و زۆر لووت بەرز بوون، بۆیە دەیانوت: ئەوە ئێمە باوەڕ بە دوو ئادەمیزادی وەكوو خۆمان بكەین كە خۆیان و گەلەكەیان ژێردەستە و خزمەتكاری ئێمەن؟! ﴿وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾ [النَّمل : ١٤]، لە ناخدا باوەڕیان پێبوو، بەڵام لەبەر خۆبەگەورەزانینی خۆیان تەسلیمی پەیام و پێغەمبەرەكەی خوا نەبوون.

هەروەكوو بێبڕوایی یەهوودییەكان كە پێغەمبەری ئیسلامیان وەكوو منداڵەكانی خۆیان دەناسی، بەڵام باوەڕیان پێنەدەهێنا و دژایەتییان دەكرد.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَكُفْرُ إِبْلِيسَ وَفِرْعَوْنَ وَالْيَهُودِ وَنَحْوُهُمْ لَمْ يَكُنْ أَصْلُهُ مِنْ جِهَةِ عَدَمِ التَّصْدِيقِ وَالْعِلْمِ؛ فَإِنَّ إِبْلِيسَ لَمْ يُخْبِرْهُ أَحَدٌ بِخَبَرٍ بَلْ أَمَرَهُ اللهُ بِالسُّجُودِ لِآدَمَ فَأَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنْ الْكَافِرِينَ فَكُفْرُهُ بِالْإِبَاءِ وَالِاسْتِكْبَارِ وَمَا يَتْبَعُ ذَلِكَ؛ لَا لِأَجْلِ تَكْذِيبٍ. وَكَذَلِكَ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُ جَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنْفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا[1].

واتە: وەكوو بێبڕوایی ئیبلیس و فیرعەون و جوولەكەكان و هاوشێوەیان، بێبڕوایی ئەمانە لە باوەڕنەبوون و نەزانینەوە نەبووە، بەڵكوو لە جێبەجێنەكردنی فەرمانەكانی خواوە بووە بە لووت بەرزی و نەكردنی، نەك لەبەر بەدرۆخستنەوە بووبێت، وە هەروەها فیرعەون و گەلەكەشی بە هەمان شێوە دڵنیا بوون، بەڵام جێبەجێیان نەكرد و دینی خوایان وەرنەگرت و دژایەتییان كرد.

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَأَمَّا كُفْرُ الْإِبَاءِ وَالِاسْتِكْبَارِ فَنَحْوُ كُفْرِ إِبْلِيسَ، فَإِنَّهُ لَمْ يَجْحَدْ أَمْرَ اللَّهِ وَلَا قَابَلَهُ بِالْإِنْكَارِ، وَإِنَّمَا تَلَقَّاهُ بِالْإِبَاءِ وَالِاسْتِكْبَارِ، وَمِنْ هَذَا كُفْرُ مَنْ عَرَفَ صِدْقَ الرَّسُولِ، وَأَنَّهُ جَاءَ بِالْحَقِّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ، وَلَمْ يَنْقَدْ لَهُ إِبَاءً وَاسْتِكْبَارًا، وَهُوَ الْغَالِبُ عَلَى كُفْرِ أَعْدَاءِ الرُّسُلِ[2].

واتە: بێبڕوایی كوفری (إبليس) جێبەجێنەكردن و خۆبەگەورەزانین بوو لە ئاستی فەرمانی خوادا، ئەمەش وەكوو بێبڕوایی ئەو كەسانەیە كە دەزانن پێغەمبەران ڕاستگۆن و پەیامەكانیان ڕاستە و لەلایەن خواوەیە، بەڵام ناچنە ژێر باری جێبەجێكردن و وەرگرتنی.

**جۆری سێیەم: بێبڕوایی پشتهەڵكردن (كفر الإعراض):**

ئەم جۆرە بێبڕواییە بەو شێوەیە كە خاوەنەكەی پشت هەڵدەكات لە دینەكەی و پێغەمبەرەكەی، بە شێوەیەك كە نە پشتیوانیەتی و نە دوژمنیشیەتی، نە بە ڕاستی دەزانێت، وە نە بە درۆی دەزانێت، وە بە هیچ شێوەیەك نە گوێ دەگرێت نە ئەیەوێت فێربێت، نە بەدواداچوونیشی بۆ دەكات.

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٧/ ٥٣٤).
(٢) "مدارج السالكين" لابن القيم (١/ ٣٤٦).

**ئەم شێوەیەیە کە مەبەستی خاوەنەکەی نەویستنی دینە و باوەڕپێنەبوونیەتی، نموونەش لەسەری:**

– چیرۆکی (عبد یالیل بن عمرو الثقفي)ە کە لە ساڵی (١٠)ی پێغەمبەرایەتیدا پێغەمبەری خوا و (زید بن الحارثة) بۆ بانگەوازی ڕوویان کردە عەشیرەتی (ثقیف)، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ سەرکردەکانی (ثقیف)دا کە سێ برا بوون کۆبووەوە و ئیسلامی پێگەیاندن، هیچیان ئیسلامیان وەرنەگرت و هەڵوێستی یەکێك لە براکان کە ناوی (عبد یالیل) بوو بەم شێوەیە بوو کە وتی: ئەگەر تۆ ڕاست بکەیت ئەوا زۆر بەڕێزتریت تا وەڵامت بدەمەوە، وە ئەگەر درۆ بکەیت تۆ لەوە کەمتریت تا قسەت لەگەڵ بکەم، پاش ئەمە پشتی لێ هەڵکرد و ڕۆی، هیچ ئامادەییەکی تێدا نەبوو کە گوێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ بگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا لەبیریدا هەبوو ئەگەری ڕاستی و درۆیی بۆی.

ئەم پشتهەڵکردنەش هەندێکجار بە عیلمەوەیە و دەیزانن و پاشان پشتی لێ هەڵدەکەن، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمۡ خَيۡرٗا لَّأَسۡمَعَهُمۡۖ وَلَوۡ أَسۡمَعَهُمۡ لَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ ٢٣﴾ [الأنفال: ٢٣]. واتە خۆ ئەگەر خێریان تیادا بێت خوا دەیدات بە گوێیاندا، وە ئەگەر بیشیدا بە گوێیاندا پشت هەڵدەکەن و دەڕۆن و ئاوڕدانەوەیان نییە بۆ حەق بە هیچ جۆرێك لە جۆرەکان.

وە هەندێك جاریش بە نەزانینەوەیە پشتهەڵکردنەکەیان، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٱلۡحَقَّۖ فَهُم مُّعۡرِضُونَ ٢٤﴾ [الأنبياء: ٢٤]. زۆریان زانیاریان بەسەر حەقدا نییە و پشتیان تێکردووە.

بەڵام پشتهەڵکردنی تەواو پاش گەیشتنی پەیامەکەی خوایە بۆیان، کە ئەمە سیما و نیشانەی زۆری ئەهلی کیتابە لە گاوور و جوولەکەکان، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦۚ فَلَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٨٩﴾ [البقرة: ٨٩]. واتە کاتێك پێیان گەیشت ئەوەی دەیانزانی کە حەقە؛ باوەڕیان پێنەهێنا، نەفرەتی خوا لە بێبڕوایان بێت، وە دەفەرموێت: ﴿يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡ﴾ [البقرة: ١٤٦]. وەکوو منداڵەکانی خۆیان دەیانناسییەوە کە ئەم پێغەمبەرە و پەیامەکەی حەقن، وە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعۡرِضُونَ ٣﴾

[الأحقاف : ٣]. واتە ئەوانەی بێبڕوا بوون بە ئاگادارکردنەوەکانی خوا پشتیان لێ هەڵکرد و گرنگییان پێنەدا.

ئەم جۆرە بێبڕواییە بێبڕواییە بەشێوەی بێدەنگی و پشتهەڵکردن، بۆیە وەڵامی ئەم جۆرانەش لە گۆڕدا کاتێك پرسیاریان لێ دەکەن سەبارەت بە پێغەمبەر ﷺ دەڵێن: «هَاهْ، هَاهْ، لَا أَدْرِي، سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ، فَقُلْتُ مِثْلَهُ»(١). واتە: ها ها نازانم، گوێم لێبوو خەڵکی شتێکیان لە بارەیەوە دەوت، منیش دەموت. واتە بەبێ شوێنکەوتنی.

**جۆری چوارەم: بێبڕوایی گومان (كفر الشك):**

ئەم جۆرەیان خاوەنەکەی نە دان دەنێت بە ڕاستگۆیی پێغەمبەرەکەیدا، وە نە دان دەنێت بە بەدرۆخستنەوەیدا، یەکلابوونەوەیەکی بۆ نییە و لە گومان و دوودڵیدایە، ئەمە بۆخۆی لە سەرەتای کارەکەیەوەیەتی، گەرنا پاش ئەوە دەتوانێت ئەگەر مەبەستی بێت بەدواداچوونی بۆ بکات و یەکلابێتەوە، کە بۆخۆی بە شێوەیەکی گشتی بوونی ئیسلام بە ئاشکرایی و کتێب و کەسانی شارەزای ئەو دینە و کار و کرداری ئیمانداران و ڕێگەکانی بیستن ... ئەمانە هەموویان دەبنە هۆکاری وەرگرتنی دین و دەرکەوتن و ئاشکرابوونی وەکوو ڕۆژی ڕووناك بۆ کەسی خاوەن مەبەست، گەر بەسەر ئەمانەدا پشتی هەڵکرد، ئەوا دەچێتە بەشەکەی پێشوو کە بێبڕوای پشتهەڵکەرە، وە گەر بە دڵ باوەڕی پێکرد و بە زمانیشی باوەڕی پێکرد، بەڵام لووت بەرزی کرد و وەری نەگرت، ئەوا پەیوەست دەبێت بە بەشی دووەمەوە کە (كفر الإباء والإستكبار)ە، وە گەر بە دڵ باوەڕی کرد بەڵام بە زمانی بەدرۆی خستەوە، ئەوا پەیوەست دەبێت بە بەشی یەکەمەوە کە (كفر التكذيب)ە، وە گەر باوەڕی پێهێنا و بەڕاستی زانی و بە دڵ و زمان شوێنکەوتە و هەڵگری ئەو دینە بوو؛ ئەوا بە پێچەوانەی هەموویانەوە ئیماندارە.

نموونەی ئەم چوارەمە کە خاوەنی گومان و دوودڵییە لەسەر ئیمان، خاوەن دوو باخەکەی سوورەتی (الكهف)ە کە وتی: ﴿ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً ﴾ [الكهف : ٣٦]. واتە گومانم هەیە لە

(١) رواه أبو داود (٤٧٥٣)، والترمذي (١٠٧١)، وأحمد في "المسند" (١٨٥٣٤)، والحاكم في "المستدرك" (١٠٧)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (١٢٠٥٩)، والبيهقي في "الشعب" (٣٩٠)، والآجري في "الشريعة" (٨٦٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢١٤٠)، وصححه الألباني في "المشكاة" (١٣١)، و "صحيح الجامع الصغير" (١٦٧٦).

بوونی ڕۆژی قیامەت و زیندووبوونەوە، وە هاوەڵەکەی پێی وت: ﴿أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ﴾ [الكهف: ٣٧]. ئەوە بێبڕوا بوویت بەرامبەر ئەو خوایەی کە لە خاك دروستی کردوویت؟!

لەم بەشەدا ئیمان بوونی نییە لەگەڵ گوماندا، بەڵکوو دەبێت لەگەڵ ئیماندا دڵنیایی و باوەڕبوون هەبێت.

**جۆری پێنجەم: بێبڕوایی دووڕوویی (كفر النفاق):**

ئەم جۆرەیان دەربڕینی ئیمانە و باوەڕپێکردنە بە زمان، بەڵام بەدرۆزانینی و باوەڕپێنەبوونیەتی بە دڵ.

وەکوو بارودۆخی دووڕووەکانی ناو شاری مەدینە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، تەنانەت بە لاشە و کرداریش نوێژ و حەج و جیهادیان دەکرد، ئەم جۆرە بە پێچەوانەی جۆری یەکەمەوەیە، کە ئەوان بە دڵ باوەڕیان پێی هەبوو، بەڵام بە زمان و کردار نەیاندەکرد.

ئەم جۆرە بێبڕواییە دووڕووییە خوای پەروەردگار دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ﴾ [الفتح: ١١]. ئەوەی بە زمان دەیڵێن لە دڵیاندا نییە، وە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾﴾ [البقرة: ١٤]. ئەگەر بە بڕواداران بگەیشتنایە دەیانوت ئێمەش باوەڕدارین، وە گەر بە خراپەکارانی وەکوو خۆیان بگەیشتنایە دەیانوت ئێمە لەگەڵ ئێوەین، ئەوەی کە دەیکەین گاڵتەپێکردنیانە، وە دەفەرموێت: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴿١﴾﴾ [المنافقون: ١]. واتە دووڕووەکان دەڵێن شایەتی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خوای، خواش شایەتی دەدات کە دووڕووەکان درۆ دەکەن، لەبەرئەوەی تەنها بە ڕووکەش وادەڵێن، وە دەفەرموێت: ﴿يَحْذَرُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ ۚ قُلِ ٱسْتَهْزِءُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ ﴿٦٤﴾﴾ [التوبة: ٦٤]. واتە دووڕووەکان زۆر لەوە دەترسن سوورەتێك بێتەخوارەوە هەواڵی دڵیان ئاشکرا بکات، ئەی (محمد ﷺ) پێیان بڵێ گاڵتەی خۆتان بکەن، خوای گەورە ئەوەی کە لە ناخی دڵتاندایە پێتانی دەردەخات.

ئەم جۆرە دووڕووییە (نفاق الأكبر)ە، واتە دووڕوویی گەورەیە، كە خاوەنەكەی لە دین پێی دەردەچێت.

**هۆكاری سێیەمی گومڕایی: هاوبەش بڕیاردان (الشِّركْ).**

یەكێك لە هەرە ڕێگرییە بەربڵاوەكانی ناو ئادەمیزاد بە گشتی لە هەموو گەل و چینێكی پێشوودا بە ئێستەشەوە، هاوبەش بڕیاردان بووە بۆ خوا بە هەموو جۆرەكانیەوە، بۆیە كێشەی سەرەكی نێوان هەموو پێغەمبەران و گەلانیان لەسەر (توحید الألوهیة) بووە.

❁ (نُوحٌ) عَلَيْهِ السَّلَامُ لەگەڵ قەومەكەی: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ﴾ [الأعراف: ٥٩]. (نوح) بە گەلەكەی وت: ئەی گەلەكەم، خوا بە تاك و تەنیا بپەرستن، هیچ خوایەكی تر نییە بێجگە لەو.

❁ (هُودٌ) عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾﴾ [الأعراف: ٦٥]. (هود) بە گەلەكەی وت: ئەی گەلەكەم، خوا بە تاك و تەنیا بپەرستن، هیچ خوایەكی تر نییە بێجگە لەو.

❁ (ثمود) عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾ [الأعراف: ٧٣]. (ثمود) بە گەلەكەی وت: ئەی گەلەكەم، خوا بە تاك و تەنیا بپەرستن، هیچ خوایەكی تر نییە بێجگە لەو.

❁ (شُعَيْبٌ) عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾ [الأعراف: ٨٥]. (شعیب) بە گەلەكەی وت: ئەی گەلەكەم، خوا بە تاك و تەنیا بپەرستن، هیچ خوایەكی تر نییە بێجگە لەو.

❁ (إِبْرَاهِيمُ) عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾﴾ [الزخرف: ٢٦]. (إبراهیم) بە گەلەكەی و باوكی وت: من بەریم لەوەی كە ئێوە دەیپەرستن.

❁ (مُوسَىٰ) عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ﴾ [البقرة: ٥٤]. (موسى) بە گەلەكەی وت: ئێوە ستەمتان لە خۆتان

کردووە بەهۆی گوێرەکە پەرستنتانەوە، بگەڕێنەوە بۆلای خوای خۆتان.

❁ (المسيح) عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ﴾ [المائدة: ٧٢]. (عیسى) وتی: ئەی کوڕانی (بنی إسرائیل) ئەو خوایە بپەرستن کە خوای من و ئێوەشە، وە بزانن ئەوەی هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات حەرامە لەسەر بەهەشت و شوێنی دۆزەخە.

❁ (محمد) عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا﴾ [النساء: ٣٦]، ﴿قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا﴾ [الأنعام: ١٥١]. پێغەمبەری ئیسلام وتی: خوا بپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار مەدەن. وە خوای پەروەردگار پێی فەرموو: ئەی (محمد) پێیان بڵێ وەرن با ئەوەی حەرامە لەسەرتان پێتانی ڕابگەیەنم، ئەویش هاوبەش بڕیارنەدانە بۆ خوا.

❁ هەموو پێغەمبەران: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ﴾ [النحل: ٣٦]. بۆ هەموو گەلێك پێغەمبەرمان ناردووە بۆئەوەی پێیان ڕابگەیەنن کە خوا بپەرستن و لە هاوبەش بڕیاردان دووربکەونەوە.

هۆکار و مەبەست لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران و ناردنەخوارەوەی پەیامەکانی و پاداشت و سزای دوارِۆژ ... لەسەر ئەم بنەمای دینە دانراوە کە (توحيد الألوهية)ە، واتە خواپەرستی و دوورکەوتنەوەیە لە هاوبەش بڕیاردان، ئێستاش ئەوەی کە ونە لەناو گەلانی هەموو جیهان تەنها (توحيد الألوهية)ە، وە گەورەترین و سەرەکیترین هیدایەت وەرگرتنی ئەو (توحید)ەیە، کەواتە گەورەترین هۆکاری گومڕاییش جۆرەکانی هاوبەش بڕیاردانانە بۆ خوا، تەنانەت ئەگەر لەناو دینیشدا بێت هەمووی هەر هۆکاری هاوبەش بۆ خوا بڕیاردانە، هەر لە قەبر پەرستن و هاوارکردن لە غەیری خوا و کردنی جۆرێك لە جۆرەکانی پەرستن بۆ زیندوویەك بێت یاخود مردوویەك ... هەر لە شیعە و سۆفییەکان و دەروێش و ئەو هەموو تەریقەی تیجانی و شازلی و نەقشبەندی و سوهرەوەردی ... نموونەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکران بۆ ناو دین، چ جای دەرەوەی دین لە پەرستنی (عیسا) و پێغەمبەرانی جوولەکە و بوزا و کۆنفۆشیۆس و مانگاپەرستی هندۆسەکان و بتپەرستەکانی ئەفریقا ... .

وە هاوبەش بڕیاردانیش (الشرك) گەورەترین تاوانە لە ئیسلامدا و هەڵوەشێنەرەوەی ئیمان و كردەوەكانە، وەكوو خوای گەورە جَلَّ وَعَلَا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾﴾ [النساء: ٤٨]. واتە خوا لە شەریك بڕیاردان خۆش نابێت، بەڵام بێجگە لە شەریك بڕیاردان خوا بە ویستی خۆی لێیان خۆشدەبێت، وە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾﴾ [الزمر: ٦٥]. واتە وەحیمان ناردووە بۆ تۆ و پێغەمبەرانی پێش تۆ، ئەگەر شەریك بۆ خوا بڕیار بدەیت هەموو كردەوەكانت دەسڕینەوە و لەو كەسانە دەبیت كە زەرەرۆمەندن، وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾ [لقمان: ١٣]. واتە شەریك بڕیاردان گەورەترین ستەمە لە حەقی خوادا.

وە هاوبەش بڕیاردانیش كارێكە لە هەموو جۆرەكانی عیبادەتدا دروستدەبێت، بۆیە پەیوەندی بە هەموو دینەوە هەیە، وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: «الشِّرْكُ فِي أُمَّتِي أَخْفَى مِنْ دَبِيبِ النَّمْلِ عَلَى الصَّفَا»[1].

واتە: شەریك بڕیاردان لە گەلەكەی مندا لە ڕۆیشتنی مێروولەیەك بەسەر شاخێكی لووسدا ووردترە و نابینرێت.

**هۆكاری چوارەم: شوێنكەوتنی حەز و ئارەزووەكان (إتباع الهوى).**

هەوا و ئارەزوو و حەزەكانی ئادەمیزاد زۆر شت لەخۆدەگرێت لە جۆرەكانی تاوان، وەكوو: (الفسق، إتباع الشيطان، التقليد، التعصب، إتباع الظن والشك وحب الدنيا والبدعة والتشبه بالضالين ...).

هەرچییەك لە بازنەی حەز و ئارەزووەكانی ئادەمیزاددا هەیە و جێگەی دەبێتەوە هەمووی هۆكارە و بەربەستە لە وەرگرتنی هیدایەت و ڕێگەكەیدا، هەر سوننەتی خوا وایە هەوا و ئارەزوو

(١) رواه البخاري في "الأدب المفرد" (٧١٦)، وأحمد في "المسند" (١٩٦٠٦)، وأبو يعلى في "مسنده" (٥٨)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٩٥٤٧)، وابن بطة في "الإبانة" (٩٨١)، وأبو نعيم في "الحلية" (٧/ ١١٢)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٣٧٣٠).

بەرامبەر هیدایەتە، لەبەرئەوەی هەوا و ئارەزوو بۆ خودی ئادەمیزادە و مافی خۆی تیادا دەبینێت، وە هیدایەتیش مافی خوایە، دەبێت هەر بۆ ئەو بێت و بەشی بوونێکی تری تێدا نەبێت، وە هەموو کێشەکان و کێشمەکێشەکانی سەر زەوی هەر لەم نێوەندەدایە.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ﴾ [القصص : ٥٠]. واتە کێ لەوە گومڕاترە کە شوێنکەوتەی هەوا و ئارەزووەکانیەتی بەبێ هیدایەتی خوا، لە ئایەتەکەدا وشەی (هوى) و (هدى) بەرامبەر یەکن و بە وشەی (غير) جیاکراونەتەوە و نێوانگیری کردووە، واتە (هوى) حەز و ئارەزووە و بێجگە لە هیدایەت هەموو شتێکی تری تێدایە، وەك دەفەرموێت: ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ﴾ [الفاتحة : ٧]. لەپاش ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾﴾ [الفاتحة : ٦]. واتە هیدایەتم بدە بۆ ڕێگە ڕاستەکە بێجگە لە ڕێگە گومڕایی و سزادراوەکان، وە جیاوازی داڕشتنی پیتی نێوان ئەو دوو وشەیەش یەك پیتی جیاوازە ئەویش (واو)ە کە لە وشەی (هدى)دا نییە، وە (دال)ە لە وشەی (هوى)دا نییە، واتە زۆر نزیکن لە یەکەوە.

وە هەموو تاقیکردنەوەکانی خواش لە عیبادەت و عەقیدەدا هەر بۆ ئەوەیە کە شوێنکەوتەی هیدایەت بیت و دابڕێیت لە هەوا و ئارەزووەکانت، وەك دەفەرموێت: ﴿فَلَا تَتَّبِعُوا الْهَوَىٰ﴾ [الفاتحة : ١٣٥]. واتە شوێنکەوتەی هەوا و ئارەزووەکانت مەبە، وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا أَهْوَاءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا﴾ [المائدة : ٧٧]. واتە شوێنکەوتەی هەوا و ئارەزووەکانی کەسانی گومڕا مەبە، وە دەفەرموێت: ﴿لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ [الحجرات : ١]، ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ [الأنعام : ١١٩]. واتە زۆری خەڵکی گومڕا بوون بە هۆکاری هەوا و ئارەزووەکانیانەوە بەبێ عیلم، وە دەفەرموێت: ﴿قُل لَّا أَتَّبِعُ أَهْوَاءَكُمْ قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾﴾ [الأنعام : ٥٦]. واتە ئەی (محمد) بڵێ من شوێنکەوتەی هەوا و ئارەزووەکانتان نابم، گەر وابم گومڕا دەبم و هیدایەتدراو نابم، وە دەفەرموێت: ﴿وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ﴾ [المؤمنون : ٧١]. واتە ئەگەر حەق شوێنکەوتەی هەوا و ئارەزووەکان بێت ئاسمان و زەوی تێکدەچێت بەوانەشەوە کە تیایدان، وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ [الأنعام : ١٥٠]. واتە شوێنی هەوا و ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە فەرمانەکانی خوا بە درۆ دەزانن.

ئەم ئایەتانە هەمووی ئاماژە بۆ یەك كار دەكەن، ئەویش شوێن نەكەوتنی هەوا و ئارەزووی ئادەمیزادە، لەبەرئەوەی دوژمنی سەرەكییانە، لەبەرئەوە مەرجی یەكەمی كردەوە وەرگیراوەكان نیەتپاكییە (الإخلاص) لەگەڵ خوادا، وە ئەوەی داواكراوە لە كارەكاندا نەبوونی حەزەكانی خۆتە.

هەوا و ئارەزوو هۆكاری شێواندنی كاركردن و وەرگرتنە، وە چۆنیەتی ئەنجامدان لە ئادەمیزاددا دەگۆڕێت بۆ شێوازێكی ناسروشتی كە كەسان و بوونێكی تر بەشداری تیادا بكەن.

هەموو تاوانەكان كە هۆكاری شوێنكەوتەی ئارەزووەكانە كاریگەری هەیە لەسەر گۆڕانكاری لە دڵدا، وە دڵیش مەلیك و سەركردەی لاشەی ئادەمیزادە، وە بێگومان هەموو هەست و فەرمانەكان لەوێوە دەردەچێت، هەر لەبەر ئەوەشە كە هەڕەشەكانی خوا لە سەرەتای قورئانەوە تا كۆتایی هەمووی بۆ سەر دڵە.

پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ العَبْدَ إِذَا أَخْطَأَ خَطِيئَةً نُكِتَتْ فِي قَلْبِهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ، فَإِذَا هُوَ نَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ وَتَابَ سُقِلَ قَلْبُهُ، وَإِنْ عَادَ زِيدَ فِيهَا حَتَّى تَعْلُوَ قَلْبَهُ، وَهُوَ الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ: ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ [المطففين: ١٤].»[(١)].

واتە: ئەگەر كەسێك تاوانێكی كرد خاڵێكی ڕەش لەسەر دڵی دادەنرێت، ئەگەر گەڕایەوە و داوای لێخۆشبوونی كرد ئەوا دڵی پاك دەبێتەوە، وە ئەگەر گەڕایەوە سەر تاوان و زیادی كرد، ئەوا خاڵەكان زیاد دەبن، تاوەكوو تارماییەك بەسەر دڵیدا دێنن، ئەویش ئەو تارماییەیە كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ [المطففين: ١٤]. واتە بەڵكوو تارماییەكی ڕەشە هاتووە بەسەر دڵیاندا.

- وە پاش ئەمەش ئەگەر تاوانی زیاتری كرد ئەوا: ﴿وَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ﴾ [التوبة: ٨٧]. مۆر لەسەر دڵ دەدرێت.

---

(١) رواه الترمذي (٣٣٣٤)، والنسائي في "الكبرى" (١٠١٧٩)، وابن ماجه (٤٢٤٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٩٣٠)، وأحمد في "المسند" (٧٩٥٢)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي، والحاكم في "المستدرك" (٣٩٠٨) وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ ، والبزار في "المسند" (٨٩٣٤)، والبيهقي في "الشعب" (٦٨٠٨)، وابن بطة في "الإبانة" (٩٧٤)، والآجري في "الشريعة" (٢١٢)، والبغوي في "شرح السنة" (١٣٠٤)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (١٦٧٠).

- پاشان: ﴿وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم﴾ [الأنعام : ٤٦]. لە زیادکردنی تاواندا مۆرێکی هەڵکەنراو لە دڵ دەدرێت.

- پاشان: ﴿عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ﴾ [محمد : ٢٤]. لە زیادکردن و بەردەوامی تاواندا دڵەکان قوفڵ دەدرێن.

- پاشان: الأكنة والغطاء والغلاف والحجاب والوقر والغشاوة ... والمرض وتقليب الأفئدة والحول بين المرء وقلبه وإزاغة القلوب ...(١).

ئەمانە هەموو ئەو قۆناغی تاوانبارییانەیە کە بەسەر دڵدا دێت، وەك پەردە هاتن بەسەر دڵدا و خستنە لاوە و داپۆشین و نەخۆشی و هەڵگێڕانەوەی و نێوانکردنی و لادانی لە وەرگرتنی حەق و ڕەق و ئەستووربوونی، هەمووی هۆکاری مردنی حەقیقییە بۆ دڵ و لەکارکەوتنە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ﴾ [الأنعام : ١١٠]. دڵیان هەڵدەگێڕینەوە، وە دەفەرموێت: ﴿وَلَـٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ [الأنعام : ٤٣]. واتە بەڵام دڵەکانیان ڕەق و ئەستوور دەکەین، وە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ﴾ [فصلت : ٥]. واتە دەڵێن دڵمان لە گۆشەیەکدایە لێتان تێناگات، وە دەفەرموێت: ﴿يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ﴾ [الأنفال : ٢٤]. واتە خوا جیاوازی دەخاتە نێوان دڵ و خاوەنەکەیەوە، وە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ﴾ [الصف : ٥]. واتە کاتێك گومڕا بوون دڵیانمان گومڕا کرد، وە دەفەرموێت: ﴿فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ [البقرة : ١٠]. واتە لە دڵیاندا نەخۆشی هەیە، وە دەفەرموێت: ﴿فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ﴾ [آل عمران : ٧]، ﴿وَقَالُواْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ﴾ [البقرة : ٨٨]. واتە دەڵێن پەردە بەسەر دڵماندا هاتووە و تێناگەین لێتان، وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا﴾ [الكهف : ٢٨]. واتە گوێڕایەڵی ئەوانە مەکە کە دڵیان بێئاگا کردووە لە ئێمە

خاوەنی ئەم حاڵەتانە مردوون و زیندووبوونەوەیان نییە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَمْوَٰتٌ غَيْرُ أَحْيَآءٍ﴾ [النحل : ٢١]، وەکوو شاعیریش دەڵێت:

(١) "شفاء العليل" لابن القيم ص٩٢.

وَفِي الْجَهْلِ قَبْلَ الْمَوْتِ مَوْتٌ لِأَهْلِهِ        وَأَجْسَامُهُمْ قَبْلَ الْقُبُورِ قُبُورُ[(١)]

واتە: ئەمانە پێش مردن خاوەنەکانیان مردوون بە هۆکاری نەزانین و گومڕاییانەوە، وە لاشەیان پێش ئەوەی بخرێنە ناو گۆڕەوە خۆی گۆڕە.

**هۆکاری پێنجەم: لووت بەرزی و خۆبەگەورەزانین (التکبر).**

هۆکارێکی دەروونی بۆ گومڕاکردن و سەرلێشێواندن، لووت بەرزی و خۆ بەگەورە و کامڵ زانینە لە ناخی خاوەنەکانیدا، ئەمە دەرد و نەخۆشی دەسەڵاتدار و پلەوپایە دونیاییەکانی ئەو خەڵکەیە، لە دەسەڵاتی سیاسی و ماڵی و زانستی و پلە و پۆستەکانی تر.

لەبەرئەوەی وەکوو (ابن القیم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: لِأَن أَحْكَام الرب سُبْحَانَهُ كثيرا مَا تَأتي على خلاف أغراض النَّاس وَلَا سِيمَا أهل الرياسة وَالَّذين يتبعُون الشُّبُهَات فَإِنَّهُم لَا تتمّ لَهُم أغراضهم إِلَّا بمخالفة الْحق وَدفعه كثيرا فَإِذا كَانَ الْعَالم وَالْحَاكِم محبين للرياسة متبعين للشهوات لم يتم لما ذَلِك إِلَّا بِدفع مَا يضاده من الْحق[(٢)].

واتە: یاساکانی خوا زۆریان بە پێچەوانەی خواستی ئادەمیزادەوەیە، بەتایبەت کەسانی خاوەن دەسەڵات، لەبەرئەوەی مەبەست و حەزەکانیان نایەتە دی بێجگە بە ڕێگەی پێچەوانەیەتی حەق و کارپێکردنیەوە نەبێت، ئەوکات لە سزا و تۆڵەی ئەوەشدا خواش ڕێگرییان لێدەکات لە وەرگرتنی ئیمان و حەق، وەکوو دەفەرموێت: ﴿ سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَإِن يَرَوْاْ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُواْ بِهَا وَإِن يَرَوْاْ سَبِيلَ ٱلرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا ﴾ [الأعراف: ١٤٦]. واتە ڕێگری لە خۆبەگەورەزانان دەکەین لە سوودبینینیان لە ئایەتەکانمان، ئەوانەی بەبێ حەق خۆیان باڵادەست و گەورە کردووە، ئەوانە هەرچی ئایەت و دەسەڵاتی ئێمە هەیە پشانیان بدەیت باوەڕ ناهێنن و ڕێگەی ڕاست ناگرنە بەر، بەڵام گەر ڕێگەی ستەم و گومڕایی ببینن دەیگرنە بەر و شوێنکەوتەی دەبن.

---

(١) "إغاثة اللهفان" لابن القيم (١/ ٢٢)، "مدارج السالكين" لابن القيم (٣/ ٢٤٥).

(٢) "الفوائد" لابن القيم ص١٠٠.

- خۆ بەگەورەزانین لـە مافی خوادا وەکوو فیرعەون کە وتی: ﴿أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٢٤﴾﴾ [النَّازعَات : ٢٤]. واتە من خوا و بەڕێوەبەری ئێوەم، یاخود وەکوو: ﴿إِنَّهُمۡ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٣٥﴾﴾ [الصَّافات : ٣٥]. واتە ئەوانە ئەگەر پێیان بوترایە هیچ خوایەك نییە بێجگە لە (الله)، لووت بەرزییان دەنواند و وەریان نەدەگرت.

- وە لـە مافی پێغەمبەرانیشدا باوەڕنەهێنانە بە پێغەمبەرایەتییان، وەکوو: ﴿أَنُؤۡمِنُ لِبَشَرَيۡنِ مِثۡلِنَا﴾ [المؤمنون : ٤٧]. دەیانوت: ئەوە باوەڕ بە دوو کەس (موسا و هاروون) بێنین کە وەکوو ئێمە ئادەمیزادن؟ یاخود: ﴿أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمۡ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهۡوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ فَفَرِيقٗا كَذَّبۡتُمۡ وَفَرِيقٗا تَقۡتُلُونَ ﴿٨٧﴾﴾ [البَقَرَة : ٨٧]. واتە گەر پێغەمبەرێکمان بناردایە لووت بەرزییان دەنواند و هەندێکیان بە درۆزنیان دەزانی و هەندێکیشیان دەکوشتن.

- وە لـە مافی خەڵکیشدا: ﴿إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظۡلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾ [الشّورى : ٤٢]. واتە ڕێگەی سزای خوایی لـەسەر ئەو کەسانەیە کە ستەم لـە خەڵکی دەکەن لـەسەر زەویدا بەبێ حەق.

لـە مافی خوادا سیفاتێك لـە سیفاتەکانی خوایەتی بۆ خۆیان دروستدەکەن، بەوەی کە بە گەورەیی و باڵادەستی خۆیان دەڕازێننەوە، وە لـە مافی پێغەمبەرانیشدا شوێنکەوتەییان پێناکرێت، ناتوانن بچووك ببنەوە بچنە ژێر باری گوێڕایەڵیکردنیەوە، وە لـە مافی خەڵکیشدا ستەم و سزا و ماف خواردنی خەڵك پیشەیانە و بە جۆرێك لـە خوایەتی خۆیان دەسەپێنن بەسەر خەڵکیدا.

لـە هەموو حاڵەتەکاندا ئەمان ڕقیان لـە حەق و خاوەنەکانیانە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ، وَغَمْطُ النَّاس»[1]. پێناسەی خۆ بەگەورەزانین دەکات بە ڕەتکردنەوەی حەق و ڕقلێبوونی خاوەنەکەی.

(١) رواه مسلم (٩١)، وأبو داود (٤٠٩٢)، والترمذي (١٩٩٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٥٤٦٦)، وأحمد في "المسند" (٤٠٥٨)، والحاكم في "المستدرك" (٦٩)، والبزار في "المسند" (١٠٠٧٠)، والطبراني في "الشاميين" (٧٤٥)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٥٥٥٧)، والبيهقي في "الشعب" (٥٧٨٢)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٦١١)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٥٨٧).

سزای خواش بۆیان وەكوو دەفەرمویت: ﴿كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلۡبِ مُتَكَبِّرٖ جَبَّارٖ ٣٥﴾ [غافر: ٣٥]. واتە خوای گەورەش مۆری تاوانباری و نەگبەتی دەدات لەسەر دڵی هەموو خۆ بەگەورەزانێكی ستەمكاردا، وە دەفەرمویت: ﴿أَلَيۡسَ فِي جَهَنَّمَ مَثۡوٗى لِّلۡمُتَكَبِّرِينَ ٦٠﴾ [الزمر: ٦٠]. بەس نییە كە شوێن و لانەی لووت بەرزەكانی دونیا دۆزەخ بێت؟!

وە هەر سروشتی دینی خوا و هیدایەتەكەشی وایە كە هەموو خۆ بەكەمزان و ملكەچ و لاوازێك وەریدەگرێت، بۆیە خوای پەروەردگار بە بەندەكانم ناویان دەبات كە دەفەرمویت (یا عبادی، عبدنا)، بەڵام دەسەڵاتداران و لووت بەرزان كەسانی گومڕان، بۆیە بەهەشت و جەهەننەم دەڵێن: «احْتَجَّتِ النَّارُ وَالْجَنَّةُ، فَقَالَتِ النَّارُ: يَدْخُلُنِي الْجَبَّارُونَ، وَالْمُتَكَبِّرُونَ، وَقَالَتِ الْجَنَّةُ: يَدْخُلُنِي الضُّعَفَاءُ، وَالْمَسَاكِينُ، فَقَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ لِلنَّارِ: أَنْتِ عَذَابِي، أَنْتَقِمُ بِكِ مِمَّنْ شِئْتُ، وَقَالَ لِلْجَنَّةِ: أَنْتِ رَحْمَتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ شِئْتُ»[1].

واتە: دۆزەخ وتی: خوایە هەرچی خۆ بەگەورەزان و دەسەڵاتدارانی ستەمكارن دێنە ناو من، بەهەشتیش وتی: هەرچی هەژار و كەم دەسەڵاتە منت كردووەتە لانەیان، خوای گەورەش بە بەهەشتی فەرموو: تۆ ڕەحمەتی منیت، هەركەسێك بەر بەزەیی من بكەوێت دەیخەمە ناو تۆوە، وە بە دۆزەخیشی فەرموو: تۆ سزای منی، تۆڵەت پێدەكەمەوە بەوانەی كە ویستم لەسەریەتی.

**هۆكاری شەشەم: ستەمكردن (الظلم).**

ڕێگەیەكی تر لە ڕێگرییەكانی هیدایەت بۆ وەرگرتنی حەق، ستەم و ستەمكارانن، ستەمكاریش ناكرێت هەتا بە كۆمەڵێك ڕێگەی تاوان و شكاندنی فەرمانەكانی خوادا تێپەڕ نەبوویت و دەقی پێوە نەگرتبێت و نەبووبێتە ڕێگا بۆی.

❁ قال تعالى: ﴿أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرۡتَابُوٓاْ أَمۡ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَرَسُولُهُۥۚ بَلۡ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٥٠﴾ [النور: ٥٠].

---

(١) رواه البخاري (٧٤٤٩)، ومسلم (٢٨٤٦)، والترمذي (٢٥٦١)، والنسائي في "الكبرى" (١١٤٥٨)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٤٤٧)، وأحمد في "المسند" (٩٨١٦) واللفظ له، والبزار في "المسند" (٩٨٥٥)، وأبو يعلى في "مسنده" (١١٧٢)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٥٢٨)، والآجري في "الشريعة" (٩٢٠)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٧٢٠)، والبغوي في "شرح السنة" (٤٤٢٢).

واتە: لە دڵیاندا نەخۆشی هەیە یاخود گومان، وا دەترسن خوا و پێغەمبەرەکەی ستەمیان لێ بکەن، ستەم لەوانەوە دوورە، بەڵکوو خۆیان ستەمکارن.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَشَهِدُوا أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ ۚ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٨٦﴾﴾ [آل عمران: ٨٦].

واتە: چۆن خوا هیدایەتی کەسانێك دەدات کە بێبڕوا بوون لەدوای ئەوەی کە زانییان پێغەمبەر و پەیامەکەی حەقن، خوا هیدایەتی گومڕاکاران نادات.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ۖ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ الظَّالِمِينَ ﴿١٠٦﴾﴾ [يونس: ١٠٦].

واتە: داوا بێجگە لە خوا مەکە کە هیچ سوود و زیانێکت پێناگەیەنێت، گەر بەو شێوەیە بیت ئەوا تۆ کەسێکی ستەمکاری لە مافی خوادا.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالًا ﴿٢٤﴾﴾ [نوح: ٢٤].

واتە: ستەمکاران لە گومڕایی بەردەوامدان.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٢٥٨﴾﴾ [البقرة: ٢٥٨].

واتە: خوا هیدایەتی گومڕا و ستەمکاران نادات.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا هُمُ الظَّالِمِينَ ﴿٧٦﴾﴾ [الزخرف: ٧٦].

واتە: ئێمە ستەممان لێ نەکردوون، بەڵکوو خۆیان ستەمکار بوون.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الظَّالِمُونَ ﴿٤٩﴾﴾ [العنكبوت: ٤٩].

واتە: هیچ کەسێك نییە کە باوەڕی بە پەیامەکەی خوا نەبێت بێجگە لە ستەمکاران نەبێت.

ستەمکردن لە مافی خوا و پێغەمبەرەکەی و خەڵکی هۆکاری ئەوەیە کە لە حەق و هیدایەتەوە دوورە، وە کەسێکیش دادپەروەر نەبێت بۆ خۆی و خەڵکی ئەوا ناتوانێت دادپەروەرییەکەی خوا وەربگرێت، لەبەرئەوە نەبینراوە ستەمکاران خاوەن هیدایەت و حەق بن و ماف پارێز بن.

یاسا و بەرنامەی خوا پاکترین و دادپەروەرترین بەرنامەیە، لەبەرئەوە زۆرترین بەکارهێنانی وشەی حەق لەخۆدەگرێت، وە ئادەمیزادیش سروشتی خۆی ستەم و ستەمکارییە و ڕاهاتنە

لەسەری، لەبەر نەزانین و ناتەواوییەکانی خۆی، بۆیە قورسترین و گرانترین کار وەرگرتنی دینی خوایە، وەکوو خوای پەروەرگار دەفەرمویت: ﴿وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا ٧٢﴾ [الأحزاب : ٧٢]. واتە ئادەمیزاد پەیامەکەی خوای هەڵگرت، بەڵام هەر لە دروستکردنیەوە ستەمکارە لەبەرئەوەی نەزانە، وە دەفەرمویت: ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَظَلُومٞ كَفَّارٞ ٣٤﴾ [إبراهيم : ٣٤]. واتە بە دڵنیاییەوە ئادەمیزاد زۆر ستەمکار و بێبڕوایە، وە دەفەرمویت: ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٞ ٦﴾ [العاديات : ٦]. واتە ئادەمیزاد لەسەر نیعمەتەکانی خوای خۆی نکوولێکارە، هەر لەبەر ئەمانەیە شایستەی ئەوەیە کە خوای پەروەردگار پێی دەفەرمویت: ﴿قُتِلَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَآ أَكۡفَرَهُۥ ١٧﴾ [عبس : ١٧]. واتە هەی تیابچیت و بکوژرێیت ئادەمیزاد چەندە بێبڕوای.

ئەمانە گرنگترین هۆکارەکانی گومڕایین لە ڕێگەی وەرگرتنی حەقدا، ئەگەرچی چەندەها هۆکاری تر هەیە بۆ گومڕاییکردن، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئەو جۆرانەی تریش لەژێر ناونیشانێك لەم ناونیشانانەدا کۆدەبێتەوە.

لە ئەنجامی ئەم بەشەشدا ڕوون بووەوە کە ئادەمیزاد لە نێوان ڕێگەی هیدایەت و گومڕاییدایە، وە لە توانایدا هەیە بژاردەی لایەك بکات و بیگرێتە بەر، بەڵام هەردوو ڕێگاکە هۆکار و ڕێگای تایبەتی خۆی هەیە کە خاوەنەکەی دەگەیەنێتە ئەنجام.

وە زانیمان کە خوای پەروەردگار خاوەن و دروستکاری بەندەکانی و هەردوو ڕێگا و هۆکارەکانیەتی، وە کارکردن و گرتنەبەری ڕێگا و بەکارهێنانی پێبەخشراوەکانی لەلایەن بەندەکانیەوەیەتی و کاری خۆیانە.

وە پەیوەندییەك هەیە بۆ هەڵسووڕانی کارەکان لە نێوان کاری خوا و کاری بەندەکانیدا، ئەم پەیوەندییە نهێنی خوایە لە بەڕێوەبردنی دروستکراوەکانیدا و هیچ کەسێك و بوونێك توانای زانین و دەرکپێکردنی نییە و پێویستە بەدوایدا نەچێت، وەکوو خۆی دەفەرمویت: ﴿لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ﴾ [الأنبياء : ٢٣]. واتە پرسیار لەو بارەیەوە ناکرێت، لەبەرئەوەی تۆ (مخلوق)یت و توانا و زانینت بەسەر کارەکانی (خالق)دا نییە.

بۆ زیاتر شارەزابوون و ئاشنابوون بەسەر ڕێگەکانی هیدایەت و گومڕایی و دەرئەنجام و کاریگەرییەکانیان، پێویستمان بە زانین و شارەزابوون هەیە بەسەر کار و هۆکارەکانیدا، تاوەکوو ووردەکاری لەسەر کاریگەری هۆکارەکان و هاتنەدی کارەکان بزانین، وە تا چەند و چۆن ئادەمیزاد لەو نێوەندەدایە و کاری بۆ دەکرێت، وە چ ڕێنموونی و مامەڵە و شێوازێکی بەکارهێنان هەیە بۆ گرتنەبەری هۆکارەکان، شارەزابوون بەسەر ئەمانەدا لەم بابەتەی دواتردا دێت.

  

# بابەتی حەوتەم

## کار و هۆکارەکانی

## (الأسباب والمسببات)

دارِشتن و سوننەتی خوا وایە لە بوونەوەردا کە هیچ کارێك بەبێ هۆکارەکەی نایەتە دی، کارەکان دروستکراو و قەدەری خوایین لە بووندا، ئەمە پەیوەندی بە (توحید)ەوە هەیە کە بەڕێوەبەری دروستکراوەکانیەتی (خالق ومدبر)، وە گرتنەبەری هۆکارەکان بۆ هێنانەدی کارەکان و پاراستنی لە ڕێگری و دژەکانی، ئەمەش پەیوەندی بە یاسا شەرعییەکانەوە هەیە کە ڕێنموونی کردوویت بۆ کارەکان، باوەڕبوون بەم دوو قەدەرە (قەدەری کەونی و گرتنەبەری قەدەرە شەرعییەکان) پێویستییەکانی دونیا و دوارِۆژ دێنێتەدی.

**وە هۆکارەکانیش لە قورئاندا دوو جۆرە:**

١. **هۆکارە کەونییەکان:** وەکوو دروستکردنی ئاسمان و زەوی و شەو و ڕۆژ و ئادەمیزاد و گیانلەبەران و پێویستییەکانیان لە باران بارین و ڕووانی کشتوکاڵ و ڕزق و ڕۆزییان ... .

وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡ﴾ [البَقَرَة: ٢٢].

واتە: هەر ئەو خوایە کە لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت بۆ هێنانەدی بەروبوومەکان و ڕۆزییەکانتان.

وە دەفەرموێت: ﴿فَالِقُ ٱلۡإِصۡبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيۡلَ سَكَنٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ حُسۡبَانٗا﴾ [الأنعَام: ٩٦].

واتە: خوا دروستکاری شەو و ڕۆژە بۆ ژیانتان و مانگ و ڕۆژی دروستکردووە بۆ ژمارەی ساڵ و مانگ.

وە دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ ٤٥﴾ [النَّجۡم: ٤٥].

واتە: خوا دروستکاری نێر و مێیە لە ئێوەدا.

وە دەفەرموێت: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُ﴾ [الجَاثِيَة: ١٣].

واتە: خوای پەروەردگار هەرچییەك هەیە لە ئاسمان و زەویدا بۆی ڕەخساندوون.

وە دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ [البَقَرَة : ٢٩].

واتە: هەر ئەو خوایەیە کە هەرچییەکی لە ئاسمان و زەوی دروستکردبێت بۆ خزمەتی ئێوەیە.

هەموو ئەو پێویستییانەی بوونەوەران لە باران و شەو و ڕۆژ و مانگ و ڕەگەزەکان، بگرە هەموو بوونەوەرەکان لە خزمەتی ئادەمیزاددایە بۆ بەکارهێنانی خۆی.

٢. **هۆکارە شەرعییەکان:** جێبەجێکردنی شەرعی خوایە لە گرتنەبەری ڕێگەی خێر و چاکە و عیبادەت و خواناسی و پاککردنەوەی دەروون و گرتنەبەری هەموو ڕێگە خێرەکان لەگەڵ خۆت و خێزان و کۆمەڵگا و وڵات و ئەوەی کە پەیوەندیداری پێیەوە، وە دوورکەوتنەوە لە هەموو ڕێگە شەڕەکانی نەفس و شەیتان و خراپەکارانی چواردەور و چۆنیەتی خۆپاراستن لێیان.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾﴾ [النَّحل : ٩٠].

واتە: خوای پەروەردگار فەرمان دەکات بە دادپەروەری و چاکەکان و گەیاندنی پەیوەندییەکانی کەس و کار، وە ڕێگری دەکات لە خراپە و تاوان و ستەمکردن.

وە دەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ [المزمل : ٢٠].

واتە: نوێژ و زەکات و هەموو کارە خێرەکانتان و ئەوەی پێشتان خستووە بۆتان کۆکراوەتەوە لەلای پەروەردگار، قورئان بۆخۆی باشترین ڕوونکردنەوە و ڕێنموونی هەیە بۆ ڕێگە چاکەکان و هاندانی خاوەنەکەی و ڕەخساندنی یارمەتی و پشت و پەنا بۆی.

وە دەفەرموێت: ﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً﴾ [النَّحل : ٩٧].

واتە: ئەو ئیماندارەی کە کردەوەی چاك دەکات لە نێر و مێ؛ لە پاداشتیدا باشترین ژیانی بۆ دەڕەخسێنین.

وە دەفەرموێت: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۙ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٩﴾﴾ [المَائدة : ٩].

واتە: خوا بەڵێنی بە ئیمانداران داوە کاتێك کاری چاك ئەنجام دەدەن لە پاداشتدا لێخۆشبوون و پاداشتی گەورەیان هەیە.

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: والناس في هذا المقام أربعة أقسام: فأعجزهم من لم يبذل السبب ... والثاني: مقابلة ... والثالث: من استعمل الأسباب وصرف همته إليها وقصر نظره عليها ... والرابع: مقابله وهو رجل نبذ الأسباب وراء ظهره [(١)].

واتە: خەڵکی لە گرتنەبەری هۆکارەکان چوار جۆرن:

**جۆری یەکەم:** کەسێکە هیچ هۆکار و ڕێگایەك ناگرێتە بەر، ئەمانە لاواز و بێڕێزترین دروستکراون.

**جۆری دووەم:** کەسێك کە بەهیممەتترین کەسە لە گرتنەبەری هۆکارەکان، وە دوعا و داواکردنێکی هەیە لە خوای خۆی کە لێی وەربگرێت، وە هەستی بۆ کارەکانی وەکوو کەسێك وایە کە هیچ هۆکارێکی نەگرتبێتە بەر و لە حاڵەتێکی بێ هیوایی و موفلیسیدا بێت کە خاوەنی هیچ ڕێگا و توانایەك نەبێت و تەنها چاوی لە ڕەحمەتی خوا بێت.

**جۆری سێیەم:** کەسێك هۆکارەکان دەگرێتە بەر بەڵام هەموو ئاوات و پشت و پەنا و هیوایەکی جەخت دەکاتەوە سەر هۆکارەکان، پشت هەڵکراوە لە بینینی یارمەتییەکانی خوا، ئەم جۆرە ئەگەر بەشێکی هەبێت لەم هۆکار و کارانەدا کە خوا بۆی پەیوەستکردووە پێوەی؛ بەڵام متمانەی بەردەوامی نابێت و لەسەر ڕێگەی هەموو هاتنی بەڵا و ڕێگرییەکانیدایە و دراوەتە دەست خۆی و هۆکارەکانی و بەگوێرەی توانا و بوون هێزی دیاریکراوی خۆی پێدەدرێت، ئیتر یارمەتییەکانی خوا و بەرەکەت و بۆ ڕەخساندنی کارئاسانی دەرەوەی هۆکارەکان لە زیادە و بەخشینی یارمەتی، ئەمانەی پێنادرێت، بە هۆکاری نەبوونی پەیوەندییەکی ئیمانی و عەقیدەیی لە پشتبەستن و داوا و یارمەتی لە خوا، وە کاڵ و کرژی خاوەنەکەی لە (توحید)دا و نەبوونی عیبادەتە دڵییەکان.

**جۆری چوارەم:** کەسێك هەرچی هۆکارەکان هەیە خستوویەتییە پشتییەوە و نایگرێتە بەر، ڕوودەکاتە دوعا و پاڕانەوە و داواکردن، ئەمە لەڕووی پەراوێزخستنی هۆکارەکانەوە هەڵەیە و

---

(١) "بدائع الفوائد" لابن القيم (٣/ ١٧٩).

تاوانبارە، وە لەڕووی پاڕانەوە و داواکارییەکانی لە خوا و ڕووکردنە ئەو هۆکارێکی چاکە و ڕێگەیەکە لە ڕێگەکانی گەیشتن بە مەبەستەکان، بەڵام ئەم داواکاری و پاڕانەوانە کاری پێش و دوای گرتنەبەری هۆکارەکانە، ئەم کەسە وەکوو یەکێك وایە کە دوژمن دەوری دابێت، هیچ بەرگرییەك نەکات و داوا بکات لە خوا کە بیپارێزێت، یاخود وەکوو کەسێك وایە کە تینوو بێت و ئاو نەخواتەوە و داوا بکات خوا تێرئاوی بکات.

## گرنگترین نهێنییەکانی ناو هۆکارەکان چوار خاڵن:

١. هۆکارەکان سەربەخۆ نین بە خۆیان (الأسباب ليست مستقلة بنفسها):

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ **دەڵێت**: الَّذِي عَلَيْهِ السَّلَفُ وَأَتْبَاعُهُمْ وَأَئِمَّةُ أَهْلِ السُّنَّةِ وَجُمْهُورُ أَهْلِ الْإِسْلَامِ الْمُثْبِتُونَ لِلْقَدَرِ الْمُخَالِفُونَ لِلْمُعْتَزِلَةِ إثْبَاتَ الْأَسْبَابِ وَأَنَّ قُدْرَةَ الْعَبْدِ مَعَ فِعْلِهِ لَهَا تَأْثِيرٌ كَتَأْثِيرِ سَائِرِ الْأَسْبَابِ فِي مُسَبَّبَاتِهَا؛ وَاَللَّهُ تَعَالَى خَلَقَ الْأَسْبَابَ وَالْمُسَبَّبَاتِ. وَالْأَسْبَابُ لَيْسَتْ مُسْتَقِلَّةً بِالْمُسَبَّبَاتِ؛ بَلْ لَا بُدَّ لَهَا مِنْ أَسْبَابٍ أُخَرَ تُعَاوِنُهَا وَلَهَا مَعَ ذَلِكَ أَضْدَادٌ تُمَانِعُهَا وَالْمُسَبَّبُ لَا يَكُونُ حَتَّى يَخْلُقَ اللهُ جَمِيعَ أَسْبَابِهِ وَيَدْفَعَ عَنْهُ أَضْدَادَهُ الْمُعَارِضَةَ لَهُ، وَهُوَ سُبْحَانَهُ يَخْلُقُ جَمِيعَ ذَلِكَ بِمَشِيئَتِهِ وَقُدْرَتِهِ، كَمَا يَخْلُقُ سَائِرَ الْمَخْلُوقَاتِ، فَقُدْرَةُ الْعَبْدِ سَبَبٌ مِنْ الْأَسْبَابِ، وَفِعْلُ الْعَبْدِ لَا يَكُونُ بِهَا وَحْدَهَا، بَلْ لَا بُدَّ مِنْ الْإِرَادَةِ الْجَازِمَةِ مَعَ الْقُدْرَةِ(١).

**واتە: بیروڕای هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان و کۆی زانایانی ئەهلی سوننەت لەسەر بوون و گرتنەبەر و کارپێکردنی هۆکارەکانن، خوای گەورە دروستکاری هۆکار و کارەکانە، بۆیە هۆکارەکان بۆخۆیان سەربەخۆ نین، بەڵکوو پێویستیان بە هۆکارەکانی تر هەیە بۆ یارمەتیدانیان، وە لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگری و دژەکانی هەیە لە هێنانەدیدا، وە کارەکان نایەنە دی تاوەکوو خوا هەموو هۆکارەکانی بۆ نەڕەخسێنێت، وە تاوەکوو هەموو دژەکان و ڕێگرییەکانی لە ڕێگایدا نەڕەوێنێتەوە، هەموو ئەمانە پەروەردگار دروستیان دەکات بە ویست و توانای خۆی وەکوو چۆن هەموو دروستکراوەکانی دروستکردووە، توانای بەندەکانیش هۆکارێکن لە هۆکارەکانی هێنانەدی، وە کارەکانیشیان بۆ خۆیان بە تەنیا ئەو توانایەیان نییە بێنە دی، بەڵکوو لەگەڵ بوونی**

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٤٨٧).

**تواناشدا بوونی ئیرادەی تەواو بە تواناکەوە پێویستە بۆ هاتنەدی کارەکان.**

**وە دەڵێت:** وَلَيْسَ شَيْءٌ مِنْ الْأَسْبَابِ مُسْتَقِلًّا بِمَطْلُوبِ بَلْ لَا بُدَّ مِنْ انْضِمَامِ أَسْبَابٍ أُخَرَ إلَيْهِ وَلَا بُدَّ أَيْضًا مِنْ صَرْفِ الْمَوَانِعِ وَالْمُعَارَضَاتِ عَنْهُ حَتَّى يَحْصُلَ الْمَقْصُودُ. فَكُلُّ سَبَبٍ فَلَهُ شَرِيكٌ وَلَهُ ضِدٌّ فَإِنْ لَمْ يُعَاوِنْهُ شَرِيكُهُ وَلَمْ يُصْرَفْ عَنْهُ ضِدُّهُ لَمْ يَحْصُلْ سَبَبُهُ فَالْمَطَرُ وَحْدَهُ لَا يُنْبِتُ النَّبَاتَ إلَّا بِمَا يَنْضَمُّ إلَيْهِ مِنْ الْهَوَاءِ وَالتُّرَابِ وَغَيْرِ ذَلِكَ[1].

**واتە: هیچ هۆکارێك سەربەخۆ نییە لە کاریدا و بەس نییە بۆ هێنانەدی مەبەستەکان، هەر دەبێت کۆمەڵێك هۆکاری تر بخرێتە پاڵی و ڕێگرییەکان و دژایەتییەکانی هەڵگیرێت لە ڕێگایدا تاوەکوو مەبەستەکان بێنە دی، بۆیە هەموو هۆکارێك هاوبەشی هەیە و دژیشی هەیە، گەر هاوبەشەکان یارمەتیدەر نەبن و دژەکان نەڕەوێنرێنەوە؛ هیچ هۆکارێك کارەکەی پێ نایەتە دی، باران بەتەنها خۆی کشتوکاڵی پێ ناڕوێت، بەڵکوو پێویستی بە خاك و هەوا و کاری تر هەیە بۆ هاتنەدی، وە هەر بەو شێوەیەش ئاگر بۆ سووتاندن و ڕۆژ لە هەڵهاتندا و خۆراك و خواردنەوە بۆ ژیان ... هەموو ئەمانە هۆکارێکن، بە سەربەخۆیی خۆیان کارەکانیان ئەنجام نادرێت.**

٢. مەرج نییە بە بوونی هۆکار و پێویستییەکانی و نەبوونی ڕێگرییەکانی کارەکان بێتە دی:

**(ابن القيم)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** ضرورة وجود السبب من السنن الكونية التي خلق الله بها الكون، سواء فيما يتعلق بالدين أو ما يتعلق بالدنيا[2].

**واتە: بوونی هۆکارەکان پێویستە، بەڵکوو گرتنەبەریان یاسا و پێویستییەکی کەونی خواییە، پەیوەستە بە هاتنەدی کارە دینییەکانەوە (وەکوو بوونی دەستنوێژ هۆکارە بۆ دروستی نوێژ ...)، وە هەروەها پەیوەستە بە هێنانەدی کارە دونیاییەکان، وەکوو هەوڵدان بۆ پەیداکردنی ڕزق و ڕۆزی ژیان، گرتنەبەری ئەم هۆکارانە وەکوو گرتنەبەری ڕێگایەك وایە کەسی موسافیر دەیگرێتە بەر بۆ شوێنی مەبەستی.**

**ئەگەرچی خوای پەروەردگار دروستکار و نەخشێنەری ئەم ڕێگە و هۆکارانەیە، وای داناوە بە گرتنەبەری مەبەستەکان کارەکان دێتەدی، بەڵام لە سەروو ئەمانەشەوە ئەگەر خوای پەروەردگار**

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٦٧).

(٢) "كتاب الروح" لابن القيم ص١٣٠.

ویستی لەسەر نەبێت ئەوا بەو ڕێگە و ڕێڕەوەی کە بۆی ڕەخساندووە ناڕوات نابێت، وە ئەگەر ویست و ڕەزامەندی و ئیرادەی خوایی لەسەر ببێت؛ کارەکان دەبن و هەموو ڕەخساندنەکانیشی بۆ جۆر دەکات و دێنە دی، ئەم بوون و نەبوونە لە ئیرادەی خوادا مامەڵەیەکی ووردی نێوان خوا و دروستکراوەکانیەتی، کە بە حیکمەت و دانایی خۆی دەیانبات بەڕێوە، وە دەرککردن بەو ووردەکارییەش لە ئاستی تێگەیشتنی بەندەکانیدا نییە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ﴾ [البَقَرَة : ٢٥٥]. واتە دەرك بە کەمترین زانیاری خوایی ناکەن، وە دەفەرموێت: ﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ﴾ [الأنبیَاء : ٢٣]. واتە پرسیار لە خوا ناکرێت لەسەر کارەکانی.

لەبەرئەوە مەرج نییە هەموو مەبەست و هۆکارەکان بگیرێتە بەر لەگەڵ نەبوونی هیچ ڕێگرییەکدا و کارەکانیش بە مسۆگەری بکرێت، لەبەرئەوەی ویستی خوا لەسەرروو هەموو مەبەستەکانەوەیە، تەنانەت هیچ کارێك شایستە نییە ناویشی ببرێت بەبێ ناو و ویستی ئەو، وەکوو خۆی دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ﴾ [الكَهف : ٢٣، ٢٤].

واتە: بۆ ئەنجامدانی کارێك بۆ سبەینێ مەڵێ من ئەو کارە دەکەم، بێجگە لەوەی بڵێی ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت ئەنجامی دەدەم.

ئیمامی (الحسن البصري) رَحِمَهُ ٱللَّهُ لەسەر ئەم ئایەتە ﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ﴾ [الكَهف : ٢٤]. **دەڵێت**: إِذَا ذَكَرَ أَنَّهُ لَمْ يَقُلْ: إِنْ شَاءَ اللهُ، فَلْيَقُلْ: إِنْ شَاءَ اللهُ[(١)].

واتە: کاتێك بیرت کەوتەوە کە نەتگوتووە (إن شاء الله) لەسەر کارێك، بڵێ (إن شاء الله).

(ابن القيم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ **دەڵێت**: والأسباب والمسببات طوع مشيئته وقدرته منقادة لحكمه إن شاء أن يبطل سببية الشيء أبطلها كما أبطل إحراق النار على خليله إبراهيم وإغراق الماء على كليمه وقومه[(٢)].

واتە: هۆکار و کارەکان لەژێر جێبەجێکردنی ویستەکانی خوادایە و تواناکانیشی پەیوەستە بە

---

(١) "تفسير الطبري" (١٥/ ٢٢٦).

(٢) "شفاء العليل" لابن القيم ص١٨٩.

هێنانەدی حیکمەتەکانی، ئەگەر ویستی لێبێت هۆکاری کارەکە بەتاڵ بکاتەوە ئەوا دەیکات.

- نموونەی (إبراهیم) ﷺ کە خوای گەورە سووتێنەری ئاگرەکەی لەسەر بەتاڵ کردەوە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ٦٩﴾ [الأنبياء: ٦٩]. ئەی ئاگر سارد بەرەوە و سەلامەت بە لەسەر (إبراهیم) ﷺ.

عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: بَرَدَتْ عَلَيْهِ حَتَّى كَادَتْ تَقْتُلُهُ، حَتَّى قِيلَ: (وَسَلامًا)، قَالَ: لَا تضرِّيه[1]. واتە بە شێوەیەك سارد بووەوە لەسەر پێغەمبەر (إبراهیم) ﷺ تاوەکوو خەریك بوو ببێتە هۆکاری ڕەقبوونەوەی، تاوەکوو فەرمووی بە ساردبوونەوەیەکی سەلامەتی.

- یاخود وەستانی شەپۆلی ئاوی دەریایەکی وەکوو (نیل) و بووە ڕێڕەوکردنەوە بۆ پەڕینەوەیان و بەتاڵکردنەوە و نەمانی سیفەتی نقومبوون لە دەریادا.

- یاخود براکانی (یوسف) ﷺ ڕێگەی لەناوبردنی یوسفیان گرتەبەر تاوەکوو ﴿يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ﴾ [یوسف: ٩]. باوکیان لەبیری بکات و ئیتر گرنگی بدات بەمان و یوسفیش نەمێنێت تاوەکوو پلەبەرزییەکەی نەمێنێت بەسەریاندا، کەچی بوو بە هۆکاری زیاتر خۆشەویستی و پەیوەستی باوکیان بە (یوسف)ەوە: ﴿تَٱللَّهِ تَفْتَؤُاْ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوْ تَكُونَ مِنَ ٱلْهَٰلِكِينَ ٨٥﴾ [یوسف: ٨٥]. کوڕەکانی وتیان سوێند بە خوا باس و ناوی (یوسف) لە تۆ دوورناکەوێتەوە هەتا دەبێتە هۆکاری لاوازیت یاخود تیاچوونت، تەنانەت بووە هۆکاری نابینایی باوکی: ﴿وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ ٨٤﴾ [یوسف: ٨٤]. بەتەواوی ڕووی وەرچەرخان لە کوڕەکانی و باسی یوسفی لەسەر زار بوو، وە هێندە بووە هۆکاری خەفەت بۆی و ڕشتنی فرمێسکی تا چاوەکانی نابینا بوو، وە لە کۆتاییشدا هەموویان پێویستی دەستی (یوسف) بوون و پلەوپایەی بەسەریاندا بڵند بوو: ﴿لَقَدْ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيْنَا﴾ [یوسف: ٩١]. واتە خوا پلەوپایەی بەرزکردیتەوە بەسەریاندا.

- یاخود نموونەی ئەو گەلەی کە لە ترسی مردن شاریان بەجێهێشت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٥/ ٣٥٢).

﴿خَرَجُواْ مِن دِيَـٰرِهِمۡ وَهُمۡ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِ فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُواْ﴾ [البَقَرَة: ٢٤٣]. ژمارەیان هەزارەها کەس بوون، بەڵام کاتێك کە لە شوێنی ترسناك کە شارەکەیانە چوونە دەرەوە؛ خوای گەورە لەوێ هەموویانی مراند، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «لَا يُغْنِي حَذَرٌ مِنْ قَدَرٍ»[1]. واتە خۆپاراستن سوودی نییە لە قەدەر.

- یاخود (یونس) ﷺ ویستی لە گەلەکەی ڕزگاری بێت کاتێك کە باوەڕیان پێنەهێنا، بەڵام کەوتە ناو خراپتر لە گەلەکەی کە ناوسکی نەهەنگ بوو.

- یاخود ڕێگە گیرایە بەر بۆ کوشتنی (عیسی) ﷺ، بەڵام بە باشتر بۆی ڕەخسا: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينَۢا ١٥٧ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِ﴾ [النِّسَاء: ١٥٧، ١٥٨]. بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان و لە کاتێکی چاکتر و تەواوتردا دەینێرێتەوە خوارەوە پێغەمبەرایەتییەکەی تەواو بکات.

- یاخود پێغەمبەر (محمد) ﷺ و هاوەڵانی بە نیەتی ڕێگرتن لە کاروانێکی قوڕەیش کە لە شام دەگەڕایەوە بۆ مەککە دەستی بەسەردا بگرن، لە بریتی داگیرکردنی سەروەت وماڵی هاوەڵان کە قوڕەیش لە مەککەدا کردبوویان، بەڵام قەدەر وابوو کاروانەکە ڕزگاری بوو، وە شەڕی بەدری لێکەوتەوە کە لەو دەسکەوتە گەورەتر بوو بۆ ئەوان لەڕووی دینی و دونیاییەوە، ئەو گۆڕانکاریانەی کە ڕوویدا لەو کارەدا خوای گەورە باسی دەکات: ﴿وَلَوۡ تَوَاعَدتُّمۡ لَٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡمِيعَـٰدِ وَلَـٰكِن لِّيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗا﴾ [الأنفَال: ٤٢]. واتە ئەگەر وادە و مەوعیدتان لە نێواندا هەبوایە بۆ ئەو جەنگە ئەوا ئامادە نەدەبوون، لەبەر ڕای جیاوازتان، بەڵام خوای گەورە ئەم کارانەی بۆیە هەڵگێڕایەوە بۆ هاتنەدی ئەوەی کە ویستی لێیە بێتە دی.

- گرتنەبەری هۆکارەکان ڕێگایە بۆ هاتنەدی کارەکان، نەك مەرجی هاتنەدی کارەکان بێت، نموونەی فیرعەون و ژنەکەی و عەزیزی میسر، هەردووکیان منداڵیان نابێت، دوو منداڵ هەڵدەگرنەوە بە نیەتی ئەوەی بیکەن بە کوڕ و جێگرەوەی خۆیان، کە لەکاتی هەڵگرتنەوەکەیاندا یەك قسە دەکەن: ﴿عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗا﴾ [يُوسُف: ٢١]، [القَصَص: ٩]. لە ئەنجامدا ئەوەی

(١) رواه الحاكم في "المستدرك" (١٨١٣) وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، والطبراني في "الأوسط" (٢٤٩٨)، وفي "الدعاء" (٣٣)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٢٢٣٤)، و "صحيح الجامع الصغير" (٧٧٣٩).

فیرعەون (موسى) ﷺ دەردەچێت و دەبێتە هۆی تیاچوونی خۆی و دەسەڵاتەکەی، ئەویتریشیان (یوسف) ﷺ دەردەچێت و دەبێتە هۆی بەهێزکردنی دەسەڵاتی عەزیزی میسر و ڕزگاربوونی وڵاتەکەی لە گەورەترین گرانی و قەیران. گرتنەبەری هۆکارەکەی (فیرعەون) نەچووە سەر بۆی، بەڵام گرتنەبەری هۆکارەکەی (عەزیزی میسر) سەری گرت و هاتە دی.

- یاخود وەکوو گەلی (عاد) کە پەڵە هەورێکی گەورە هات و وایانزانی هۆکاری بارانە، بەڵام هۆکاری تیاچوونیان بوو: ﴿هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَاۚ بَلْ هُوَ مَا ٱسْتَعْجَلْتُم بِهِۦۖ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٤﴾﴾ [الأحقاف: ٢٤]. وتیان: ئەو پەڵە هەورە باراناوییە بۆ ئێمە، خوای گەورە فەرمووی: بەڵکوو ئەو سزا سەختەیە کە ئێوە پەلەی هاتنیتانە.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: وَمَنْ عَرَفَ هَذَا حَقَّ الْمَعْرِفَةِ انْفَتَحَ لَهُ بَابُ تَوْحِيدِ اللهِّ وَعَلِمَ أَنَّهُ لَا يَسْتَحِقُّ لِأَنْ يُدْعَى غَيْرُهُ فَضْلًا عَنْ أَنْ يُعْبَدَ غَيْرُهُ وَلَا يُتَوَكَّلَ عَلَى غَيْرِهِ وَلَا يُرْجَى غَيْرُهُ وَهَذَا مُبَرْهَنٌ بِالشَّرْعِ وَالْعَقْلِ[١].

واتە: ئەوەی ئەم ئاڵوگۆڕانە بزانێت بە تەواوی ووردکردنەوە و تێگەیشتنی بۆی، ئەو دەرگایەی بۆ دەکرێتەوە کە تاك و تەنیایی و گەورەیی و بەڕێوەبردنی دروستکراوەکان شایستە هەر بە خوای تاك و تەنیای بێ هاوبەشە، کە شایستە بەوەیە داوا لە بوونێك نەکرێت بێجگە لەو، چ جای بوونێکی تر بپەرسترێت و پشتی پێببەستێت و داوا و ئاواتەکانی ڕووتێبکات، ئەمە زۆر ڕوونە لە ڕوانگەی شەرع و عەقڵەوە.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِي ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾﴾ [آل عمران: ٢٦].

واتە: ئەو پەروەردگارەیە موڵك و دەسەڵات دەبەخشێت بەوەی کە ویستی لەسەرە و لەوەشی وەردەگرێتەوە کە ویستی لەسەرە، وە ئەوەی ویستی لەسەرە پایەداری دەکات و ئەوەشی ویستی لەسەرە بێ دەسەڵات و زەلیل و ملکەچی دەکات، وە هەموو خێرەکان بەدەستی خوایە و کارەکانی پڕە لە حیکمەت و دانایی و ووردەکاری بێسنوور، وە بەگوێرەی سوودی بەندەکانی و کاربەڕێکردنیان هەڵیان دەسووڕێنێت.

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٦٨).

٣. گرتنەبەری هۆکارەکان و پشتنەبەستنی دڵی پێیان (الأخذ بالأسباب والكفر بها):

**(ابن تيمية)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** وَمِمَّا يَنْبَغِي أَنْ يُعْلَمَ: مَا قَالَهُ طَائِفَةٌ مِنْ الْعُلَمَاءِ. قَالُوا: الِالْتِفَاتُ إلَى الْأَسْبَابِ شِرْكٌ فِي التَّوْحِيدِ. وَمَحْوُ الْأَسْبَابِ أَنْ تَكُونَ أَسْبَابًا نَقْصٌ فِي الْعَقْلِ وَالْإِعْرَاضُ عَنْ الْأَسْبَابِ بِالْكُلِّيَّةِ قَدْحٌ فِي الشَّرْعِ وَإِنَّمَا التَّوَكُّلُ وَالرَّجَاءُ مَعْنًى يَتَأَلَّفُ مِنْ مُوجِبِ التَّوْحِيدِ وَالْعَقْلِ وَالشَّرْعِ(١).

**واتە: پێویستە ئەوە بزانرێت کە هەندێك لە زانایان وتوویانە ئاوڕدانەوەی دڵی و پشتبەستن بە هۆکارەکان هاوبەش بڕیاردانە لە (توحيد)دا، دانەنانی هۆکارەکان بە هۆکار ناتەواوییە لە عەقڵ و ژیریدا، بەکارنەهێنان و پشتکردنە هۆکارەکان ڕەخنەیە لە شەرعدا، بەڵکوو پشتبەستن بە خوا و داواکاری لەو و گرتنەبەری هۆکارەکان دەبێتە هۆکاری هاتنەدی تەواوی (توحيد) و بوونی عەقڵ و جێبەجێکاری شەرع.**

**وە دەڵێت:** أَنَّ الِالْتِفَاتَ إلَى السَّبَبِ هُوَ اعْتِمَادُ الْقَلْبِ عَلَيْهِ وَرَجَاؤُهُ وَالِاسْتِنَادُ إلَيْهِ، وَلَيْسَ فِي الْمَخْلُوقَاتِ مَا يَسْتَحِقُّ هَذَا، لِأَنَّهُ لَيْسَ مُسْتَقِلًّا، وَلَا بُدَّ لَهُ مِنْ شُرَكَاءَ وَأَضْدَادٍ(٢).

**واتە: ئاوڕدانەوە بۆ هۆکارەکان "مەبەستی تیایدا پشتبەستنی دڵی و ئاوات پەیوەستبوونە پێوەی" هیچ شتێك نییە شایستەی ئەمە بێت (واتە شایستەی پشتپێبەستنی تەواو بێت) لە دروستکراوەکاندا، لەبەرئەوەی هیچ بوون و شتێك نییە سەربەخۆ بێت و خاوەنی توانا و هێنانەدی کاری تەواو بێت، لەبەرئەوەی هەموو شتێك بوونی پشتیوانی تر و نەمانی دژەکەی دەوێت.**

**وە دەڵێت:** مَحْوُ الْأَسْبَابِ أَنْ تَكُونَ أَسْبَابًا: نَقْصٌ فِي الْعَقْلِ فَهُوَ كَذَلِكَ ... مَعَ أَنَّ الْحِسَّ وَالْعَقْلَ يَشْهَدُ أَنَّهَا أَسْبَابٌ وَيَعْلَمُ الْفَرْقَ بَيْنَ الْجَبْهَةِ وَبَيْنَ الْعَيْنِ فِي اخْتِصَاصِ أَحَدِهِمَا بِقُوَّةٍ لَيْسَتْ فِي الْآخَرِ وَبَيْنَ الْخُبْزِ وَالْحَصَى فِي أَنَّ أَحَدَهُمَا يَحْصُلُ بِهِ الْغِذَاءُ دُونَ الْآخَرِ(٣).

**واتە: بڕیاردان بە "دانەنانی هۆکارەکان بە هۆکار ناتەواوییە لە عەقڵدا" دروستە و هەر وایشە، لەبەرئەوەی هەست و عەقڵ شایەتحاڵی ئەوەن کە هۆکارەکان هۆکارن بۆ کارەکان،**

---

(١) (٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٦٩).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٧٥).

وەکوو چۆن دەزانرێت چاو لەگەڵ ناوچاودا یەکێکیان پەیوەستە بە بینینەوە و ئەویتریان نییە، وە جیاوازی نێوان بەرد و نان کە یەکێکیان تێرکەرە و ئەویتریان نییە، کەواتە هۆکارەکان ئاشکران.

**وە دەڵێت:** الْإِعْرَاضُ عَنْ الْأَسْبَابِ بِالْكُلِّيَّةِ قَدْحٌ فِي الشَّرْعِ ... فَمَنْ جَعَلَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَوْ يَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ فَهُوَ مِنْ أَعْظَمِ النَّاسِ جَهْلًا وَأَشَدِّهِمْ كُفْرًا[١].

**واتە: پشتهەڵکردن لە هۆکارەکان بەتەواوی؛ دژایەتی شەرعی خوایە، بۆیە ئەوەی کەسانی ئیماندار و خاوەن کرداری چاك (کە بە گرتنەبەری هۆکارەکانی ئیمان پێی گەیشتووە) وەك کەسانی خراپەکار سەیربکات ئەوە کەسێکە زۆر نەزان و بێبڕوایە لە دیندا.**

**(ابن القيم)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** ولو تتبعنا ما يفيد إثبات الأسباب من القرآن والسنة لزاد على عشرة آلاف موضع ولم نقل ذلك مبالغة بل حقيقة ... ثم من أعظم الجناية على الشرائع والنبوات والتوحيد إيهام الناس أن التوحيد لا يتم إلا بإنكار الأسباب، فإذا رأى العقلاء أنه لا يمكن إثبات توحيد الرب سبحانه إلا بإبطال الأسباب ساءت ظنونهم بالتوحيد وبمن جاء به، وأنت لا تجد كتابا من الكتب أعظم إثباتا للأسباب من القرآن، ويا لله العجب إذا كان الله خالق السبب والمسبب[٢].

**واتە: ئەگەر بەدواداچوون بکەین بۆ سەلماندنی گرتنەبەری هۆکارەکان لە قورئان و فەرموودەدا، دەبینین زیاد لە دە هەزار شوێن دەبێت بێ زیادەڕەوی، وە گەورەترین تاوان لە ئاستی شەرعی خوا و پێغەمبەران و (توحيد)دا بۆ خوا؛ بڕیاردانە بەوەی کە (توحيد) و عەقیدەی پاك نایەتە دی لە موسوڵماناندا ئیلا بە ڕێگەی باوەڕنەبوون بە هۆکارەکان و پشتگوێ خستنیان نەبێت، وەکوو ئەهلی (تصوف)، کاتێك ئەم بڕیارە درا گومانیان بۆ (توحيد) و ئەوەی هێناویەتی خراپ بوو، بۆیە نە خوایان بەتەواوی بۆ پەرسترا و نە شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەی بوون، بۆیە هیچ کتێبێك نییە لە کتێبەکان بە گەورەترین شێوە بوونی هۆکارەکان بسەلمێنێت جگە لە قورئان، وە ئەم بابەتە مایەی سەرسامییە کاتێك دەبینێت خوا دروستکاری کار و هۆکارەکانە کەچی نایگرێتە بەر.**

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٧٥، ١٧٦). (٢) "شفاء العليل" لابن القيم ص١٨٩.

## چەند ئاماژەیەكی قورئان بۆ گرتنەبەری هۆكارەكان:

**١. لە خۆپاراستندا:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ﴾ [النساء: ٧١]. خوا فەرمان دەكات بە ئیمانداران كە حەزەری خۆیان وەرگرن بەرامبەر دوژمنیان بە هەموو هۆكارەكان كە دەبنە پشتیوانی بۆ شەڕكردن و پاراستنی خۆیان و بەرپەرچدانەوەیان[(١)].

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ﴾ [الأنفال: ٦٠]. خوا فەرمان دەكات بە ئامادەكاری بۆ گرتنەبەری هێز بە هەموو جۆرەكانیەوە لە شەڕدا دژ بە دوژمنان[(٢)].

**٢. بۆ بەدەستهێنانی ڕزق و ڕۆزی ژیان:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ﴾ [الجمعة: ١٠]. پاش نوێژی هەینیتان بڵاوببنەوە بە زەویدا بۆ بەدەستهێنانی نیعمەتەكانی خوا.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ ١٥﴾ [الملك: ١٥]. زەویمان ڕەخساندووە بۆتان، بگەڕێن بە هەموو شوێنێكیدا بۆ ڕزق و ڕۆزیتان.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَا﴾ [القصص: ٧٧]. لەو نیعمەتانەی كە خوا پێیداویت لە دونیادا بەكاری بهێنە بۆ ڕۆژی دواییت و بەشی دونیای خۆشت لەبیر مەكە لە خواردن و خواردنەوە و پۆشاك ... لەبەرئەوەی مافی خوا و خۆت و خێزانت و كەسوكار و میوانت لەسەر دەبێت كە مافی هەموویان بدەیت[(٣)].

**٣. فەرمان بە كردەوەی چاك و بەدەستهێنانی:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰ﴾ [البقرة: ١٩٧]. كاتێك فەرمان دەدات بۆ خۆراك و توێشوو هەڵگرتنی دونیایی بۆ ڕێگەی حەج، ڕێنموونیشیان دەكات بۆ هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی توێشووی ڕۆژی دوایی لە خواناسی و عیبادەت و چاكە[(٤)].

---

(١) "تفسير السعدي" ص١٨٦.
(٢) "فتح القدير" للشوكاني (٢/ ٤٦٦).
(٣) "تفسير ابن كثير" (٦/ ٢٥٣).
(٤) "تفسير ابن كثير" (١/ ٥٤٠).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَأَنفَقُواْ لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ ۝٧﴾ [الحَدِيد : ٧]. ببەخشن لەو ڕزق و ڕۆزییەی کە لەژێر دەستاندا هەیە، ئەوانەی ئیماندارن و دەبەخشن لە ماڵەکانیان پاداشتی گەورەیان هەیە.

**٤. هاندان بۆ بەدەستهێنانی ئەو کارانەی کە هۆکاری ڕەزامەندی خوایە:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝٢ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾ [الطَّلَاق : ٢، ٣]. ئەوەی خواپەرستی بکات ئەوا خوا ڕێگەی بۆ دەرەخسێنێت بۆ ڕزگاربوون لە هەموو ناخۆشییەکان و ڕزق و ڕۆزییەکی پێدەدات بەبێ پێوانە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَٱبْتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُواْ لَهُۥٓ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ۝١٧﴾ [العَنكَبُوت : ١٧]. داوای ڕزق لای خوا بکەن، کەس لە دەستیدا نییە بێجگە لەو، وە هۆکارەکانی بەدەستهێنانیشی عیبادەت بۆکردن و سوپاسگوزارییە لەسەر نیعمەتەکانی.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ﴾ [النَّمْل : ٦٢]. کێ هەیە لەکاتی تەنگانەدا بێت بە هانای لێقەوماوانەوە کاتێك داوا دەکات و ناخۆشییەکان دەڕەوێنێتەوە و دەتانکاتە ئاوەدانکاری زەوی.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ﴾ [البَقَرَة : ٢٧٢]، ﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ﴾ [سَبَأ : ٣٩]. ئەوەی دەیبەخشن بۆ خۆتان و ماڵ و منداڵتان و خێر و خێرات؛ بۆتانی پڕدەکەینەوە.

**٥. پاداشتی کردەوەکان پەیوەستە بە هۆکارەکانەوە:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۝٤٣﴾ [الأَعْرَاف : ٤٣]. ئەو بەهەشتەیە کە پێتان دراوە بە هۆکاری کردەوەکانتەوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿كُلُواْ وَٱشْرَبُواْ هَنِيٓـًٔا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۝١٩﴾ [الطُّور : ١٩]. بخۆن و بخۆنەوە لە بەهەشتدا بە هۆکاری ئەو کردەوانەی لە دونیادا بۆتان کردبوو.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ۝١٧﴾ [السَّجْدَة : ١٧]. نەفسەکان نازانن چییان بۆ شاردراوەتەوە لە نیعمەتە گەورەکان بە هۆکاری کردەوەکانیانەوە.

- بۆ سزا و تۆڵەسەندنەوەش:

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَذُوقُواْ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ﴾ [السَّجدَة : ١٤]. سزا و سەختییەکان بچێژن بە هۆکاری لەبیرچوونەوەی ئەم ڕۆژەتانەوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ﴿٤٩﴾﴾ [الأنعَام : ٤٩]. ئەوانەی ئایەتەکانی خوا بەدرۆ دەخەنەوە سزای سەختیان هەیە بە هۆکاری تاوانەکانیانەوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾. بە هۆکاری کردەوەکانتانەوە، ﴿بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ﴾. بە هۆکاری بێبڕواییتانەوە، ﴿بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ﴾. بە هۆکاری کردەوەکانتانەوە، ﴿بِمَا كَانُواْ يَكْفُرُونَ﴾. بە هۆکاری بێبڕواییتانەوە، ﴿بِمَا كَانُواْ يَكْذِبُونَ﴾. بە هۆکاری بەدرۆزانینتانەوە، ﴿بِمَا كَانُواْ يَظْلِمُونَ﴾. بە هۆکاری ستەمکاریتانەوە، ﴿بِمَا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾. بە هۆکاری بەدرۆخستنەوەتانەوە.

هەموو ئەم ئایەتانە باس لەو هۆکارانە دەکات کە بوونەتە هۆی سزاکانی دونیا و دوارِۆژیان.

## پشتبەستن و هیوا بە خوا (التوكل على الله تعالى):

لەپاش گرتنەبەری هۆکارەکان و هەوڵی تەواو لەگەڵ کارەکاندا، ئەوکات کاتی ئەوەیە کە دڵنیایی و پەیوەستبوونی دڵ و دەروونت هەمووی بگێڕیتەوە بۆلای خوا، ئەمەش بە ڕێگەی بیرخستنەوەی خۆت بە هێز و بوون و کاریگەری هۆکارەکان کە چەندە سنووردار و ڕێژەیین، وە کاریگەریەکانیان و مانەوەیان لە چرکە ساتە وەختێکدایە ئەگەر خوا ویستی لەسەربێت دەمێنێتەوە، وە گەر نا هەروەك بوونی نەبووبێت وایە.

لەگەڵ بیرخستنەوەی ئەوەی نەك هۆکارەکان بەڵکوو نیعمەتەکانیش بۆ ژیانێکی دونیایی براوەیە و لەپێش تۆشدا لەدەستی کەسانێکی تردا بووە و بەجێیان هێشتووە و لەدوای تۆش دەکەوێتە دەستی کەسانێکی تر، ئەمانە و مردن و هاتنە دونیات بە ڕووتی و ڕۆشتنەوەت بە ڕووتی و ڕۆیشتنی شتەکان و تەمەنت هێدی هێدی.

ئەم بیرخستنەوانە یارمەتیدەرن بۆ کەمبوونەوەی ئەو غەڕرابوون و لووت بەرزییانەی کە بەسەر ئادەمیزاددا دێت لەکاتی هاتنەدەستی هۆکارەکان و بوونە خاوەنی، وەکوو خوای گەورە

دەفەرمویّت: ﴿كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ﴿٧﴾﴾ [العلق: ٦، ٧]. ئادەمیزاد یاخی بووە کاتێك دەبینێت بالادەستە، وە دەفەرمویّت: ﴿يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ ﴿٣﴾﴾ [الهمزة: ٣]. ئادەمیزاد وا گومان دەبات کە ماڵ و سەروەتەکەی بە هەتا هەتایی بۆی دەمێنێتەوە.

وە بزانە خوای پەروەردگار دروستی کردوویت بۆ عیبادەتی خۆی و یەك دڵی پێداویت بۆئەوەی بەکاریبێنیت بۆ ئەو، بەلاّم کاتێك تۆ دەبیتە بەندەی دونیا و هەموو دڵت دەدەی بە دونیا و بەندایەتی و زەلیلیتی تیادا ون دەکەیت، ئەوکات دەسەلاّتی خوا لەسەر سەرت ئامادەیە و سەرەی تۆلّەسەندنەوەتە، لەبەرئەوە پێویستە پشتبەستن بە خوا سەرەتا و کۆتایی کارەکان بێت، وا هەست بکەیت کە دونیا وەکوو تەسبیحێك بەدەستتەوەیە، وە ماڵیش بەدەست دەژمێریت، با هەر لە دەستتدابێت و نەچێتە دڵتەوە و لەو پیاوانە بیت کە پەروەردگار وەسفیان دەکات و دەفەرمویّت: ﴿رِجَالٞ لَّا تُلۡهِيهِمۡ تِجَٰرَةٞ وَلَا بَيۡعٌ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾ [النور: ٣٧]. واتە پیاوانێکی کامڵ هەن بازرگانییەکانیان و کڕین و فرۆشتنەکانیان هۆکار نییە بۆ لەبیرکردنی یادی خوا و نوێژەکانیان.

وە خوای پەروەردگار عیبادەتەکانی پەیوەستکردووە بە پشتبەستن بە خۆیەوە، وەکوو دەفەرمویّت: ﴿فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِ﴾ [هود: ١٢٣]. واتە خوا بپەرستن و پشت ببەستن بە خوا، واتە کارکردن و پشتبەستن بە خوا لەسەری.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: وَالْعِبَادَةُ فِعْلُ الْمَأْمُورِ فَمَنْ تَرَكَ الْعِبَادَةَ الْمَأْمُورَ بِهَا وَتَوَكَّلَ لَمْ يَكُنْ أَحْسَنَ حَالًا مِمَّنْ عَبَدَهُ وَلَمْ يَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ بَلْ كِلَاهُمَا عَاصٍ لِلَّهِ تَارِكٌ لِبَعْضِ مَا أُمِرَ بِهِ. وَالتَّوَكُّلُ يَتَنَاوَلُ التَّوَكُّلَ عَلَيْهِ لِيُعِينَهُ عَلَى فِعْلِ مَا أَمَرَ وَالتَّوَكُّلَ عَلَيْهِ لِيُعْطِيَهُ مَا لَا يَقْدِرُ الْعَبْدُ عَلَيْهِ[1].

واتە: عیبادەت ئەو کارانەیە کە (واجب) کراوە لەسەر ئادەمیزاد، خوا فەرمانی داوە عیبادەتی خوا بکەن و پشتی پێببەستن، ئەوەی کە عیبادەتی ناکات و پشتی پێدەبەستێت حاڵی باشتر نییە لەوەی کە عیبادەتی بۆ دەکات و پشتی پێنابەستێت، هەردووکیان تاوانبارن و بەشێك لە فەرمانەکانیان جێبەجێ نەکردووە، پشتبەستن بە خوا بۆ یارمەتیدانیەتی بۆ هێنانەدی عیبادەت و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی لەگەڵ پێبەخشینی ئەوەی کە لە توانایدا نییە بەدەستهێنانی.

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٧٧).

**هەروەك چۆن هۆكارە مادییەكان بەكاردێنن بۆ كارەكانی دونیا؛ ئاواش پێویستە (التوكل) كە كارێكی ناخی و ناوەڕۆكییە و پەیوەندی بە دڵەوە هەیە بەكاریبێنن بۆ كارەكانیان لە دونیادا.**

**(ابن تیمیة)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** التَّوَكُّلَ عَلَى اللهِّ وَاجِبٌ مِنْ أَعْظَمِ الْوَاجِبَاتِ كَمَا أَنَّ الْإِخْلَاصَ للهِّ وَاجِبٌ وَحُبَّ اللهِّ وَرَسُولِهِ وَاجِبٌ. وَقَدْ أَمَرَ اللهُّ بِالتَّوَكُّلِ فِي غَيْرِ آيَةٍ أَعْظَمَ مِمَّا أَمَرَ بِالْوُضُوءِ وَالْغُسْلِ مِنْ الْجَنَابَةِ وَنَهَى عَنْ التَّوَكُّلِ عَلَى غَيْرِ اللهِّ"[١].

**واتە: پشتبەستن و دڵنیایی لەسەر خوا گەورەترین واجبە لە واجبە دینییەكان، وەكوو چۆن نیەتپاكی (الإخلاص) واجبە، خوای گەورە زیاتر لە دەستنوێژ و عیبادەتەكان فەرمانی بە (توكل) كردووە و حەرامی كردووە (توكل) بە غەیری ئەو.**

**پشتبەستن بە خوا پێویستی بە ڕاستگۆییەكی تەواو هەیە لەسەر خوا، وە كارەكان بدرێنە دەست ئەو پاش هەموو بەكارهێنانی تواناكان، لەگەڵ گومانی باشدا پێی و بوونی متمانەی تەواوت لەسەر باشترین بژاردە بۆت لەلایەن خواوە، ئەمانە پێش هاتنەدی كارەكان پێویستە، وە لەدوای هاتنەدی كارەكان ڕازیبوونی تەواو و بە دڵ متمانەبوون بەوەی ئەمەی كە بژاردە كراوە بۆی لە هەمووی باشترە بۆ دونیا و دواڕۆژی، وە هەوڵ بدات بژاردەی نەبێت بەسەر بژاردەی خواییدا، هەموو دین لەسەر دوو بەش بنیاد نراوە: نیوەی كاركردنە و نیوەكەی تریشی پشتبەستنە بە خوا[٢]:**

﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾ [الفاتحة: ٥]. **(نعبد) كاركردنە، وە (نستعين) پشتبەستنە،** ﴿فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِ﴾ [هود: ١٢٣]. **(فاعبدوه) كاركردنە، وە (وتوكل عليه) پشتبەستنە،** ﴿فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ﴾ [آل عمران: ١٥٩]. **(عزمت) كاركردنە، وە (فتوكل) پشتبەستنە.**

**ئەو خوایەی كە فەرمانی داوە بە (توكل) هەر ئەویشە فەرمانی داوە بە گرتنەبەری هۆكارەكانی كاركردن، وەكوو دەفەرموێت:** ﴿وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ﴾ [التوبة: ١٠٥]. **واتە پێیان بڵێ كار بكەن، خوا كارەكانتان دەبینێت، وە دەفەرموێت:** ﴿فَأَتۡبَعَ سَبَبًا ۝٨٥﴾ [الكهف: ٨٥]. **واتە هۆكارەكان بگرنە بەر، وە دەفەرموێت:** ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَيۡءٖ سَبَبًا ۝٨٤﴾ [الكهف: ٨٤]. **واتە (ذو**

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٧/ ١٦).

(٢) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١١٣).

القرنين) هەموو هۆکارەکانمان بۆ ڕەخساندبوون، وە دەفەرمویت: ﴿وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًا﴾ [المؤمنون: ٥١]. واتە کردارە چاکەکان بگرنە بەر، وە دەفەرمویت: ﴿ٱعۡمَلُواْ مَا شِئۡتُمۡ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ۝٤٠﴾ [فصلت: ٤٠]. واتە بەگوێرەی ویستی خۆتان کار بکەن، خوا کارەکانتان دەبینێت، وە دەفەرمویت: ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ﴾ [القصص: ٧٧]. ئەوەی پێت دراوە بەکاری بێنە بۆ ڕۆژی دوایی، وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمویت: «احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ»[1]. واتە کۆشش بکە لەسەر ئەوانەی کە سوودمەندیت تیایدا.

(ابن القيم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: واجعل سيرك بين مطالعة منته ومشاهدة عيب النفس والعمل والتقصي[2].

واتە: لەکاتی ئەنجامدانی کارەکانتدا لەیادی نەکەیت منەتەکانی خوای گەورە بەسەرتەوە لە نیعمەتەکانیدا، وە ناتەواوی و کەموکورتی خۆت و کارەکانت.

**- خوای گەورە فەرمانی داوە بە (توکل) و پشتبەستن بە خۆی وەکوو هەموو فەرمانە دینییەکانی تر:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ۝٣﴾ [الأحزاب: ٣].
واتە: پشت بە خوا ببەستن و بەستانە کە خوا سەرپەرشتیکارتان بێت.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ۝٢١٧﴾ [الشعراء: ٢١٧].
واتە: پشت ببەستن بە باڵادەستێکی بەبەزەیی کە پەروەردگارە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡحَيِّ ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ﴾ [الفرقان: ٥٨].
واتە: پشت بە خوایەك ببەستە کە زیندووە و نامرێت.

---

(١) رواه مسلم (٢٦٦٤)، والنسائي في "الكبرى" (١٠٣٨٢)، وابن ماجه (٤١٦٨)، وابن حبان في "صحيحه" (٥٧٢١)، وأحمد في "المسند" (٨٧٩١)، والبزار في "المسند" (٨٨٣٥)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٢٥١)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٥٩)، والبيهقي في "الشعب" (١٩١)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٣٥٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٠٢٨)، وأبو نعيم في "الحلية" (١٠/ ٢٩٦).

(٢) "عدة الصابرين" لابن القيم ص٢٨٤.

- مەرجی ئیمانداری بە (توکل)ەوە پەیوەستکردووە:

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٣﴾﴾ [المَائِدَة: ٢٣].

واتە: ئەگەر ئێوە ئیماندارن پشت بە خوا ببەستن.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ﴾ [آل عِمرَان: ١٥٩].

واتە: خوای پەروەردگار ئەوانەی خۆشدەوێت کە پشتی پێدەبەستن.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ [آل عِمرَان: ١٢٢].

واتە: ئیمانداران با پشت بە خوا ببەستن.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٤٩﴾﴾ [الأنفَال: ٤٩].

واتە: ئەوەی پشت بە خوا دەبەستێت ئەوا خوا باڵادەست و دانایە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ﴾ [الطَّلَاق: ٣].

ئەوەی پشت بە خوا دەبەستێت ئەوە خوای بەسە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ ﴿٨٤﴾﴾ [يُونُس: ٨٤].

واتە: ئەگەر موسوڵمانن ئەوە پشت بە خوا ببەستن.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿قُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُۖ عَلَيۡهِ يَتَوَكَّلُ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾﴾ [الزُّمَر: ٣٨].

واتە: بڵێ خوام بەسە و پشتیوانی ئەوانەیە کە پشتی پێ دەبەستن.

هەموو ئەم ئایەتانە فەرمان بە (توکل) و پشتبەستن بە خوا دەکەن لەکاتی ئەنجامدانی کارەکانیاندا، بە هاوشێوەی ئەم فەرمانانە بە پشتبەستن بە خوا؛ خوای گەورە جَلَّ وَعَلَا فەرمانی نەداوە بە زۆرێك لە کارە عیبادەتییەکانی تری وەکوو زەکات و ڕۆژوو و دەستنوێژ و کۆمەڵێك کاری عیبادەتی تر.

لەبەرئەوەی عیبادەتێکی دڵییە و پەیوەندی بە عەقیدە و بیروباوەڕ و نیەتپاکییەوە هەیە (توحید والإخلاص)، وە پشتبەستن بە خوا (توکل) ڕێگری لە بەکارهێنانەکانی هۆکارەکان ناکات، بەڵکوو کاری (توکل) پاش گرتنەبەری هۆکارەکانە.

وەکوو (أنس بن مالك) ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: «يَا رَسُولَ اللَّهِ أَعْقِلُهَا وَأَتَوَكَّلُ، أَوْ أُطْلِقُهَا وَأَتَوَكَّلُ؟ قَالَ: "اعْقِلْهَا وَتَوَكَّلْ"»[(١)].

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا حوشترەکەم ببەستمەوە و پاشان پشت بە خوا ببەستم، یاخود بەرەڵای کەم و پشت بە خوا ببەستم؟ فەرمووی: بیبەستەرەوە و پاشان پشت بە خوا ببەستە.

وە (أسامة بن شريك) ﷺ دەڵێت: «فَجَاءَتِ الْأَعْرَابُ، فَسَأَلُوهُ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، نَتَدَاوَى؟ قَالَ: "نَعَمْ، تَدَاوَوْا، فَإِنَّ اللَّهَ لَمْ يَضَعْ دَاءً إِلَّا وَضَعَ لَهُ دَوَاءً غَيْرَ دَاءٍ وَاحِدٍ الْهَرَمُ"»[(٢)].

واتە: لادێییەکان هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ و پرسیاریان لێکرد ئایا دەرمان و چارەسەر بەکاربێنین؟ فەرمووی: بەڵێ چارەسەر و دەرمان بەکاربێنن، خوای گەورە هیچ دەردێکی نەناردووە بەبێ دەرمان بۆی.

لەپاش گرتنەبەری هۆکارەکان و متمانەبوون بە خۆت و گەشبینی و گومانی باش بە خوا، لەگەڵ کارکردنی بەردەوام و هەوڵدان بۆ زیادە و پێشبڕکێ، پاش ئەمانە خۆت دابڕە لە هەموو شتێك و پشت بە خوا ببەستە و هەموو دڵتی ڕادەست بکە، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾﴾ [المطففين: ٢٦]. هەوڵەکان و پێشبڕکێ کردن لەم بوارەدایە.

وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: «الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ، خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ بِاللهِ وَلَا تَعْجَزْ»[(٣)].

واتە: ئیمانداری بەهێز خێرتر و خۆشەویستترە لای خوا تاوەکوو ئیمانداری لاواز، وە لە هەموو خێرێکدا هەوڵی تەواو بدە لەسەر سوودمەندییەکانت و پشت بە خوا ببەستە و تووشی ڕووخاندنی دەروونی مەبە.

---

(١) رواه الترمذي (٢٥١٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٣١)، والبيهقي في "الشعب" (١١٦١)، وأبو نعيم في "الحلية" (٨/ ٣٩٠)، وحسنه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (١٠٦٨).

(٢) رواه أبو داود (٣٨٥٥)، والنسائي في "الكبرى" (٧٥١١)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٠٦١)، وأحمد في "المسند" (١٨٤٥٤)، والحاكم في "المستدرك" (٨٢٠٦)، والطبراني في "الكبير" (٤٦٥)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٢٢٦)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٤٥٣٢)، و "صحيح الجامع الصغير" (٧٩٣٤).

(٣) رواه مسلم (٢٦٦٤)، وسبق تخريجه ص٣٤٣.

نموونەی پێغەمبەرێك لە جێبەجێکردنی (توکل) بەم شێوەیەی (یعقوب)ە ﷺ کە بە کوڕەکانی دەڵێت: ﴿ وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍۖ ﴾ [يوسف: ٦٧]. پێغەمبەر (یعقوب) ﷺ خاوەنی دوانزە کوڕ بوو بە (یوسف)ەوە ﷺ ، بە کوڕەکانی وت: ئەی کوڕەکانم لە یەك دەرگاوە مەچنە ژوورەوە، بەڵکوو لە چەند دەرگایەکەوە بچنە ژوورەوە، ئەمە وەکوو گرتنەبەری هۆکار بۆ خۆپاراستن لە چاوی پیس، پاش ئەمە وتی من ناتوانم هیچ سوودێکتان پێبگەیەنم بێجگە لە خوا، ئەمەش واتای ئەوەیە پشت بە خوا ببەستن و ویستی خوا لەسەروو هەموو ویستەکانەوەیە و هیچ خۆپاراستنێك لە ئاستی ویست و قەدەری خوا بوونی نییە.

(ابن الجوزي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: ليس بين التوكل وبين الأسباب تضاد، وذلك أن التوكل اعتماد القلب عَلَى الوكيل وحده، وذلك لا يناقض حركة البدن فِي التعلق بالأسباب[1].

واتە: لە نێوان پشتبەستن بە خوا و گرتنەبەری هۆکارەکان دژایەتی نییە، لەبەرئەوەی (توکل) پشتبەستنی دڵییە لەسەر خوا و بەس، وە گرتنەبەری هۆکارەکان کاری لاشەییە و پەیوەندی بە بەکارهێنانی جەستە و ئەندامەکانی جەستە و دەوروبەرەوە هەیە.

٤. بەرەنگاریکردنی قەدەر بە قەدەر (منازعة الأقدار بالأقدار):

ئادەمیزاد بە سروشتی خۆی هەوڵ بۆ سوودمەندییەکانی دەدات و خۆی دەپارێزێت لە زیان و زەرەرۆمەندییەکانی ﴿قَدَّرَ فَهَدَىٰ﴾ [الأعلى: ٣]. خوای گەورە بەو شێوەیە دروستیکردووە کە لەناو کێشمەکێشی خێر و شەڕدایە.

بەڵام ئیماندار بەوە چاوکراوەیە کە هەموو کار و دروستکراوەکان دانان و دروستکراوی خوایە لە نێوان خێر و شەڕدا، وە لە نێوان سوودمەندی و زیاندا، ... بۆیە ئەگەر کارێك هاتە پێش لە سوودمەندی ئەودا نەبوو هەوڵ بۆ کارێکی تری جێگرەوەی دەدات، بەو واتایەی تەسلیم نابێت و دەستەوەستان ناوەستێت لە ئاستی قەدەرەکاندا، وە لە ئاستی زەرەرۆمەندییەکانیدا بۆ بەرپەرچدانەوەی یاخود هەڵگرتنی ئەو زەرەرۆمەندییە ئیشی ئەم کارکردنە هەتاوەکوو هۆکار

(١) "تلبيس إبليس" لابن الجوزي ص٢٤٨.

ببێت، بۆیە گرتنەبەری هەموو هۆکارەکان کاریەتی لەگەڵ پشتبەستن بە خوای خۆی.

(ابن القیم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: بَلِ الْفَقِيهُ كُلَّ الْفِقْهِ الَّذِي يَرُدُّ الْقَدَرَ بِالْقَدَرِ، وَيَدْفَعُ الْقَدَرَ بِالْقَدَرِ، وَيُعَارِضُ الْقَدَرَ بِالْقَدَرِ، بَلْ لَا يُمْكِنُ لِإِنْسَانٍ أَنْ يَعِيشَ إِلَّا بِذَلِكَ، فَإِنَّ الْجُوعَ وَالْعَطَشَ وَالْبَرْدَ وَأَنْوَاعَ الْمَخَاوِفِ وَالْمَحَاذِيرِ هِيَ مِنَ الْقَدَرِ. وَالْخَلْقُ كُلُّهُمْ سَاعُونَ فِي دَفْعِ هَذَا الْقَدَرِ بِالْقَدَرِ، وَهَكَذَا مَنْ وَفَّقَهُ اللهُ وَأَلْهَمَهُ رُشْدَهُ يَدْفَعُ قَدَرَ الْعُقُوبَةِ الْأُخْرَوِيَّةِ بِقَدَرِ التَّوْبَةِ وَالْإِيمَانِ وَالْأَعْمَالِ الصَّالِحَةِ، ... فَرَبُّ الدَّارَيْنِ وَاحِدٌ وَحِكْمَتُهُ وَاحِدَةٌ لَا يُنَاقِضُ بَعْضُهَا بَعْضًا، وَلَا يُبْطِلُ بَعْضُهَا بَعْضًا، فَهَذِهِ الْمَسْأَلَةُ مِنْ أَشْرَفِ الْمَسَائِلِ لِمَنْ عَرَفَ قَدْرَهَا، وَرَعَاهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا، وَاللهُ الْمُسْتَعَانُ[١].

واتە: تێگەیشتووترین کەس ئەو کەسەیە کە قەدەری خوا بە قەدەر دەگێڕێتەوە، بەڵکوو ژیان نییە بەبێ ئەوە، برسیەتی و تینویەتی و سەرما و هەموو ناخۆشییەکان لە قەدەردایە، بەرپەرچیان دەداتەوە بە قەدەری خواردن و خواردنەوە و خۆگەرمکردنەوە و پۆشینی جل و بەرگ ...، هەموو دروستکراوەکان کۆششیان لەم بوارەدایە کە قەدەرەکان دەگێڕنەوە بە قەدەرەکانی تر، ئەو کەسەی خوا یارمەتی دابێت و ڕێنموونی کردبێت قەدەری سزاکانی دواڕۆژ بە تەوبە و ئیمان و کاری چاکە دەگێڕێتەوە، وە هەموو ترس و ناخۆشییەکانی دونیا و قیامەتیش بەو شێوەیە پێوانە دەکرێت، خوای هەردوو دونیا هەر یەکە و داناییەکانیشی هەر یەکە و پێچەوانە و بەتاڵکەرەوەی یەکتر نین، تێگەیشتنی ئەم بابەتە بەم شێوەیە باشترین جۆری تێگەیشتنە بۆ کەسێك بزانێت و حەقی خۆی بداتێ.

ئیماندار لەسەری داواکراوە خۆپاراستن لە ناخۆشییەکان بۆئەوەی نەبێت، وە ئەگەر بوو نەیهێڵێت و بەرەنگاری بێتەوە، قەدەریش لەبەرئەوەی نادیارە لەسەرمان و ئەگەری هاتنی هەیە، ئەوا ئێمە هۆکارەکانی ڕێگری لە بوونیدا دەگرینە بەر، خۆ ئەگەر لەسەرمان نووسرابێت و لەلایەن خواوە بێت؛ ئەوا بەدەستهێنانی هۆکارەکانی ڕێگریش کارئاسانی ناکات و بوونی نابێت بەدەستمانەوە، وە گەر هۆکارەکانیش بەدەستهات؛ ئەنجام و کاریگەری نابێت بۆ ڕێگرتن لەو قەدەرە، بە هۆکاری بوونی چەند ڕێگرییەك لە ڕێگای گەیاندنی هۆکارەکان بە کارەکانەوە.

(١) "الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافي" لابن القيم ص٢١.

قەدەری برسیەتی و تینویەتی بە خواردن و خواردنەوە دەڕەوێنیتەوە، نەخۆشی بە خۆپاراستن و دەرمان، وە هەژاری بە هەوڵدان، وە نەزانین بە هۆکارەکانی فێربوون، وە بوونی نەوەکانت بە ژنهێنان و خێزان پێکەوەنانت، وە هەرووەها.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: «لَا يُورِدُ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ»(١).

واتە: حوشترە نەخۆشەکان تێکەڵی حوشترە لەش ساغەکان نەکرێن.

وە دەفەرمویت: «فِرَّ مِنَ المَجْذُومِ كَمَا تَفِرُّ مِنَ الأَسَدِ»(٢).

واتە: لە کەسێك کە تووشی گولی بووە ڕاکە وەکوو چۆن لە شێر ڕادەکەیت.

هەروەك بەسەرهاتی خەلیفەی دووەم (عمر بن الخطاب) ﷺ بە زۆرێك لە هاوەڵانەوە ڕوودەکەنە شام، کاتێك دەگەنە نزیك شام دەبیستن نەخۆشی (طاعون) کەوتووەتە ناو شامەوە (سوریای ئێستا)، خەلیفەش دەڵێت: «ادْعُ لِي الْمُهَاجِرِينَ الْأَوَّلِينَ، فَدَعَاهُمْ فَاسْتَشَارَهُمْ، وَأَخْبَرَهُمْ أَنَّ الْوَبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِالشَّأْمِ، فَاخْتَلَفُوا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: قَدْ خَرَجْتَ لِأَمْرٍ وَلَا نَرَى أَنْ تَرْجِعَ عَنْهُ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: مَعَكَ بَقِيَّةُ النَّاسِ وَأَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَا نَرَى أَنْ تُقْدِمَهُمْ عَلَى هَذَا الْوَبَاءِ، فَقَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّي، ثُمَّ قَالَ: ادْعُوا لِي الْأَنْصَارَ فَدَعَوْتُهُمْ فَاسْتَشَارَهُمْ، فَسَلَكُوا سَبِيلَ الْمُهَاجِرِينَ، وَاخْتَلَفُوا كَاخْتِلَافِهِمْ، فَقَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّي، ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لِي مَنْ كَانَ هَا هُنَا مِنْ مَشْيَخَةِ قُرَيْشٍ مِنْ مُهَاجِرَةِ الْفَتْحِ، فَدَعَوْتُهُمْ فَلَمْ يَخْتَلِفْ مِنْهُمْ عَلَيْهِ رَجُلَانِ، فَقَالُوا: نَرَى أَنْ تَرْجِعَ بِالنَّاسِ وَلَا تُقْدِمَهُمْ عَلَى هَذَا الْوَبَاءِ، فَنَادَى عُمَرُ فِي النَّاسِ، إِنِّي مُصَبِّحٌ عَلَى ظَهْرٍ فَأَصْبِحُوا عَلَيْهِ، قَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ: أَفِرَارًا مِنْ قَدَرِ اللَّهِ ! فَقَالَ عُمَرُ: لَوْ غَيْرُكَ قَالَهَا يَا أَبَا عُبَيْدَةَ: نَعَمْ، نَفِرُّ مِنْ قَدَرِ اللَّهِ إِلَى قَدَرِ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ لَكَ إِبِلٌ هَبَطَتْ وَادِيًا لَهُ

---

(١) رواه البخاري (٥٧٧٤)، ومسلم (٢٢٢١)، وابن ماجه (٣٥٤١)، وابن حبان في "صحيحه" (٦١١٥)، ومالك في "الموطأ" (١٨)، وأحمد في "المسند" (٩٢٦٣)، والبزار في "المسند" (٧٩٤١)، والطبراني في "الأوسط" (٣٤٨٥)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٦٤١٠)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (١٦٦٠)، والبغوي في "شرح السنة" (١٢/ ١٦٨).

(٢) رواه البخاري (٥٧٠٧)، وأحمد في "المسند" (٩٧٢٢)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٤٥٤٣)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٢٤٧).

عُدْوَتَانِ إِحْدَاهُمَا خَصِبَةٌ وَالْأُخْرَى جَدْبَةٌ، أَلَيْسَ إِنْ رَعَيْتَ الْخَصْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللهِ وَإِنْ رَعَيْتَ الْجَدْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللهِ، قَالَ: فَجَاءَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ وَكَانَ مُتَغَيِّبًا فِي بَعْضِ حَاجَتِهِ، فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِي فِي هَذَا عِلْمًا: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَقُولُ: إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ فَلَا تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلَا تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ، قَالَ: فَحَمِدَ اللهَ عُمَرُ، ثُمَّ انْصَرَفَ»[(١)].

واتە: بانگی کۆچەرییەکانی مەککەی کرد (المهاجرین) و هەواڵی دانێ بە ڕووداوەکە، هەندێکیان وتیان هاتوویت بۆ کارێك بۆ شام و مەگەڕێرەوە، هەندێکیان وتیان: پاشماوەی هاوەڵانت لاماوە ڕامان وایە مەیانبەرە ناو ئەو دەردەوە، پاشان پشتیوانەکانی بانگکرد (الأنصار) و بە هەمان شێوەی کۆچەرییەکان دوو ڕایان هەبوو، پاشان پیاوە گەورەکانی قوڕەیشی بانگکرد، ئەوانەی کۆچیان کرد بۆ مەدینە ئەو ساڵەی کە مەککە گیرایەوە، هەموویان وتیان: ڕامان وایە خەڵکی بگێڕیتەوە و نەیانبەیتە ناو ئەو نەخۆشییەوە، خەلیفەش بانگی خەڵکی کرد و وتی: من سبەینێ لەسەر ڕێم بۆ گەڕانەوە، (أبو عبیدة) ﷺ وتی: ئەوە ڕادەکەیت لە قەدەری خوا؟ ئەویش وتی: خۆزگە تۆ نەبوویتایە ئەو قسەیەت بکردایە، بەڵێ ڕادەکەین لە قەدەری خوا بۆ قەدەرێکی تری خوا، پاشان (عبد الرحمن بن عوف) ﷺ کە لەم ڕووداوەوە دوور بوو، کاتێك گەڕایەوە و هەواڵەکەی بیست وتی: زانیارییەکم هەیە لەسەر ئەمە کە بیستوومە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بیستتان لە شوێنێك (طاعون) بڵاوە مەڕۆنە ناوی، وە گەر لە شوێنێکدا بوون و تیایدا بڵاو بوو لێی دەرمەچن، ئەوکات خەلیفە سوپاسی خوای کرد و گەڕانەوە مەدینە.

ئەمە لە یاسای تەندروستیشدا پێی دەوترێت هۆکارەکانی خۆپاراستنی تەندروستی (الطوق الصحي).

وە سوننەت و قەدەری کەونی خواش وایە ژیانی ئادەمیزاد لە نێوان دوو هێز و تەوژمی دژبەیەکدایە، بۆیە هەر لە بوونیەوە کە دروستکراوە لە (صراع) و ململانێدایە لە نێوان خێر و

---

(١) رواه البخاري (٥٧٢٩)، ومسلم (٢٢١٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٩٥٣)، ومالك في "الموطأ" (٢٢)، والبزار في "المسند" (٩٩٠)، وأبو يعلى في "مسنده" (٨٣٧)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٧٠٣٥)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٢٦٧)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١١٩١).

شەڕدا کە بەرجەستە بوو لە (آدم وإبليس)دا، پاشان شۆڕ بووەتەوە بۆ بوارەکانی ژیان و لە لایەکەوە هەڵهاتووە بۆ لایەکەی تری بە هیوای مانەوە و بوونی خۆی لە شەڕەوە بۆ خێر، لە مردنەوە بۆ ژیان، لە زیانەکانیەوە بۆ سوودمەندییەکانی، تا دەژی دەبێت لە نێوان موژدە و هەڕەشەکان و ترس و هیوا و عیبادەت و تاوانباری و کاری بەهەشت و کاری دۆزەخدا بێت (الوعد والوعيد، الخوف والرجاء، الطاعة والمعصية، الجنة والنار ...)، هەموو ئادەمیزاد ژیان لەم نێوەندەدا دەبەنە سەر، هەمووشیان داڕێژراوە و قەدەری خوایین و هەندێك بە هەندێك تێدەپەڕێنێت، وەکوو قوتابی کە لە ترسی دەرنەچوون و (طموح) و ویستی دەرچوون؛ هەوڵ دەدات و ئەم ململانێیە دەیخاتە دەرچوونەوە.

بۆیە یەکێك لە دوعاکانی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «اللهُمَّ أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ»(١).

واتە: ئەی پەروەردگار پەنا ئەگرم بە ڕازیبوونی تۆ لە تووڕەبوونت، وە بە لێبوردەییت لە سزادانت، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە تۆ، وەسف و باسی تۆم پێناکرێت وەکوو چۆن خۆت باس و وەسفی خۆت دەکەیت شایستە بەو شێوەیەیت.

ئەگەر هۆکارەکان خودی خۆیان سەربەخۆ نەبن لە کارەکاندا و مەرجیش نەبێت لە بوونیدا بوون هەبێت و بە واقعیش پەیوەستبوونی دڵیشی نابێت پێوە بێت؛ کەواتە هۆکارەکان سنووردار و لاوازن و لە ڕووە دینی و دونیاییەکەشەوە بۆ هەرەس نەهێنان و نەڕووخاندنی دەروون دەبێت بەردەوام ئەگەری سفر و نەبوونی بدەیتێ، لە ڕووە دینییەکەشەوە جۆرێکە لە هۆکارەکانی شەریك دانان بۆ خوا، وە دەبێت ڕێگەی ئاڵوگۆڕی هۆکارەکان بەردەوام بگیرێتە بەر بۆئەوەی بزانی توانا و ڕەخساوییەکانت لەکوێدایە، کە ئەمە پێی دەوترێت ڕەواندنەوەی قەدەر بە قەدەر.

بەهەرحاڵ ئەگەر ئەمە حاڵی هۆکارەکان بێت دەبێت گەڕاندنەوە بۆلای پەروەردگار و بوارەکانی ئیمان کۆتا چارەسەر بێت لە بوونی تۆدا.

---

(١) رواه مسلم (٤٨٦)، وأبو داود (٨٧٩)، والترمذي (٣٤٩٣)، والنسائي في "الكبرى" (١٥٨)، وابن ماجه (١١٧٩)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٦٥٥)، وابن حبان في "صحيحه" (١٩٣٢)، ومالك في "الموطأ" (٧٢٥)، وأحمد في "المسند" (٧٥١)، والدارقطني في "السنن" (٥١٣)، والحاكم في "المستدرك" (١١٥٠)، وأبو يعلى في "مسنده" (٢٧٥)، والطبراني في "الأوسط" (٣٦٧٧)، والبيهقي في "الشعب" (٣٥٥٧)، والبغوي في "شرح السنة" (١٣٦٦).

لە کۆتایی ئەم بەشەدا کۆمەڵێك بابەتی گرنگ ڕوون بووەوە کە بۆخۆیان بناغەن بۆ تێگەیشتنی ووردەکاری لەسەر قەدەر، لەوانە دڵنیابوون لەسەر ئەوەی کە ئادەمیزاد خاوەن بژاردە و ئیرادەی سەربەخۆی خۆیەتی، نکوولێکردن لەو بابەتە ئەستەمە و بە واقعی ڕۆژانە تیایدا دەژی، ئەگەرچی ئەم بژاردەیەی پەیوەندی بە خۆی و کار و تواناکانی چواردەورەوە هەیە و ڕێژە و چۆنیەتییەکی دیاریکراو لەخۆدەگرێت.

وە بەو عەقڵەی کە پێی دراوە دەتوانێت دەرك بە چاك و خراپی کار و ڕێگاکان بکات و تا ڕادەیەکی زۆر پاساو و خۆدزینەوەی بۆ نەچێتە سەر، مەگەر لەسەر ووردەکاری و هەندێك بواری شاراوە نەبێت تیایدا.

وە بە هەمان شێوەش تواناکانی ئادەمیزاد لەپێش کارەکاندا بوونی هەیە و هەموو پێویستییەکانی کارکردنی بۆ ڕەخساوە و لەژێر باری بەکارهێنانی خۆیدایە، وە هەمان توانا و ئیرادە بوونی هەیە لە کاتی ئەنجامدانی کارەکانیدا، لەگەڵ چوونە ناو ئەنجامدانی کارەکانەوە کۆمەڵێك توانا و یارمەتی و ئاسانکاری تری بۆ ئەنجام دەدرێت، بەگوێرەی نیەت و چوونەپێشەوەی لە کارەکان، جا ئیتر ئەگەر ڕێگەی خێر بێت ئەوا وەکوو ئەنجام و پاداشتی کارە چاکەکانی ئەو ڕێگە خێرەی بۆ ڕەخساوە، وە ئەگەر ڕێگەی خراپ بێت ئەوا وەکوو سزا و پاشکۆ و هۆکاری ئەنجامی کارە خراپەکانی ڕێگە خراپەکەی بەدوای خۆیدا هێناوە، وەکوو گەر ئاو بخواتەوە تێرئاوی دەکات کە چاکە، وە گەر عەرەق بخواتەوە ئەنجامەکەی بێئاگای دەکات کە خراپە.

وە ڕێگەکانی هیدایەت و گومڕایی لەلایەن خواوە بە کار و هۆکار و ڕێگاکانیەوە چنراوە، ووردکراوەتەوە و والاّ کراوە، بە شێوەیەك کە تەنانەت ئادەمیزادەکان لە نێوان یەکدا توانای خوێندنەوە و یەکلاکردنەوەی هەموو لایەکانیان هەیە و چاکە و خراپەیان بۆ ڕوون دەبێتەوە، وە قەبارەی پاداشت و سزاش لەسەریان، بەڵگەش لەسەر ئەمە دانانی ئەم هەموو یاسا و بەرنامە دونیاییەیە بەبێ زانستی دینی بۆ بەڕێکردنی ژیانی ئادەمیزاد لە ئاستی دەوڵەت و خێزان ... .

وە هەموو هۆکارەکان و کاریگەرییان لەسەر هێنانەدی کارەکان وا پەیوەست کراون بەیەکەوە کە بەبێ یەکتر بوونیان نابێت، هەروەکوو تا ئاو و زەوی و دانەوێڵە و کێلاّن ... بوونیان نەبێت بەروبوومیش بوونی نابێت.

ئەمانە ئەوە دەگەیەنێت کە هۆکارەکان سەربەخۆ نین لە هێنانەدی کارەکاندا، وە مەرجیش نییە بە بوونی هۆکارەکان کارەکان بێنە دی، لەبەرئەمە پێویست دەکات پەیوەندییەکی دڵی پەیوەست بێت بە پەروەردگاری هێنەرەدی کارەکانەوە، نەك ڕاستەوخۆ تەنها بە هۆکارەکانەوە، تەنانەت لەڕووی دونیاییشەوە دەبێت بەردەوام ئەنجامی سفر بۆ کارەکان دابنێیت، تاوەکوو لە نەهاتنەدیدا ڕووخاندن و بێ ئومێدی و پاڵدانەوە بۆ خاوەنەکەی دروست نەبێت، وە دەبێت وەکوو شەرعیش پەرچدانەوە و وەڵامدانەوەی قەدەر بە قەردەر ئەنجام بدرێت تاوەکوو هەموو هۆکارەکان بگرێتە بەر، بەڵام لە سەروو هەموویانەوە دەبێت پشتبەستن و داواکردن و پەیوەندی بە پەروەردگار و هێنەرەدی خۆی و کار و هۆکارەکانیەوە توند و تۆڵ بێت.

ئەمانە هەمووی دەربارەی ئادەمیزاد، ئەوەی دەربارەی پەروەردگاری ئادەمیزادە ئەوەیە کە دڵنیا بین لەوەی خوای پەروەردگار ستەم لە بوونێك ناکات و لە شەرعەکەشیدا حەرامی کردووە و هیچ شتێکیشی بە شەڕی تەواو دروست نەکردووە.

ئەوەی بەسەر ئادەمیزاددا دێت هەمووی کار و ڕێگە و ئەنجامی تایبەتی خۆیەتی، خوا پێویستی بە ستەم و سزا و زۆرپێکردن نییە و زانایە بەسەر کار و وردەکارییەکاندا، لەبەرئەوە ستەم لە ناو و سیفات و کاری ئەودا نییە و نابێت.

وە هەموو کارەکانی پڕە لە حیکمەت و زانایی و خوێندنەوەی هۆکارەکان، وە هەڵە و نەزانین و لەخۆوە بوون لە هیچ کار و ئەنجامی کارەکانیدا بوونی نییە و ئەستەمە و هەر ئەو لە نەبوونەوە هێناونییەتە بوون، وە هەر ئەویش (رَبّ) و (خالق)یانە، وە هەر ئەویش شایستەی پەرستنە، لەبەرئەوەی خاوەنی تەواوترین ناو و سیفات و زات و کارێکە و هاو وێنە و شێوازی نییە.

﴿سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ﴾

  




# بەندی دووەم

## بەشی یەکەم:

١. ڕازیبوون بە قەدەر و حوکمەکانی.
٢. داد پەروەری خوایی لە لێپرسینەوەدا.
٣. پرسیار و وەڵام لە بابەتە قەدەرییەکاندا.
٤. بەرهەمەکانی باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر.

## بەشی دووەم:

١. سەرەتای دروستبوونی بیروڕا لە قەدەردا و هۆکارەکانی.
٢. قەدەرییەکان (القدرية).
٣. جەبرییەکان (الجبرية).
٤. ئەشعەرییەکان (الأشعرية).
٥. کورتەی بیروڕای ئەهلی سوننەت لە قەزا و قەدەردا.




# بەشی یەکەم

## ڕازیبوون بە قەدەر و حوکمەکانی

## الرضا بالقدر وأحكامه

۩ قال رسول الله ﷺ: «ذَاقَ طَعْمَ الْإِيمَانِ مَنْ رَضِيَ بِاللهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا»(١).

واته: تام و چێژی ئیمانی چەشتووە ئەو کەسەی کە ڕازیبێت بە خوایەتی (الله) جَلَّجَلَالُهُ، وە بە دینی ئیسلام، وە بە پێغەمبەرایەتی (محمد) ﷺ.

۩ قال رسول الله ﷺ: «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللهِ رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ»(٢).

واته: هەرکەسێك گوێی لە بانگبێژ بوو پاشان بڵێت: "منیش شایەتی دەدەم کە جگە لە (الله) هیچ خوایەك بە حەق بوونی نییە و تاك و تەنیایە و شەریکێکی نییە، وە (محمد) ﷺ بەندە و نێردراوی خوایە، ڕازیم بە خوایەتی (الله) جَلَّجَلَالُهُ، وە بە دینی ئیسلام، وە بە پێغەمبەرایەتی (محمد) ﷺ" ئەوا خوای پەروەردگار لە هەموو تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێت.

(ابن القیم) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: وَهَذَانِ الْحَدِيثَانِ عَلَيْهِمَا مَدَارُ مَقَامَاتِ الدِّينِ، وَإِلَيْهِمَا يَنْتَهِي. وَقَدْ تَضَمَّنَا الرِّضَا بِرُبُوبِيَّتِهِ سُبْحَانَهُ وَأُلُوهِيَّتِهِ. وَالرِّضَا بِرَسُولِهِ، وَالِانْقِيَادَ لَهُ. وَالرِّضَا بِدِينِهِ،

---

(١) رواه مسلم (٣٤)، والترمذي (٢٦٢٣)، وابن حبان في "صحيحه" (١٦٩٤)، وأحمد في "المسند" (١٧٧٨)، والبزار في "المسند" (١٣١٨)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٦٩٢)، والبيهقي في "الشعب" (١٩٥)، وابن بطة في "الإبانة" (٨٦٧)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٦٣٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (٩/ ١٥٦)، والبغوي في "شرح السنة" (٢٤).

(٢) رواه مسلم (٣٨٦)، وأبو داود (٥٢٥)، والترمذي (٢١٠)، والنسائي في "الكبرى" (١٦٥٥)، وابن ماجه (٧٢١)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٤٢١)، وابن حبان في "صحيحه" (١٦٩٣)، وأحمد في "المسند" (١٥٦٥)، والحاكم في "المستدرك" (٧٢٨)، والبزار في "المسند" (١١٣٠)، وأبو يعلى في "مسنده" (٧٢٢)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٨٩١).

وَالتَّسْلِيمَ لَهُ، وَمَنِ اجْتَمَعَتْ لَهُ هَذِهِ الْأَرْبَعَةُ: فَهُوَ الصِّدِّيقُ حَقًّا. وَهِيَ سَهْلَةٌ بِالدَّعْوَى وَاللِّسَانِ. وَهِيَ مِنْ أَصْعَبِ الْأُمُورِ عِنْدَ الْحَقِيقَةِ وَالِامْتِحَانِ. وَلَا سِيَّمَا إِذَا جَاءَ مَا يُخَالِفُ هَوَى النَّفْسِ وَمُرَادَهَا. مِنْ ذَلِكَ تَبَيَّنَ أَنَّ الرِّضَا كَانَ لِسَانُهُ بِهِ نَاطِقًا. فَهُوَ عَلَى لِسَانِهِ لَا عَلَى حَالِهِ ... فَالرِّضَا بِإِلَهِيَّتِهِ يَتَضَمَّنُ الرِّضَا بِمَحَبَّتِهِ وَحْدَهُ، وَخَوْفَهُ، وَرَجَائَهُ، ... وَالرِّضَا بِرُبُوبِيَّتِهِ: يَتَضَمَّنُ الرِّضَا بِتَدْبِيرِهِ لِعَبْدِهِ ... وَأَمَّا الرِّضَا بِنَبِيِّهِ رَسُولًا: فَيَتَضَمَّنُ كَمَالَ الِانْقِيَادِ لَهُ. وَالتَّسْلِيمَ الْمُطْلَقَ إِلَيْهِ، ... وَأَمَّا الرِّضَا بِدِينِهِ: فَإِذَا قَالَ، أَوْ حَكَمَ، أَوْ أَمَرَ، أَوْ نَهَى: رَضِيَ كُلَّ الرِّضَا. وَلَمْ يَبْقَ فِي قَلْبِهِ حَرَجٌ مِنْ حُكْمِهِ. وَسَلَّمَ لَهُ تَسْلِيمًا[١].

واتە: ئەو دوو فەرموودەیە خاڵی کۆکەرەوەی هەموو دینە، وە کۆتا کۆکەرەوەی هەموو مەبەستەکانی دینە، ڕازیبوون بە خوایەتی خوا لە بەڕێوەبردن و پەرستندا لەخۆدەگرێت، وە ڕازیبوون بە پێغەمبەرایەتی (محمد) ﷺ و گوێڕایەڵیکردنی، وە ڕازیبوون بە دینەکەی و خۆبەدەستەوەدانی، هەرکەس ئەم چوارەی بۆ کۆببێتەوە ئەوە لە پلەی ڕاستگۆیانە (الصديقين) لای خوا بە ڕاست و دروستی، ئەمانە بە زمان و باسکردنی ئاسانە، بەڵام یەکێکە لە هەرە کارە قورسەکان لە ناوەڕۆك و کاتی تاقیکردنەوەدا، بەتایبەت لەکاتی بوونی دژ و پێچەوانەکانیدا کە حەز و ئارەزووەکانی ئادەمیزادە، ئەوکات دەزانێت کە ئەمانە باسکردنێکی سەرزارەکی بوون، گەرنا بە واقع حاڵ حاڵەتێکی جیاوازە، ڕازیبوون بە خوایەتی (اللَّهُ) جَلَّجَلَالُهُ پەیوەستە بە خۆشەویستی و ترس و پشتبەستن و ئاوات بوون تەنیا بەوەوە، وە بە ڕازیبوون بە بەڕێوەبردنی خوایی بوونەوەرەکانەوە (الربوبية)، واتە ڕازیبوون بە هەموو جۆرەکانی سەرپەرشتیکاری بۆ بەندەکانی، وە ڕازیبوون بە پێغەمبەرەکەشی واتە تەواو پەیوەستبوون و شوێنکەوتەیی تەواو بۆی، وە ڕازیبوون بە دینەکەشی واتە هەر فەرماییشت و یاسا و فەرمان و ڕێگرییەکی پێکردیت دەبێت ڕازیبیت بە هەموو جۆرێکی ڕازیبوون کە هیچ شتێك لە دڵتا نەبێت لە قورسایی و ناڕازیبوون، بەڵکوو خۆبەدەستەوەدانی تەواو بە خاوەنەکەیەوە دیاربێت.

گەر لە فەرموودەکە ووردببینەوە دەبینین «ذَاقَ طَعْمَ الْإِيمَانِ» چێژی ئیمانی پەیوەستکردووە بە ڕازیبوون بە خوایەتی خواوە «بِاللهِ رَبًّا»، نەك بە ڕازیبوون لە خوا لەو کارانەی کە لەگەڵتا

(١) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٧١).

**دەكات، وە ڕازیبوون بە خۆی خستووەتە ڕیزی ڕازیبوون بە پێغەمبەرەكەی و دینەكەیەوە.**

**(ابن تيمية)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** وَالرِّضَا وَإِنْ كَانَ مِنْ أَعْمَالِ الْقُلُوبِ فَكَمَالُهُ هُوَ الْحَمْدُ حَتَّى إنَّ بَعْضَهُمْ فَسَّرَ الْحَمْدَ بِالرِّضَا؛ وَلِهَذَا جَاءَ فِي الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ حَمْدُ اللَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ وَذَلِكَ يَتَضَمَّنِ الرِّضَا بِقَضَائِهِ[1].

**واتە: ئەم ڕازیبوونانە ئەگەرچی كاری دڵییە، بەڵام نیشانەی تەواوی و ڕاست و دروستییەكەی بوونی سوپاس و ستاییشكردنی خوایە لەسەر هەمووی، بۆیە هەندێك پێناسەی ستاییشی خوایان كردووە بە ڕازیبوون لە خوا، بەو واتایەی بەندە كاتێك ستاییشی خوا دەكات كە ڕازی بێت لێی، هەر لەبەر ئەمەیە لە قورئان و سوننەتدا فەرمان دراوە بە سوپاس و ستاییشكردنی خوا لەسەر هەموو كارەكان، لەبەرئەوەی ڕازیبوون بە قەدەر لەخۆدەگرێت.**

**بە (يَحْيَى بْنُ مُعَاذ)یان وت:** مَتَى يَبْلُغُ الْعَبْدُ إِلَى مَقَامِ الرِّضَا؟ فَقَالَ: إِذَا أَقَامَ نَفْسَهُ عَلَى أَرْبَعَةِ أُصُولٍ فِيمَا يُعَامِلُ بِهِ رَبَّهُ، فَيَقُولُ: إِنْ أَعْطَيْتَنِي قَبِلْتُ. وَإِنْ مَنَعْتَنِي رَضِيتُ. وَإِنْ تَرَكْتَنِي عَبَدْتُ. وَإِنْ دَعَوْتَنِي أَجَبْتُ[2].

**واتە: چ كاتێك بەندەیەكی خوا دەگاتە پلەی ڕازیبوونی خوایی؟ وتی: ئەگەر ئەو كەسە خۆی ڕابهێنێت لەسەر چوار بنەمای كاركردن لەگەڵ خوای خۆیدا و بڵێ: ئەگەر پێت بەخشیم وەریدەگرم و ئەگەر پێت نەدام ڕازی دەبم و ئەگەر وازت لێهێنام هەر دەتپەرستم و ئەگەر بانگت كردم وەڵامت دەدەمەوە.**

**جۆری ڕازیبوون بە قەدەرەكان دووانن، جۆرێكیان لەگەڵ حەز و سروشت و پێویستییەكانتدا گونجاوە، ئەمەیان:** فَلَيْسَ فِي الرِّضَا بِهِ عُبُودِيَّةٌ، بَلِ الْعُبُودِيَّةُ فِي مُقَابَلَتِهِ بِالشُّكْرِ، وَالِاعْتِرَافِ بِالْمِنَّةِ[3].

**واتە: ڕازیبوون لەم جۆرە عیبادەت نییە، بەڵكوو عیبادەت لە بەرامبەر ئەمەدا ستاییش و سوپاسگوزاری خوایە و داننانە بە نیعمەتەكانیدا و بەكارهێنانیەتی لە شوێنی خۆیدا.**

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٠/ ٤٣).

(٢) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٧٢).

(٣) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٨٩).

وە جۆری دووەمیان بە پێچەوانەی ویست و حەز و پێویستییەكانی ئادەمیزادەوەیە، ڕازیبوون لەم جۆرەیاندا عیبادەتە و وەكوو (ابن القیم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: مُسْتَحَبٌّ. وَهُوَ مِنْ مَقَامَاتِ أَهْلِ الْإِيمَانِ[١]. واتە باشتر و چاكتر وایە وەكوو دین ڕازیبێت پێی، وە ئەمە پلەوپایەی خاوەن ئیمانداره تایبەتەكانە كە هەرچییەك بە پێچەوانەی حەزەكانیەوە بوو ئەم پێی ڕازییە و بە دڵێكی فراوانەوە وەری دەگرێت.

وە دەڵێت: وَالتَّحْقِيقُ فِي الْمَسْأَلَةِ: أَنَّ الرِّضَا كَسْبِيٌّ بِاعْتِبَارِ سَبَبِهِ، مُوهَبِيٌّ بِاعْتِبَارِ حَقِيقَتِهِ. فَيُمْكِنُ أَنْ يُقَالَ بِالْكَسْبِ لِأَسْبَابِهِ. فَإِذَا تَمَكَّنَ فِي أَسْبَابِهِ وَغَرَسَ شَجَرَتَهُ: اجْتَنَى مِنْهَا ثَمَرَةَ الرِّضَا. فَإِنَّ الرِّضَا آخِرُ التَّوَكُّلِ[٢].

واتە: ڕای دروست لەم بابەتەدا ئەوەیە: بۆ بەدەستهێنانی ڕازیبوون لە خوا؛ ئەوا بەگوێرەی گرتنەبەری هۆكارەكانی ڕێگای هەوڵدانە، وە بەگوێرەی هێنانەدی ڕاست و دروستی و تەواوی ئەو ڕازیبوونەیە لە ئادەمیزاددا بەرامبەر بە خوای خۆی، ئەمە بەخشینێكی خواییە بۆ بەندەكەی، لە توانای بەندەكەیدا نییە، خۆ ئەگەر هۆكارەكان بگرێتە بەر ئەوا درەختی ڕازیبوون دێتە بەرهەم، لەبەرئەوەی ڕازیبوون كۆتا قۆناغی پشتبەستنە بە خوا (التوكل).

ڕازیبوون عیبادەتێكی دڵییە، پەیوەستە بە خۆبەدەستەوەدان و قبووڵكردنی هەموو ئەوانەی دێتە ڕێگەت بە خۆشی و ناخۆشییەكانیەوە، ئەمەش بە هۆكاری دڵنیایی لەسەر كارە پڕ حیكمەتەكانی خوا و نەبوونی هیچ گومانێك لەسەر ئەو قەدەرانەی لای ئەوەوە دێت، بۆیە ڕازیبوون لەسەرروو ئارامگرتنەوەیە و بەڵكوو زیاتریش.

وەكوو (أبو الدَّرداء) رضي الله عنه دەڵێت: «ذِرْوَةُ الْإِيمَانِ الصَّبْرُ لِلْحُكْمِ، وَالرِّضَى بِالْقَدَرِ، وَالْإِخْلَاصُ فِي التَّوَكُّلِ، وَالِاسْتِسْلَامُ لِلرَّبِّ عَزَّ وَجَلَّ»[٣].

واتە: چڵەپۆپەی ئیمان ئارامگرتنە لەسەر حوكم و شەرعەكەی خوا و ڕازیبوونە لەسەر قەدەر و نیەتپاكییە لە كاتی پشتبەستن بە خوا و خۆدانە دەستی خوایە.

---

(١) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٨٩).
(٢) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٧٢).
(٣) "حلية الأولياء" لأبي نعيم الأصبهاني (١/ ٢١٦)، و "صفة الصفوة" لأبي فرج الجوزي (١/ ٢٤٣)، و "قوت القلوب" لابن عطية (٢/ ٦٤).

وە کاتی ڕازیبوونیش دوای هاتنەدی قەدەرەکانە، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الرِّضَا بَعْدَ الْقَضَاءِ»(١).

واتە: خوای پەروەردگار داوات لێدەکەم ڕازیبوونم پێببەخشە لەدوای قەدەرەکانت.

لەبەرئەوەی لەپێش قەدەرەکان نیەت و خۆئامادەکردنە بۆ ڕازیبوون، بەڵام بناغەی ئەم بابەتە دوای قەدەرەکان گرنگە، تاوەکوو ناڕازیبوون نەیەتە دی کە پێی دەوترێت (السخط)، لەبەرئەوەی پێچەوانەی ڕازیبوونە، تاوەکوو ئەم ناڕازیبوونە بوونی نەبێت بە ڕێژەیەکی زۆر، بەڵام بەشێوەی وردە گلەیی و کەم تا زۆر بوونی هەر دەبێت، ئەگەرچی خاوەنەکەشی هەستی پێنەکات.

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: قَلَّ أَنْ يَسْلَمَ السَّاخِطُ مِنْ شَكٍّ يُدَاخِلُ قَلْبَهُ وَيَتَغَلْغَلُ فِيهِ، وَإِنْ كَانَ لَا يَشْعُرُ بِهِ. فَلَوْ فَتَّشَ نَفْسَهُ غَايَةَ التَّفْتِيشِ لَوَجَدَ يَقِينَهُ مَعْلُولًا مَدْخُولًا. فَإِنَّ الرِّضَا وَالْيَقِينَ أَخَوَانِ مُصْطَحَبَانِ. وَالشَّكَّ وَالسُّخْطَ قَرِينَانِ مُتَلَازِمَانِ(٢).

واتە: بە دەگمەن هەیە سەلامەت بێت لە گومانی ناو دڵی کاتێك تێکەڵی دڵ دەبێت و هەستیشی پێناکات، خۆ ئەگەر بە وردی بەدواداچوونی بۆ بکات دەبینێت دڵنیاییەکەی نەخۆشە و وردە شتی تێکەڵە، لەبەرئەوەی ڕازیبوون و دڵنیایی دوو بران هاوڕێی یەکن، وە گومان و ناڕازیبوون دووانەیەکی پەیوەستبوون بەیەکەوە.

(المناوي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: والراحة كلها في الرضا بالمقسوم والاقتصار على حال الوقت والإعراض عما كان ويكون، لأن ذلك كدر في الوقت وشغل بما لا يعني ولا يغني(٣).

واتە: هەموو خۆشحاڵی و ئاسوودەییەك لە ڕازیبوون بە خوادایە لەوەی بەخشیویەتی پێت.

---

(١) رواه النسائي في "الكبرى" (١٢٢٩)، وابن حبان في "صحيحه" (١٩٧١)، وأحمد في "المسند" (٢١٦٦٦)، والحاكم في "المستدرك" (١٩٠٠) وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، والطبراني في "الكبير" (٨٢٥)، والبيهقي في "الشعب" (١٩٢) وَسُئِلَ أَبُو عُثْمَانَ عَنْ قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَسْأَلُكَ الرِّضَا بَعْدَ الْقَضَاءِ فَقَالَ: "الرِّضَا قَبْلَ الْقَضَاءِ عَزْمٌ عَلَى الرِّضَا، وَالرِّضَا بَعْدَ الْقَضَاءِ هُوَ الرِّضَا"، وابن أبي عاصم في "السنة" (٤٢٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٨٤٧)، وصححه الألباني في "التعليقات الحسان" (١٩٦٨)، و "تخريج الكلم الطيب" (١٠٦)، و "صحيح الجامع الصغير" (١٣٠١).

(٢) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٨٩).

(٣) "فيض القدير" للمناوي (١/ ٢٢٤).

وە کورتکردنەوەی تێڕوانین و بیرکردنەوەکان لەسەر ئان و ساتی ئەو کاتەی تێیدا دەژیت پێویستە، وە پشتکردنە ڕووداوەکانی ڕابوردوو و داهاتوو دەبێت کاری تۆ بێت، لەبەرئەوەی دەبێتە لێڵکردن و تێکدانی ئەو سات و کاتەی کە تیایدا دەژیت و خۆسەرقاڵکردنە بە بابەتێکەوە کە بە تۆوە پەیوەستی نەماوە و سوودی لێ نابینیت.

لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الهَمِّ وَالحَزَنِ، ...»[١].

واتە: خوایە پەنات پێدەگرم لە خەمی ڕابوردوو و خەفەتی داهاتوو.

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَلِذَلِكَ كَانَ الرِّضَا بَابَ اللهِ الْأَعْظَمَ، وَجَنَّةَ الدُّنْيَا، وَمُسْتَرَاحَ الْعَارِفِينَ، وَحَيَاةَ الْمُحِبِّينَ، وَنَعِيمَ الْعَابِدِينَ، وَقُرَّةَ عُيُونِ الْمُشْتَاقِينَ[٢].

واتە: ڕازیبوون لە کارەکانی خوا دەرگایەکی گەورەیە و بەهەشتی دونیایە و شوێنی ئاسوودەیی خواناسان و ئاشنایانە بە خوا، وە ژیانی خۆشەویستانە و نیعمەتەکانی عیبادەتکارانە و بیلبیلەی چاوی خاوەن حەزانی گەیشتنە بە پەروەردگار.

یەکێك لە خواناسان دەڵێت: إِذَا كُنْتَ لَا تَرْضَى عَنِ اللهِ فَكَيْفَ تَسْأَلُهُ الرِّضَا عَنْكَ؟[٣].

واتە: ئەگەر تۆ ڕازی نابیت لە خوا چۆن داوای ڕازیبوونی لێدەکەیت لە خۆت؟

خەلیفە (عمر بن الخطاب) رضي الله عنه نامەیەکی نووسی بۆ (أبو موسى الأشعري) و وتی: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ الْخَيْرَ كُلَّهُ فِي الرِّضَا، فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تَرْضَى وَإِلَّا فَاصْبِرْ[٤].

واتە: هەموو خێرێك لە ڕازیبووندایە ئەگەر بتوانیت جێبەجێی بکەیت، وە گەر نا ئەوە ئارام بگرە لەسەر کارەکان.

(١) رواه البخاري (٢٨٩٣) كِتَابُ الجِهَادِ وَالسِّيَرِ، بَابُ مَنْ غَزَا بِصَبِيٍّ لِلْخِدْمَةِ، وأبو داود (١٥٤١)، والترمذي (٣٤٨٢)، والنسائي في "الكبرى" (٧٨٣٥)، وأحمد في "المسند" (١٢٦١٦)، والبزار في "المسند" (٦٢٢٨)، وأبو يعلى في "مسنده" (٣٧٠٠)، والطبراني في "الأوسط" (١٢٩)، والطيالسي في "مسنده" (٢٢٥٦)، والبغوي في "شرح السنة" (١٣٥٥).

(٢) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٧٢)، "الفوائد" لابن القيم (١/ ٩٣).

(٣) "تفسير البغوي" (٥/ ٢٩١).

(٤) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٧٥).

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: وَالرِّضَا ثَلَاثَةُ أَقْسَامٍ: رِضَا الْعَوَامِّ بِمَا قَسَمَهُ اللهُ وَأَعْطَاهُ. وَرِضَا الْخَوَاصِّ بِمَا قَدَّرَهُ وَقَضَاهُ. وَرِضَا خَوَاصِّ الْخَوَاصِّ بِهِ بَدَلًا مِنْ كُلِّ مَا سِوَاهُ[(١)].

**واته: ڕازیبوونی بەندەکانی خوا سێ جۆرە: ڕازیبوونی ڕەشۆکی خەڵك، کە ڕازیبوونە بەوەی خوا پێی بەخشیوە و پێی داوە، وە ڕازیبوونی تایبەتمەندان، کە ڕازیبوونە بە هەموو قەدەرەکانی خوا لەسەری، وە ڕازیبوونی تایبەتی تایبەت، ئەوە ڕازیبوونە بە خوا خۆی لە بریتی هەموو شتەکان، واتە ڕازیبوونە بەوەی کە خوایە و خاوەن ویست و ئیرادەی سەربەخۆی خۆیەتی و قابیلی هیچ ڕەخنە و گازندەیەك نییە.**

وە (ابن مسعود) رضي الله عنه دەڵێت: "لَأَنْ أَخِرَّ مِنَ السَّمَاءِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَقُولَ لِشَيْءٍ قَضَاهُ اللهُ تَعَالَى: لَيْتَهُ لَمْ يَكُنْ"، وفي رواية: "لَأَنْ أَعَضَّ عَلَى جَمْرَةٍ حَتَّى تَبْرُدَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَقُولَ لِشَيْءٍ قَدْ قَضَاهُ اللهُ: لَيْتَهُ لَمْ يَكُنْ"[(٢)].

**واته: ئەگەر لە ئاسمانەوە بکەومە خوارەوە، یاخود قەپ بکەم بە پشکۆیەکدا تا دەکوژێتەوە، پێم خۆشترە لەوەی قەدەر و کارێك خوا ئەنجامیداوە لەسەرم بڵێم خۆزگە ئەمە نەبوایە.**

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: إِذا جرى على العَبْد مَقْدُور يكرههُ فَلهُ فِيهِ ستّة مشَاهد: أَحدهَا: مشْهد التَّوْحِيد، وَأَن الله هُوَ الَّذِي قدّره وشاءه وخلقه ... الثَّانِي: مشْهد الْعدْل، وَأَنه مَاض فِيهِ حكمه عدل فِيهِ قَضَاؤُهُ. الثَّالِث: مشْهد الرَّحْمَة، وَأَن رَحمته فِي هَذَا الْمَقْدُور غالبه لغضبه وانتقامه وَرَحمته حشوه. الرَّابِع: مشْهد الْحِكْمَة، وَأَن حكمته سُبْحَانَهُ اقْتَضَت ذَلِك لم يقدّره سدى وَلَا قَضَاهُ عَبَثا. الْخَامِس: مشْهد الْحَمد، وَأَن لَهُ سُبْحَانَهُ الْحَمد التَّام على ذَلِك من جَمِيع وجوهه. السَّادِس: مشْهد العبوديّة، وَأَنه عبد مَحْض من كل وَجه تجْرِي عَلَيْهِ أَحْكَام سيّده وأقضيته[(٣)].

---

(١) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٧٥).

(٢) "تفسير الرازي" (٤/ ١٣٣)، و "اللباب في علوم الكتاب" للنعماني (٣/ ٨٨)، و "شعب الإيمان" للبيهقي (٢١٠)، و "الإبانة الكبرى" لابن بطة (١٤٥٧)، و "الزهد" لأبي داود (١٢٨)، و "شرح أصول إعتقاد" للالكائي (١٢١٧).

(٣) "الفوائد" لابن القيم ص٣٢.

واتە: ئەگەر قەدەرێکی ناخۆش بەسەر بەندەیەکی خوادا بێت، لە شەش ڕووەوە خوێندنەوەی بۆ دەکرێت:

**یەکەم:** لایەنی عەقیدەیی (التوحید)، بەوەی کە ئەم قەدەرە لەلایەن خواوەیە و ئەو ویستی لەسەرە و بۆی دروستکردووە.

**دووەم:** لایەنی دادپەروەری خوایی، کە قەدەرەکانی بەسەر بەندەکانی تێدەپەڕێت و هیچی ستەم نییە و هەمووی دادپەروەرییە.

**سێیەم:** لایەنی بەزەیی خوایی، کە ئەم قەدەرە ناخۆشە زاڵبوونی بەزەیی خواییە بەسەر سزایدا و بەمە تێیدەپەڕێنێت.

**چوارەم:** لایەنی حیکمەت لە کارەکاندا، وای ڕەخساندووە ئەم قەدەرە وابێت، بە لاوەکی و گاڵتە ئەمە ڕوویندداوە.

**پێنجەم:** لایەنی سوپاسگوزاری و ستاییش و شوکرانەی تەواوی خوایی، بە هەموو شێوازەکانیەوە، بەو شێوەیەی کە لە هەموو ڕوویەکەوە شایستەیە بە خوا.

**شەشەم:** لایەنی بەندایەتی بۆ خوا، کە بەندەیەکی بێدەسەڵاتە و لەژێر ویست و هەڵسووڕاندنی گەورەکەیایەتی بەبێ بوونی دەسەڵاتی خۆی.

لەبەرئەوە ڕازی بە لە خوا بە هەموو ئەو کارانەی کە لەگەڵتدا دەیکات، خوای پەروەردگار مەبەستی لە ڕێگریکردنت پێدانیەتی پێت، وە مەبەستی لە بەڵا بەسەرتدا ئەوەیە کە لەسەرت لابات و سەلامەتیت پێببەخشێت، وە نەخۆشت دەخات بۆ ئەوەیە کە شیفات بۆ بهێنێت، وە دەتخاتە بەر ناخۆشییەکان بۆئەوەی بتژیێنێت، وە لە هەموو ئاڵوگۆڕەکاندا مەبەست ئەوەیە کە تۆ بەندەی ئەویت، پێویستە لەگەڵ ئەودا بیت، وە هەموو کار و هەڵسووڕاندنەکانی سەرت مەبەست بە تۆ گەیاندنە بە پاداشت و هۆکارەکانی ڕزگاربوون.

**خەلیفە (عمر بن الخطاب)** ﷺ **دەڵێت:** مَا أُبَالِي عَلَى أَيِّ حَالٍ أَصْبَحْتُ، عَلَى مَا أُحِبُّ أَوْ عَلَى مَا أَكْرَهُ، لِأَنِّي لَا أَدْرِي الْخَيْرَ فِيمَا أُحِبُّ أَوْ فِيمَا أَكْرَهُ[١]، **وە دەیوت:** لو كَانَ الصَّبْرِ والشُّكر

---

(١) "الزهد والرقائق" لابن المبارك (١/ ١٤٣) برقم (٤٢٥)، و "الكنى والأسماء" للدولابي (٣/ ٩٨٧)، و "شرح السنة" للبغوي (١٤/ ٣٠٦)، و"الزهد" لأبي داود (٩٦)، و"مدارج السالكين" لابن القيم (١/ ٤٩٧).

بعيرَين ما باليت أيُّهما ركِبت[١].

واتە: ئێوارە و بەیانی بە هەرجۆرێك بکەمەوە بەلامەوە وەکوو یەك وایە، لەبەرئەوەی من نازانم خێرەکان لە خۆشییەکانمدایە یاخود لە ناخۆشییەکان، وە ئەگەر هەژاری و دەوڵەمەندی دوو وشتر بن ئەوا بە سواری هەرکامێکیان ڕێ بکەم لای من وەکوو یەك وان، لەبەرئەوەی هەردووکیان دەمگەیەننە شوێنی مەبەستم.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: «عَجَبًا لِأَمْرِ الْمُؤْمِنِ، إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ، وَلَيْسَ ذَاكَ لِأَحَدٍ إِلَّا لِلْمُؤْمِنِ، إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ، فَكَانَ خَيْرًا لَهُ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ، صَبَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ»[٢].

واتە: کاری ئیماندار شوێنی سەرسامییە، هەموو کارەکانی خێرە بۆی، ئەمەش بەس بۆ ئیماندارە، ئەگەر خۆشییەکانی پێ بەخشرا ئەوا سوپاس و ستاییشی خوای لەسەر دەکات و بۆ ئەو خێرە، خۆ ئەگەر ناخۆشییەکانی تووش بوو ئارام دەگرێت و بۆ ئەو هەر خێرە ئارامگرتنەکە.

## حوکمی ڕازیبوون بە قەدەر

### حكم الرضا بالقدر

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: لَيْسَ فِي كِتَابِ اللهَّ وَلَا فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللهَّ آيَةٌ وَلَا حَدِيثٌ يَأْمُرُ الْعِبَادَ أَنْ يَرْضَوْا بِكُلِّ مَقْضِيٍّ مُقَدَّرٍ مِنْ أَفْعَالِ الْعِبَادِ حَسَنِهَا وَسَيِّئِهَا؛ فَهَذَا أَصْلٌ يَجِبُ أَنْ يُعْتَنَى بِهِ وَلَكِنْ عَلَى النَّاسِ أَنْ يَرْضَوْا بِمَا أَمَرَ اللهُّ بِهِ فَلَيْسَ لِأَحَدِ أَنْ يَسْخَطَ مَا أَمَرَ اللهُّ بِهِ[٣].

واتە: لە هیچ شوێنێکی قورئان و سوننەتدا ئایەتێك یا فەرموودەیەك نییە لەسەر فەرماندان بە بەندەکانی خوا کە ڕازی بن بە هەموو قەدەر و ڕووداوەکانی سەریان لە چاکە و خراپە، ئەمە بنەمایەکی دینییە پێویستە گرنگی پێبدرێت، بەڵام ئەوەی کە پێویستە لەسەر موسوڵمانان ڕازیبوونە بە فەرمانە شەرعییەکانی خوا، بۆ کەسیشیان نییە نارازی بن لەسەر شەرع و جێبەجێکردنی.

---

(١) "التعازي" لأبي الحسن المدائني (١/ ٨٩) برقم (١٣٧)، و"تأريخ الإسلام" للذهبي (١٢/ ٦٩٦)، و"تأريخ دمشق" لابن عساكر (١٣/ ٤٧)، و"الصبر والثواب عليه" لابن أبي الدنيا (٧)، و"عدة الصابرين" لابن القيم ص٩٥.

(٢) رواه مسلم (٢٩٩٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٨٩٦)، وأحمد في "المسند" (١٨٩٣٤)، والطبراني في "الأوسط" (٣٨٤٩)، والبيهقي في "الشعب" (٤١٦٩).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٩٠).

(ابن القيم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ **دەڵێت**: فإن الإيجاب يستلزم دليلًا شرعيًا، ولا دليل يدل على الوجوب وهذا القول أرجح[1].

**واتە: لە دیندا گەر شتێك (واجب) بێت پێویستی بە بەڵگەی شەرعی هەیە، وە هیچ بەڵگەیەكیش نییە لەسەر واجب بوونی ڕازیبوون بۆ هەموو ئەو قەدەرانەی كە دێت بەسەریاندا، ئەم ڕایە بەهێزترین ڕایە لەم بوارەدا.**

وە **دەڵێت**: الحكم والقضاء نوعان، ديني وكوني، فالديني يجب الرضا به وهو من لوازم الإسلام، والكوني منه ما يجب الرضا به كالنعم التي يجب شكرها، ومن تمام شكرها الرضا بها، ومنه ما لا يجوز الرضا به كالمعايب والذنوب التي يسخطها الله وإن كانت بقضائه وقدره ومنه ما يستحب الرضا به كالمصائب ... هذا كله في الرضا بالقضاء الذي هو المقضي، وأما القضاء الذي هو وصفه سبحانه وفعله كعلمه وكتابه وتقديره ومشيئته فالرضا به من تمام الرضا بالله ربًا وإلهًا ومالكًا ومدبرًا، فبهذا التفصيل يتبين الصواب ويزول اللبس في هذه المسألة العظيمة التي هي مفرق طرق بين الناس[2].

**واتە: یاساكانی خوا و قەدەرەكانی دوو جۆرن: قەدەر و یاسای شەرعی و دینی، وە قەدەر و یاسای كەونی:**

**قەدەر و یاسا شەرعییەكان** **ئەوانەی كە خوا فەرمانی پێداوین لە عیبادەت و كارەكانی تردا، وە ئەوانەی لە سوننەتدا هەیە واجبە ڕازیبین بە هەمووی، یەك بە یەكی و بگرە مەرجی پەیوەستبوونە بە ئیسلامەوە.**

**قەدەر و یاسا كەونییەكان** **ئەوانەی لە بووندا خوای گەورە دروستی كردوون و هێناونیەتە دی چەند جۆرێكن، هەیانە واجبە ڕازیبیت پێی، وەكوو نیعمەتەكانی خوا بەسەر بەندەكانیەوە، وە هەیانە نابێت ڕازیبیت پێی، وەكوو ئەو هەموو تاوان و خراپانەی كە هەیە لە كەوندا (وەك ئیبلیس و تاوانەكان و بێبڕوایی ...)، وە هەشە حوكمی ڕازیبوونەكەی سوننەتە و باش وایە ڕازی بین پێی، لەوانە بەڵا و ناخۆشییەكانی دونیا.**

(١) (٢) "شفاء العليل" لابن القيم ص٢٧٨.

ئەمانە لـەو ڕووەوە کە قەدەر و دروستکردن و هێنانەدییە دونیاییەکانە، بەڵام وەکوو قەدەر و نووسین و ویست و هێنانەدی خوایی بۆ سەر بەندەکانی کە پەیوەندی بە خوایەتی خۆیەوە هەیە؛ ئەمە لـە تەواوکاری ڕازیبوون و باوەڕبوونە بە خوای خۆت لـە ڕووی (الربوبة والألوهیة)ەوە کە خاوەن و بەڕێوەبەری بوونەوەرەکانە، وە بە نەبوونی ئەم شێوازە باوەڕبوون و ڕازیبوونە ناتەواوییە لـە عەقیدەی ئیمانداردا، واتە ڕازین بە بڕاردە و نووسین و هێنانەدی خوا لـەسەرمان وەکوو قەدەر، بەڵام وەکوو کارەکان کە باس کران جیاوازن.

وە خوای پەروەردگار خۆیشی ڕەخنە لـەوانە دەگرێت کە هەموو قەدەرەکان بە ڕازیبوونی خوا دادەنێن و تەنها ئەو لایەنە کەونییەکەی تیادا دەخوێننەوە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأۡسَنَاۗ قُلۡ هَلۡ عِندَكُم مِّنۡ عِلۡمٖ فَتُخۡرِجُوهُ لَنَآ﴾ [الأنعام : ١٤٨]. موشریکەکان دەیانوت: خۆ ئەگەر خوا ویستی لـەسەر نەبوایە ئەوا ئێمە و باو و باپیرانمان بتمان نەدەپەرست و ئەو کارانەی حەرامان کردووە لـەسەر خۆمان نەمان دەکرد، ئەمانە هەروەك ئەوانەی پێشووی خۆیان درۆ دەکەن تا سزاکانمان دەچێژن، ئەی (محمد) ﷺ پێیان بڵێ ئایا ئێوە لـەسەر ئەم قسانە کە دەڵێن خوا ویستی لـەسەرە و پێی خۆشە؛ هیچ زانیارییەکتان هەیە لـەلای خواوە لـەسەری تا پێمان پشانبدەن.

موشریکەکان لـەوەدا بەهەڵەدا چوون یاخود دەیکەنە پاساو کە هەرچییەك لـە بووندا هەیە ویستی خوای لـەسەرە بۆیە دروستی کردووە، وە ئەوەشی کە ویستی ئەوی لـەسەرە و دروستی کردووە دەبێت پێی خۆش بێت و پێی ڕازی بێت، بەڵام ئەوە دەزانین کە ئیرادە و ویست (الإرادة والمشیئة) پێخۆشبوون و پێڕازیبوون (المحبة والرضا) نییە، تەنانەت ئەمە لـە ئادەمیزادیشدا هەیە کە کار هەیە ویستی لـەسەرە ببێت و دەشیکات، بەڵام پێی ڕازی نییە.

هەموو ئاماژەکانی قورئانیش پێداگرییە لـەسەر ڕازیبوون بە دینی خوا و شەرعەکەی و ناڕازیبوونە بە ڕێگەی هەڵە و تاوانەکان، وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾ [المائدة : ٣]. ڕازیم بەوەی کە لـە ئیسلامدا هەیە وەکوو دین، وە دەفەرموێت: ﴿وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَ﴾ [الحجرات : ٧]، ﴿وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَ﴾ [الزمر : ٧]، واتە خوای گەورە پێی ناخۆشە و ڕقی لـە بێبڕوایی و تاوان و لادانەکانە، وە ڕازی نییە بە بێبڕوایی بۆ بەندەکانی.

ئەمانە بەڵگەن لەسەر ڕازیبوون بەوەی کە خوا ڕازییە لەسەری، وە ناڕازیبوون لەوەی کە خوا پێی ناڕازییە.

## بیروڕای فیرەقەکان لەسەر ڕازیبوون بە قەزا و قەدەر(١):

**یەکەم: قەدەرییەکان:** دەڵێن ڕازیبوون بە قەدەرە خێرەکان عیبادەتە، بەڵام ڕازیبوون بە تاوانەکان دروست نییە و بگرە بە قەدەری خواش نییە، واتە خوا دروستی نەکردووە و داینەناوە لەسەرت، ئەمە لەسەر بیروڕای خۆیانە کە دەڵێن ئادەمیزاد خۆی کاری خۆی دروستدەکات، نیوەی قسەکەیان کە دەڵێن "ڕازیبوون بە تاوانەکان دروست نییە" ئەمە تەواوە، بەڵام "قەدەر نییە" ئەمە هەڵەیە، لەبەرئەوەی لە ئەنجامی کارەکانتا خوا بۆی ڕەخساندوویت، هەر ئەویش دایناوە و دروستی کردووە.

**دووەم: جەبەرییەکان:** دەڵێن هیچ کارێك لە دەستی ئادەمیزاددا نییە، بۆیە ڕازیبوون بە قەدەر عیبادەتە، وە تەنانەت تاوانەکانیش بە قەدەری خوایە و ئێمە پێی ڕازین و ڕقمان لێیان نییە، لەبەرئەوەی هەرچییەك لە بووندا هەیە بە ویستی خوایە، کە بە ویستی ئەویش بوو ئەوا پێی خۆشە و پێی ڕازییە، لای ئەمان (المشيئة والمحبة والرضا) یەك شتن و لە هەموو قورئاندا یەك واتایان هەیە، هەروەکوو قسەی موشریکەکان.

**(ابن القيم)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** قال كثير من الأشعرية بل جمهورهم ومن اتّبعهم: أن الرضا والمحبة والإرادة في حق الرب تعالى بمعنى واحد، وأن كل ما شاءه وأراده فقد أحبه ورضيه(٢).

**واتە: هەموو ئەشعەرییەکانیش هەمان بیروڕای جەبەرییەکانیان هەیە، ئەگەرچی ئەشعەرییەکان دەڵێن ئادەمیزاد خاوەن ئیرادە و کارە، بەڵام کاریگەرییان لەسەر هێنانەدی توانای کارەکە نییە، کەواتە لە ئەنجامدا هەمان قسەی جەبەرییەکان دەردەچێت.**

وە **دەڵێت:** وَالطَّائِفَتَانِ مُنْحَرِفَتَانِ، جَائِرَتَانِ عَنْ قَصْدِ السَّبِيلِ. فَأُولَئِكَ أَخْرَجُوهَا عَنْ قَضَاءِ الرَّبِّ وَقَدَرِهِ. وَهَؤُلَاءِ رَضُوا بِهَا وَلَمْ يَسْخَطُوهَا. هَؤُلَاءِ خَالَفُوا الرَّبَّ تَعَالَى فِي رِضَاهُ

---

(١) ئەم بابەتە لە "شفاء العليل" لابن القيم ص٦٨٧، و "مدارج السالكين" لابن القيم (١/ ٥٨١)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٩٠)، و "شرح الطحاوية" لعبد الرحمن جبرين (٢٢)، و "الإبانة" لابن بطة (٣/ ٢٢٦).

(٢) "شفاء العليل" لابن القيم ص٢٧٩.

وَسَخَطِهِ. وَخَرَجُوا عَنْ شَرْعِهِ وَدِينِهِ. وَأُولَئِكَ أَنْكَرُوا تَعَلُّقَ قَضَائِهِ وَقَدَرِهِ بِهَا[١].

واتە: ئەم دوو فیرەقانە هەردووکیان تاوانبار و لادەرن لە ڕێگەی ڕاست، قەدەرییەکان تاوان و خراپەکانیان لە قەدەری خوا دەرکردووە و دەڵێن ئادەمیزاد خۆی دروستی دەکات، خوا دروستی نەکردووە و دەسەڵاتیشی تیایدا نییە و لەسەریشی نەنووسیوە.

وە جەبرییەکان و ئەشعەرییەکانیش بە تاوان و خراپە و بێبڕواییەکان ... ڕازین ئەگەر ڕووبدات و ڕقیان لێی نییە، لەبەرئەوەی ویستی خوای لەسەرە و وادەزانن کە ویستی لەسەر بوو پێشی خۆشە و ڕازییە، ئەمانە پێچەوانەیی خوا دەکەن لە ڕازیبوون و پێناخۆشبووندا و بگرە لە شەرع و دینیشیان دەرکردووە، لەبەرئەوەی ئادەمیزاد هیچ دەسەڵاتێکی نییە و بەزۆر کارەکانی پێدەکرێت، کەواتە (قەدەر هەیە و شەرع نییە)، قەدەرییەکانیش لە قەدەر دەریانکردووە و پەیوەستییان بە خواوە نەهێشتووە، لای ئەمان (شەرع هەیە و قەدەر نییە)، وە هەڵەکانی ئەم جۆرە بیروڕایانەیان دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار:

هۆکاری یەکەم: هەردوو لایان جیاوازییان نەکردووە لە نێوان (القضاء والمقضي)، واتە ئەوەی کە خوا بڕیاری لەسەر دەدات بۆ هاتنەدی، لەگەڵ ئەوەی کە هێناویەتییە دی و دروستی کردووە لە بووندا، ئەم دووانە جیاوازن، یەکەمیان پەیوەندی بە خواوە هەیە، دووەمیان پەیوەندی بە دروستکردن و هێنانەدی سەر ئادەمیزاد و کارەکانیەوە هەیە، وەکوو الشَّيخ (العثيمين) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: فالمقضي غير القضاء؛ لأن القضاء فعل الله، والمقضي مفعول الله، فالقضاء الذي هو فعل الله يجب أن نرضى به، ولا يجوز أبدًا أن نسخطه بأي حال من الأحوال، وأما المقضي فعلى أقسام: **القسم الأول**: ما يجب الرضا به (مثل الواجب شرعاً)، **القسم الثاني**: ما يحرم الرضا به (يحرم الرضا بالمعاصي)، **القسم الثالث**: ما يستحب الرضا به (وهو ما يقع من المصائب)[٢].

وە (**ابن أبي العز**)یش رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: هُنَا أَمْرَانِ: قَضَاءُ اللَّهِ؛ وَهُوَ فِعْلٌ قَائِمٌ بِذَاتِ اللَّهِ تَعَالَى، وَمَقْضِيٌّ: وَهُوَ الْمَفْعُولُ الْمُنْفَصِلُ عَنْهُ. فَالْقَضَاءُ كُلُّهُ خَيْرٌ وَعَدْلٌ وَحِكْمَةٌ، نَرْضَى بِهِ كُلِّهِ،

---

(١) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٨٦).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" (٢/ ٩٢).

وَالْمَقْضِيُّ قِسْمَانِ: مِنْهُ مَا يُرْضَى بِهِ، وَمِنْهُ مَا لَا يُرْضَى بِهِ[(١)].

**واته: جیاوازییان بۆ نەکراوە لە نێوان قەزا و قەدەر وەکوو "نووسین و دانان و کاری خوا کە پەیوەندی بە خوایەتی خۆیەوە هەیە" کە ئەمە پێی دەوترێت (القضاء)، وە لەگەڵ "دروستکردن و هاتنەدی و بوون لە واقعدا" کە ئەمەشیان پێی دەوترێت (المُقضي) واتە هاتوودەییەکان، ئەمانە سێ جۆرن، هەیانە واجبە ڕازیبیت پێیان، وەکوو کار و واجبە شەرعییەکان لە عیبادەت ...، وە هەیانە حەرامە ڕازیبیت پێیان، وەکوو تاوان و خراپەکان کە دەبێت ڕێگە بگریتە بەر بۆ نەکردن و لەناوبردنیان، وە هەشیانە (مستحب)ە و باش وایە ڕازی بیت پێی و پاداشتی تیادایە و مایەی پلەبەرزییە بۆت ئەگەر ڕازی بیت بە قەدەرەکان، وەکوو بەڵا و ناخۆشییەکانی ژیان و لە ئاستیاندا وەکوو (ابن بطة)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** الْإِيمَان بِالْقدرِ وَالرِّضَا وَالتَّسْلِيم لقَضَاء الله وَقدره وَترك الْبَحْث والتنقير وَإِسْقَاط لم وَكَيف وليت وَلَوْلَا فَإِن هَذَا كُله اعتراضات من العَبْد على ربه[(٢)].

**واته: ئیمان بە قەدەرەکان بێنین و ڕازی بین پێیان و خۆمان بدەین بەدەستەوە لە ئاستیاندا، وە واز لە بەدواداچوون و قووڵبوونەوە و وتنی وشەکانی (بۆ و چۆن و خۆزگە و ئەگەر) بێنین، لەبەرئەوەی هەموو ئەمانە ڕەخنەگرییە لەلایەن بەندەکانەوە بۆ خوا، ئەم جۆرە ڕازیبوون و تەسلیمە بۆ قەدەری شەرعی و (مصائب) و ناخۆشییەکانە نەك تاوان و لادان و بیروڕاکان.**

**هۆکاری دووەم: جیاوازی نەکردن لەنێوان "ئیرادە و ویست و پێخۆشبوون و ڕازیبوونی خوایی" (الإرادة والمشيئة والمحبة والرضا)، وەکوو (ابن تيمية)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** لكون هؤلاء المتوهمين لم يفرقوا بين الإرادة، والمحبة، والرضا، بل جعلوا كل مراد محبوباً مرضياً. ثم قال هؤلاء: الكفر والفسوق والعصيان ليس محبوباً باتفاق المسلمين، فلا يكون مراداً، فيكون وقوع ذلك بدون إرادته، فيكون في ملكه ما لا يريده، فيكون ما لا يشاء، ويشاء ما لا يكون. وقال هؤلاء بل هو مريد لكل حادث، فإنه ما شاء كان، وما لم يشأ لم يكن. والكفر والفسوق والعصيان. مراد له فيكون محبوباً مرضياً، ... سووا بين المأمور والمحظور[(٣)].

---

(١) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٢٥٨.

(٢) "الإبانة الكبرى" لابن بطة العكبري (٣/ ٢٢٦).

(٣) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٨/ ٢٣).

واتە: هەردوو ئەم فیرقانە جیاوازی ناکەن لە نێوان ئیرادە و ویست و پێخۆشبوون و ڕازیبوونی خوایی، وە قەدەرییەکان دەڵێن تاوان و خراپەکان خۆشەویست نین، لەبەرئەوە لای خواش شوێنی ویست و ئیرادەی ئەو نین و بەبێ ئیرادەی خوا بوونیان دەبێت، بەم واتایە ئەوە دەگەیەنێت کە لە موڵك و دەسەڵاتی خوادا دەشێت بوون هەبێت خوا ویست و ئیرادەی لەسەر نەبێت، وە دەشێت خوا ویست و ئیرادەی لەسەر هەندێك شت هەبێت بەڵام بوونی نەبێت، ئەمە لە ئادەمیزاددا بەو شێوەیە بوونی هەیە، بەڵام بۆ خوا ئەمە بێ دەسەڵاتییە.

جەبرییەکانیش دەڵێن: هەموو بوونێك ویستی خوای لەسەرە و هەموو شتێکیش کە ویستی ئەوی لەسەر بێت دەبێت و ئەوەشی ویستی لەسەر نەبێت نابێت، تاوان و خراپەکانیش ویستی خوایان لەسەرە، کەواتە دەبێت شوێنی خۆشەویستی و ڕازیبوونی ئەو بن، بەم هۆکارە جیاوازییان نەهێشتەوە لە نێوان حەڵاڵ و حەرام و چاکە و خراپەکاندا، ئەمە تەنانەت لای ئادەمیزاد بوونی نییە کە هەرچی ویستی لەسەر بێت دەبێت پێشی خۆش بێت و ڕازی بێت، چ جای پەروەردگار!

(ابن القیم) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: وَالَّذِي يَكْشِفُ هَذِهِ الْغُمَّةَ، وَيُبْصِرُ مِنْ هَذِهِ الْعِمَايَةِ، وَيُنْجِي مِنْ هَذِهِ الْوَرْطَةِ: إِنَّمَا هُوَ التَّفْرِيقُ بَيْنَ مَا فَرَّقَ اللهُ بَيْنَهُ، وَهُوَ الْمَشِيئَةُ وَالْمَحَبَّةُ. فَإِنَّهُمَا لَيْسَا وَاحِدًا. وَلَا هُمَا مُتَلَازِمَيْنِ. بَلْ قَدْ يَشَاءُ مَا لَا يُحِبُّهُ، وَيُحِبُّ مَا لَا يَشَاءُ كَوْنَهُ. فَالْأَوَّلُ: كَمَشِيئَتِهِ لِوُجُودِ إِبْلِيسَ وَجُنُودِهِ. وَمَشِيئَتِهِ الْعَامَّةِ لِجَمِيعِ مَا فِي الْكَوْنِ مَعَ بُغْضِهِ لِبَعْضِهِ. وَالثَّانِي: كَمَحَبَّتِهِ إِيمَانَ الْكُفَّارِ، وَطَاعَاتِ الْفُجَّارِ، وَعَدْلَ الظَّالِمِينَ، وَتَوْبَةَ الْفَاسِقِينَ. وَلَوْ شَاءَ ذَلِكَ لَوُجِدَ كُلُّهُ وَكَانَ جَمِيعُهُ. فَإِنَّهُ مَا شَاءَ كَانَ. وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ. فَإِذَا تَقَرَّرَ هَذَا الْأَصْلُ، وَأَنَّ الْفِعْلَ غَيْرُ الْمَفْعُولِ، وَالْقَضَاءَ غَيْرُ الْمَقْضِيِّ(١).

واتە: ئەم تارمایی و کوێری و ڕێگە ئاڵۆزییەی سەر کەسێك بەوە لادەچێت کە دەبێت جیاوازی بکات لە نێوان ئەو جیاوازییەی کە خوا کردوویەتی لە نێوان "ویست و ئیرادەی" لەگەڵ سیفەتی "ڕازیبوون و پێخۆشبوونی" (المشیئة والمحبة)، کە هەردووکیان جیاوازن و بە دوو واتای جیاواز باسیان هەیە لە قورئاندا، لەبەرئەوە دەشێت خوا ویستی لەسەر هەندێك شت هەبێت و پێیشی خۆش نەبێت، وەکوو (ئیبلیس و تاوان و بێبڕوایی ...)، ئەمە ویستێکی خوایی گشتییە لە

(١) "مدارج السالکین" لابن القیم (٢/ ١٨٨).

کەونی و بووندا، وە دەشێت پێی خۆشبێت و لە هەمان کاتدا ویستی لەسەر نەبێت، وەکوو (ئیمانهێنانی بێبڕوایان و تەوبە و گەڕانەوەی تاوانباران و دادپەروەری ستەمکاران)، ئەمانەی هەموو پێی خۆشە لەم کەسانەدا ببێت، بەڵام بە هۆکاری بژاردەی خۆیان و کارکردنیان لەسەری وەکوو ئەنجام و سزای گرتنەبەری ئەو ڕێگەیەیان خوا ویستی لەسەر نییە ببێت، وەکوو عەدالەت و دادپەروەرییەکی خوایی بەسەریانەوە، بەڵام دڵنیاین خۆ هەمووی لەژێر ویستی خوادایە، ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت دێتە دی، ئەم بابەتە پەیوەندی بەو جیاکارییەوە هەیە کە لە قەدەری کەونی و شەرعیدا بە درێژی باسکراوە، لەگەڵ جیاوازیکردن لە نێوان "دروستکردنی خوا و دروستکراوەکانیدا" و "قەدەر و داڕشتنەکانی خوا و هاتنەدی بوونەکان"، بەم جیاوازیکردنە لەو نێوەندەدا یەکلاکەرەوەی هەموو بابەتەکانی قەزا و قەدەرە.

  

## دادپەروەری خوایی لە لێپرسینەوەدا

## العدل الإلهي في الجزاء

یەکێك لە بنەما و متمانەکان لای ئادەمیزاد دادپەروەری خواییە بۆ بەندەکانی، بەڵام وردەکارییەکانی ئەم دادپەروەرییە زۆرجار لای بەندەکانی ونە، بە هۆکاری بێئاگاییان لە سوننەتی خوا و ڕێگە چنراوە کەونی و شەرعییەکانی لە مامەڵەکردن و بەڕێوەبردنی دروستکراوەکانیدا، ئەویش هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ کار و هۆکار و بوونی مەرج و جۆری داواکارییەکان، ئەوکات بەم هۆکارانە لە دادپەروەری پەروەردگار تێدەگەیت، ئێستاش بۆ چاوڕۆشنی هەندێك لە سوننەت و یاساکانی پەروەردگار دەخەینە ڕوو لە ئاستی لێپرسینەوە و پاداشت و سزای بۆ بەندەکانی، کە سەلمێنەری بوونی متمانەی دادپەروەری خوایە.

**١. بنەما لای خوا لە سزاداندا هاوشێوەیەتییە.**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَا﴾ [الشورى: ٤٠].

واتە: سزای تاوانێك یەك سزایە بە هاوشێوەی خۆی.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦ﴾ [النحل: ١٢٦].

واتە: گەر تۆڵەتان سەندەوە با بە هاوشێوەی خۆی بێت.

هێشتا لەگەڵ ئەمەشدا زۆری مایەی لێبووردەییە، وەکوو دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ٣٠﴾ [الشورى: ٣٠].

واتە: هەرچییەکتان تووشدەبێت بە هۆکاری کردەوەکانی خۆتانەوەیە، هێشتا زۆریشی بەر لێبوردن کەوتووە.

**٢. بۆ پاداشتی چاکەکان زیاتر و پڕترە لە قەبارەی خۆیان.**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦ﴾ [النساء: ١٧٣].

واتە: بۆ خاوەن باوەڕ و کارچاکەکان پاداشتی خۆیان بەتەواوی و زیادەیەکیش لە پلەوپایەی خواییان پێدەبەخشرێت.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾ [إبراهيم: ٧]، ﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ ﴿١٧﴾﴾ [محمد: ١٧].

واتە: گەر سوپاسگوزار بن بۆتان زیاد دەکەین، وە ئەوانەی هیدایەتیان وەرگرتووە هیدایەتی زیاتریان پێدەبەخشرێت، سەرەڕای ئەمانەش هۆکارەکانی خواپەرستی والآدەکرێت بە ڕوویاندا.

**٣. تۆڵە لە ستەمکارەکان دەکاتەوە بەوەی هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا زاڵ دەکات.**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٢٩﴾﴾ [الأنعام: ١٢٩].

واتە: هەندێك لە ستەمكاران بالآدەست و زاڵ دەکەم بەسەر هەندێکیاندا بە هۆکاری کردەوەکانیانەوە.

**٤. سەرکەوتنی خوایی بەندە بە سەرخستنی دینەکەیەوە.**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ﴿٧﴾﴾ [محمد: ٧].

واتە: ئەگەر دینی خوا سەربخەن ئەوکات سەرکەوتنتان پێدەبەخشین.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ﴾ [الحج: ٤٠].

واتە: خوا ئەوانە سەردەخات کە دینەکەی سەردەخەن.

**٥. نیعمەتەکانی لەوانە وەردەگرێتەوە کە نایبەخشن بەوانەی کە شایستەی پێبەخشینن.**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِنَّا بَلَوْنَاهُمْ كَمَا بَلَوْنَا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ﴾ [القلم: ١٧]، ﴿فَطَافَ عَلَيْهَا طَائِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَائِمُونَ ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ كَالصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾﴾ [القلم: ١٩، ٢٠].

واتە: وەکوو خاوەن باخەکەی کە دەیویست مافی هەژاران نەدات و لە سزایدا سووتا، لە خەودا بوون کە باخەکەیان سووتا.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَا تُنفِقُوا مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٢﴾﴾ [البقرة: ٢٧٢].

واتە: ئەوەی ببەخشن بۆتان پڕدەکەینەوە و ستەمتان لێناکرێت.

**٦. کارئاسانی بۆ کەسێکە کە کارئاسانکارە بۆ خەڵکی.**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ فَٱفۡسَحُواْ يَفۡسَحِ ٱللَّهُ لَكُمۡ ﴾ [المجادلة: ١١].

واتە: ئەی ئیمانداران ئەگەر لە کۆڕێکدا کارئاسانی بکەن بۆ دانیشتنی کەسێك؛ خوای گەورە فراوانی و کارئاسانی هەمەجۆرەتان پێدەبەخشێت.

**٧. پاداشتی خاوەن چاکە بە چاکە.**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ٦٠ ﴾ [الرحمن: ٦٠].

واتە: ئایا پاداشتی چاکەکردنی دونیایی چاکەی دوارۆژ نییە؟

**٨. پشتگوێخستنی ئەوانەی کە دینیان پشتگوێ خستووە.**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰهُمۡ كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ يَوۡمِهِمۡ هَٰذَا ﴾ [الأعراف: ٥١].

واتە: ئەمڕۆ لەبیرتان دەکەین وەکوو چۆن ئەم ڕۆژەتان لەبیرکرد.

**٩. بە هاوشێوەی کارەکانی دونیا مامەڵە لەگەڵیاندا دەکرێت.**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ٣٤﴾ [المطففين: ٣٤].

واتە: ئەمڕۆ ئیمانداران بە بێبڕوایان پێدەکەنن وەکوو چۆن لە دونیادا ئەوان پێدەکەنین بە ئیمانداران.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿إِن تَسۡخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسۡخَرُ مِنكُمۡ كَمَا تَسۡخَرُونَ ٣٨﴾ [هود: ٣٨].

واتە: ئەگەر گاڵتە بە ئێمە بکەن ئێمەش ڕۆژێك دەبێت گاڵتە بە ئێوە بکەین.

**١٠. گرتنی ڕێگەی پاك بەرهەمی پاکە.**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَٱلَّذِي خَبُثَ لَا يَخۡرُجُ إِلَّا نَكِدٗا ﴾ [الأعراف: ٥٨].

واتە: زەوی پاك بەرهەمی پاکە و زەوی پیسیش بەرهەمی پیسە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ ... وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ ﴾ [النور: ٢٦].

واتە: ئافرەتە پاکەکان بۆ پیاوە پاکەکان و پیسەکانیش بۆ پیسەکانە.

**١١. هەموو کەس کردەوەی خۆی بۆ خۆیەتی و تاوانیش هەر بۆ خۆیەتی.**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ﴾ [النجم: ٣٩، ٤٠].
واتە: هەموو کەس کردەوەی خۆی بۆ خۆیەتی و پاداشتەکەشی دەبینێتەوە.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾ [الإسراء: ١٥].

واتە: هەرکەس هیدایەت وەربگرێت بۆ خۆیەتی و گومڕاش بێت هەر بۆ خۆیەتی، وە تاوانی کەسیش نادرێت بەسەر کەسی تردا.

**١٢. لەناوبردنی ئەوانەی کە ئازاری پێغەمبەران و وەلییەکانی خوا دەدەن.**

❁ بۆ فیرعەون قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴿١٠٣﴾ ﴾ [الإسراء: ١٠٣]. دەیویست موسا و گەلەکەی سەرگەردان بکات لەسەر زەوی، خوای گەورەش هەموویانی خنکان لە ئاوەکەدا.

❁ بۆ گەلی (نوح) ﷺ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۖ وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍۭ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ ۖ وَجَٰدَلُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ لِيُدْحِضُوا۟ بِهِ ٱلْحَقَّ فَأَخَذْتُهُمْ ۖ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٥﴾﴾ [غافر: ٥]. گەلی (نوح) و ئەوانەی کە لەدوای ئەوانەوە هاتن پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستەوە و هەموو گەلان هەوڵی لەناوبردنی پێغەمبەرەکانیان دەدا، تاوەکوو بە زۆرەملێ بیانگێڕنەوە و حەقەکەیان ناشرین بکەن، بەڵام چ سزایەکمان دان!

**١٣. سزادانی هەندێك بە هەندێك بە لەناوبردنیان.**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ ﴾ [البقرة: ٢٥١].
واتە: ئەگەر هەندێك بە هەندێك لەناونەبەین لە خراپەکان؛ ژیانی سەرزەوی تێکدەچێت.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴾ [الحج: ٤٠].

واتە: گەر خوای پەروەردگار خراپەکان لەناونەبات بە یەکتری، ئەوا شوێن و ڕێگە خێرەکان بنەبڕ دەکرێن و ڕێگری لە ڕێگە خێرەکانیش دەکرێت.

لە ڕوانگەی ئەم دەقانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کارەکانی خوا پڕ لە ووردەکاری بەڕێوەبردنی بەندەکانیەتی بە دادپەروەری و هیچ شتێك لەژێر دەسەڵاتی خوای پڕ لە حیکمەت و دانا دەرچوونی نییە و هەر ئەو چاودێرە بەسەر دروستکراوەکانیەوە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ [النساء : ١]، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا ٥٢﴾ [الأحزاب : ٥٢]. واتە هەر لە ئەزەلەوە خوا بەسەرتانەوە چاودێر و ڕەقیبە.

  

# پرسیار و وەڵام
# لە بابەتە قەدەرییەکاندا
## الأسئلة والأجوبة في مسائل القدر

ئەگەرچی هەست دەکەین بەو ڕێگە و بابەتانەی پێشوو گرێ و پرسیار و گومانی زۆر ڕەویونەتەوە و ئەگەر پرسیاری تریش هەبێت لەژێر باری ئەو باسانەدا بە دڵنیاییەوە وەڵامی دەبێت، بەڵام هەر بە تایبەت و سەربەخۆ پرسیارەکان ئاراستە بکرێن و وەڵام بدرێنەوە باشتر و زووتر تێگەیشتن دەدات بەدەستەوە، وە لە قەزا و قەدەردا هەندێك بابەت و دەق هەیە شوێنی پرسیارە و پێویستی بە ڕوونکردنەوە و وەڵام هەیە کە بە شێوەی سەربەخۆ نەڕەخساوە وەڵامی بدرێتەوە، بۆ تەواوکردنی بابەتی قەزا و قەدەر بە پێویستی دەزانین کە بە شێوەی پرسیار و وەڵام شی بکرێتەوە.

**پرسیاری یەکەم:** **حیکمەت چییە لە دروستبوونی (إبلیس، تاوان، بێبڕوایی ...)؟ یاخود: ئایا چۆن خوا کارێکی دەوێت کە پێی خۆش نییە (یریده ولا یرضاه)؟**

(ابن القیم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: قِيلَ: هَذَا السُّؤَالُ هُوَ الَّذِي افْتَرَقَ النَّاسُ لِأَجْلِهِ فِرَقًا، ... فَاعْلَمْ أَنَّ الْمُرَادَ نَوْعَانِ: مُرَادٌ لِنَفْسِهِ. وَمُرَادٌ لِغَيْرِهِ. فَالْمُرَادُ لِنَفْسِهِ: مَطْلُوبٌ مَحْبُوبٌ لِذَاتِهِ ... فَهُوَ مُرَادُ إِرَادَةِ الْغَايَاتِ وَالْمَقَاصِدِ. وَالْمُرَادُ لِغَيْرِهِ: قَدْ لَا يَكُونُ فِي نَفْسِهِ مَقْصُودًا لِلْمُرِيدِ، وَلَا فِيهِ مَصْلَحَةٌ لَهُ بِالنَّظَرِ إِلَى ذَاتِهِ. وَإِنْ كَانَ وَسِيلَةً مَقْصُودَةً وَمُرَادَةً[1].

واتە: ئەم پرسیارە هۆکاری جیاوازی بیروڕاکانە، مەبەستەکان دوو جۆرن، **یەکەمیان:** ئەو مەبەستانەی کە بۆ خودی خۆیەتی و پێی خۆشە؛ ئەوا بوونی (ئیبلیس و تاوان و بێبڕوایی ..) هۆکارن بۆ گەیشتن بە مەبەست و داواکارییەکانی وەك عیبادەت و (توحید) ... کە مەبەست تیایدا دەرکەوتنی حەقی خوایەتییە، **دووەمیان:** ئەو مەبەستانەی کە بۆ خۆی نییە، ئەمانە لە ڕووی خودی خۆیانەوە سوود و مەبەست نین، بەڵام لە ڕووی هۆکارەکانەوە بۆ گەیشتن بە مەبەستەکان پێویستە و شوێنی مەبەستە.

(ابن القیم) رَحِمَهُ اللَّهُ نموونەیەك بۆ دووەم دەهێنێتەوە و دەڵێت: مِثَالُ ذَلِكَ: أَنَّهُ سُبْحَانَهُ

---

(١) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٩٠).

خَلَقَ إِبْلِيسَ، الَّذِي هُوَ مَادَّةٌ لِفَسَادِ الْأَدْيَانِ وَالْأَعْمَالِ، وَالِاعْتِقَادَاتِ وَالْإِرَادَاتِ، وَهُوَ سَبَبُ شَقَاوَةِ الْعَبِيدِ، ... وَمَعَ هَذَا فَهُوَ وَسِيلَةٌ إِلَى مَحَابَّ كَثِيرَةٍ لِلرَّبِّ تَعَالَى تَرَتَّبَتْ عَلَى خَلْقِهِ. وَجُودُهَا أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ عَدَمِهَا[1].

**واتە: نموونەی (المراد لغيره) خوای گەورە هەندێك شتی دروستكردووە بۆ بەندەكانی كە ببنە هۆكار و گەیاندن و بەدەستهێنانی كۆمەڵێك پلەوپایەی بەرز، گەر بەم هۆكارانەوە نەبێت ئەوا نایەتە دی، لەوانە (إبليس) كە هۆكاری تێكدانی دین و بیروڕا و كارەكانی ئادەمیزادە و ڕێگەی خراپە و نەگبەتییە بۆ بەندەكانی خوا ... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هۆكارە بۆ گەیشتنی بەندەكانی بە زۆرێك لە خۆشەویستییەكانی خوا، هەر لە جیهاد و عیبادەت و دژایەتیكردن و پەناگرتن و داواكردن لە خوا و هەتا دوایی، بۆیە بوونی خۆشەویستترە تا نەبوونی.**

**وە هەر لەوانەش نەخۆشی و هەژاری و بێبڕوایی و تاوان ... كە نهێنی بوونی ئەمانە زۆرن، وەكوو (ابن القيم)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** الْحِكْمَةُ فِيْ خَلْقِ الله سُبْحَانَهُ لِمَا يَكْرَهُ مِنْهَا: أَنْ تَظْهَرَ لِلْعِبَادِ قُدْرَةُ الرَّبِّ تَعَالَى عَلَى خَلْقِ الْمُتَضَادَّاتِ الْمُتَقَابِلَاتِ فَخَلَقَ هَذِهِ الذَّاتَ الَّتِي هِيَ أَخْبَثُ الذَّوَاتِ وَشَرُّهَا. وَهِيَ سَبَبُ كُلِّ شَرٍّ فِي مُقَابَلَةِ ذَاتِ جِبْرِيلَ، الَّتِي هِيَ أَشْرَفُ الذَّوَاتِ، وَأَطْهَرُهَا وَأَزْكَاهَا. وَهِيَ مَادَّةُ كُلِّ خَيْرٍ، ... وَمِنْهَا: ظُهُورُ آثَارِ أَسْمَائِهِ الْقَهْرِيَّةِ، مِثْلَ الْقَهَّارِ، وَالْمُنْتَقِمِ، وَالْعَدْلِ، وَالضَّارِّ، وَشَدِيدِ الْعِقَابِ، وَسَرِيعِ الْحِسَابِ، وَذِي الْبَطْشِ الشَّدِيدِ، وَالْخَافِضِ، وَالْمُذِلِّ. فَإِنَّ هَذِهِ الْأَسْمَاءَ وَالْأَفْعَالَ كَمَالٌ. فَلَا بُدَّ مِنْ وُجُودِ مُتَعَلِّقِهَا. وَمِنْهَا: ظُهُورُ آثَارِ أَسْمَائِهِ الْمُتَضَمِّنَةِ لِحِلْمِهِ وَعَفْوِهِ، وَمَغْفِرَتِهِ وَسِتْرِهِ، ... وَمِنْهَا: ظُهُورُ آثَارِ أَسْمَاءِ الْحِكْمَةِ وَالْخِبْرَةِ. فَإِنَّهُ سُبْحَانَهُ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ الَّذِي يَضَعُ الْأَشْيَاءَ مَوَاضِعَهَا، ... وَمِنْهَا: حُصُولُ الْعُبُودِيَّةِ الْمُتَنَوِّعَةِ الَّتِي لَوْلَا خَلْقُ إِبْلِيسَ لَمَا حَصَلَتْ، ... عُبُودِيَّةَ الْجِهَادِ مِنْ أَحَبِّ أَنْوَاعِ الْعُبُودِيَّةِ إِلَيْهِ سُبْحَانَهُ، ... وَعُبُودِيَّةُ الْأَمْرِ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيِ عَنِ الْمُنْكَرِ، وَعُبُودِيَّةُ الصَّبْرِ وَمُخَالَفَةُ الْهَوَى، ... وَمِنْهَا: عُبُودِيَّةُ التَّوْبَةِ، ... وَمِنْهَا: عُبُودِيَّةُ مُخَالَفَةِ عَدُوِّهِ، ... وَمِنْهَا: أَنْ يَتَعَبَّدَ لَهُ بِالِاسْتِعَاذَةِ مِنْ عَدُوِّهِ، ... وَمِنْهَا:

---

(١) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٩٠).

أَنَّ الطَّبِيعَةَ الْبَشَرِيَّةَ مُشْتَمِلَةٌ عَلَى الْخَيْرِ وَالشَّرِّ، وَالطَّيِّبِ وَالْخَبِيثِ. وَذَلِكَ كَامِنٌ ... فَخُلِقَ الشَّيْطَانُ مُسْتَخْرِجًا لِمَا فِي طَبَائِعِ أَهْلِ الشَّرِّ مِنَ الْقُوَّةِ إِلَى الْفِعْلِ، ... وَبِالْجُمْلَةِ: فَالْعُبُودِيَّةُ وَالْآيَاتُ وَالْعَجَائِبُ الَّتِي تَرَتَّبَتْ عَلَى خَلْقِ مَا لَا يُحِبُّهُ وَلَا يَرْضَاهُ وَتَقْدِيرُهُ وَمَشِيئَتُهُ: أَحَبُّ إِلَيْهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى مِنْ فَوَاتِهَا وَتَعْطِيلِهَا بِتَعْطِيلِ أَسْبَابِهَا[١].

واتە: لە حیکمەت و نهێنییەکانی دروستبوونی ئەو شتانە، **لەوانە: تاوەکوو توانای خوا** دەرکەوێت لە دروستبوونی دژەکان و پێچەوانەکاندا، وەك (إبلیس) کە بەرامبەری (جبریل)ە ﷺ، کە هۆکار و بوونی خێر و پاکییە، بەڵام (إبلیس) بە پێچەوانەوە.

**لەوانە:** دەرکەوتنی پاشماوە و کاری ناوەکانی خوا کە باس لە تۆڵەسەندنەوە و سزادان و لێپرسینەوە ... دەکات، خۆ ئەگەر ئەم شەڕانە نەبێت ئەو ناو و سیفاتانە لەکاردەکەوێت، وە بە پێچەوانەشەوە سیفات و ناوەکانی لەخۆگری بەزەیی و لێبوردن و هاوشێوەکانیشی کاریان نەدەکرد، لە کێ ببورێ و تاوانەکانی کێ بپۆشێ و بەزەیی بە کێدا بێتەوە؟! وە هەروەها سیفەتەکانی دانایی و زانایی و وردەکاری (علیم، خبیر، حکیم ...) بە چی و بەسەر چیدا ببێت ئەگەر دەرئەنجامی ئەو هۆکارانە نەبێت؟

وە سەرەڕای ئەمانەش: هاتنەدی هەموو جۆرەکانی عیبادەت لە جیهاد و فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە و ئارامگرتن و دژایەتی حەز و ئارەزووەکان ... بە چی دروستبێت گەر ئەو هۆکارانە بوونی نەبێت؟ وە عیبادەتی تەوبە و داوای لێخۆشبوون و پەناگرتن بە خوا ... وە دەرکەوتنی ئەو سروشتە جۆراوجۆرەی کە لە ناخی ئادەمیزاددا هەیە لە ناخ پیسی و شەڕ و فێڵ و خیانەت و درۆ و پاکی ... کە بەو هۆکارانەوە دەردەکەون و دەیکەنە کار و خاوەنیان ... وە بوونە هۆکاری دەرکەوتنی دەسەڵات و نیشانە گەورەکانی خوا لە بوونەوەردا، تۆفان و جۆرەکانی لەناوبردنی گەلان وەك (ثمود) و گەلی (لوط)، وە بە پێچەوانەشەوە نەسوتاندنی ئاگر بۆ (إبراهیم) ﷺ ... وە دەرکەوتنی سیفات و نیشانە گەورەکانی تەوحید لە (الربوبیة والألوهیة والأسماء والصفات) کە بەڕێوەبەر و شایستەی پەرستراوی و خاوەن هەموو سیفات و ناوە تەواوەکانە و هیچ ناتەواوی و کەموکورتی لەخۆناگرێت ﴿وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ [النمل : ٨]. هەموو ئەو

(١) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٩٠ – ١٩٣).

هۆکارانە دەبنە هێنانەدی نهێنییەکانی ناو ژیان و ئادەمیزاد و دەسەڵاتی پەروەردگار لە بەڕێوەبردنی بوونەوەردا، وەك دەڵێن (ولله في خلقه شؤون): خوا ووردەکاری زۆری هەیە لە دروستکردنی بوونەوەرەکان و بەڕێکردنیاندا، لە دەرکەوتنی وادەکانی خوا و حیکمەت و جۆرەکانی عیبادەتی هەمەجۆرە کە ئادەمیزاد بۆی دروستکراوە(١).

وە دەزانین کە خوا هیچ شتێکی دروست نەکردووە کە شەڕی تەواو بێت و خێری تیادا نەبێت، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ»(٢). واتە شەڕ لە تۆوە نییە ئەی پەروەردگار، بەڵکوو بوونی هەموو شەڕەکان ڕێژەییە و لە بوونێکەوە بۆ بوونێکی تر جیاوازە، وە بوونی شەڕەکان لە کاری دروستکراوەکاندایە، نەك لە دروستکردنی خوادا.

**پرسیاری دووەم: ئایا دیاریکردنی داهاتووی ئادەمیزاد لە سکی دایکیدا بە جۆری خراپەکاران یان بەختەوەران (شقيٌّ أم سعيدٌ) نابێتە زۆرەملێکردن لەسەریان؟**

قال رسول الله ﷺ: «إِنَّ اللهَّ عَزَّ وَجَلَّ وَكَّلَ بِالرَّحِمِ مَلَكًا، يَقُولُ: يَا رَبِّ نُطْفَةٌ، يَا رَبِّ عَلَقَةٌ، يَا رَبِّ مُضْغَةٌ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَقْضِيَ خَلْقَهُ قَالَ: أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى، شَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ، فَمَا الرِّزْقُ وَالأَجَلُ، فَيُكْتَبُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ»(٣).

واتە: خوای پەروەردگار مەلائیکەیەك بە سکی دایکێك ڕادەسپێرێت، قۆناغ بە قۆناغ ئیزن لە خوا وەردەگرێت لەسەر بەڕێوەبردنی تا دەگاتە ئەوەی دروست دەبێت، ئەوکات ئیزنی لێ وەردەگرێت نێر بێت یاخود مێ، کەسێکی چاك بێت یاخود خراپ، وە تەمەن و ڕزقی بۆ دیاری

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" (٢/ ١٠٦).

(٢) رواه مسلم (٧٧١)، وأبو داود (٧٦٠)، والترمذي (٣٤٢٢)، والنسائي في "الكبرى" (٩٧٣)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٤٦٢)، وابن حبان في "صحيحه" (١٧٧٣)، وأحمد في "المسند" (٨٠٣)، والدارمي في "سننه" (١٢٧٤)، والدارقطني في "السنن" (١١٣٧)، والبزار في "المسند" (٥٣٦)، وأبو يعلى في "مسنده" (٥٧٤)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٢٥٦٦)، والطيالسي في "مسنده" (١٤٧)، والبيهقي في "الشعب" (٢٨٦٤)، والآجري في "الشريعة" (٥٣٨).

(٣) رواه البخاري (٣١٨، ٦٥٩٥)، ومسلم (٢٦٤٦)، وأحمد في "المسند" (١٢١٥٧)، والبزار في "المسند" (٧٤٥٢)، والطيالسي في "مسنده" (٢١٨٦)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٦٦٦)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٨٧)، وابن بطة في "الإبانة" (١٤٠٦)، والآجري في "الشريعة" (٣٦٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٠٤٩)، وأبو نعيم في "الحلية" (٦/ ٢٦٠)، والبغوي في "شرح السنة" (٧٠)، والفريابي في "القدر" (١٤٤).

دەکرێت، هەموو ئەمانەی لە سکی دایکیدا بۆ دەنووسرێت.

بابەتە نووسراوەکانی ناو سکی دایك پێکهاتووە لەمانە: (نێر یا مێ و خراپ یاخود چاك لەگەڵ ڕزق و تەمەن) لەناو هەموو ئەمانەدا زۆری پرسیار لەسەر (شقي أم سعيد) دەکرێت کە کەسێکی خراپ دەبێت یاخود چاك، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر پرسیاری ڕەخنەیی بێت ئەوا هەموو ئەم بابەتانە هەر لە بوونیشیەوە شوێنی ڕەخنەیە و دەبێت پرسیار لەسەر هەمووی بێت، وە ئەگەر ڕەخنە نەبێت لەسەر بوونی و هاتنە دونیای و نێری و مێیی و تەمەن و ڕزقی کەسەکە؛ ئەوا نابێت ڕەخنە و پرسیاریش هەبێت لەسەر دیاریکردنی چاك و خراپی کەسەکە، کەس ناڵێت بۆ تەمەنم ئەوەندەیە و چەندی ماوە، یاخود نێرە بلێت یا مێ بوومایە، یاخود ڕزقم دیارە و پێویست بە کار و کاسپی ناکات ... هەمان ئەو بابەتی (شقي أم سعيد)ەش لە ڕیزی ئەمانەدا هاتووە و قابیلی ڕەخنە و بیرکردنەوە نییە لەسەری، لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك پرسیار لەسەر (شقي أم سعيد) دەکرێت کە لە کەسەکەدا عەقڵ و ئیرادە و زانستی دینی و دونیایی بەشی خۆی پێ بەخشراوە و توانای کارکردنیشی هەیە بە ویست و هەوڵ و بژاردەی خۆی؛ ئیتر ئەم پرسیارە لەکوێدا جێگەی دەبێتەوە؟!

بۆ نموونە چۆن لە یاساکانی دەوڵەتدا هەر لە قوتابخانە و فەرمانگەکانی بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا تۆ کار دەکەیت و یاسایەك هاتە پێشت ناڵێت بە هۆکاری ئەوەی نەتزانیوە بەم یاسایە و زانستت بەسەریدا نەبووە ئەوا تۆ تاوانبار نیت و ڕزگارت دەبێت لە سەرپێچی و باجەکان ... لەبەرئەوەی بە شێوەیەکی گشتی تۆ پابەندی بە کارکردن لەسەر کار و مەبەستە ڕاست و دروستەکانی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا و دەوڵەت، هەر بەم شێوەیەش ئادەمیزاد دەبێت پابەند بێت بە یاساکانی خوا لە بەڕێوەبردنی مافەکانی خوا و خەڵکی و خۆت و کۆمەڵگا، ئەمە شتێکە لە ناخ و بیر و هۆش و ژیری و ژیانی هەموو کەسێکدا شوێنی قبووڵە و ڕەخنەلێگرتنی شوێنی قبووڵ نییە، لەبەرئەوەی خاوەن عەقڵ و توانا و بژاردەیە و چاوڕۆشنی هەیە لەسەر کارەکان، ئەمە لە ڕووی بوونی پرسیارەوە لەم بابەتەدا کە قابیل و شوێنی پرسیار نییە.

وە لە ڕووی بابەتییەوە وەکوو (ابن العثيمين) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وليس باب الهداية بأخفى من باب الرزق وبأخفى من أبواب طلب العلم[1]. واتە ڕێگەی هیدایەتی خوا زۆر والآیە و

(١) "رسالة في القضاء والقدر" لمحمد بن صالح العثيمين ص١٦.

شاراوەیی تیادا نییە، بەڵکوو ڕێگەی ڕزق و ڕۆزی زۆر شاراوەترە کە هەڵپەی هەموو لایەکی بۆ دەکەیت و دانانیشیت و بڵێیت خۆ ڕزقم دراوە پێویست بە هەڵپە و هەوڵ ناکات، بە هەمان شێوەش ڕێگەی خواپەرستی و چاکە و عیبادەت و دینداری هەوڵ و هەڵپە و کاری بۆ بکە، خۆ ئەگەر ڕێگەی زانست و شەهادە و پلەبەرزەکان کەم کەس بتوانێت بیبڕێت، ئەوا دینداری هەر لە شوانێکەوە تا زانایەك دەتوانێت بیگرێتەبەر و کاری لەسەر بکات و بەگوێرەی زانین و توانای خۆی ئەنجامی بدات.

کردنی ئەم پرسیارە پەیوەندی بە ناخی ئادەمیزادەوە هەیە، بۆخۆی گرتنەبەری ڕێگەی چاك و دینداری قورسە و پێچەوانەی حەز و ئارەزووەکانی ئادەمیزادە و کۆتکردن و گرتنەوەیەتی لە نەفس و دونیا، بۆیە بۆ خۆدزینەوە لەو ڕێگایە ئەمانە دەکەنە بەڵگە و پاساو و دەربازبوون، پاشان گەر سەرنج بدەین بە گشتی ئەوانەی ئەم جۆرە بەڵگە و پاساوانە دەهێننەوە کەسانێکن کە ڕێگەی دین و چاکە و عیبادەتیان نەگرتووەتەبەر، بۆیە ئەوانەی کە ئەو ڕێگەیەیان گرتووەتەبەر هەمیشە دوورن لە بڕوبیانوو و هێنانەوەی پاساو بەو شێوازانە، ئەمە واقعێکی ئاشکرایە کە موسوڵمان ئەم جۆرە پرسیارانە ناکات.

**وەڵامێکی تر بۆی:** وەك دەڵێن: "عِلْمُ اللهِ كَاشِفٌ لاَ مُكْرِه"[(١)].

واتە زانستی خوا ئاشکراکارە نەك بەزۆرپێکەر، ئەم هەواڵدانە بۆ کەسەکان کە چاك دەبێت یاخود خراپ واتای ئەوە ناگەیەنێت کە ئیرادە و ژیری و بژاردەی لێ وەردەگیرێتەوە و بە زۆرەملێ دەیخاتە سەر ئەو ڕێگایەی کە بۆی داناوە، هەر بە واقعیش ئەوانە لە ژیانیدا ڕوونادات، خۆ ئەگەر هەرشتێك لەوانە وەکوو عەقڵ و توانا و ئیرادەی پێنەمێنێت ئەوا داوای هیچ کارێکی جێبەجێکاری لێ ناکرێت، لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّغِيرِ حَتَّى يَكْبَرَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ، أَوْ يُفِيقَ»[(٢)].

واتە: حوکم لەسەر سێ کەس نییە: خەوتوو و منداڵ و شێت.

وە دەفەرموێت: «إِنَّ اللهَ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ، وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ»[(٣)].

---

(١) "القضاء والقدر حق وعدل" لهشام عبد الرزاق الحمصي ص٢٩.

(٢) رواه أبو داود (٤٣٩٨)، والترمذي (١٤٢٣)، وسبق تخريجه ص١٨٩.

(٣) رواه ابن ماجه (٢٠٤٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٢١٩)، وسبق تخريجه ص١٨٩.

واتە: خوای پەروەردگار لەسەر موسوڵمانانی نانووسێت گەر هەر کارێك بە هەڵە و لەبیرچوون و بەزۆرپێکردن بکەن.

خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ [البَقَرَة : ٢٨٦].

ئەو هەواڵانەی کە بەسەر کەسەکاندا نووسراوە لە سکی دایکیاندا پەیوەندی بە سیفەتی زانستی خوایی (علم الغيب)ەوە هەیە بەسەر دروستکراوەکانیدا، خۆ ئەگەر خوا زانست و زانیاری نەبێت بەسەر بوونەکاندا کەی دەبن و چۆن دەبن و چی دەبن و ووردەکارییەکانیان؛ ئەوا بۆ خوا ناتەواوییە لە سیفەتی خوایەتیدا و شایستەی خوایەتی نییە، بۆیە دەبێت (علام الغيوب) بێت، وە ئەم هەواڵدانە بەسەر بەندەکانیدا کە چاك دەبن یان خراپ پەیوەندی بە زانستی خوایەتی خۆیەوە هەیە، نەك پەیوەندی بە ئادەمیزادەوە هەبێت، لەبەرئەوەی هەواڵ بدرێت لەلایەنی خواوە و نەدرێت هەر بەو شێوەیە دەردەچێت، وە هیچ گۆڕانکارییەك لە کەسەکاندا ڕوونادات.

خوای پەروەردگار خاوەن زانیارییە غەیبییەکانە (علم الغيب)، وەکوو چۆن هەواڵی داوە لەسەر ڕابوردووەکانی وەك ئادەم و ئیبلیس و گەلانی پێش ئێمە و ڕووداوەکان کە چی بوون، وە پاشماوەکانیشیان هەر ماوە لە شوێنەوارەکانی فیرعەون و گەلی (ثمود) و (لوط) ... و بەڵگەن و شایەتحاڵن، وە هەواڵیشی داوە لەسەر داهاتووەکان و نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، ... وە مردن و زیندووبوونەوە و بەهەشت و دۆزەخ ... بە هەمان ئەم جۆرە هەواڵانە هەواڵیشی داوە کە ئەوانەی دەیانهێنێتە دونیا و چین و چۆنن و دوارۆژیشیان چۆن دەبێت، هەموو ئەمانە هەواڵی ڕابوردوو و ئێستا و داهاتووە و نکووڵی لێ ناکرێت.

خۆ کەسێك دەتوانێت هەواڵ بدات لەسەر منداڵەکەی لە کۆمەڵێك بابەتی دونیایی و ژیانیدا و بە ڕێژەیەکی بەرچاو دێتە دی و ڕاست دەردەچێت، چ جای پەروەردگاری مەزن و داهێنەری هەموو بوونەوەرەکان "ولله المثل الأعلى".

ئەم هەواڵدانانەش وەکوو ئاوێنەیەك وایە کە چۆن گوزارشت لە حەقیقەتی خۆت دەکات لە جل و بەرگ و شکڵ و شێواز ...، وە بە هیچ جۆرێك زۆری لەسەرت نییە و هەر بەو شێوەیەش دەبێت، بۆیە خوای پەروەردگار لە پاشەڕۆژ و کۆتایی کارەکانی ئادەمیزاد دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ فَسَقُوٓا۟ أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾﴾ [يُونُس : ٣٣]. واتە هەر بەو شێوەیە فەرموودە

و دانانەکەی خوا هاتە دی لەسەر تاوانباران کە ئیمان ناهێنن، وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٩٦﴾ [يونس: ٩٦]. واتە ئەوانەی کە بە ڕاست و دروستی فەرموودەکانی خوا هاتە دی بەسەریاندا باوەڕیان نەهێنا، وە دەفەرموێت: ﴿فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُ﴾ [النحل: ٣٦]. واتە لەوانە هەبوو کە شایستە بوون خوا هیدایەتیان بدات، وە هەیان بوو دانانەکەی خوا هاتەدی بەسەریاندا گومڕا بوون، وە دەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ۝٧١﴾ [الزمر: ٧١]. واتە بەڕاستی ئەوەی خوا داینابوو لە سزا بەسەر بێبڕواياندا هاتەدی.

هەموو ئەم ئایەتانە باس لەوە دەکات کە ئەوەی خوا دەربارەیان فەرمووی و لەسەریان نووسی؛ بە ڕاست و دروستی هاتەدی وەکوو خۆی، بۆیە هەموویان تاوانبار و بێبڕوا و گومڕا دەرچوون، ئەوەیشی کە هیدایەتی وەرگرت خوا یارمەتیدا و ڕێگەی باشتری گرتەبەر، ئەوەیشی نەیگرتە بەر ڕێگەی گومڕایی هات بەسەریدا و یارمەتی خوایی نەیگرتەوە، گەر هەرچی هۆکار و ڕێگەی هیدایەتیشە بگیرێتە بەر بۆ هیدایەتی ئەوان سوودمەند نابن لێی، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِن تَدۡعُوهُمۡ لَا يَسۡمَعُواْ دُعَآءَكُمۡ وَلَوۡ سَمِعُواْ مَا ٱسۡتَجَابُواْ لَكُمۡ﴾ [فاطر: ١٤].

واتە گەر بانگەوازییان بکەیت بانگەوازەکە نابیستن، وە ئەگەر بشیبیستن وەڵامتان نادەنەوە.

وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٦﴾ [البقرة: ٦].

واتە ئەوانەی کە بێبڕواییان هەڵبژاردووە ئاگاداریان بکەنەوە و نەکەنەوە ئیمان ناهێنن.

**- نموونەیەك لەسەر ئەو هەواڵدانە کە ڕوویداوە:**

خوای پەروەردگار هەواڵ دەدات کە (أبو لهب)ی مامی پێغەمبەر ﷺ ئیمان ناهێنێت و دەچێتە دۆزەخەوە، وەکوو دەفەرموێت: ﴿سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ ۝٣﴾ [المسد: ٣]. واتە ئەبو لەهەب دەخرێتە ئاگری بلێسەدارەوە، دوای ئەم هەواڵە دە ساڵ دەژی بەڵام ناتوانێت ئەم هەواڵە بەدرۆ بخاتەوە و ئیمان بێنێت، لەبەر بژاردە و کاری پێشینە و مەبەستی خۆی کە سەرقاڵی کردووە و دەقی پێوەگرتووە و توانای وەرگرتنی ڕێگەی هیدایەتی نەماوە.

وە خوای پەروەردگار دەفەرمویّت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ٩٦ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ٩٧﴾ [يونس: ٩٦، ٩٧]. واتە خوا ئەوانەی کە داینابوو لەسەریان بە ڕاست و دروستی هات بەسەریاندا و ئیمان ناهێنن، ئەگەر هەرچی نیشانە و (معجزة) و بەڵگەی خواییش هەیە بۆیان بێت، بەڵام ئیمان ناهێنن تاوەکوو سزای سەختی دۆزەخ دەبینن.

وە فەرموودەکەی پێغەمبەری خواش ﷺ ڕوونکردنەوەی داوە لەسەر بابەتەکە و فەرموویەتی: «اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ، "اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ" أَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ، وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاءِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ٥ وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ٦ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ ٧ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ٨ وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ٩ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ ١٠﴾ [الليل: ٥ - ١٠].»[1].

واتە: کار بکەن، هەموو کەس کارئاسانی بۆ بژاردەی کارەکانی دەکرێت، کەسانی چاك کارئاسانییان بۆ دەکرێت بۆ کردەوەی چاك، وە کەسانی خراپ کارئاسانییان بۆ دەکرێت بۆ کاری خراپ، پاشان ئایەتەکەی کردە بەڵگە کە هەرکەس ببەخشێت لە خێردا و خواناسی بکات و باوەڕی بە ڕۆژی دوایی بێت کارئاسانی بۆ دەکرێت بۆ ڕێگەی چاك، وە هەرکەس بەخیل بێت لە کاری خێردا و پێویستی بە خوا نەبێت و پاداشتی ڕۆژی دوایی نەوێت ئەوا ڕێگەی خراپەی بۆ ئاسان دەکرێت، ئەمانە هەمووی لەدوای بژاردە و کاری خۆیانەوەیە، وە کارئاسانییان بۆ دەرەنجامی کارەکانیان بۆ دەکرێت.

**پرسیاری سێیەم: ئایا متمانە هەیە لەسەر گرتنەبەری ڕێگەی خێر لە کاتێکدا کە ئەنجامەکان نادیارن؟ وە دەشێت بەپێچەوانەوە بێت بە گوێرەی ئەم فەرموودەیە!!:**

قال رسول الله ﷺ: «...فَوَالَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، فَيَدْخُلُهَا، وَإِنَّ أَحَدَكُمْ

(١) رواه البخاري (٤٩٤٩)، ومسلم (٢٦٤٧)، وأبو داود (٤٦٩٤)، والترمذي (٢١٣٦)، والنسائي في "الكبرى" (١١٦١٥)، وابن ماجه (٧٨)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٣٤)، وأحمد في "المسند" (١١١٠)، والبزار في "المسند" (٥٨٣)، وأبو يعلى في "مسنده" (٥٨٢)، والبيهقي في "الشعب" (١٨٢)، وابن بطة في "الإبانة" (١٣١٥).

لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَيَدْخُلُهَا»(١).

لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە یەکێك لە ئێوە کردەوە دەکات بە کردەوەکانی ئەهلی بەهەشت تاوەکوو هەنگاوێکی دەمێنێت بۆ بەهەشت، ئەوکات ئەوەی کە لەسەری نووسراوە لە قەدەردا کە ئەم کەسە دۆزەخییە؛ لە کۆتاییدا کردەوەیەك دەکات لە کردەوەکانی ئەهلی دۆزەخ و دەچێتە دۆزەخەوە، وە بە هەمان شێوەش بۆ کەسێك کە کردەوە بە کردەوەی دۆزەخییەکان دەکات و دەچێتە بەهەشت لە کۆتاییدا.

پرسیار لێرەدا ئەوەیە کە چۆن هیچ متمانەیەك نییە لەسەر ڕێگەی چاك و دەشێت هەمووی پێچەوانە بێتەوە و کار و کردەوەی بەجارێك بسووتێت؟! وە ڕێگەی خراپیش هەمووی ببێتە مایەی چاکە و ڕزگاربوون بۆی!

یەکێك لە ڕێگە بەرنامەییەکانی ئەهلی سوننەت بۆ تێگەیشتن و حەقپێدانی بابەتێك کۆکردنەوەی هەموو جۆرە دارشتنەکانی ئەو دەقەیە لە ئایەت و فەرموودە، لەبەرئەوەی شێوازی دارشتنی قورئان و فەرموودە تایبەتمەندییەکی خۆیان هەیە، ئەویش کەسانی زۆر شارەزا و ئاشنا بە دەقەکان دەتوانێت بە کۆکردنەوەی هەموو چمکەکانی ئەو باسە لەسەر شێواز و تایبەتمەندی خۆی وەڵام و تێگەیشتنی تەواو بەدەستبهێنێت.

وەڵام بۆ ئەم پرسیارەش ئەوەیە: ئێمە لە دیندا ئەو بنەمایەمان پێدراوە کە ستەمکردن لە کەس نییە بە دڵنیاییەوە، وەکوو خۆی دەفەرمووێت: ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ۝٤٦﴾ [فُصِّلَتْ: ٤٦]. واتە ئەی (محمد) ﷺ لەلایەن خواوە بە هیچ شێوەیەك ستەمکردن نییە لە بەندەکانی، وە ئەگەر ڕووداوێك ببێت ئەوا لایەنی کەسەکەیە و خۆی هۆکارە، وەکوو دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ ٱلنَّاسَ شَيْـًٔا وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ۝٤٤﴾ [يُونُس: ٤٤]. واتە خوا ستەم لە کەس ناکات، بەڵکوو کەسەکان خۆیان ستەم لە خۆیان دەکەن.

---

(١) رواه البخاري (٦٥٩٤)، ومسلم (٢٦٤٣) واللفظ له، وأبو داود (٤٧٠٨)، والترمذي (٢١٣٧)، وابن ماجه (٧٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٦١٧٤)، وأحمد في "المسند" (٣٦٢٤)، والبزار في "المسند" (١٥٥١)، وأبو يعلى في "مسنده" (٥١٥٧)، والطيالسي في "مسنده" (٢٩٦)، والبيهقي في "الشعب" (١٨٤)، وابن بطة في "الإبانة" (١٣٩٧).

وە بنەمایەکی ترمان هەیە ئەویش ئەوەیە کە کردەوەی کەس بەفیڕۆ ناچێت، وەکوو دەفەرمویێت: ﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ﴾ [آل عمران: ١٩٥]. خوا دەفەرمویێت: من کردەوەی کەستان لە ئێوە بەفیڕۆ نادەم، چ پیاو بن چ ئافرەت، وە دەفەرمویێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾﴾ [التوبة: ١٢٠]. بە دڵنیاییەوە خوا کردەوەی هیچ کەسێکی چاك لە ئێوە بەفیڕۆ نادات.

وەڵامی تەواویش لە ووردەکاری ڕیوایەتەکانی تردا دەردەکەوێت، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: «إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الجَنَّةِ، فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ، فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ»[(١)]. في رواية: «فِيمَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّاسِ»[(٢)]، في رواية: «فِيمَا يَرَى النَّاسُ»[(٣)]. واتە خەڵك وای دەبینن، وای تێدەگەن، وا دەردەکەوێت کە ئەم کەسە ئەهلی بەهەشتە و کارەکانی ئیماندارانەیە لە ڕووکەشدا، بەڵام لە ناخدا وانییە.

✎ وەکوو (إبليس) ئەو هەموو عیبادەت و خواناسییەی کرد لەسەر زەوی و لە ڕیزی (ملائكة)کاندا بوو، کۆتاییەکەشی بێبڕواییەکەی تیادا دەرکەوت و نەچووە ژێر جێبەجێکردنی فەرمانی خواوە، ئەمە لە ناخدا هەر ئەو سیفەتەی تیادا بووە و نەیهێشتووە دەرکەوێت تاوەکوو کاتی تاقیکردنەوە دەرکەوت، هەروەکوو خوای گەورە جَلَّ وَعَلَا دەفەرمویێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ ﴿٦٤﴾﴾ [التوبة: ٦٤]. واتە ئەوەی لە ناختاندایە و حەزەری لێدەکەن کە دەرکەوێت، ئەوە دڵنیا بن خوای گەورە بارودۆخی بۆ دەرەخسێنێت تا دەرکەوێت، وە فەرمووی: ﴿إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ [البقرة: ٣٠]. واتە ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن.

✎ یاخود دووڕووەکان کە بە پشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ نوێژیان دەکرد و بەشداری جیهادیشیان دەکرد، وا دەبینران کە ئیماندارن، هەروەك لە شکاندنی شەڕی ئوحوددا (عبد الله بن

---

(١) رواه البخاري (٢٨٩٨)، ومسلم (١١٢)، وأحمد في "المسند" (٢٢٨١٣)، وأبو يعلى في "مسنده" (٧٥٤٤)، وابن بطة في "الإبانة" (١٣٢١)، والآجري في "الشريعة" (٣٦٧).

(٢) رواه ابن حبان في "صحيحه" (٦١٧٥).

(٣) رواه الطبراني في "الكبير" (٥٨٠٦).

**مسعود)** ﷺ **وتی:** «مَا كُنْتُ أَرَى أَنَّ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُرِيدُ الدُّنْيَا، حَتَّى نَزَلَتْ فِينَا يَوْمَ أُحُدٍ: ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْآخِرَةَ﴾ [آل عمران : ١٥٢].»[١]. **واتە گومانم نەدەبرد کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دونیایان بویستایە تاوەکوو ئەو ئایەتە بە بۆنەی شەڕی ئوحودەوە هاتە خوارەوە کە دەفەرموێت: هەندێکتان دونیاتان دەوێت و هەندێکیشتان مەبەستتان ڕۆژی دواییە، ئەوکات دەرکەوت کێن ئەوانەی کە ئیمان لاوازن و دونیایان دەوێت بەسەر ڕۆژی دواییدا.**

✎ **یاخود وەکوو عابیدەکەی (بني إسرائيل) کە لەناو خەڵکدا چەند ناودار بوو بە خواناسی و دینداری، بەڵام لە ئەنجامی تاقیکردنەوەیەك لە کۆتاییدا بە گومڕاییەوە ڕۆیشت، خوای پەروەردگار دەربارەی دەفەرموێت:** ﴿وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱلَّذِىٓ ءَاتَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾﴾ [الأعراف : ١٧٥]. **واتە ئەی (محمد) ﷺ هەواڵی ئەو پیاوەی کە شارەزامان کرد لە دیندا و ناودار بوو پێی بۆ موسوڵمانانی باس بکە کە ئەم کەسە شوێنی هەواوئارەزووەکانی کەوت و هەموو ئەوەی کە پێمان بەخشیبوو پشتگوێی خست، تاوەکوو شەیتان بەو هۆکارەوە گومڕای کرد.**

✎ **یاخود وەکوو (أبو طالب) مامی پێغەمبەر ﷺ ئەو هەموو پشتیوانییەی لە پێغەمبەر ﷺ کرد و ئازاری چەشت لەپێناویدا، کەچی لە کۆتاییدا ئیمانی وەرنەگرت و بە بێبڕوایی ڕۆیشت:** «آخِرَ مَا كَلَّمَهُمْ: هُوَ عَلَى مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَأَبَى أَنْ يَقُولَ: لاَ إِلَهَ إِلَّا اللهُ»[٢]. **کۆتا قسەی سەرەمەرگی کە پێغەمبەر ﷺ داوای ئیمانی لێکرد ئەوەبوو وتی: من هەر بە دینی (عبد المطلب) ڕازیم و بە موشریکی مرد، دەرکەوت کە هەموو پشتگیرییەکەی لەبەر کەسایەتی بوو نەك پشتیوانی بۆ دینی خوا.**

---

(١) رواه أحمد في "المسند" (٤٤١٤)، والطبراني في "الأوسط" (١٣٩٩)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٦٧٨٣)، وانظر "تفسير ابن كثير" (٢/ ١٣٤).

(٢) رواه البخاري (١٣٦٠)، ومسلم (٢٤)، والنسائي في "الكبرى" (٢١٧٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٩٨٢)، وأحمد في "المسند" (٢٣٦٧٤)، والحاكم في "المستدرك" (٣٢٩١)، والطبراني في "الشاميين" (٣٠٣٣)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٤٨٤)، والبغوي في "شرح السنة" (١٢٧٤).

✍ وە ساحیرەکانی فیرعەونیش کارەکانیان کاری ئەهلی دۆزەخ بوون، بەڵام لە کۆتاییدا بە هۆکاری زانستەکەیانەوە لەسەر سیحر ڕزگاریان بوو و بە ئیمانەوە ڕۆیشتن.

ئیمامی (النووي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَالْمُرَادُ بِهَذَا الْحَدِيثِ أَنَّ هَذَا قَدْ يَقَعُ فِي نَادِرٍ مِنَ النَّاسِ لَا أَنَّهُ غَالِبٌ فِيهِمْ ثُمَّ أَنَّهُ مِنْ لُطْفِ اللهِ تَعَالَى وَسَعَةِ رَحْمَتِهِ انْقِلَابُ النَّاسِ مِنَ الشَّرِّ إِلَى الْخَيْرِ فِي كَثْرَةٍ وَأَمَّا انْقِلَابُهُمْ مِنَ الْخَيْرِ إِلَى الشَّرِّ فَفِي غَايَةِ النُّدُورِ وَنِهَايَةِ الْقِلَّةِ[١].

واتە: مەبەست لەم فەرموودەیە ڕووداوە دەگمەنەکانە لەناو خەڵکدا، زۆرینە نییە، پاشان لە فراوانی سۆز و بەزەیی خوا ئەوەیە کە زۆرینە لە خراپەوە دەگەڕێنەوە سەر چاکە، بەڵام لە خێرەوە بۆ شەڕ ڕێژەیەکی زۆر کەمە کە ڕوودەدات.

**پرسیاری چوارەم:** **ئایا گۆڕانکاری لە زیادبوونی تەمەن و ڕزقدا هەیە؟ وەك لە فەرموودەیەکدا ئاماژەی پێ دەکات، لە کاتێکدا هەموو ئاماژە قورئانییەکان بە پێچەوانەوەیە:**

❁ قَالَ تَعَالَى: ﴿إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾﴾ [يونس: ٤٩].

واتە: ئەوەی ئەجەلی هاتبێت دواکەوتن و پێشکەوتنی نییە بە ئان و سات.

❁ قَالَ تَعَالَى: ﴿يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَـٰبِ ﴿٣٩﴾﴾ [الرعد: ٣٩].

واتە: ئەوەی خوا ویستی لێبێت دەیسڕێتەوە لە پەڕاوگەی کردەوەی ئادەمیزاددا، ئەوەشی ویستی لەسەر بێت دەیهێڵێتەوە.

❁ قَالَ تَعَالَى: ﴿وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ [إبراهيم: ١٠].

واتە: دواتان دەخات بۆ کاتی ناوبراو و دیاریکراو کە لەسەر ئادەمیزادی دیاری کردووە.

قال رسول الله ﷺ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، أَوْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ»[٢]،

---

(١) "شرح النووي على مسلم" (١٩/ ١٩٢).

(٢) رواه البخاري (٢٠٦٧)، ومسلم (٢٥٥٧)، وأبو داود (١٦٩٣)، والنسائي في "الكبرى" (١١٣٦٥)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٣٨)، وأحمد في "المسند" (١٢٥٨٨)، والحاكم في "المستدرك" (٧٢٧٩)، والبزار في "المسند" (٦٣١٦)، وأبو يعلى في "مسنده" (٣٦٠٩)، والطبراني في "الكبير" (١١٨٢٢)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٣٠٧٠)، والبيهقي في "الشعب" (٧٥٧١)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٤٢٩).

وفي رواية: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُمَدَّ لَهُ فِي عُمْرِهِ، وَأَنْ يُزَادَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، فَلْيَبَرَّ وَالِدَيْهِ، وَلْيَصِلْ رَحِمَهُ»(١)، وفي رواية: «وَأَنْ يَمُدَّ فِي أَجَلِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ»(٢).

**واتە: ئەوەی کە پێی خۆشە ڕۆزی زیاد بێت و تەمەنی درێژ بێت با پەیوەندی خزمایەتی نەپچڕێنێت و چاك بێت لەگەڵ دایك و باوکیدا.**

**لە کاتێکدا ئاماژە لەسەر ئەم کارانە لە فەرمووودەیەکی تردا بە شێوەی ئایەتەکانی قورئانە، وەك:**

۩ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ، قَالَ: قَالَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ زَوْجُ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اللهُمَّ أَمْتِعْنِي بِزَوْجِي رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَبِأَبِي أَبِي سُفْيَانَ، وَبِأَخِي مُعَاوِيَةَ قَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «قَدْ سَأَلْتِ اللهَ لِآجَالٍ مَضْرُوبَةٍ، وَأَيَّامٍ مَعْدُودَةٍ، وَأَرْزَاقٍ مَقْسُومَةٍ، لَنْ يُعَجِّلَ شَيْئًا قَبْلَ حِلِّهِ، أَوْ يُؤَخِّرَ شَيْئًا عَنْ حِلِّهِ، وَلَوْ كُنْتِ سَأَلْتِ اللهَ أَنْ يُعِيذَكِ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ، أَوْ عَذَابٍ فِي الْقَبْرِ، كَانَ خَيْرًا وَأَفْضَلَ»(٣).

**واتە: (أم حبيبة) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای کرد و وتی: خوایە خۆشحاڵم بکە بە مانەوەی مێردەکەم کە پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە بە باوکم و براکەم کە (أبو سفيان) و (مُعاوية)یە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: داوات لە خوا کرد بۆ ئەجەلێك و ڕۆژانێکی دیاریکراو و ڕۆزییەکی دابەشکراو کە هەمووی بڕاوەتەوە و کۆتایی پێهاتووە، خوا هیچ کارێك لە وادەی خۆی پێش و پاش ناخات، خۆ ئەگەر تۆ دوعات بکردایە لەسەر پاراستنت لە دۆزەخ و سزای گۆڕ، زۆر خێرتر و چاکتر بوو.**

**۩ وە هەموو منداڵێك لە سکی دایکیدا فەرمان دەدرێت بە دیاریکردنی ڕزق و تەمەنی، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:** «...وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: بِكَتْبِ رِزْقِهِ، وَأَجَلِهِ، ...»(٤).

---

(١) رواه أحمد في "المسند" (١٣٤٠١) وأبو نعيم في "الحلية" (٣/١٠٧). (٢) رواه أحمد في "المسند" (١٢٥٨٨).

(٣) رواه مسلم (٢٦٦٣)، والنسائي في "الكبرى" (١٠٠٢٢)، وأحمد في "المسند" (٣٧٠٠)، وأبو يعلى في "مسنده" (٥٣١٣)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (١٢٠٢٩)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٢٢٩)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢٦٢)، وابن بطة في "الإبانة" (٢٠١١)، والفريابي في "القدر" (٤٧).

(٤) رواه البخاري (٦٥٩٤)، ومسلم (٢٦٤٣)، واللفظ له، وسبق تخريجه ص٥٥.

کەواتە گۆڕانکاری نییە لەو بوارانەدا.

**وەڵام بۆ ئەمەش ئەوەیە:** ئەم دەقانە دەبنە دوو بەشەوە، بەشێکیان باس لە دیاریکردنێکی نەگۆڕ دەکات لە تەمەن و ڕۆزی بۆ ئادەمیزاد، کە خوا لە ئەزەلدا بۆی دیاریکردووە و لە سکی دایکیشیدا دووبارە دیاریدەکرێتەوە، وە بەشێکیش لە دەقەکان باس لە گۆڕانکاری دەکات بە سڕینەوە و دواخستن و زیاد و کەمی لە تەمەن و ڕۆزیدا بۆ ئادەمیزاد.

ئەو بەشەی کە باس لە نەگۆڕی دەکات ئەو قەدەرە ئەزەلییەیە کە خوای پەروەردگار ئەوکاتەی کە قەڵەمی دروستکردووە پێی فەرموو: «**اكْتُبْ مَقَادِيرَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ**»[1]. بنووسە ووردەکاری ئەوانەی کە دەبێت تاوەکوو ڕۆژی دوایی، کە لە (اللوح المحفوظ)دا تۆمار کراوە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَىَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٢٩﴾﴾ [ق: ٢٩]. گۆڕانکاری بەسەردا نایەت، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «**رُفِعَتِ الأَقْلَامُ وَجَفَّتْ الصُّحُفُ**»[2]. قەڵەم هەڵگیراوە و لاپەڕە وشك بووەتەوە.

وە ئەو دەقانەیشی کە باس لە گۆڕانکاری دەکەن هەموو ئەو هۆکار و ووردەکاریانەیە کە لەناو ئەو قەدەرەی پێشوودا ڕوودەدات، بەگوێرەی کردارەکانی ئادەمیزاد دەبێتە هۆکاری گەیشتنی ئەو ئەجەل و ڕزقەی کە خوا بۆی دیاری کردووە، کەواتە خوا زانایە بەسەر ئادەمیزاددا لە گرتنەبەری هۆکارەکان و ئەنجامەکانی، بۆیە ئەو ڕزق و تەمەنەی بۆ دیاری کردووە.

هەموو ئەو هاندانانەشی کە باسکراوە هەموویان بە بوون و نەبوون لەناو قەدەرە گەورەکەدا بوونیان هەیە بە گرتنەبەر یاخود نەگرتنەبەری لەلایەن ئادەمیزادەوە، وە ئەو گۆڕانکاریانەشی کە دێت بەسەریدا لە پەڕاوگەی دەستی (ملائكة)کاندایە، بەگوێرەی ئەو (تعليمات)انەی پێیان دراوە لەلایەن خواوە دەیبەن بەڕێوە.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: وَالْأَجَلُ أَجَلَانِ: أَجَلٌ مُطْلَقٌ يَعْلَمُهُ اللهُ، وَأَجَلٌ مُقَيَّدٌ[3].

واتە: دوو جۆر قەدەر هەیە:

---

(١) رواه أبو داود (٤٧٠٠)، والترمذي (٣٣١٩)، وأحمد في "المسند" (٢٢٧٠٧)، وسبق تخريجه ص٤٢.

(٢) رواه الترمذي (٢٥١٦) وقال: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وسبق تخريجه ص٥٣.

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٥١٧).

**١. القدر المثبت أو المطلق أو المبرم:** ئەوەیە کە لە (أم الكتاب اللوح المحفوظ)دا نووسراوە، جێگیرە و گۆڕانکاری بەسەردا نایەت.

**٢. القدر المعلق أو المقيد:** ئەجەل و قەدەری تایبەت، یاخود پەیوەست، ئەوەیە کە دراوەتە دەست مەلائیکەکان، ئەوەیان سڕینەوە و دانان و گۆڕانکاری لە ئەجەل و ڕزق و تەمەن و ئەوانەدا ڕوودەدات لە لاپەڕەکانی دەستی مەلائیکەکان، ئەویش بە هۆکاری ئەو زانیاری و وردەکارییەی کە خوا فێری مەلائیکەکانی کردووە لەسەر کار و کردەوە و پاداشت و سزا و پێدان و لێگرتنەوە ... لەسەر کردار و کاری ئادەمیزاد، بەڵام هەموو ئەو ڕووداو و گۆڕانکارییانەی کە ڕۆژانە ڕوودەدات لە کۆتاییدا جێگیر دەبێت لەسەر قەدەرە ئەزەلییەکەی پێشوو وەکوو خۆی کە خوا دایناوە دێتە دی، ئەمە ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە جَلَّ وَعَلَا دەفەرموێت: ﴿يَمْحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ۝٣٩﴾ [الرعد: ٣٩]. سڕینەوە و دانان بە ویستی خوا دەبێت لە پەڕاوەکانی دەستی مەلائیکەکان، بەڵام ﴿وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ﴾ نووسینی (اللوح المحفوظ) سەرچاوەیە و لای خوایە و گۆڕانکاری نییە لەودا، ئیتر ئەم گۆڕانکارییانە لە ڕزق و ئەجەل و هەموو کارەکاندا دەبێت.

بۆیە فەرموودەکە دەفەرموێت ئەوەی کە دەیەوێت تەمەن درێژ بێت و ڕزقی زیاد بکات با پەیوەندی خزمایەتی و کەسایەتی نەپچڕێنێت، با چەند کردەوەیەکی تری وەکوو چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك بکات، یاخود دەفەرموێت: «لَا يَزِيدُ فِي الْعُمْرِ إِلَّا الْبِرُّ، وَلَا يَرُدُّ الْقَدَرَ إِلَّا الدُّعَاءُ»[1]. واتە هیچ کارێك تەمەن زیاد ناکات بێجگە لە چاکە نەبێت، وە هیچ کارێك قەدەر ناگێڕێتەوە بێجگە لە دوعا نەبێت.

دەشێت کەسەکە ئەم هۆکارانە بگرێتەبەر و بەو هۆیەوە ئەوەی کە لەسەری نووسراوە دێتە دی، یاخود نەیگرێتەبەر و بە هۆیەوە ئەوەی لەسەری نووسراوە دێتە دی، بە هەردوولادا،

(١) رواه الترمذي (٢١٣٩) وقال: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وابن ماجه (٩٠)، وأحمد في "المسند" (٢٢٣٨٦) وقال شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره، والحاكم في "المستدرك" (١٨١٤) وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، والطبراني في "الكبير" (١٤٤٢)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٩٨٦٧)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٣٠٦٩)، والبيهقي في "الشعب" (٩٧٥٢)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٤١٨)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٥٤).

لەبەرئەوەی خوا زانایە بەو کەسە کە ئەمانە دەکات، بۆیە ئەوەی بۆ نووسیوە، وە زانایە بەوەی کە ئەوانە ناکات بۆیە بۆی نەنووسیوە.

(ابن حجر) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: كَأَنْ يُقَالَ لِلْمَلَكِ مَثَلًا إِنَّ عُمُرَ فُلَانٍ مِائَةٌ مَثَلًا إِنْ وَصَلَ رَحِمَهُ وَسِتُّونَ إِنْ قَطَعَهَا وَقَدْ سَبَقَ فِي عِلْمِ اللهِ أَنَّهُ يَصِلُ أَوْ يَقْطَعُ، فَالَّذِي فِي عِلْمِ اللهِ لَا يَتَقَدَّمُ وَلَا يَتَأَخَّرُ، وَالَّذِي فِي عِلْمِ الْمَلَكِ هُوَ الَّذِي يُمْكِنُ فِيهِ الزِّيَادَةُ وَالنَّقْصُ، وَإِلَيْهِ الْإِشَارَةُ بِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٣٩﴾﴾ [الرعد: ٣٩] ... وَمَا فِي أُمِّ الْكِتَابِ ... يُقَالُ لَهُ: الْقَضَاءُ الْمُبْرَمُ (فِي صُحُفِ الْمَلَائِكَةِ) الْقَضَاءُ الْمُعَلَّقُ[(١)].

واتە: وەك بە مەلائیکەکان بلێت تەمەنی فلان کەس سەد ساڵە گەر پەیوەندی کەسوکاری گەیاند و چاکەی کرد و ئەو هۆکارانەی گرتە بەر، وە گەر نەیگەیاند و ئەو کارانەی نەکرد ئەوا تەمەنی شەست ساڵە، لە زانستی خوادا هەیە و دەزانێت کە دەیگەیەنێت یاخود نایگەیەنێت، وە ئەوەی لە نووسینی خوادایە هەر ئەوە دێتە دی و مەلائیکەکانیش نایزانن کە ئەو کارانە دەکات یاخود نایکات، بەڵام لە کۆتایی نووسین و تۆمارکردنی کارەکانی؛ دەردەکەوێت کە هەمووی وەکوو ئەوە دێتە دی کە لە قەدەری (اللوح المحفوظ)دا هەیە.

ئەمە ئەو وتەیەی (نوح)ە عَلَيْهِ السَّلَامُ بە گەلەکەی دەڵێت: ﴿أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ [نوح: ٣، ٤]. ئەگەر هۆکارەکان بگرنە بەر لە باوەڕبوون و خواپەرستی و گوێڕایەڵی؛ ئەوا خوا لێتان خۆشدەبێت و بەم هۆکارانەوە دەگەنە کاتی دیاریکراوی ئەو هۆکارانەی خۆتان، وە ئەگەر نەیگرنە بەر ئەوا کارێکی ترتان لەسەر دەنووسرێت و ئەوەتان بەسەردا دێت، خوای پەروەردگاریش زانایە بەسەرتاندا کام کار دەگرنە بەر و چی دێت بەسەرتاندا و لەسەریشی نووسیون، بە هۆکاری بژاردەکانتانەوە.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَالْجَوَابُ الْمُحَقَّقُ: أَنَّ اللهَ يَكْتُبُ لِلْعَبْدِ أَجَلًا فِي صُحُفِ الْمَلَائِكَةِ فَإِذَا وَصَلَ رَحِمَهُ زَادَ فِي ذَلِكَ الْمَكْتُوبِ. وَإِنْ عَمِلَ مَا يُوجِبُ النَّقْصَ نَقَصَ مِنْ ذَلِكَ الْمَكْتُوبِ. وَنَظِيرُ هَذَا مَا فِي التِّرْمِذِيِّ وَغَيْرِهِ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «أَنَّ آدَمَ لَمَّا طَلَبَ مِنْ

---

(١) "فتح الباري" لابن حجر (١٠/٤١٦).

اللهَّ أَنْ يُرِيَهُ صُورَةَ الْأَنْبِيَاءِ مِنْ ذُرِّيَّتِهِ فَأَرَاهُ إيَّاهُمْ فَرَأَى فِيهِمْ رَجُلًا لَهُ بَصِيصٌ فَقَالَ مَنْ هَذَا يَا رَبِّ؟ فَقَالَ ابْنُك دَاوُد. قَالَ: فَكَمْ عُمُرُهُ؟ قَالَ أَرْبَعُونَ سَنَةً. قَالَ: وَكَمْ عُمْرِي؟ قَالَ: أَلْفُ سَنَةٍ. قَالَ فَقَدْ وَهَبْت لَهُ مِنْ عُمْرِي سِتِّينَ سَنَةً ...» ... فَهَذَا دَاوُد كَانَ عُمُرُهُ الْمَكْتُوبُ أَرْبَعِينَ سَنَةً ثُمَّ جَعَلَهُ سِتِّينَ ... وَاَللهُّ سُبْحَانَهُ عَالِمٌ بِمَا كَانَ وَمَا يَكُونُ وَمَا لَمْ يَكُنْ لَوْ كَانَ كَيْفَ كَانَ يَكُونُ؛ فَهُوَ يَعْلَمُ مَا كَتَبَهُ لَهُ وَمَا يَزِيدُهُ إيَّاهُ بَعْدَ ذَلِكَ وَالْمَلَائِكَةُ لَا عِلْمَ لَهُمْ إلَّا مَا عَلَّمَهُمْ اللهُ"[(١)].

واتە: وەڵامی ڕاست بۆ ئەم بابەتە ئەوەیە کە خوا لە پەڕاوگەی مەلائیکەدا تەمەنی کەسێك دەنووسێت، خۆ ئەگەر کەسایەتی و چاکەکانی گەیاند ئەوا لەو پەڕاوگەیەدا بۆی زیاد دەکات، وە گەر نەیگەیاند ئەوا لەو پەڕاوگەیەدا بۆی کەم دەکاتەوە بەگوێرەی یاسای گرتنەبەری هۆکارەکان، بەڵام لە (اللوح المحفوظ)دا جێگیرە کامیان دەکات و هەر ئەوەش دەردەچێت، ئەمە بە هاوشێوەی بەسەرهاتەکەی (آدم)ە ﷺ کە نەوەکانی دەبینێت، پرسیار لە یەکێکیان دەکات کە (داود)ە ﷺ تەمەنی چەندە؟ خوای گەورە پێی دەفەرموێت چل ساڵە، دەڵێت: ئەی تەمەنی من چەندە؟ خوا دەفەرموێت: سەد ساڵە، ئادەمیش دەڵێت: ئەوا من شەست ساڵی خۆمم بەخشی بە داود، خوای گەورە ئەمەی لەسەر دەنووسێت و مەلائیکەکان بە شاهید دەگرێت لەسەری، بۆیە کاتێك شەست ساڵ دەمێنێت لە تەمەنی پێی دەڵێن ئامادە بە بۆ مردن، دەڵێت: شەست ساڵم ماوە، دەڵێن: بەخشیوتە بە داودی کوڕت، ئەویش نکوولّی لێدەکات، ئەوکات پەڕاوگەکەی بۆ دەردەخەن و پشانی دەدەن، لەپاش ئەم وتوویژ و ڕووداوە دەردەکەوێت کە بۆ ئادەم هەزار ساڵ و بۆ داود سەد ساڵ نووسراوە لە (اللوح المحفوظ)دا، بۆیە خوا زانایە بەوەی بووە و دەبێت و نەبێت چۆن دەبێت، وە دەزانێت بەوەی بۆی نووسیوە و چی بۆ زیاد دەکات لەدوای ئەوە، بەڵام مەلائیکەکان ئەمانە نازانن، واتە هەزار ساڵەکەی بۆ ئادەم هەر نووسیبوو، وە سەد ساڵەکەشی بۆ داود نووسیبوو، بەڵام ئەم وتوویژە لە پەڕاوگەی مەلائیکەدا کەوتە نێوان بۆ مەبەستی تر، لەوانە: نەزانین و بێ عیلمی مەلائیکەکان بەسەر غەیبدا و خۆشەویستی ژیان و نکوولّی و لەبیرچوونەوە لە ئادەمیزاددا لەگەڵ بوونی سیفاتەکانی، وە پێغەمبەرانیش ئادەمیزادن و بوونی پێغەمبەرێك بەناوی داودەوە، وە ئەو جۆری قەدەرەی کە گۆڕانکارییەکانی تیادا دەبێت لە بەڕێوەبردنی دروستکراوەکاندا.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٤/ ٤٩٠، ٤٩١).

هەر ئەمەشە واتای دوعاکەی (عمر بن الخطاب) ﷺ کە دەیوت: «اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ كَتَبْتَنِي فِي أَهْلِ السَّعَادَةِ فَأَثْبِتْنِي فِيهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَتَبْتَنِي فِي أَهْلِ الشَّقَاوَةِ وَالذَّنْبِ فَامْحُنِي وَأَثْبِتْنِي فِي أَهْلِ السَّعَادَةِ وَالْمَغْفِرَةِ، فَإِنَّكَ تَمْحُو مَا تَشَاءُ وَتُثْبِتُ، وَعِنْدَكَ أُمُّ الْكِتَابِ»[(١)].

واتە: خوایە ئەگەر منت لە ڕیزی چاکەکاندا نووسیوە جێگیرم کە لەسەری، وە ئەگەر لە ڕیزی خراپەکاندا منت نووسیوە بمکوژێنەوە و لە ڕیزی چاکەکاندا بمنووسە، ئەی خوایە ئەوەی کە بتەوێت هەر خۆت بە ویستی خۆت دەیسڕیتەوە و دایدەنێیت، مەبەستی لێرەدا ئەوەیە کە هۆکارم بۆ بڕەخسێنە تا دەمگەیەنیتە ڕیزی چاکەکان.

- (معتزلة)کان لە بارەی ئەجەلەوە دەڵێن: دوو ئەجەل هەیە، بڕاوە و نەبڕاوە (المبرم وغير المبرم)، یا درێژ یا کورت، وە هەروەها فەیلەسووفەکانیش هەمان بیروڕایان هەیە کە تەمەن درێژ و کورتی هەیە بەگوێرەی ڕووداوەکان، ئەگەر بە هۆکارێك وەکوو کوشتن ڕۆی؛ ئەوە تەمەنی کورتکرایەوە لەلایەن بکوژەکەوە، خۆ ئەگەر نەکوژرایە ئەوا تەمەنی درێژتر دەبوو[(٢)].

جیاوازی بیروڕا و دابەشکردنەکەی موعتەزیلەکان لەگەڵ دابەشکردنی ئەهلی سوننەت لەوەدایە ئەوان دەڵێن ئەجەلیش ئامادە بێت ئەگەر ئەو هۆکارە نەبوایە درێژ دەکرایەوە، واتە گەر ڕێگرییەکان بهێڵن دەگاتە ئەو ئەجەلەی بۆی دیاری کراوە، کەواتە ڕێگری هۆکارەکان ئەجەل دەگۆڕێت، بەڵام ئەهلی سوننەت دەڵێن: ئەگەر ئەجەلی ئامادە بوو ئەوا هیچ هۆکارێك کاریگەری نییە، وە ئەگەر ئەجەلی ئامادە نەبوو ئەوا هۆکارەکان کاریگەرییان هەیە لە پێشکەوتن و دواکەوتنی ئەجەلیاندا، بۆیە ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا﴾ [المنافقون: ١١]. نەفسێك ئەجەلی ئامادەبێت خوا دوای ناخات.

پاشان جیاوازی هەیە لە نێوان عیلمی خوا و نووسینی پەڕاوگەی مەلائیکەکان، ئەوەی کە لە

---

(١) رواه البخاري في "التأريخ الكبير" (٧/ ٦٣)، والطبراني في "الكبير" (٨٨٤٧)، والبيهقي في "القضاء والقدر" ص٢١٥، وابن بطة في "الإبانة" (١٥٦٥)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٢٠٧)، وأبو نعيم في "الحلية" (٤/ ١٠٣)، وانظر "تفسير الطبري" (١٣/ ٥٦٣)، و "تفسير القرطبي" (٩/ ٣٣٠)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٥٤٠).

(٢) "شرح أصول اعتقاد" للالكائي (٤/ ٧٣٥)، و "المعجم الكبير" للطبرياني (٨٨٤٧) عن ابن مسعود بنفس القول، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٥٤٠)، و "شفاء العليل" لابن القيم ص٩٠، و "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص٣٠٥.

**عیلمی خوادا هەیە بەسەر (مخلوقات)دا نووسیویەتی گۆڕانکاری بەسەریاندا نایەت، بەڵام ئەوەی لە پەڕاوگەی مەلائیکەکاندا هەیە ئەوەیە کە گۆڕانکارییەکانی بەسەردا دێت تا دەگاتە ئەوەی کە خوا لەسەری نووسیوە.**

**(الشوكاني)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** إِذا حضر الْأَجَل، فَإِنَّهُ لَا يتَقَدَّم، وَلَا يتَأَخَّر. وَقبل حُضُوره يجوز أَن يُؤَخِّرهُ الله بِالدُّعَاءِ أَو بصلَة الرَّحِم، أَو بِفعل الْخَيْر[1].

**واتە: ئەگەر ئەجەلی کەسێك ئامادە بوو ئەوا پێش و دوا ناکەوێت، بەڵام ئەگەر ئامادە نەبوو ئەجەلەکەی ئەوا خوا دوای دەخات بە هۆکاری بوونی دوعا و کارە چاکەکانەوە.**

**وە (الزهري)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** نرى أنه يؤخر ما لم يحضر الأجل فإذا حضر الإجل لم يزد في العمر ولم يقع تأخير[2].

**واتە: بیروڕای ئێمە وایە بە ئامادەبوونی ئەجەل دواکەوتنی نابێت، وە بە ئامادەنەبوونی دوادەکەوێت.**

**لەسەر ڕای (معتزلة)کان ئەگەر دوو ئەجەل بۆ کەسێك دانرابێت ئەوا واتای ئەوە دەگەیەنێت کە خوای گەورە "نعوذ بالله" نازانێت ئەو کەسە بە کام ئەجەلەیان دەڕوات، بۆیە دووانی بۆ داناوە.**

**کەواتە هەموو هۆکارەکان لە دوعا و گەیاندنی کەسایەتی و چاکە لەگەڵ باوك و دایك و کاری خێر و پێچەوانەکانیان هەمووی لەناو قەدەر و ئەجەلی گەورەدایە و خوای گەورە تەمەن و ڕزق و هەموو پێویستییەکانی ژیانی بۆ ڕەخساندووە بەگوێرەی ئەوەی کە بۆی دیاریکردووە، وە ئەو دیاریکردنانەشی بە زانایی خۆیەتی بەسەر بەندەکەیدا کە بەو شێوەیە دەبێت و بۆیە دەبێت و ئەنجامەکەشی دەبێت وا بێت، بەبێ زۆرلێکردن و لێسەندنەوەی عەقڵ و ئیرادە و بژاردەی و سەپاندن بەسەریدا، خۆ ئەگەر ئەم زانیارییانە بۆ خوا نەبێت ئەوا ناتەواوییە لە خوایەتی ئەودا، بۆیە دەبێت ئەو زانیارییەی بەسەر ووردەکاری بوونەوەردا هەبێت.**

---

(١) "قطر الولي" للشوكاني ص٤٩١.

(٢) "معاني القرآن" لأبو جعفر النحاس (٧/ ١٦).

**(معتزلة)كان هەندێك بەڵگە دەهێننەوە بۆ ئەم دوو ئەجەلە، لەوانە:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ﴾ [الأنعام: ٢].

**دەڵێن: واتە ئادەمیزاد ئەجەلێك بەڕێدەكات و ئەجەلێكی تریشی هەیە ئەگەر بیگاتێ.**

**بەڵام لە تەفسیرەكەیدا:** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: يَعْنِي: أَجَلَ الْمَوْتِ. وَالْأَجَلُ الْمُسَمَّى: أَجَلُ السَّاعَةِ، الْوُقُوفُ عِنْدَ اللهِ"[1]. **واتە مەبەست بە ئەجەلی یەكەمی ئایەتەكە ئەجەلی ئادەمیزادە، وە ئەجەلی دووەمیش ئەجەلی ڕۆژی دواییە.**

**ئەم تەفسیرەش تەفسیری زانایانی (تابعین)ە، وەك:** وهذا القول مأثور عن مجاهد، وعكرمة، وسعيد بن جبير، والسدي وغيرهم، وقد رجحه الطبري، وابن تيمية، وابن القيم، وكثير من العلماء والمفسرين[2].

**تەفسیری بەهێز و تەواو بۆ ئەو ئایەتە واتای ئەجەلی مردنی ئادەمیزادە، وە** (أجل المسمى) **ئەجەلی ڕۆژی دواییە نەك ئەجەلی ئادەمیزاد، واتە ئێوە ئەجەلی خۆتان بەڕێدەكەن، وە ئەجەلی دونیاش لای خوا تۆمار كراوە.**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ﴾ [فاطر: ١١]. **بەڵگەیەكی تری (معتزلة)كان لەسەر دوو ئەجەل ئەم ئایەتەیە، دەڵێن واتای ئەوەیە كە زیادكردن و كەمكردن لە ئەجەلدا تۆمار كراوە، بەڵام زانایانی ئەهلی سوننەت دەڵێن:** أن الضمير عائد إلى شخصين مختلفين لا شخص واحد، فيكون معنى الآية: وما يمد في عمر أحد حتى يدركه الهرم، ولا ينقص من عمر آخر حتى يموت ذلك إلا في كتاب ... وهذا القول رجحه الطبري، وابن عطية، والبغوي، وابن كثير، وغيرهم من المفسرين[3]. **ڕای تەواو لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا واتا و**

---

(١) "تفسير الطبري" (٩/ ١٥٣).

(٢) "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص٣٠٦.

(٣) "جامع البيان" للطبري (٢٢/ ١٢٣)، و "المحرر الوجيز" لابن عطية (٤/ ٤٣٢)، و "تفسير ابن كثير" (٣/ ٧٢٠)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٤/ ٤٨٩)، و "إغاثة اللهفان" لابن القيم (٢/ ٨٤)، و "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص٣٠٦.

مەبەستی پێی ئەجەلی دوو کەسی جیاوازە، کە یەکێکیان تەمەنی درێژ دەکەین تا دەگاتە مردن، وە ئەویتریشیان لـە تەمەنی کەم ناکرێتەوە تاوەکوو دەمرێت، نەك چەند ئەجەلێك بۆ یەك کەس.

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ [نوح: ٤]. بەڵگەیەکی تری (معتزلة)کان لـەسەر دوو ئەجەل ئەم ئایەتەیە، دەڵێن بەو واتایە دێت کە لـە ئەجەلێکەوە بۆ ئەجەلێکی تر دواتان دەخەین، بەڵام تەفسیری تەواوی ئەم ئایەتە لای ئەهلی سوننەت دەڵێن: معنى الآية: أن الله تعالى يؤخر في آجالكم، فلا يهلككم بالعذاب، (إلى أجل المسمى): يعني إلى حين كتب أنه يبقيكم إليه إن أنتم أطعتموه وعبدتموه في أم الكتاب[1]. واتە خوا ئەجەلتان دوادەخات و بە سزا لـەناوتان نابات تا دەگەنە ئەو ئەجەلـەی کە بۆی نووسیون لـە (اللوح المحفوظ)دا ئەگەر ئیمان بێنن و گوێڕایەڵی بکەن، ئەمە هاندانە بۆ ئیمان و گوێڕایەڵی، ئەگەرچی دیاریکراوە ئەنجامیان چی دەبێت، کەواتە بە گرتنەبەری هۆکارەکان ئەنجامەکان دەگۆڕێن، نەك دوو ئەجەل هەبێت و بتوانن ئەمیان بگرنە بەر یاخود ئەویان.

ئەمە ئاماژەیە بۆ گرتنەبەری ڕێگە و هۆکارەکان تا ئەنجامەکان بەو گوێرەیە بێت، وە لای خوا ئاشکرایە چ ڕێگەیەك و ئەنجامێکیان بەسەردا دێت و بۆیان نووسراوە، وە دڵنیاییە بۆ ئادەمیزاد کە کردەوەکانی خۆتان هۆکارە بۆ هاتنەدی هەموو ڕووداوەکان.

هەموو ئەم دەقانە دەکەنە بەڵگە بۆ بوونی دوو ئەجەلی جیاواز لـە یەکتر و گوایە دەتوانرێت ئەجەلـەکان هەڵبژێردرێن، بەڵام کێشەی سەرەکی فیرەقەکان ئاشنا نەبوونی تەواویانە بەسەر زمانی عەرەبی و شێوازی دارشتنی قورئان و فەرموودەدا، بەتایبەت قورئان لـە هێنان و باس و مەبەستەکاندا.

**پرسیاری پێنجەم:** ئایا هەڵە و تاوانەکانیش بە قەدەر لەسەر ئادەمیزاد نەنووسراوە بەگوێرەی ئەم فەرموودەیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى، فَقَالَ مُوسَى: يَا آدَمُ أَنْتَ أَبُونَا خَيَّبْتَنَا وَأَخْرَجْتَنَا مِنَ الْجَنَّةِ، فَقَالَ لَهُ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى، اصْطَفَاكَ اللهُ بِكَلَامِهِ، وَخَطَّ لَكَ بِيَدِهِ، أَتَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدَّرَهُ اللهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً؟ فَقَالَ النَّبِيُّ

(١) "جامع البيان" للطبري (٢٩/ ٩٠)، و "تفسير ابن كثير" (٤/ ٥٤٥)، و "فتح القدير" للشوكاني ص١٨٢٩، و "تيسير الكريم المنان" للسعدي ص٨٨٨، و "الشبهات النقلية" لهند بنت دخيل الله ص٣٠٦.

صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى"»[١].

واتە: (ئادەم و موسی) ﷺ بەڵگەكارییان بەسەریەكەوە كرد، (موسی) ﷺ وتی: ئەی ئادەم تۆ باوكمانی، بوویتە هۆكاری زەرەرۆمەندی و ناخۆشییەكانمان و دەركردنمان لە بەهەشت، (ئادەم) ﷺ پێی وت: تۆ (موسی)یت ﷺ، كە خوای پەروەردگار قسەی كردووە لەگەڵتا، وە تەوراتی بۆ نووسیتەوە، ئەوە سەرزەنشتم دەكەیت لەسەر شتێك كە خوا لەسەری نووسیوم بە چل ساڵ پێش ئەوەی دروستم بكات؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئادەم) بەڵگەی بەهێز بوو بەسەر (موسی)دا.

(ابن تيمية) رحمه الله دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: وَقَدْ ظَنَّ كَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ أَنَّ آدَمَ احْتَجَّ بِالْقَدَرِ السَّابِقِ عَلَى نَفْيِ الْمَلَامِ عَلَى الذَّنْبِ[٢].

واتە: زۆری خەڵكی ئەم فەرموودەیە دەكەنە بەڵگە بۆ پاساو هێنانەوە بۆ تاوانەكانیان، وا گومان دەبەن كە (ئادەم) ﷺ قەدەری كردووەتە بەڵگە لەسەر ئەوەی كە لۆمە و سەرزەنشتی نەكەن لەسەر تاوانەكەی.

**بێگومان ئەمە هەڵەیەكی گەورەیە لە تێگەیشتنی قەزا و قەدەردا كە زۆری خەڵك تێی دەكەون، وە ئەم وتووێژ و بەڵگەكارییەی نێوان (ئادەم و موسی) ﷺ مەبەست تیایدا ئەمانە بووە:**

**١. قەزا و قەدەر ناكرێتە بەڵگەی لەسەر تاوانەكان:**

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: وَمُوسَى وَآدَمُ أَعْلَمُ بِاَللَّهِ مِنْ أَنْ يَظُنَّ وَاحِدٌ مِنْهُمَا أَنَّ الْقَدَرَ عُذْرٌ لِمَنْ عَصَى اللَّهَ وَقَدْ عَلِمَا مَا حَلَّ بِإِبْلِيْسَ وَغَيْرِ إِبْلِيسَ وَآدَمُ نَفْسُهُ قَدْ أُخْرِجَ مِنْ الْجَنَّةِ[٣]، وَآدَمُ أَعْلَمُ بِاَللَّهِ مِنْ أَنْ يَحْتَجَّ بِالْقَدَرِ عَلَى الذَّنْبِ وَمُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ أَعْلَمُ بِاَللَّهِ تَعَالَى مِنْ أَنْ يَقْبَلَ هَذِهِ الْحُجَّةَ فَإِنَّ هَذِهِ لَوْ كَانَتْ حُجَّةً عَلَى الذَّنْبِ لَكَانَتْ حُجَّةً لإبليس عَدُوِّ آدَمَ وَحُجَّةً لِفِرْعَوْنَ عَدُوِّ مُوسَى وَحُجَّةً لِكُلِّ كَافِرٍ وَفَاجِرٍ وَبَطَلَ أَمْرُ اللهِ وَنَهْيُهُ[٤]، فَإِنَّ الْقَدَرَ لَوْ كَانَ عُذْرًا لِلْخَلْقِ لَلَزِمَ أَنْ

(١) رواه البخاري (٣٤٠٩)، ومسلم (٢٦٥٢) وسبق تخريجه ص٧٨.
(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٠٤).
(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٤٥٤).
(٤) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٠٨).

لَا يُلَامَ أَحَدٌ وَلَا يُذَمَّ وَلَا يُعَاقَبَ لَا فِي الدُّنْيَا وَلَا فِي الْآخِرَةِ وَلَا يُقْتَصَّ مِنْ ظَالِمٍ أَصْلًا بَلْ يُمْكِنُ النَّاسُ أَنْ يَفْعَلُوا مَا يَشْتَهُونَ مُطْلَقًا(١).

**واتە: (ئادەم و موسى) ﷺ زۆر لەوە زاناترن لە دینی خوادا کە وا گومان بەرن قەدەر بەڵگە و پاساوە بۆ ئەنجامدانی تاوانەکان، وە بەتایبەت (موسى) ﷺ زۆر لەوە زاناترە کە ئەو بەڵگەکارییە وەربگرێت، هەردووکیان دەزانن چی بەسەر (إبلیس) و بێجگە لەو هات بە هۆکاری تاوانەکانیانەوە، وە (ئادەم) خۆشی بەو هۆکارەوە دەرکرا لە بەهەشت.**

**خۆ ئەگەر ئەمە بەڵگە بێت بۆ ڕزگاربوون لە تاوان؛ ئەوا بەڵگەیە بۆ (إبلیس)ی دوژمنی (ئادەم) و (فیرعەون)ی دوژمنی (موسى)، وە بەڵگەیە بۆ هەموو بێبڕوا و تاوانبارێك و هۆکارە بۆ بەتاڵبوونەوەی شەرعی خوا لە جێبەجێکردنی فەرمان و ڕێگرییەکان، وە کەس لۆمە نەکرێت و سزا نەدرێت لە دونیا و قیامەت و هەریەکە چی بوێت بیکات.**

**وە دەڵێت:** فَإِنَّ الْإِنْسَانَ لَيْسَ مَأْمُورًا أَنْ يَنْظُرَ إلَى الْقَدَرِ عِنْدَمَا يُؤْمَرُ بِهِ مِنْ الْأَفْعَالِ وَلَكِنْ عِنْدَ مَا يَجْرِي عَلَيْهِ مِنْ الْمَصَائِبِ الَّتِي لَا حِيلَةَ لَهُ فِي دَفْعِهَا(٢).

**واتە: ئادەمیزاد کاتێك کە فەرمانەکانی خوا بۆ جێبەجێکردن دەخرێنە بەردەستی، فەرمانی پێ نەکراوە سەیری قەدەر بکات و بیکاتە بەڵگە، بەڵکوو فەرمانی پێ کراوە کاتێك بەڵایەك بەبێ هۆکاری خۆی دێت بەسەریدا و هیچ دەسەڵاتی نییە لە ڕێگرتنیدا؛ دەشێت سەیری قەدەر بکات و بیکاتە بەڵگە بۆ ئەو کارە.**

**٢. لۆمەکەی (موسى) ﷺ لەسەر هۆکاری بەڵای دەرکردن بوو لە بەهەشت، نەك کردنی تاوانەکە:**

**(ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت:** فَآدَمُ عَلَيْهِ السَّلَامُ إنَّمَا حَجَّ مُوسَى لِأَنَّ مُوسَى لَامَهُ عَلَى مَا فَعَلَ لِأَجْلِ مَا حَصَلَ لَهُمْ مِنْ الْمُصِيبَةِ بِسَبَبِ أَكْلِهِ مِنْ الشَّجَرَةِ لَمْ يَكُنْ لَوْمُهُ لَهُ لِأَجْلِ حَقِّ اللَّهِ فِي الذَّنْبِ. فَإِنَّ آدَمَ كَانَ قَدْ تَابَ مِنْ الذَّنْبِ كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ﴾

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٤٥٤).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٧٨).

[البَقَرَةِ : ٣٧]، وَقَالَ تَعَالَى: ﴿ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾﴾ [طه: ١٢٢] [(١)]، وَأَمَّا كَوْنُهُ لِأَجْلِ الذَّنْبِ كَمَا يَظُنُّهُ طَوَائِفُ مِنْ النَّاسِ فَلَيْسَ مُرَادًا بِالْحَدِيثِ؛ لِأَنَّ آدَمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ كَانَ قَدْ تَابَ مِنْ الذَّنْبِ وَالتَّائِبُ مِنْ الذَّنْبِ كَمَنْ لَا ذَنْبَ لَهُ وَلَا يَجُوزُ لَوْمُ التَّائِبِ بِاتِّفَاقِ النَّاسِ[(٢)]، وَالصَّوَابُ فِي قِصَّةِ آدَمَ وَمُوسَى أَنَّ مُوسَى لَمْ يَلُمْ آدَمَ إلَّا مِنْ جِهَةِ الْمُصِيبَةِ الَّتِي أَصَابَتْهُ وَذُرِّيَّتَهُ بِمَا فَعَلَ لَا لِأَجْلِ أَنَّ تَارِكَ الْأَمْرِ مُذْنِبٌ عَاصٍ؛ وَلِهَذَا قَالَ: لِمَاذَا أَخْرَجْتنَا وَنَفْسَك مِنْ الْجَنَّةِ؟ لَمْ يَقُلْ: لِمَاذَا خَالَفْت الْأَمْرَ وَلِمَاذَا عَصَيْت؟[(٣)]، وَمُوسَى كَانَ أَعْلَمَ مِنْ أَنْ يَلُومَهُ لِحَقِّ اللهِ عَلَى ذَنْبٍ قَدْ عَلِمَ أَنَّهُ تَابَ مِنْهُ فَمُوسَى أَيْضًا قَدْ تَابَ مِنْ ذَنْبٍ عَمِلَهُ وَقَدْ قَالَ مُوسَى: ﴿أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا ۖ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْغَٰفِرِينَ ﴿١٥٥﴾﴾ [الأعراف: ١٥٥][(٤)].

واتە: (ئادەم) بەڵگەی بەهێز بوو، لەبەرئەوەی (موسى) لۆمە و سەرزەنشتی کرد لەسەر ئەو بەڵایەی هات بەسەر ئادەمیزاددا کە دەرکرا لە بەهەشت بە هۆکاری درەخت خواردنەکەیەوە، لۆمەکەی بە هۆکاری حەقەکەی خوا نەبوو کە فەرمان شکاندنەکەیەتی، لەبەرئەوەی (ئادەم) تەوبەی کردبوو لەو تاوانە و خوای گەورەش تەوبەکەی لێ قبووڵکردبوو، ئەو تاوانەی لەسەر سڕدرابووەوە، وە ئەوەشی کە تەوبە بکات لە تاوانێك و تەوبەکەی لێ قبووڵکرابێت، وەکوو ئەوە وایە کە تاوانی نەکردبێت، وە بە کۆدەنگی زانایانیش لۆمە لەسەر تەوبەکار نییە.

ڕاستی لەم وتووێژەی (ئادەم و موسى)دا ﷺ ئەوەیە کە (موسى) لۆمەی (ئادەم)ی نەکردووە بێجگە لەوەی کە ئەو بەڵای دەرکردنە ڕوویدا بە هۆکاری کارەکەیەوە، نەك لەبەر کارەکەی کە فەرمانی خوای شکاندووە، بۆیە (موسى) فەرمووی: (لِمَاذَا أَخْرَجْتنَا وَنَفْسَك مِنْ الْجَنَّةِ؟)، بۆچی خۆت و ئێمەت دەرکرد لە بەهەشت؟ نەیوت بۆچی پێچەوانەی فەرمانی خوات کرد و تاوانت ئەنجامدا.

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٠٨).
(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ١٧٨، ١٧٩).
(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣١٩).
(٤) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٢١).

(موسی) ﷺ زۆر لەوە شارەزاترە لۆمەی بکات لەسەر حەقەکەی خوا کە تاوانێکە و دەزانێت خوا لێی خۆشبووە، (موسی) ﷺ خۆشی تاوانی ئەنجامداوە کە کەسێکی کوشت لە ناوبژیوانیدا، فەرمووی: ﴿أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا﴾ تۆ ئەی پەروەردگار سەرپەرشتیکاری ئێمەیت، لێم خۆشبە، خوای پەروەردگاریش لێی خۆشبوو، ئیتر چۆن لۆمەی (ئادەم) دەکات لەسەری؟! بەڵکوو مەبەستی ئەوەبوو کە ئەو کردارەی تۆ بووە هۆکاری بەلاّ بۆ خۆت و نەوەکانیشت کە دەرکرای لە بەهەشت و نێردرایتە سەر زەوی.

وە لەلایەکی تریشەوە (ئادەم) ﷺ ئەو درەختەی نەخوارد بۆئەوەی لە بەهەشت دەربکرێت، وە نموونەی ئەمە وەکوو کەسێك وایە کە سەفەر بکات تووشی ڕووداوێك ببێت و تۆش لۆمەی بکەیت لەسەر ئەوەی کە ئەو سەفەرەی کردووە، ئەمە لۆمە هەڵناگرێت، لەبەرئەوەی ئەو سەفەری نەکردووە بۆئەوەی ئەو ڕووداوە ڕوو‌بدات، وە ئەگەر بۆ ڕووداوەکە بڵێت ئەوە بە قەدەری خوا بووە ئەوا ئەم قسەیەی تەواوە و لێی وەردەگیرێت.

**دەرئەنجامی تەوبەکردنیش دوو جۆرە:**

**جۆری یەکەم: دەشێت بەس تەوبەکە هەبێت و سزا بەدوایدا نەیەت.**

(ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: وَهَكَذَا قَدْ يُصِيبُ النَّاسُ مَصَائِبَ بِفِعْلِ أَقْوَامٍ مُذْنِبِينَ تَابُوا، مِثْلَ كَافِرٍ يَقْتُلُ مُسْلِمًا ثُمَّ يُسْلِمُ وَيَتُوبُ اللهُ عَلَيْهِ، أَوْ يَكُونُ مُتَأَوِّلًا لِبِدْعَةٍ ثُمَّ يَتُوبُ مِنْ الْبِدْعَةِ، أَوْ يَكُونُ مُجْتَهِدًا أَوْ مُقَلِّدًا مُخْطِئًا[1].

واتە: خەڵکانێك تووشی کۆمەڵێك بەلاّ دەبن بە هۆکاری کەسانی تاوانبار و هەڵەوە: وەکوو کەسێکی بێبڕوا موسوڵمانێك دەکوژێت و پاشان موسوڵمان دەبێت و تەوبەی لێدەکات ئەوا هیچی لەگەڵ ناکرێت، یاخود بە هۆکاری بیروڕایەکی بیدعەوە و ئیجتیهادی هەڵەوە کۆمەڵێك کاری هەڵە و تاوان دەکرێت، بەڵام پاش تەوبەکردنەکە یاخود گەڕانەوە لە هەڵەی ئیجتیهادەکە هیچ تۆڵەسەندنەوەیەك ئەنجام نادرێت.

هەروەك ڕێگر و چەتەکانی سەر ڕێگاکان کە خوای پەروەردگار لەو بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوْ يُصَلَّبُوٓاْ أَوْ

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٣٣).

تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ... إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡۖ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣٤﴾ [المَائدة: ٣٣، ٣٤]. ئەو ڕێگر و چەتانەی سەر ڕێگا کە خەڵك دەکوژن و ڕووتیان دەکەنەوە دەبێت بکوژرێن و هەڵواسرێن و دەست و قاچیان بە پێچەوانەوە ببڕدرێت، بەڵام ئەگەر پێش ئەوەی بگیرێن و بکەونە ژێر دەستی دەسەڵات؛ خۆیان تەوبەیان کرد و وازیان هێنا و تەسلیم بوون؛ ئەوا هیچ تۆڵە و کارێکیان لەگەڵدا ئەنجام نادرێت، وەك ئەو تاوانانەی کە لە کۆتاییەکەیدا پێیان دەڵێن: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَ﴾، واتە خوا لە ڕابوردووتان خۆش بووە. بۆیە (ابن تیمیة) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: فَهَؤُلَاءِ إذَا أَصَابَ الْعَبْدَ أَذًى بِفِعْلِهِمْ فَهُوَ مِنْ جِنْسِ الْمَصَائِبِ السَّمَاوِيَّةِ الَّتِي لَا يُطْلَبُ فِيهَا قِصَاصٌ مِنْ آدَمِيٍّ وَمِنْ هَذَا الْبَابِ الْقِتَالُ فِي "الْفِتْنَةِ"[1].

واتە: هەرچییەك بە هۆکاری ئەوانەوە تووشبێت ئەوا تۆڵەسەندنەوە لێیان نییە، وەکوو بەڵاکان وایە بە هۆکارە ئاسمانییەکانەوە (لافاو و هەورەبروسکە و بوومەلەرزە ...).

**جۆری دووەم: دەشێت دوابەدوای تەوبەکە دەرەنجام بەدوای خۆیدا بێنێت.**

(ابن تیمیة) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: فَإِنْ قِيلَ: وَهُوَ قَدْ تَابَ فَلِمَاذَا بَعْدَ التَّوْبَةِ أُهْبِطَ إلَى الْأَرْضِ؟ . قِيلَ: التَّوْبَةُ قَدْ يَكُونُ مِنْ تَمَامِهَا عَمَلٌ صَالِحٌ يَعْمَلُهُ فَيُبْتَلَى بَعْدَ التَّوْبَةِ لِيَنْظُرَ دَوَامَ طَاعَتِهِ[2].

واتە: گەر وترا: ئەی بۆ دوای تەوبە دابەزێنرانە سەر زەوی؟ دەڵێین: ئەمە بەشی دووەمی تەوبەیە کە دەشێت لەپاش تەوبەکردن هەندێك دەرەنجامت تووشبێت.

وەکوو تەوبەکردن لەدوای تاوانەکان کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥﴾﴾ [النُّور: ٥]. واتە بێجگە لە تەوبەکارانێك کە لەپاش تەوبەکەیان بەردەوامن لەسەر کرداری چاك، وە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥٤﴾﴾ [الأنعَام: ٥٤]، ﴿وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابٗا ﴿٧١﴾﴾ [الفُرقان: ٧١]. واتە ئەوەی بگەڕێتەوە و تەوبە بکات و کرداری چاك ئەنجام بدات؛ خوا بەخشندەیی خۆی

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٣٣، ٣٣٤). (٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٢٢).

پێدەبەخشێت، وە دەفەرمویێت: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصْلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ ﴾ [البَقَرَة : ١٦٠]. واتە بێجگە لەوانەی تەوبە دەکەن و چاك دەبن، ئەوانە بەر لێخۆشبوونی خوا دەکەون، وە دەفەرمویێت: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾ [الفُرقَان : ٧٠]. واتە بێجگە لەوانەی تەوبە دەکەن و کرداری چاك دەکەن، ئەوانە خوا خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە، وە دەفەرمویێت: ﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ﴾ [طه : ٨٢]. واتە من لێبووردەم بۆ ئەو کەسانەی کە تەوبە دەکەن و کرداری چاك دەکەن و ڕێگەی هیدایەت دەگرنە بەر.

هەموو ئەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر بەمەرجگرتن و کردنی کاری چاك بە بەردەوامی لەپاش تەوبەکردن کە ئەمە دەرئەنجامە و وەکوو سەلماندنی ئەوەشە کە بەتەواوی لەسەر ئەو کارانە نەماون.

- وەکوو تەوبەی (کعب بن مالك) و دوو هاوەڵەکەی کە لە جیهاد دواکەوتن لە تەبووکدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا کە کەس قسەیان لەگەڵدا نەکات و خێزانەکانیشیان لێ دوورخرایەوە تاوەکوو هەشتا ڕۆژ، سەرەڕای تەوبەکردنەکەشیان ئەمەیان بەسەردا هات.

- یاخود تەوبەی (بني إسرائیل) لەپاش گوێرەکە پەرستنەکەیان، وەکوو خوای پەروەردگار باسیان دەکات: ﴿ يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓاْ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ ﴾ [البَقَرَة : ٥٤]. دەبێت لەپاش تەوبەکردنەکەیان خۆیان بکوژن.

(ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: وَإِذَا كَانَ اللهُ تَعَالَى قَدْ يَبْتَلِي الْعَبْدَ مِنْ الْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ وَالسَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ بِمَا يَحْصُلُ مَعَهُ شُكْرُهُ وَصَبْرُهُ أَمْ كُفْرُهُ وَجَزَعُهُ وَطَاعَتُهُ أَمْ مَعْصِيَتُهُ؛ فَالتَّائِبُ أَحَقُّ بِالِابْتِلَاءِ، فَآدَمُ أُهْبِطَ إِلَى الْأَرْضِ ابْتِلَاءً لَهُ وَوَفَّقَهُ اللهُ فِي هُبُوطِهِ لِطَاعَتِهِ، فَكَانَ حَالُهُ بَعْدَ الْهُبُوطِ خَيْرًا مِنْ حَالِهِ قَبْلَ الْهُبُوطِ[١].

واتە: ئەگەر ئادەمیزاد تاقی بکرێتەوە بە چاکە و خراپە و خۆشی و ناخۆشییەکان، تاوەکوو بەو هۆکارانەوە دەرکەوێت کێ سوپاسگوزارە و کێ ئارامگرە و خواپەرستی لەسەر دەکات و کێش بەپێچەوانەی ئەمانەوەیە؛ ئەوا کەسێك تاوانی ئەنجام دابێت و پاشان تەوبەی لەسەر بکات؛

(١) "مجموع الفتاوی" لابن تیمیة (٨/ ٣٢٣).

لەپێشترە بەو تاقیکردنەوە و هاتنەرێی ناخۆشی و بەڵاکان بۆی (وەکوو دەرئەنجامێك)، (ئادەم)یش نێردرایە سەر زەوی وەکوو تاقیکردنەوە و بەڵایەك بۆی، بەڵام لە هاتنەخوارەوەیدا حاڵی (ئادەم) کامڵتر و خێرتر بوو تا پێش هاتنەخوارەوەی، ئەو هەموو پێغەمبەرانە لە نەوەی ئەو بوون، لەگەڵ ئەو هەموو ئیماندار و عیبادەت و خواپەرستییەی بە هۆکاری هاتنەخوارەوەی ئەوەوە سەرزەوی ئاوەدان بووەوە، بێبڕوا و تاوانبارانیش دەرکەوتن و پاك و پیس لەیەك جیابووەوە.

**٣. (آدم) عليه السلام ستەمی لە نەوەکەی نەکردووە تا لۆمە بکرێت:**

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: فَإِنَّ آدَمَ لَمْ يَظْلِمْ أَوْلَادَهُ بَلْ إنَّمَا وُلِدُوا بَعْدَ هُبُوطِهِ مِنْ الْجَنَّةِ وَإِنَّمَا هَبَطَ آدَمَ وَحَوَّاءُ وَلَمْ يَكُنْ مَعَهُمَا وَلَدٌ حَتَّى يُقَالَ: إنَّ ذَنْبَهُمَا تَعَدَّى إلَى وَلَدِهِمَا ثُمَّ بَعْدَ هُبُوطِهِمَا إلَى الْأَرْضِ جَاءَتْ الْأَوْلَادُ فَلَمْ يَكُنْ آدَمَ قَدْ ظَلَمَ أَوْلَادَهُ ظُلْمًا يَسْتَحِقُّونَ بِهِ مَلَامَهُ وَكَوْنُهُمْ صَارُوا فِي الدُّنْيَا دُونَ الْجَنَّةِ أَمْرٌ كَانَ مُقَدَّرًا عَلَيْهِمْ لَا يَسْتَحِقُّونَ بِهِ لَوْمَ آدَمَ[(١)].

واتە: (ئادەم) عليه السلام ستەمی لە نەوەکەی نەکردووە و کاتێك نێردراوەتە خوارەوە هەر خۆی و حەوای خێزانی بووە و منداڵ و نەوەیان نەبووە، تاوەکوو بڵێن ئادەم ستەمی لە نەوەکەی کردووە، بەڵکوو لەسەر زەویدا نەوەیان بووە.

بۆیە هیچ ستەمێکی نەوەکەی ناخرێتە ئەستۆی و ستەمی لێ نەکردوون تاوەکوو شایستەی لۆمە بێت، بەناوی ئەوەی کە نەوەکانی لە دونیان و لە بەهەشتدا نین، یاخود بوترێت لە بەهەشتدا بوون و دەرکراون بۆ دونیا.

پاشان (ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: وَالنَّاسُ مَأْمُورُونَ عِنْدَ الْمَصَائِبِ الَّتِي تُصِيبُهُمْ بِأَفْعَالِ النَّاسِ أَوْ بِغَيْرِ أَفْعَالِهِمْ بِالتَّسْلِيمِ لِلْقَدَرِ وَشُهُودِ الرُّبُوبِيَّةِ كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥ﴾ [التغابن: ١١][(٢)].

واتە: لەکاتی بەڵاکاندا فەرمان دراوە بە خەڵکی کە خۆی ڕادەستی قەدەر بکات و دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی خوایی تیادا ببینێت، جا ئیتر ئەو بەڵایانە بە هۆکاری کردەوەی خەڵکییەوە

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٢١).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣١٩).

بێت یاخود نا، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: هەر بەڵایەکتان بەسەردا بێت بە ئیزنی خوایە، وە ئەوەی باوەڕیشی بەوە بێت ئەوە هیدایەتدراوە.

خۆ ئەگەر (ئادەم) تاوانی کرد و پاشان تەوبەی کرد، ئەوکات بە بوونی ئەو هۆکارەوە لە بەهەشت دەرکرا، ئەوا وەکوو (ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: وَقَدْ عَلِمَ أَنَّ إِبْلِيسَ لَعَنَهُ اللهُ بِسَبَبِ ذَنْبِهِ؛ وَهُوَ أَيْضًا كَانَ مُقَدَّرًا عَلَيْهِ[1]. خۆ دەزانرێت کە (إبلیس) لەپاش تاوانەکەی خوا نەفرەتی لێکرد و ئەویشی لە بەهەشت دەرکرد، ئەمیش وەکوو ئەوەی ئادەم قەدەرە و پاش نەفرەتلێکردن و دەرکردنەکە هاتە سەر زەوی، کەواتە هەردووکیان بە قەدەری خوا دەرکراون.

کەواتە هەڵوێست لەکاتی بەڵادا وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ فێرمان دەکات کە بڵێین: «وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ، فَلَا تَقُلْ لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ قَدَرُ اللهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ»[2]. گەر شتێکت تووش بوو مەڵێ "ئەگەر" ئەوەم بکردایە ئەوا وا دەبوو، بەڵکوو بڵێ خوا چی دانابێت و چی بوێت هەر ئەوە دەبێت.

بەختەوەر ئەو کەسەیە کە داوای لێخۆشبوون دەکات لە تاوانەکانی و ئارام لەسەر بەڵاکان دەگرێت، وە گومڕاش ئەو کەسەیە کە ناڕەزایی دەردەبڕێت لەکاتی بەڵاکاندا و قەدەر دەکاتە بەڵگە لەسەر تاوانەکانی.

کەواتە (ئادەم)یش عَلَيْهِ السَّلَامُ وەکوو نەوەکانی بەڵادارە و لەژێر قەدەری خوادایە و حەزی نەدەکرد لە بەهەشت دەرکرێت، وە بگرە ئەو درەختەشی بۆیە خوارد کە لە بەهەشت دەرنەکرێت ﴿أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ ﴿٢٠﴾﴾ [الأعراف: ٢٠]. هەر ئەو ڕێگایەشی گرتەبەر و نەبووە ڕێگا، بەڵکوو قەدەرەکە لەوەدا دانرابوو، کەچی لۆمەش دەکرێت لەسەری! بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى». (ئادەم) بەڵگەی بەهێزتر بوو بەسەر (موسى)دا.

**تێبینی:** کۆمەڵێك بەناوی گەیشتن بە پلەی حەقیقەت و عیرفان وا گومان دەبەن و بڕوایان وایە کە هەرچی ڕوودەدات و هەرچی دەبێت هۆکاری تێدا نییە، بێجگە لە ویستی ڕەهای خوا

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٢١، ٣٢٢).

(٢) رواه مسلم (٢٦٦٤)، وسبق تخريجه ص٢٦.

نەبێت، بەبێ بوونی هۆکار و یاسای شەرعی و کار و کردەوەی ئادەمیزاد.

لەم بارەیەوە (ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ: هَذَا فِي حَقِّ أَهْلِ الْحَقِيقَةِ الَّذِينَ شَهِدُوا تَوْحِيدَ الرُّبُوبِيَّةِ وَفَنُوا عَمَّا سِوَى اللَّهِ فَيَرَوْنَ أَنْ لَا فَاعِلَ إلَّا اللَّهُ فَهَؤُلَاءِ لَا يَسْتَحْسِنُونَ حَسَنَةً وَلَا يَسْتَقْبِحُونَ سَيِّئَةً فَإِنَّهُمْ لَا يَرَوْنَ لِمَخْلُوقٍ فِعْلًا؛ بَلْ لَا يَرَوْنَ فَاعِلًا إلَّا اللَّهُ ... وَهَذَا قَوْلُ كَثِيرٍ مِنْ مُتَأَخِّرِي الصُّوفِيَّةِ الْمُدَّعِينَ لِلْحَقِيقَةِ وَقَدْ يَجْعَلُونَ هَذَا نِهَايَةَ التَّحْقِيقِ وَغَايَةَ الْعِرْفَانِ وَالتَّوْحِيدِ وَهَذَا قَوْلُ طَائِفَةٍ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ ... وَمِمَّنْ يُشْبِهُ هَؤُلَاءِ كَثِيرٌ مِنْ الْفَلَاسِفَةِ: كَقَوْلِ ابْنِ سِينَا بِأَنْ يَشْهَدَ سِرَّ الْقَدَرِ. وَالرَّازِي يُقَرِّرُ ذَلِكَ؛ لِأَنَّهُ كَانَ جَبْرِيًّا مَحْضًا. وَفِي الْجُمْلَةِ فَهَذَا الْمَعْنَى دَائِرٌ فِي نُفُوسِ كَثِيرٍ مِنْ الْخَاصَّةِ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ وَالْعِبَادَةِ فَضْلًا عَنْ الْعَامَّةِ وَهُوَ مُنَاقِضٌ لِدِينِ الْإِسْلَامِ(١).

واتە: هەندێك لە ئەهلی حەقیقەت و عیرفان دەڵێن: تاوانەکەی ئادەم و بەڵاکەی کە بەسەریدا هات بەڕێوەبردنی خوایی و دەسەڵاتی ڕەهای ئەوی تیادا دەبینرێت و بەس، کە هیچ کارێك بۆ ئادەمیزاد نییە، بەڵکوو هیچ خاوەن کارێك نییە بێجگە لە خوا، ئەمانە کار و کردەوەی چاك و عیبادەت و تاوان و خراپ وەك یەك دەبینن، هەرکامێکیان بکەیت و ببێتە کردەوە ئەوە ویست و ڕازیبوونی خوای لەسەرە و بەس ئەو ببینە لە بووندا، ئەوە کۆتا تێگەیشتن و ڕاستییەکانە و خاڵی کۆتای عیرفانی و ئاشنابوونە بە خوا و (توحید) و ناسینی ئەو، مەبەست بەمە ئەوەیە کە خوا ڕەخساندوویەتی و ویست و ڕازیبوونی ئەوی لەسەر بووە کە (ئادەم) تاوانەکە بکات و بەڵای بەسەردابێت و (إبليس)یش فەرمان بشکێنێت و نەفرەتکراو بێت، ئەمە بۆچوونی زۆری ئەهلی تەسەوفی ئەم دواییانەیانە کە بانگەوازی بۆ گەیشتن بە (حقيقة) دەکەن، ئەو (حقيقة)ەی کە تەنها (الربوبية)ی خوای تێدا دەبینرێت و نە کار و نە کردەوە و نە شەرعی خوا تیایدا بوونی نییە.

ئەمە بیروڕای هەندێك لە زانایان و فەیلەسووفەکانە وەکوو (ابن سينا والرازي) کە دەڵێن ئەمە نهێنی قەدەرە، وە تەنانەت ئەم جۆرە بۆچوونە لە ناخی زۆری عابیدەکان و کەسانی خاوەن عیلمدا بوونی هەیە، چ جای خەڵکی گشتی کە بۆخۆی ئەم بیروڕایە پێچەوانەی ئایینی ئیسلامە.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٣٠٥ - ٣٠٧).

**پرسیاری شەشەم**: ئایا زانینی جۆری ڕەگەزی کۆرپەلە بەرپەرچی ئەم دەقانە ناداتەوە کە عیلمی غەیبی خواییە؟ وەکوو:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾ ﴾ [لقمان: ٣٤].

قال رسول الله ﷺ: «...فِي خَمْسٍ مِنَ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا اللهُ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾ ﴾ [لقمان: ٣٤]»[(١)].

ئەم ئایەت و فەرموودەیە هەردووکیان یەك بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە کۆرپەلە و ئەوەی دروستدەبێت لە ڕەحمی دایکیدا چییە و چۆنیەتییەکەی زانستێکی غەیبییە، وە کەس نایزانێت بێجگە لە خوا.

پرسیارێك لەم سەردەمەدا دەکرێت و دەڵێن بە هۆکاری تیشکی سۆنەر و ئەو ئامێرانەی ئێستا و داهاتووش کە دروستدەکرێن دەزانرێت ئەو کۆرپەلەیە نێرە یان مێیە، ئەندامەکانی ساغ و سەلامەتن یاخود نا ... کەواتە بەم هۆکارانە لە زانستی غەیبی دەرچووە و ئادەمیزاد دەیزانێت، لەبەرئەوە دەیکەنە ڕەخنە لەسەر دین.

پێش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستمان بە پێشەکییەك هەیە وەکوو بنەما بۆ ئەم بابەتە:

(ابن العثیمین) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: أنه لا يمكن أن يتعارض صريح القرآن الكريم مع الواقع أبدا، وأنه إذا ظهر في الواقع ما ظاهره المعارضة، فإما أن يكون الواقع مجرد دعوى لا حقيقة له، وإما أن يكون القرآن الكريم غير صريح في معارضته؛ لأن صريح القرآن الكريم وحقيقة الواقع كلاهما قطعي، ولا يمكن تعارض القطعيين أبدا[(٢)].

(١) رواه البخاري (٥٠)، ومسلم (١٠)، وابن ماجه (٦٤)، وابن حبان في "صحيحه" (١٥٩)، وأحمد في "المسند" (٢٩٢٤)، والطبراني في "الشاميين" (٢٤٥١)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٧٥٥٧)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٩٨٥).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" (١/ ٦٨).

واتە: وەکوو یاسایەکی بنەمایی لەدوای دابەزینی قورئانەوە نەبینراوە کە بوون و واقعێك بە شێوەیەکی ڕاست و دروست هەبووبێت و لەگەڵ ئەوەشدا پێچەوانە بووبێت لەگەڵ قورئاندا، واتە کار و شتەکانی دونیا بە هیچ شێوەیەك پێچەوانەی قورئان نەبووە، لەلایەکی تریشەوە وەکوو واقع هەر فیرەق و تاقمێك لەناو دیندا دروستبووبێت و خاوەنی هەر بیروبۆچوونێکی هەڵە یاخود پێچەوانەی دەقەکانی قورئان بووبێت؛ هەر لە کۆتاییدا قورئان ڕاستکەرەوەیان و سەلمێنەری ڕاستییەکان بووە بەسەریاندا و هەڵە و گومڕاییان بە ئاشکرا دەرکەوتووە، وە مێژوو و سەرچاوەکانی باسی فیرەق باشترین بەڵگەن، ئەمە بەدەر لەو هەموو ئەو ئیلحاد و بێبڕواییانەی کە بوونیان هەیە و لە ئاست قورئاندا هیچیان پێ نەکراوە، لەبەرئەوەی قورئان موعجیزەیەکی بەردەوامە تا ڕۆژی دوایی.

بۆیە ناشێت دەقێکی ڕوون و ئاشکرای قورئان پێچەوانەی کارێکی واقعی دروست بێت، خۆ ئەگەر بوو ئەوا ئەو واقع و بووە دەشێت بەس قسە و باس بێت و بوونی نەبێت بە ڕاست و دروستی، یاخود دەشێت واقعەکە تەواو بێت بەڵام ئەو دەقەی کە لە قورئاندا کراوەتە بەڵگە (صريح) و ڕاستەوخۆ و تەواو نەشێت بۆ ڕەتدانەوەی ئەو واقعە، یاخود ئەو بابەتەی مەبەست نییە و نایگرێتەوە، لەبەرئەوەی دەقە ڕاستەوخۆکانی قورئان یەکلاکراوە و بنەمایە (صريح القرآن قطعي)، وە بوون و واقعەکانیش ڕاستەوخۆی تەواو یەکلاکراوە و بنەمایە (حقيقة الواقع قطعي)، بۆیە ناشێت ئەم دوو بنەما (قطعي) و یەکلاکەرەوە و دڵنیایە دژایەتی یەك بکەن.

ئەمە یاسایەکی ناو زانایانە، تەنانەت (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ کتێبی "درء تعارض العقل والنقل"ی نووسیوە و لەسەر ئەم بنەمایە دایڕشتووە لەژێر ناونیشانی یاسای (العقل الصريح لا يخالف النقل الصحيح)[1].

واتە: عەقڵێکی پاك و ڕاست و دروست پێچەوانەی دەقێکی تەواوی دین ناکات.

کەواتە مەبەست لێرەدا ئەوەیە: یا دەبێت مەبەست لەو بوارەی زانینی کۆرپەلەیە تەواو نەبێت، یاخود دەبێت دەقەکان مەبەستیان لەوە نەبێت، گەر نا قورئان و فەرموودە دژایەتی واقعی دروستکراوەکانی خوا نابێت بکات و ناشیکات.

(١) "درء تعارض العقل والنقل" (٢/ ٣٦٤)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٧/ ٦٦٥).

**وەڵامیش بۆ پرسیارەکە:**

١. ئەو دوو دەقەی قورئان و فەرموودە لە عیلمی غەیبی خوایی ئاماژە نییە بەس بۆ زانینی کۆرپەلە لە سکی دایکیدا کە ڕەگەزی نێرە یان مێیە، بەڵکوو زۆر لەوە گشتگیرترە، وە مەبەستیش لەسەر زانینی خوا بەسەر ئەو کۆرپەلەیەدا هەر لە سەرەتای گەیشتنی تۆو و هێلکەی نێر و مێیە بە یەکتر، وە لە هەموو ئان و ساتێکدا و قۆناغبڕینەکانی تا دروستبوون و ڕۆح کردنەبەردا و هاتنە دونیای و کردەوەکانی و چاك و خراپی و تەمەن و ڕزق و ڕۆزی و شێوەکاری و لاشە و ڕواڵەت و هەموو دونیای و پاش مردن و قیامەتیشی کە بەهەشتییە یا دۆزەخییە ...، مەبەست بە زانین و عیلمە غەیبییەکەی خوا بەسەریدا هەموو ئەمانە دەگرێتەوە.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکی تردا ئاماژەی بەمانە کردووە و دەفەرموێت: «إِنَّ اللهَّ عَزَّ وَجَلَّ وَكَّلَ بِالرَّحِمِ مَلَكًا، يَقُولُ: يَا رَبِّ نُطْفَةٌ، يَا رَبِّ عَلَقَةٌ، يَا رَبِّ مُضْغَةٌ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَقْضِيَ خَلْقَهُ قَالَ: أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى، شَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ، فَمَا الرِّزْقُ وَالأَجَلُ، فَيُكْتَبُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ»[(١)].

واتە: خوای پەروەردگار مەلائیکەیەك بە سەرپەرشتیکار دادەنێت بەسەر ڕەحمی دایکەوە، لە هەموو قۆناغەکاندا ئیزن لە خوا وەردەگرێت بۆ قۆناغبڕینی، دەڵێت: خوایە دڵۆپێك ئاوە، ئەی خوایە پارچەیەك خوێنە، خوایە پارچە گۆشتێکە، پاش ئەمانە بیەوێت دروستکردنەکەی تەواوکات دەڵێت: ئەی خوایە نێر بێت یان مێ بێت؟ کەسێکی چاك بێت یان خراپ؟ ڕزقی چۆن دەبێت؟ ئەجەلی چی دەبێت؟ ئەمانە هەمووی لە سکی دایکیدا یەکلا دەکرێتەوە.

ئەم زانینە هەر لە سەرەتای دڵۆپێك ئاوەوەیە تا کۆتایی بوونی، بۆیە قورئانیش لە داڕشتنەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات بە بەکارهێنانی پیتی (ما) نەك پیتی (مَنْ)، لەبەرئەوەی (ما) بۆ بێ عەقڵەکان بەکاردەهێنرێت، واتە هەر لە سەرەتای بوونی بە پارچە گۆشتێکی بێ گیان و بێ عەقڵەوە خوای گەورە زانایە بەسەریدا، (مَنْ)ی بەکارنەهێنا کە بۆ عاقڵ و خاوەن ژیری دەبێت تاوەکوو بڵێیت کاتێك دروستدەبێت و ڕۆحی دەکرێت بەبەریدا و عەقڵی پێ دەدرێت ئەو کاتە خوا زانایە بەسەریدا ﴿وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ﴾، ئەمەش یەکێکە لە ئیعجازەکانی ڕەوانبێژی داڕشتنی قورئان.

---

(١) رواه البخاري (٣١٨، ٦٥٩٥)، ومسلم (٢٦٤٦)، وسبق تخريجه ص٣٧٩.

**٢.** زانینی نێر و مێیەتی لە سکی دایکدا لەپاش تەواوبوون و دروستبوونی لاشە و جەستەیەتی، وە پاش لاشە و جەستەشی ڕۆح دەکرێت بە بەریدا، وەکوو ئیمامی (ابن حجر) و (النووي) ڕەحمەتی خوایان لێبێت دەڵێن: اتَّفَقَ الْعُلَمَاءُ عَلَى أَنَّ نَفْخَ الرُّوحِ لَا يَكُونُ إِلَّا بَعْدَ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ[(١)]. واتە هەموو زانایان کۆدەنگن لەوەی لەدوای چوار مانگییەوە ڕۆح دەکرێت بە بەری لاشەی ئادەمیزاددا.

تەنانەت ئەو ماوەیەی کە جەستەی تەواو نەبووە و لە قۆناغی ئاو و خوێن و گۆشتدا دەبێت کەس نازانێت نێر دەبێت یاخود مێ، لەگەڵ ئەوەشدا پاش دروستبوون و تەواوبوونی لاشەشی هەندێك جار ئەو ئامێرانە و بەکارهێنەرەکانیان هەڵە دەکەن و بەپێچەوانەوە بڕیار لەسەر ڕەگەز و تەواوبوونی جەستەی دەدەن، بەدەر لە عەقڵ و ئەندامەکانی تری ناو جەستەی و تەمەن و ئەجەل و چاکە و خراپە و دونیا و دواڕۆژ و وردەکارییەکانی ناویان، کە هەموو ئەمانە بۆچوون و ئیجتیهادێکن دەشێت بپێکن و نەپێکن.

بۆیە پاش دروستبوون و تەواوبوونی جەستەی هیچ گرنگ نییە کە بە ئامێرێك بزانرێت نێرە یان مێ، ئەوە یەکێکە لەو کارانەی کە خوای گەورە نزیکی خستووەتەوە لە زانینی ئادەمیزاد، بەڵکوو بەبێ ئامێریش چەندەها دایك بە هۆکاری جۆری جووڵەی منداڵەکە و بوونی لە ئاڕاستەیەکی لاشەیدا و جۆری شیرەکەی پێش لەدایکبوونی دەزانێت نێرە یان مێ، بۆیە ئەم جۆرە قسەکردنانە لەسەر ئەوەی کە زانست پێشکەوتووە و هەموو شتێك دەزانرێت؛ پڕوپاگەندەی ڕووکەشی دونیایە و لە ناوەڕۆکدا بەو شێوەیە نییە، ئەمەش بەر ئەو ئاماژەیەی قورئان دەکەوێت کە خوای پەروەردگار دەربارەی ئادەمیزاد دەفەرموێت: ﴿ يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ ٧ ﴾ [الروم: ٧]. واتە ئادەمیزاد تەنها ڕووکەشییەکانی ژیانی دونیایان دەزانن و بێ ئاگان لە ڕۆژی دواییان.

وە ئەمەش وەکوو ئەوە وایە شیری دایك و شیری دەستکرد بە شیری شەرعی دابنرێت و بڵێیت بە خواردنیان دەبنە خوشك و برا، لەگەڵ ئەوەشدا شیری دەستکرد هاوڕاوەی خۆراکە لەگەڵ بابەتی تر بەگوێرەی تەمەن و بە هیچ شێوەیەك شیری دایکی تێدا نییە.

(١) "فتح الباري" لابن حجر (١١/ ٤٨١)، و "شرح النووي على مسلم" (١٦/ ١٩١).

ئەم بڕیاری زانینی ڕەگەزەش وەکوو ئەو نموونەیە وایە، تەنها لە ناودا بەشدارە، دەنا لە واقعدا زۆر دوورن لەیەکەوە، نە ئەویان زانینی غەیبە و نە ئەمیش شیری دایکە.

پرسیار و وەڵام لە بواری قەدەردا زۆرن، بەڵام پێم وایە ئەم نموونانە و باسەکانی پێشتر دەبنە یاسا و وەڵام و یەکلاکەرەوەی تەواو بۆ هەموو پرسیارێکی تر ئەگەر لە بواری قەدەردا دروست ببێت، بە مەرجێك مافی خۆی پێبدات لە تێگەیشتن و وەرگرتنی ووردەکارییەکان و هەڵسەنگاندنیدا بە شێوەیەکی زانستی تەواو.

  

# بەرهەمەكانی
# باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر
## ثمرة الإيمان بالقضاء والقدر

هەموو ڕوكنێك لە ڕوكنەكانی ئیسلام قورسایی و كاریگەرییەكی تایبەتی هەیە لەسەر ڕێكخستن و ژیانی ئیماندار، لەبەرئەوەی بۆخۆی دین بە پێویستییەكی سەرەكی دادەنرێت بۆ ژیانی ئادەمیزاد، وە بە نەبوونی؛ كەلێنەكانی ژیان و ناتەواوییەكانی قووڵتر دەبێت و ئاسوودەیی و كامەرانی دەتۆرێت لە ڕاستەڕێگەی ژیانیدا، وە لەلایەكی تریشەوە هەریەك لە بوارەكانی دین كاریگەرییەكی جیاوازی هەیە، بەتایبەت بابەتی قەزا و قەدەر كە لە كاتەكانی ناخۆشی و خۆشیدا بۆ هەڵنەدێران و لانەدان لە ڕێڕەوی دروستی ژیان پێویستت بە ئاگالێبوون و تازەكردنەوەی تێگەیشتن و ئیمان پێهێنانی هەیە، لەگەڵ دەرككردن بە نهێنییەكانی كە دەبێتە هۆكاری سەقامگیری و كامڵبوونی زیاتر لە خوێندنەوەی ووردی دوور و نزیك بۆ كارەكان، تاوەكوو ئارامگری و هیوا بەیەكەوە ژیانێكی پڕ ئاسوودەیی بڕەخسێنن بۆ ئیماندار.

گرنگی قەزا و قەدەر بە كورتی وەكوو (ابن عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «الْقَدَرُ نِظَامُ التَّوْحِيدِ»[(١)]، واتە ئیمان بە قەدەر ڕێكخەرەوەی تەواوی عەقیدە و خواناسییە، وە (الإمام أحمد)یش رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «الْقَدَرُ قَدَّرَهُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ»[(٢)]. واتە قەدەر باوەڕبوونە بە توانا و دەسەڵاتی ڕەهای خوا، بۆیە بەرهەم و كاریگەرییەكانی قەدەر لە سێ بواری سەرەكیدا خۆی دەبینێتەوە كە بریتین لە:

١. بـواری عەقیدەیی.
٢. بـواری ئاكار و ڕەوشت.
٣. بـواری دەروونی.

---

(١) رواه الطبراني في "الأوسط" (٣٥٧٣)، وابن بطة في "الإبانة" (١٦١٩)، وسبق تخريجه ص٢٧.

(٢) أخرجه الفريابي في "القدر" (٢٠٧) عن عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، وأبو بكر بن الخلال في "السنة" (٩٠٤)، والآجري في "الشريعة" (٤٨٢)، وابن بطة في "الإبانة" (١٥٦٢، ١٨٠٥) عن عمر بن الخطاب وعن زيد بن أسلم، وانظر كتاب "الجامع لعلوم الإمام أحمد" (٤/ ١٨٨)، و "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ٢٥٤).

## بەرهەم و کاریگەرە عەقیدەییەکان
## الثمرات العقدية

### ١. ڕزگاربوون لە هاوبەش بڕیاردان (الخلاص من الشرك):

عەقیدە و بیروباوەڕی یەکخواپەرستی (التوحید) لەلای ئیماندار نایەتەدی بەتەواوی تاوەکوو لە (توحید الربوبیة)دا باوەڕی بەوە نەبێت کە خوای پەروەردگار داهێنەر و بەڕێوەبەر و هەڵسووڕێنەری کەون و بوونەوەرەکانە، وە ئیرادە و ویستی ئەو بە ڕەهایی باڵادەستە بەسەر هەموو بوونێکدا، «فَأَهْلُ السُّنَّةِ يُؤْمِنُونَ بِالْقَدَرِ، وَأَنَّهُ مَا شَاءَ اللهُ كَانَ، وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ»[(١)]. ئەهلی سوننەت باوەڕیان وایە ئەوەی خوا بیەوێت دەبێت و ئەوەی کە نەیەوێت نابێت.

تەنانەت: ﴿وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ٥٩﴾ [الأنعام: ٥٩]. گەڵای دارێك ناوەرێت و بوونی تەڕ و وشکێك نابێت بەبێ ئیزن و زانیاری و تۆمارکردنی خوایی نەبێت، وە باڵادەستی و فەرمان بەڕێوەبردن و هێنانەدی هەر بۆ ئەوە: ﴿لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ﴾ [الأعراف: ٥٤]. وە سەرەتا و کۆتایی و دەرکەوتوو و ئاشکرا و نهێنی و ناوەڕۆکەکان هەمووی لەژێر ویست و دەسەڵات و زانیاری و بەڕێوەبردنی پەروەردگاردایە: ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُ﴾ [الحديد: ٣].

وە بوونی هەموو خێر و شەڕ لە دەستی ئەودایە، وە بەشداریکار و پاڵپشت و یارمەتیدەر بۆ خوای پەروەردگار نییە و نابێت، وە تەنانەت تکاکاریش لە ڕۆژی دواییدا بەبێ ئیزنی ئەو بوونی نییە: ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا لَهُمۡ فِيهِمَا مِن شِرۡكٍ وَمَا لَهُۥ مِنۡهُم مِّن ظَهِيرٍ ٢٢ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنۡ أَذِنَ لَهُۥ﴾ [سبأ: ٢٢، ٢٣]. واتە ئەی (محمد) ﷺ پێیان بڵێ ئەوانەی کە ئێوە دەیانپەرستن بێجگە لە خوا خاوەنی گەردیلەیەك نین لە ئاسمان و زەوی، وە هاوبەشێك لە ئاسمان و زەویدا بوونی نییە بۆی، وە یارمەتیدەر و کاربەڕێکاریشی نییە، وە تەنانەت تکاکاری ڕۆژی دواییش بەبێ ئیزنی ئەو نییە.

---

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (١/ ٤٥٤).

لەم ئایەتەدا ئاماژەی بە نەبوونی هەموو جۆرەکانی دەسەڵات کردووە لە بەرزترینیانەوە تا نزمترینیان، یەکەم لە خاوەنیەتی و موڵکداری و دووەم شەریکەبەشی و سێیەم پشتیوان و یارمەتیدەر و چوارەم تکاکاری، ئەمانە هەموو جۆرەکانی دەسەڵاتن و هیچیان بوونی نییە لای خوا و هەمووی هەر خۆی خاوەنیەتی.

باوەڕبوون بە خوای تاك و تەنیا و بە دەسەڵاتی بێ هاوتای قەزا و قەدەری، ڕزگاربوونە لە هەموو بوارەکانی شەریك و هاوبەش بڕیاردان بۆی، وە هۆکاری پاکبوونەوەی نیەت و دڵەکانە لە هەموو بوون و دەسەڵاتێك بێجگە لە بوون و دەسەڵاتی ئەو، ئەگەر تێبڕوانین دەبینین باوەڕبوون بەم دەسەڵاتە گەورە ڕەهاییەی خوا لەناو ئادەمیزاددا ونە و دابەشکراوە و لە ڕوانگەی ئەو دابەشکردنەوە خوایەتییان پێدراوە، وەکوو مەجووسییەکان کە باوەڕیان بە خوای خێر و شەڕ هەیە، وە بە هەمان شێوەش هەموو بەناو ئایینە کۆنەکانی زوو لە میسرییەکان و یۆنانییەکان خوای خێر و شەڕیان جیاواز بووە، وە تەنانەت گاوورەکانیش کە دەڵێن (مسیح) ﴿عليه السلام﴾ ڕزگارکاری ئادەمیزادە و جوولەکەکانیش کە باوەڕیان وایە پێغەمبەرەکانیان ڕزگارکار و دەسەڵاتدارن: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ ﴾ [التوبة : ٣٠]. هیچیان دەسەڵاتی ڕەها نادەنە خوای پەروەردگار، بەڵکوو بەشداربووی بۆ بڕیار دەدەن، هەتا دەگاتە ئەهلی تەریقە و تەسەوفەکانی ناو بازنەی دین کە باوەڕیان بە چوار (الأقطاب والأوتاد) هەیە لە خواناسان کە کاربەڕێوەبەری (مخلوقات) و بوونەوەرەکانە، تا دەگاتە هەموو جیهانی ئیسلامی ئەمڕۆ کە گۆڕی پیاو ساڵحان دەپەرستن بە بیانووی ئەوەی لە خواوە نزیکن و کاریان بەدەستە و دەتوانن گۆڕانکاری لە ژیاندا دروستبکەن: ﴿لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ ﴾ [الزمر : ٣]. وە تەنانەت فیرەقی (قەدەری)یەکانیش دەڵێن خۆت کاری خۆت دروستدەکەیت و خوا دەسەڵاتی لە کاری ئادەمیزاددا نییە، لای ئەمانیش دەسەڵاتی ڕەهای خوا بوونی نییە.

نەبوونی ئەو عەقیدەیەش لە ئاستی خەڵکی گشتیدا ڕەنگی داوەتەوە کە پەنا دەبەنە بەر بورجەکان و بەخت و فاڵگرتنەوە و هانابردن بۆ ساحیران، یاخود یەقین و دڵنیایی لەسەر کاریگەرییەکانی چواردەور و هەوڵەکانی خۆت کە سەنگی مەحەکە بۆ گۆڕانکاری و هاتنەدی هەموو ئاواتەکان، ئەمە بووەتە هۆکاری نەمانی ئەو عەقیدە پاکەی کە خوای پەروەردگار دروستکار و بەڕێکار و خاوەن گۆڕانکارییەکانی ژیانی ئادەمیزادە و بوون و نەبوون هەر لە

دەسەڵاتی ئەودایە، بۆیە باوەڕبوون بە خوا و بە دەسەڵات و قەدەری خوا ڕزگاربوونە لە هەموو ئەم تاریکی و ئەم جەنگەڵستانە.

**٢. هۆکاری دروستبوونی نیەتپاکی و بەدەستهێنانی ئیمانی زیاترە (حصول الإخلاص والهداية):**

باوەڕبوون بە قەدەر بەشێوەی دروستی خۆی هۆکاری تەواوە بۆ دروستبوونی نیەتپاکی لە کار و کردەوەکاندا، بزوێنەر و جووڵێنەری هەموو کارەکان و قسەکان و نیەتەکانە، وە هۆکارێکی کارایە لەسەر هێنانەدی ڕەزامەندی خوا و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی، هەر بەو هۆکارەوە خاوەن بڕوا بە قەدەر دڵنیایە و متمانەی دڵی هەیە کە فەرمانێکی کاریگەر لە بووندا نییە بێجگە لە فەرمانی خوا، وە باوەڕ و متمانەی بەوەیە کە هەموو بوونێك موڵکی خوایە و ئەوەی ئەو ویستی لێبێت دەبێت و ئەوەی ئەو ویستی لێ نەبێت نابێت، ڕەتکردنەوە و ڕێگری لە نیعمەت و فەرمانی کەونی ئەو بوونی نییە: ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ﴾ [يونس: ١٠٧]. خۆ ئەگەر خوا ویستی زیان پێگەیاندنی تۆی هەبێت هیچ هۆکارێکی ڕێگری لە ئاستیدا نییە بێجگە لە فەرمانی خۆی، وە ئەگەر ویستی خێری پێت هەبێت ڕەتکارێك بوونی نییە لە ڕێیدا، ئەوەی بیەوێت لەسەر بەندەکانی دێتە دی.

بە هۆکاری نیەتپاکی (الإخلاص)ەوە لە کاردا ڕزگاری دەبێت لە نەخۆشییە دەروونییەکان، لە ڕیا و ڕووپامایی و دووڕوویی و ڕازاندنەوە و دڵ ڕازیکردنی خەڵکی: ﴿يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ﴾ [النساء: ١٤٢]، ﴿وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟﴾ [آل عمران: ١٨٨]. پێیان خۆشە دەستخۆشییان لێبکەیت لە کارێکدا کە نەیانکردووە.

وە هەروەها باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر هۆکاری زیادبوونی هیدایەت و ئیمانی زیاترە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ﴾ [التغابن: ١١]. واتە هەر بەڵایەکیان بەسەردا بێت باوەڕیان وایە ئەمە لەلایەنی خواوەیە و بە ئیزنی ئەوە، ئەم جۆرە باوەڕبوونە هۆکاری هیدایەتی دڵی و ئیمان زیادبوونە، وە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ۝١٧﴾ [محمد: ١٧]. واتە ئەوانەی هیدایەتیان وەرگرتووە زیاتر هیدایەتیان پێدەبەخشین و لەسەروو ئەمانەشەوە تەقوا و خواپەرستییان بۆ ئاسان دەکەین.

ئیماندار لە هەموو ڕووداو و هەڵسووڕاندنەكانی ژیانیدا بەردەوام باسی خوا و دەسەڵات و ویست و ئیرادەی ڕەهای ئەو لە بیروهۆشیدا دەبێت، بۆیە بە دڵ و زمان و ئەندامەكانی لاشەی بەردەوام ڕووی لەوە و لەگەڵ ئەودایە، ئەوەش بۆخۆی ناوەڕۆكی بەندایەتییە بۆ خوا، هەر ئەمە وەسفی دوو پێغەمبەری خوایە لە قورئاندا كە یەكێكیان (أیوب)ە ﵇ و چەندەها ساڵە خاوەن بەڵایە، وە یەكێكیشیان (سلیمان)ە ﵇ كە خاوەنی هەموو دەسەڵات و خۆشییەكە، تەنانەت بە ئاسماندا دەڕوات و باڵندە و بوونەوەرەكان و جنەكان لەژێر دەسەڵاتی ئەودان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نە بەڵاكەی ئەو و نە نیعمەتەكانی ئەم بێئاگا و سەرقاڵی نەكردن و نەیترازاندن لە باس و زیكر و عیبادەت و بەندایەتی بۆ خوا، بۆیە بە یەك وەسف خوای پەروەردگار ئەم دوو پێغەمبەرە خاوەن خۆشی و ناخۆشییە وەسف دەكات بە وەسفێكی ژیانی دڵی لەگەڵ خوای خۆیاندا كە دەفەرموێت: ﴿نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ [ص: ٣٠، ٤٤]. باشترین بەندەی منن، بەردەوام لەگەڵ مندا بە دڵ دەژیان و ڕووی دڵییان لە من ئاوا نەدەبوو.

### ٣. هۆكاری دروستبوونی پشتبەستن و ئومێدە بە خوا (صحة التوكل والرجاء على الله عزوجل):

پشتبەستن بە خوا ناوەڕۆكی عیبادەتە و ئەم پشتبەستنە نایەتەدی هەتاوەكوو باوەڕ و ئیمان بە قەدەر بەشێوەیەكی دروست بوونی نەبێت لە عەقیدە و (توحید)ی بڕواداردا.

(توكل) لە زمانی شەرعدا واتە بە دڵ ڕووكردنە خوا لەكاتی ئەنجامدانی كارەكاندا و ئومێد پەیوەستكردن پێوەی و پاشان گرتنەبەری هۆكار و ڕێگاكان، لەگەڵ ئامادەبوون بۆ ڕازیبوون بە ئەنجامەكان گەر بە هەرلایەكدا بێت، ئەمە ڕاست و دروستی نهێنی پشتبەستنە بە خوای پەروەردگار (التوكل).

یارمەتیدەرێك بۆ دروستبوونی (التوكل) ئەو ڕێگایەیە كە تاوەكوو خاوەنەكەی شارەزایی و خوێندنەوەی ووردی بەسەر نهێنییەكانی قەدەردا هەبێت؛ پشتبەستنەكەی بە خوا كامڵ و تەواو و نوێكارتر دەبێت لە هەموو ئان و سات و جۆری كارەكاندا.

وە چاوكراوەتر دەبێت بەسەر خۆی و گرتنبەری هۆكارەكان و ئەنجامی كارەكاندا و خوێندنەوەی بۆی بەشێوەیەكی پڕ بە واقع و دروستی خۆی دەبێت، بە جۆرێك خاوەنەكەی نە دەبێتە بەندەی هۆكارەكان و ئەنجامە دونیاییەكان، وە نە مردنیش بەدیار هێنانەدی خۆشییەكانی

دونیاوە، وە نە دڵیشی بەتاڵ و بێئاگا دەبێت لە یاد و عیبادەتی خوا، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿رِجَالٌ لَّا تُلۡهِيهِمۡ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيۡعٌ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ [النور: ٣٧]. واتە پیاوانێك هەن کە بازرگانی و کڕین و فرۆشتن بێئاگایان ناکات لە یادی خوا و ئەنجامدانی نوێژەکانیان، وەکوو (علي ابن أبي طالب) ﷛ دەفەرمویێت: «فَكُونُوا مِنْ أَبْنَاءِ الْآخِرَةِ، وَلَا تَكُونُوا مِنْ أَبْنَاءِ الدُّنْيَا، فَإِنَّ الْيَوْمَ عَمَلٌ وَلَا حِسَابٌ، وَغَدًا حِسَابٌ وَلَا عَمَلٌ»[(١)]. لە کوڕانی دوارۆژ بن و لە کوڕانی دونیا نەبن، لەبەرئەوەی ئەمڕۆ کارکردنتان لەسەرە و لێپرسینەوەی خوایی نییە، سبەی لێپرسینەوەتان لەسەرە و کارکردن نییە.

بۆ ئەم حەقیقەتەش پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: «لَوْ أَنَّكُمْ تَوَكَّلْتُمْ عَلَى اللهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ، لَرَزَقَكُمْ كَمَا يَرْزُقُ الطَّيْرَ، تَغْدُو خِمَاصًا، وَتَرُوحُ بِطَانًا»[(٢)].

واتە: ئەگەر ئێوە بە ڕاستی و بە دروستی پشت ببەستن بە خوا ئەوا ڕزق و ڕۆزییەکتان دەدات وەکوو چۆن باڵندەکان بە سکی بەتاڵ دەڕۆنە دەرەوە و بە سکی پڕەوە دەگەڕێنەوە.

ئیماندار بە ڕێژە و بوونی بردنی گومانی باش بە خوای خۆی ئومێدی پێی بەهێزتر و زیاتر دەبێت، لەبەرئەوەی دەزانێت کە هیچ قەدەر و توانایەك نییە و بوونی نابێت بەبێ توانا و نووسینی پڕ دادپەروەری خوا و بەزەیی و هێنانەدی حیکمەتەکانی.

ئەمانەش هۆکارن بۆئەوەی بەندەکەی هیچ گازندە و سکاڵا و تۆمەتێك نەخاتە پاڵ خوا لە قەدەرەکانی، ئەمە دەبێتە هۆکاری هاوسەنگی هەموو حاڵەتەکانی ژیانی لە کاتی بەرزی و

(١) رواه البخاري (٨/ ٨٩) بَابُ فِي الأَمَلِ وَطُولِهِ، كِتَابُ الرِّقَاقِ، وأبو داود في "الزهد" (١٠٦)، وأحمد في "فضائل الصحابة" (٨٨١)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٤٤٩٥)، والبيهقي في "الشعب" (١٠١٣٠)، وأبو نعيم في "الحلية" (١/ ٧٦)، والبغوي في "شرح السنة" (١٤/ ٢٤٣)، ينظر "الجواب الكافي" ص٤١، و "الفوائد" ص٥١، و "إغاثة اللهفان" لابن القيم ص٧١.

(٢) رواه الترمذي (٢٣٤٤)، والنسائي في "الكبرى" (١١٨٠٥)، وابن ماجه (٤١٦٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٣٠)، وأحمد في "المسند" (٢٠٥) وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي، رجاله ثقات رجال الشيخين، والحاكم في "المستدرك" (٧٨٩٤) وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، والبزار في "المسند" (٣٤٠)، وأبو يعلى في "مسنده" (٢٤٧)، والطيالسي في "مسنده" (٥١)، والبيهقي في "الشعب" (١١٣٩)، وأبو نعيم في "الحلية" (١٠/ ٦٩)، والبغوي في "شرح السنة" (٤١٠٨)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٣١٠)، و "صحيح الجامع الصغير" (٥٢٥٤).

نزمییەکاندا و بەردەوام چاوەڕێی دەرگاکانی خوایە و ڕازییە بە بڕاردەکانی خوا بۆی و ئەرك و ناخۆشییەکانی سەر شانی سووك دەبێت، ڕزگاری دەبێت لە خەم و پەژارە و تاڵییەکانی خەفەت و بیرکردنەوە و سووتاندنی ساتەکانی ژیانی لەسەر ڕابوردوو و داهاتوو، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمویت: ﴿ لِّكَيْلَا تَأْسَوْاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ ﴾ [الحَدِيد : ٢٣]. واتە تاوەکوو خەم و پەژارەکانتان لەسەر ڕابووردوو نەبێت و خۆشحاڵی و کامەرانی و بێ ئاگایی تووشتان نەبێت لەسەر نیعمەتەکان، گەر وا بکات بەردەوام لە لوتکەی ئومێد و سەرفرازیدا دەژی و چاوەڕێی خوای پەروەردگارییەتی چی لێ بوێت و چی پێبکات و چۆنی هەڵدەسووڕێنێت بە ویست و ئیرادەکانی خۆی، بە کورتی ژیانی لەگەڵ خوادا بوونی دەبێت.

### ٤. دروستبوونی جۆرەها عیبادەتی وەك: (الشكر والرضا والخوف من الله تعالى):

ئیماندار بە قەدەر دەزانێت هەر نیعمەتێك بۆی بێتە پێش بە تەنها لەلایەن خواوەیە، وە هەر ئەویش لابەری هەموو ناخۆشییەکانە، ئەم زانینەی دەبێتە هۆکاری سوپاسگوزاری بۆ خوا بەتەنیا، گەر خوای پەروەردگار خۆشحاڵی کرد بە نیعمەتێك دەزانێت کە هەر لەلایەن ئەوەوەیە، وە ئەو خاوەنیەتی، وە ئەمیشی پلەدار کردووە بەو نیعمەتە، وە ئەگەر کارێکی ناخۆشی هێنا بەسەریدا ئەوا هەر سوپاسگوزارە بۆی، بەردەوام لە هەوڵی داپۆشینی ڕق و بێتاقەتی و سکاڵاکانیەتی بەرامبەر بە خوای خۆی، تاوەکوو ڕەوشت و ئەدەبێکی جوان بنوێنێت لەگەڵ خوادا، ئەمەش بە هۆکاری ئەو عیلم و زانستەی کە هەیەتی لە بواری عەقیدەدا وای لێکردووە ئەدەب پارێزبێت لەگەڵ خوای خۆیدا و سوپاسگوزار بێت لە خۆشی و ناخۆشییەکانیدا، ئەگەرچی سوپاسگوزاری لەسەر ناخۆشییەکان قورس و زەحمەتە دروستکردنی، لەبەر شکاندنی نەفس و زاڵبوونی دونیا، بەمە دەزانین شوکرانەی خوایی بەرزترە لە ڕازیبوون، وە سوپاسگوزاری خوا هۆکارە بۆ بەستنەوەی نیعمەتە بەخشراوەکان، وە ڕاوکردنی نیعمەتە نەهاتووەکانە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمویت: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾ [إبراهيم : ٧]. وە شوکرانەی خوایی لەسەر نیعمەتەکان لە نیعمەتەکان گەورەترە، ئەگەر هەموو دونیاش بێت، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: «مَا أَنْعَمَ اللهُ عَلَى عَبْدٍ نِعْمَةً فَحَمِدَ اللهَ عَلَيْهَا، إِلَّا كَانَ ذَلِكَ الْحَمْدُ أَفْضَلُ مِنْ تِلْكَ النِّعْمَةِ»[1].

---

(١) رواه الطبراني في "الكبير" (٧٧٩٤)، والبيهقي في "الشعب" (٤٠٩٣)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٥٥٦٢).

واتە: گەر خوای پەروەردگار هەر نیعمەتێك ببەخشێت بە بەندەکەی و ئەویش سوپاسی خوای لەسەر بکات؛ ئەوا ئەو سوپاسگوزارییەی بەرێزترە لای خوا لە نیعمەتەکەی کە پێی بەخشیوە.

ئەگەرچی ڕازیبوونیش لە خوا دەرگایەکی گەورەیە و بەهەشتێکی سەر ڕووی دونیایە و خۆشی دڵی خواناسانە و بەختەوەری و بیلبیلەی عابید و خواپەرستانە و بێگومان ڕازیبوونی عەبدەکان لە خوا پاشماوە و بەرهەمی ڕازیبوونی خوایە لە عەبدەکانی ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ﴾ [التَّوۡبَةِ : ١٠٠].

بە (يحى ى كوڕی معاذ)یان رَحِمَهُ ٱللَّهُ وت: «مَتَى يَبْلُغُ الْعَبْدُ إِلَى مَقَامِ الرِّضَا؟ فَقَالَ: إِذَا أَقَامَ نَفْسَهُ عَلَى أَرْبَعَةِ أُصُولٍ فِيمَا يُعَامِلُ بِهِ رَبَّهُ، فَيَقُولُ: إِنْ أَعْطَيْتَنِي قَبِلْتُ. وَإِنْ مَنَعْتَنِي رَضِيتُ. وَإِنْ تَرَكْتَنِي عَبَدْتُ. وَإِنْ دَعَوْتَنِي أَجَبْتُ»[(١)].

واتە: چ کاتێك عەبدێکی خوا دەگاتە پلەوپایەی ڕازیبوونی خوایی؟ وتی: ئەگەر چوار بنەمای بەسەر خۆیدا جێبەجێکرد لە مامەڵەکردن لەگەڵ خوادا، هەرکاتێك وتی: ئەگەر پێت بەخشیم وەریدەگرم، وە ئەگەر پێت نەبەخشیم ڕازی دەبم، وە ئەگەر وازت لێهێنام دەتپەرستم، وە ئەگەر بانگت کردم وەڵامت دەدەمەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا دەرچوونی هیچ عەبدێك نییە لە قەدەرەکانی خوا گەر ڕازیبێت یاخود ڕازی نەبێت، خۆ ئەگەر ڕازی بێت ئەوا هاتووە بەسەریدا و بەر ڕازیبوونی خوایی دەکەوێت، وە ئەگەر ڕازی نەبێت؛ ئەوا هەر هاتووە بەسەریدا، بەڵام بەر ناڕازیبوونی خوایی دەکەوێت.

لەگەڵ ئیمان بە قەدەریش ترسان لە خوا لە ئادەمیزاددا ناڕەوێتەوە، لەبەرئەوەی دەزانێت کە دڵی بەندەکان لە نێوان دوو پەنجەی پەروەردگاردایە، چۆنی بوێت ئاوا هەڵی دەسووڕێنێت و دڵنیا نییە لە خۆی و لە کۆتایی کردەوەکانی زۆر دەترسێت و نازانێت پەروەردگاری چی پێدەکات، دەترسێت بکەوێتە ژێر باری تاقیکردنەوەیەکی خوایی و لێی دەرنەچێت، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٩٩﴾

(١) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٧٢).

[الأعراف : ٩٩]. واتە ئەوە دڵنیان و بێباکن لە تاقیکردنەوەی خوایی؟ کەسێك ئەمین و بێباکە لە تاقیکردنەوەی خوایی کە کەسانێکی خەسارۆمەندن.

حاڵی ئیماندار ئەوەیە کە بەردەوام لە کاردایە و دەترسێت، بەڵام تاوانباریش بێ کارە و پاڵی داوەتەوە و ئومێدی بۆ خۆی دروستکردووە، گەر سەیری کۆتایی (إبلیس)ی عابید و عابیدەکەی (بني إسرائيل) و فیرەقە گومڕاکان ... وە ئەوانەی باوەڕیان نەهێناوە بکەین؛ دەبینین زۆر لە تۆ وریاتر و عاقڵتر بوون بۆ دونیا و سیفەتی کارامەییان تێدا بووە، لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانیوە ئیمان بێنن، هەروەك یەکێك لە خواناسان کوڕەکەی ئاواتی دەخواست کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بژیایە، باوکیشی پێی وت: ڕۆڵە زۆر لە تۆ عاقڵتر و کامڵتر هەبوو لەو سەردەمەدا ژیا و کاتێك پێغەمبەری ﷺ بینی نەیتوانی باوەڕی پێبێنێت.

ئەمانە بۆخۆیان وریاکەرەوەی ئیماندارانە بۆ سوپاس و ستاییشکردن و دروستبوونی ترس و ئومێد (الخوف والرجاء) و کارکردن لە بازنەی بەندایەتی خوادا.

## بەرهەم و کاریگەرە ڕەوشتییەکان
## الثمرات الأخلاقيـة

باوەڕبوون بە قەدەر بەرهەمێکی ڕەوشتی ڕازاوەی جوان دەڕەخسێنێت بۆ ئیماندار و بەرگی زێڕین و بەها و قەدری ئیمانداری دەنەخشێنێت لەبەریدا، دەیکاتە خاوەن دەروونی پاك و ڕەوشتی جوان و لەخۆگری هەڵسوکەوتی کامڵانە و دامەزراوی و لەسەرخۆیی و دروستبوونی کەسایەتی تایبەتی و نموونەیی بۆ چواردەوری، لەبەرئەوەی شتەکان بە ناوەڕۆکەوە دەبینێت و لە قووڵایی و دووربینییەوە دەڕوانێتە بوونەکان، لەو ئاکارە جوانانەی کە لە ئەنجامی باوەڕبوون و شارەزایی وورد لە قەدەردا بۆ ئیماندار دروستدەبێت ئەمانەن:

### ١. ئارامگرتن (الصبر):

یەکێك لە بەرهەمەکانی ئیمان بە قەدەر بەدەستهێنانی ئارامگرتنە لەسەر سەختییەکانی ژیان بە دڵێکی ئارام و نەفسێکی بەرز و هیوایەکی دڵنیاوە، کە دەبێت هەوری غەم و پەژارە هەر بڕەوێتەوە و ڕنهێنییەکانی ئەم ناخۆشیانە دەرکەوێت و ڕۆژی خۆشییەکان و پاداشتەکانی بێتە دی.

ئارامگرتن ئەگەرچی تاڵە وەکوو تاڵی دەرمان، بەڵام بەرهەمەکانی زۆرن و بەنرخ و پایەبەرزن بۆ خاوەنەکەی.

وەکوو ئیمامی (أحمد) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: الصَّبْرُ فِي الْقُرْآنِ فِي نَحْوِ تِسْعِينَ مَوْضِعًا[١].

واتە: لە نەوەد شوێنی قورئاندا باسی ئارامگرتن هاتووە.

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَهُوَ وَاجِبٌ بِإِجْمَاعِ الْأُمَّةِ ... فَإِنَّ الْإِيمَانَ نِصْفَانِ: نِصْفُ صَبْرٍ، وَنِصْفُ شُكْرٍ. وَهُوَ مَذْكُورٌ فِي الْقُرْآنِ عَلَى سِتَّةَ عَشَرَ نَوْعًا[٢].

واتە: بە کۆدەنگی زانایان ئارامگرتن واجبێکی دینییە، وە هەموو دینیش دوو بەشە، بەشێکی ئارامگرتنە و بەشێکی سوپاسگوزارییە.

وە بە شانزە شێوە و جۆر باسی ئارامگرتن داڕێژراوە لە قورئاندا، بەشێوەی فەرمانپێکردن و قەدەغەکاری لە گرتنەبەری ڕێگە پێچەوانەکانی، وە بە شێوازی وەسفی خاوەنەکانی و دەربڕینی خۆشەویستی خوا بۆی، وە بە وادەی لەگەڵدابوونی خوایی بەتایبەت بۆ خاوەنەکەی، وە وادەی پاداشتی بێ سنوور و موژدە و متمانە بۆ خاوەنەکەی لەگەڵ پەیوەستکردنی بە پلەکانی ئیسلام و ئیمانەوە ... .

وەك دەڵێن ئارامگرتن لە ئیماندا وەکوو سەر وایە لە جەستەدا، وە ئیمان بەبێ ئارامگرتن نییە، وەکوو چۆن جەستە بەبێ لاشە نییە[٣].

خەلیفەی بەڕێز (عمر بن الخطاب) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەفەرموێت: خَيْرُ عَيْشٍ أَدْرَكْنَاهُ بِالصَّبْرِ[٤].

واتە: بە ئارامگرتن خۆشترین ژیانمان بۆ ڕەخساوە.

ئارامگرتنیش دوو جۆرە: الصبر نوعان: اختياري واضطراري، والاختياري أكمل من الاضطراري[٥]. جۆرێکی بە ویست و ڕەزامەندی خۆت دەبێت، وە جۆرێکیش بە زۆرەملێ دروستدەبێت، جۆری ئارامگرتن بە بژاردەی خۆت باشتر و تەواوترە و پاشماوەی بەبەرەکەتترە، بەڵام ئارامگرتنی زۆرەملێ و بە ناچاری ئەمە لە ڕیزبەندی ئارامگرتنا نییە و دەبێت لە کۆتاییشدا تاڵی کارەکە بچێژێت و باجی نارازییەکانیشی بدات.

---

(١) (٢) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٥١).

(٣) "عدة الصابرين" لابن القيم ص١١١.

(٤) "مدارج السالكين" لابن القيم (٢/ ١٥٣).

(٥) "عدة الصابرين" لابن القيم ص٣٣.

هەر ئەوەندە بەسە کە خوا موژدە بە ئارامگران دەدات و دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ [آل عمران: ١٤٦]. واتە خوای پەروەردگار ئارامگرانی خۆشدەوێت، وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ [البقرة: ١٥٣]. واتە خوای پەروەردگار لەگەڵ ئارامگراندایە، وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ۝١٠﴾ [الزمر: ١٠]. واتە ئارامگران پاداشتی بێ پێوانەییان پێدەبەخشرێت.

(الحسن البصري) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: الصَّبْرُ كَنْزٌ مِنْ كُنُوزِ الْخَيْرِ، لا يُعْطِيهِ اللهُ إِلا لِعَبْدٍ كَرِيمٍ عَلَيْهِ[1].

واتە: ئارامگرتن کەنزێکە لە کەنزەکانی خێر، خوا نایدات بە کەسێك بێجگە لە بەندەیەکی بەڕێزی تایبەتی خۆی نەبێت.

### ٢. دامەزراوی و دلێری و وورەبەرزی (الثبات والشجاعة وعلو الهمَّة):

لە بەرهەمە ڕەوشتییەکانی باوەڕبوون بە قەدەر بەخشینی دامەزراوی و خۆڕاگرییە لە بەرامبەر ڕووداوەکاندا و بەرهەڵستیکردنیان و ڕووبەڕووبوونەوەیان بە وورەیەکی بەرز و دلێرییەکی بەتوانا و دوور لە داچلەکاندن و ترسنۆکی و خۆخواردنەوە، لەبەرئەوەی ئیماندار باوەڕی بەوەیە کە ڕزق و تەمەنی دیاریکراوە و نەگۆڕە و هیچ ڕووداوێك گۆڕانکارییان لەسەر دروست ناکات، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «... وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ لَكَ، وَلَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الأَقْلَامُ وَجَفَّتْ الصُّحُفُ»[2].

واتە: ئیماندار دڵنیایە لەوەی ئەگەر هەموو خەڵکی کۆببنەوە لەسەر ئەوەی سوودێکی پێبگەیەنن؛ سوودی پێ ناگەیەنن بێجگە لەوەی کە خوا لەسەری نووسیوە، وە گەر کۆببنەوە لەسەر ئەوەی زیانێکی پێ بگەیەنن؛ زیانی پێ ناگەیەنرێت بێجگە لەوەی کە خوا لەسەری نووسیوە، وە دڵنیایە لەوەی کە تووشی بووە بە هەڵە تووشی نەبووە.

---

(١) "عدة الصابرين" لابن القيم ص٩٥.

(٢) رواه الترمذي (٢٥١٦) وقال: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وسبق تخريجه ص٥٣.

باوەڕبوون بە قەدەر هۆکاری وورەبەرزی و خۆ دانەنەواندن و خۆ بەدەستەوەنەدانی ڕووداوەکانە، بەڵکوو باشتر و دلێرانەتر هەوڵ و کۆشش دەکات بۆ بەرەنگاربوونەوە و گرتنەبەری هۆکارەکانی ڕەواندنەوەی بەڵاکان و لادانیان لەسەری، قەدەر ناکاتە بەڵگەی تەسلیم بوون، بەڵکوو گرتنەبەری قەدەری تر دەکاتە بەڵگەی ڕەواندنەوە و هیوا و ئومێد بەخشینی.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «... احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ بِاللهِ وَلَا تَعْجَزْ، وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ، فَلَا تَقُلْ لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ قَدَرُ اللهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ»(١). واتە هەوڵ و کۆششی تەواو بدە لەسەر سوودمەندییەکانت و مەڕووخێ، وە ئەگەر کارێکت تووش بوو مەڵێ ئەگەر ئەوە بووبوایە ئەوە دەبوو، بەڵکوو بڵێ خوا چی داناوە و ویستی لەسەرە هەر ئەوە دەبێت.

### ٣. خۆ بەکەم زانین و بەخشندەیی و ئیرەیی نەبردن (التواضع والكرم والسلامة من الحسد):

بەرهەمێکی تری باوەڕبوون بە قەدەر خۆ نەنواندنە لە ئاستی نیعمەتەکانی خوا، گەر هەرچەندە و هەرچۆنێك بێت خۆی بە خاوەنی ڕاستەقینەی نیعمەت و بوونەکان نازانێت، وەکوو (قاروون) نالێت: ﴿أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓ﴾ [القَصَص: ٧٨]. بە وریایی و بلیمەتی و شارەزایی خۆم بەدەستم هێناوە، بەڵکوو وا هەست دەکات کە خوا ئەم نیعمەتانەی پێبەخشیوە بۆ تاقیکردنەوە و دینداری و خزمەتی دینە، وە هەستی وایە کە باری شانی قورسترە لە کەسانی تر، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗ﴾ [الأنبياء: ٣٥]. تاقیتان دەکەینەوە بە خۆشی و ناخۆشییەکان.

ئیماندار بەردەوام زمانی شوکرانەبژێری و بەکارهێنانی لە پێناوی ڕەزامەندی (خالق)ی خۆی و نیعمەتەکانی؛ کاری ڕۆژانەیەتی، وە باوەڕی وایە ئەم نیعمەتانە کاتییە و ژیانی دونیای پێ دەگوزەرێنێت و بە ڕووتی هاتووەتە دونیا و بە ڕووتیش دەگەڕێتەوە، وە بەخشندەیی و دەروون فراوانی پەیوەستییەکی نەبڕاوەیە پێوەی، وە ڕەزیلی و دەست نوقاوی و گرتنەوە کارێکی نەخوازراوە لای، لە نەخۆشییەکانی وەك ئیرەیی و چاوبڕینە سەروو خۆی و گازندە و گلەییکردن

---

(١) رواه مسلم (٢٦٦٤)، وسبق تخريجه ص٣٤٣.

و کوڕووزانەوە سەلامەت و بەرییە، ئەمە کاری ئیمانداره بە قەدەر.

## بەرهەم و کاریگەرە دەروونییەکان
## الثمرات النفسية

لە ئەنجامەکانی باوەڕبوون بە قەدەر بەرهەمە دەروونییەکانە لە ئاسوودەیی و دڵ فراوانی و ئارامی دڵ و دەروون، کە بۆخۆی هەموو ژیانی ئادەمیزاد لەسەر ئەمە بەندە و بنەمای هەموو کارەکانە، لەو بەرهەمە دەروونیانەش:

### ١. نەمانی بێ ئومێدی (عدم اليأس):

باوەڕبوون بە قەدەر دەروونێکی ئومێد بەخش دروستدەکات لای ئادەمیزاد، کە بە ئەگەر و خۆزگەکانەوە (لَوْ، لَيْتَ) ناژێت، وە دەبێتە هۆکاری ڕەواندنەوەی ئەو دڵەڕاوکێ و گومان و هات و هاوار و هەڵپەکاری دونیایەی کە لە ناخیدا هەیە، کە هەموو کات هەر هاوار و دەنگێك بێت وا هەست دەکات کە بۆ ئەو هاتووە و لەسەر ئەوە و پشت شکێنەریەتی ﴿يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ عَلَيۡهِمۡ﴾ [المنافقون: ٤]، وە خاوەن ئیمان بە قەدەر هەڵگری خەمی ڕابوردوو و ئێستا و داهاتوو نییە و بوونی ئێستاشی گۆڕانکاری ڕابوردووی و خەمی داهاتووی لەسەر نییە: ﴿لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡ﴾ [الحديد: ٢٣].

بۆیە بێ ئومێدی ژەهرێکی کوشندەیە و بەندیخانەیەکی تاریکە و نەفس سەرقاڵکردنە لە هەوڵدان، وە هۆکاری لادانە لە خێر و تاڵکردنی ژیانە و داچوون و ڕۆچوونە بە ناخی خۆیدا.

بەڵام کەسی ئیماندار بە قەدەر و باوەڕبوو بە باڵادەستی پەروەردگاری بێ ئومێدی ناناسێت و بە وەسوەسەیەکی شەیتان و لاوازی و ڕووخاندنی دەروونی و نەخۆشی دەزانێت، وە بەردەوام گەشبینە و چاوەڕێی ڕزگاربوون و دەرگاکردنەوەیە و دڵنیایە سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتندایە و لەگەڵ هەموو ناخۆشییەك چەندەها خۆشی هەیە ﴿إِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرٗا﴾ [الشرح: ٦].

وە دواڕۆژ هەر بۆ ئیماندارە، وە لە بەرامبەر قەدەرەکانی خوادا زاڵبوون و باڵادەستی نییە، وە ڕاست و دروستی کارەکان هەر لای خوایە و هەر ئەو خاوەنیەتی و هەموو ڕووداو و کارەکان پڕن لە حیکمەت و ڕەحمەتی بێشوماری پەروەردگار بۆ ئیماندار کە پێی نازانێت، وە هەستدەکات بوونی ئەم ڕووداوانەی سەری پێویستی بە کاری ترە لە عیبادەتەکان، هەر لە دوعا و نوێژ و خێر

و ڕووکردنە ئەو و داوا و پەناپێبردن و نزیکبوونەوەی زیاتر لێی کە هۆکاری ڕەواندنەوەیانە.

**٢. ڕازیبوون بە بەشی خۆت و نەفس بەرزی (القناعة وعزة النفس):**

ئیماندار بە قەدەر لەدوای گرتنەبەری هۆکارەکان ئەوکات باوەڕی وایە کە ڕزقی ئەو هەڵپەی هەڵپەکاران نایبات، وە چاوتێبڕینی ئیرەییکاران ڕێگری لێ ناکات و خۆی و تواناکانی سنووردارن و نیعمەتەکانی بەگوێرەی پێویستییەکانیەتی لەلایەن خواوە: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا ۝٢﴾ [الفرقان: ٢]. هەموو شتەکان بە ڕێژەی دیاریکراوی خۆی دروستکراوە و ڕەخسێنراوە، ئالێرەدا ئیماندار ڕازیبوون و قەناعەتی تەواوی بۆ دروستدەبێت بەوەی پێی بەخشراوە، بۆیە تەنانەت هەوڵدانەکانی بە شێوازێکی جوان و دوور لە منەت و کۆیلەیی خەڵك دەبێت.

خاوەن قەناعەت نەفس بەرز و بە ویقار و هەیبەت و ڕێزدارە لە بەرچاوی هەموو کەسدا، وە خۆشەویستە لە دڵی خەڵکیدا، وە بەردەوام سەربەرز و پڕ ڕێز و ئازادە لە بچووکبوونەوە و زەلیلی دەستی خەڵك و لە ڕێگەی خۆهەڵواسین و چەورەیی و بەدواکەوتنی ئەم و ئەودا نابینیت.

ئیمانداری ڕازیبوو بە قەدەر و بەشەکانی خوا لە جیهانێکی پڕ لە ئاسوودەیی و نەفس بەرزی و خاوەن خۆیەتیدا خۆی دەبینیت، ئەو بەس خوا دەناسێت بۆ عیبادەت و داواکردن و بەندایەتی و بچووکبوونەوە، لەپاش ئەو هەمووی بەندەی ئەون و لەژێر باری قەدەری ئەودان، (مخلوق)ن و (خالق) نین.

**٣. بەتوانایی بەرگەگرتن و هاوسەنگیبوون لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا (قوة الإحتمال والإعتدال حال السراء والضراء):**

باوەڕبوو بە قەدەر بەهێزترین دەروونی هەیە و زۆرترین بەرگەگرتنی هەیە و کەمترین گلەیی و دەربڕینی هەیە، هۆکارێکی سەرەکییە بۆ ئیماندار کە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کەسانی تردا کاتێك خراپە و هەڵەی بەرامبەر دەکەن قەدەر و ئاڵوگۆڕەکانی کردەوەی خۆی تیادا دەبینێت، کە دەشێت ئەم ڕووداوە هۆکاری کەمتەرخەمی و سزای هەڵەکانی بێت، یاخود مایەی پاکبوونەوەی بێت، یا نەخێر ئەمەش خێرێکی زیادەیە ڕووی تێکردووە، دەبێت بۆ خۆی ڕاوی بکات و خۆی بە شایستەی هەڵگرتنی ئەم کارە بزانێت کە گەورەکان بەڵای قورسیان بەسەردا دێت.

بۆیە دەبینین زۆری خۆکوشتن و لەناوبردن لەناو کەسانی بێبڕوا بە قەدەردا دەبینن، کە لە

پێناسەیاندا نە خواناسی هەیە، وە نە خۆناسین هەیە کە بەندەیەکی خوان و بۆ عیبادەت دروستکراون و بێ توانا و بێ دەسەڵات و هێزن لە ئاستی خوادا.

بوونەکانی ژیانیش لە دەوڵەمەندی و لەشساغی و دەسەڵات و زانایی، وە پێچەوانەکانیشی لە هەژاری و نەخۆشی و بێ دەسەڵاتی و هەموو بارودۆخەکانی ژیان هۆکاری تاقیکردنەوەن لای ئیماندار بە قەدەر، بۆیە بە هەستێکی وریاوە و ئامادەبوونێکی تەواوەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم بارودۆخانەدا دەکات، وە نیعمەت و پلەدارییەکان لەلای نابێتە هۆکاری خۆبەگەورەزانین و کامڵی و فەخرکردن بەسەر خەڵکیدا، وە ناخۆشییەکانیشی نابێتە هۆکاری بێ ئومێدی و ڕووخاندن و زەلیلی و خەم و پەژارەی ژیانی و نارازیبوونی لە خوای پەروەردگاری.

هەموو دونیا و دین یا سوپاسگوزارییە یا ئارامگرتن، ئەم دونیایە هەر ئەم دووانەی تێدایە، خۆ نابێتە مەلائیکە، بۆیە ئیماندار بە قەدەر شان دەداتە بەر هەموو قەدەرەکان و لەگەڵ ئەوەشدا بە تاقیکردنەوەیەکی دەزانێت کە بەردەوام دەترسێت مافی خۆی پێنەدا و تیایدا دەرنەچێت و مایەی تیاچوونی بێت، ئەوەندەی لە بیر و خەمی ڕازیبوونی خوادایە خۆی لەبیرکردووە، بۆیە خوا وەسفیان دەکات بە ﴿فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗ﴾ [النحل: ٩٧]. واتە ژیانی پڕ کامەرانی دەبەخشینە ئیماندار، وە بە پێچەوانەشەوە دەفەرموێت: ﴿وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا﴾ [طه: ١٢٤]. بێبڕوایان بە خوا و قەدەرەکانی خوا ژیانێکی پڕ خەم و پەژارە و ئاڵۆز دەدات بەسەریاندا.

هەموو سیفەتە کامڵەکان موڵکی خوایە و هەر بۆ خوایە و هەموو سیفەتە ناتەواوەکانیش موڵکی (مخلوق) و دروستکراوەکانە و هەر بۆ ئەوانە.

ئادەمیزادیش پێویستی بە خوا نابڕێت، نە لە ژیان و نە لە مردن و نە لەدوای مردنیش، خوای پەوەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ ٱلۡغَنِيُّ وَأَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ﴾ [محمد: ٣٨]، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦﴾ [العنكبوت: ٦]. خوا خاوەنی هەموو سیفەتە کامڵ و تەواوەکانە و هەر ئێوەش بەردەوام بێ دەسەڵات و هەژارن.

  

# بــەشــی دووەم

## سەرەتـای دروستبوونی بیروڕا لە قەدەردا و هۆکارەکانی

## نشأة القول بالقدر في الإسلام وأسبابه

خوای پەروەردگار ئادەمیزادی دروستکردووە و جیای کردووەتەوە لە گیانلەبەرانی چواردەوری بە عەقڵ و بیر و هۆش و ئیرادەی سەربەخۆی خۆی، لەگەڵ ئەو سیفەتانەی کە ڕایهێناوە لەسەری لە خۆشەویستی و زاڵبوون بەسەر چواردەوریدا و هەوڵ و تێکۆشان بۆ ڕێکخستنی ژیانی، لەگەڵ هەوڵدانی بۆ داهێنانی بەرنامە و ڕێگەی تازە و تازەتر بۆ تێگەیشتن و ڕۆیشتن لەسەری ...، کە ئەمانە بۆخۆی تایبەتمەندی ئادەمیزادی خاوەن بیر و هۆشە.

بۆیە هچ ئادەمیزادێك یاخود کۆمەڵگەیەك نییە خاوەن بیر و بەرنامەی جیاجیا نەبێت، هەرچەندە خاوەن شارستانیەت و کۆمەڵگا و خاوەن بیرمەندی ناودار بێت ... ئەمە سروشتی ئادەمیزاد و ژیانیەتی کە پەروەردگاری بۆی ڕەخساندووە و ڕایهێناوە لەسەری.

بەڵکوو بوونی ئەو سیفەتانە هۆکاری تاقیکردنەوەی خواییە لەسەریان و هەر بۆ ئەوەش دروستی کردوون: ﴿وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ۝١١٨ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ﴾ [هُود: ١١٨، ١١٩]. واتە بەردەوام لە ڕای جیاوازدان، مەگەر کەسێك ڕەحمەتی خوا گرتبێتییەوە و هەر بۆ ئەوەش دروستکراون، حیکمەتی وایە کە ئەو جیاوازییە ببێت، تاوەکوو هیدایەتدراو و گومڕا و جۆراوجۆرەکان لەیەك جیاببنەوە، وە شاراوەکانی ناو ناخ و چۆنیەتییەکانی ئادەمیزاد دەرکەوێت لە خێر و شەڕ، وە دادپەروەری و زانایی و دانایی خوا بۆ بەندەکانی ڕوونبێتەوە[1].

ئەو جیاوازی و دووبەرەکایەتییەش هەر بوونی هەبووە بە ئاشکرا، هەر لە دروستبوونی پێغەمبەر (آدم) ﷺ و کێشمەکێشی (إبليس)ەوە هەتا دوو کوڕەکەی ئادەم و پێغەمبەران لە (نوح وإبراهيم ولوط ويوسف) لەگەڵ کوڕ و خێزان و بنەماڵەکانیان ... هەتا کۆتایی دونیا هەر بووە و هەر دەمێنێت و تاقیکردنەوەیە لەسەرمان.

---

(١) "تفسير السعدي" ص٣٩٢.

ئەگەرچی جیاوازییەکان دوو جۆرن: یەکەم بۆ گەیشتنە بە حەق، کە بەرەو دووبەرەکایەتی و لاڕێیی و هەڵە نەبرێت، دووەمیش مەبەست پێی دووبەرەکایەتی و دژایەتی و گوێنەدان بێت بە ماف و حەقە ڕەواکان و درێژبوونەوە بێت لەسەر بەتاڵ (اختلاف تنوع واختلاف تضاد).

بە شێوەی دەرەنجام و بەرهەم و کۆتاییەکەی پێی دەوترێت (الإفتراق والإختلاف)، (الإفتراق) خراپترین جۆرە، لەبەرئەوەی نکوولّی و دژایەتی دەکرێت لەپاش زانین و ئاشنابوون بەسەر حەقەکەدا، لەو بنەما و بابەتە گەورانەدا دەبێت کە زۆر ئاشکرا و ڕوونن، وە هۆکارەکانیشی حەز و ئارەزووەکانی ئادەمیزادە، وە هەموو بەڵگەکانیان گومان و شاراوەکانە و ئەو کارانەش دەگرێتەوە کە شەرعی خوا ڕێگەی پێ نەداوە قسەی لەسەر بکرێت و هەڕەشەی لەسەرە، لەبەرئەوە خاوەنەکەی هیچ پاساوێکی نییە ... بەڵام (الإختلاف) بە پێچەوانەی (الإفتراق)ەوەیە، (الإختلاف) بۆ گەیشتن بە حەق و دەرکەوتنی ڕاستییەکانە بە ووردی، لەبەرئەوە دەوترێت: (أن كل افتراق اختلاف، وليس كل اختلاف افتراق)[1].

ئەگەرچی ئەو (الإفتراق) و دووبەرەکایەتییە دەبێت بوونی هەبێت لە قەدەری کەونیدا بە هۆکاری ئەو ئیرادە و مەبەستە خواییانەی کە لە پشتییەوەیەتی لە تاقیکردنەوەی بەندەکانی، بەڵام لە قەدەری شەرعیدا ئەو جیاوازییە و (الافتراق) و دژایەتییە ڕێگەپێدراو نییە، بگرە ڕێگری و هەڕەشەی لەسەرە، لەبەرئەوەی دەبێتە هۆکاری ڕێگری لە پێدان و بەدەستهێنانی ڕێگەی پڕ هیدایەت و عیبادەت و کامڵی دینی.

خوای پەروەردگار لە قەدەرە شەرعییەکەی خۆیدا بە چەند شێوازێك باس و ڕێگری لەو جیاوازی و دووبەرەکایەتییانە دەکات، وە داوای پاراستنی یەکڕیزی ئیمانداران و هەوڵدان بۆ شوێنکەوتەی حەق و ڕێگەکەی دەکات، لەو شێوازانەش[2]:

**١. بە شێوەی فەرمان بە یەکڕیزی و کۆدەنگی و نەبوونی دووبەرەکایەتی و جیاوازی (الأمر بالجماعة والنهي عن الفرقة):**

---

(١) "تناقض أهل الأهواء والبدع في العقيدة" لعفاف بنت حسن بن محمد (١/ ٤١)، و "دراسات في الأهواء والفرق والبدع" لدكتور ناصر بن عبد الكريم العقل (١/ ٣٧).

(٢) "موقف الصحابة من الفرقة والفرق" لدكتورة أسماء بنت سليمان السويلم ص١٢١ - ١٨٤، و "دراسات في الأهواء والفرق والبدع" لدكتور ناصر بن عبد الكريم العقل (١/ ٤٥، ٧٥).

ئەم دوو داواکارییە پەیوەستن بە یەکەوە (الأَمْرُ بِالشَّيْءِ نَهْيٌ عَنْ ضِدِّهِ)(١)، واتە فەرمان بە کارێك ڕێگرییە لە پێچەوانەکەی.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُواْ﴾ [آل عمران: ١٠٣].

واتە: پشتبەستوو بن بە بەرنامەی خواییەوە و جیاوازیکار مەبن.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ [الأنعام: ١٥٣]، ﴿أَنْ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِ﴾ [الشورى: ١٣].

واتە: شوێنکەوتەی ڕێگەی ڕاست بن و دوای ڕێچکەکانی تر مەکەون کە دەبێتە هۆکاری جیاکاریتان، وە شوێنکەوتەی دینی خوا بن و جیاوازی تیادا دروست مەکەن.

**٢. ئاگاداری ئیمانداران دەکاتەوە بە شێوەی باس و بارودۆخی خراپیان لە ئەنجامی دووبەرەکایەتی:**

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُواْ فِي ٱلْكِتَٰبِ لَفِي شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿١٧٦﴾﴾ [البقرة: ١٧٦].

واتە: جیاکاران لە دووبەرەکایەتی و دژایەتی حەق و خاوەنەکانیان لە بەرەیەکی دوور و جیاوازن بەرامبەر حەق.

❁ قَالَتَعَالَىٰ: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾﴾ [النساء: ١١٥]، ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ﴾ [الأنعام: ١٥٩].

واتە: ئەوەی لە بەرەی جیاکاری بێت لە پێغەمبەرەکەی لەپاش زانین و ئاشکرابوونی، وە ڕێگەی ئیمانداران نەگرێتە بەر؛ ئەوا ئەو ڕێگەیەی کە هەڵیبژاردووە دەیخەینە سەری و کۆتاییەکەشی بەرە و دۆزەخ و پاشەڕۆژی خراپ دەبیات، وە ئەو کەسانە پێغەمبەری خوا ﷺ و سوننەتەکانی بەرین لێیان و هیچ پەیوەندییەکیان پێوەی نابێت.

**٣. جیاکاری و جیاوازییەکان کار و سیمای بێبڕوایانە نەك ئیمانداران:**

---

(١) "روضة الناظر وجنة المناظر" لابن قدامة (٢٥)، و"مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/٣٦٨).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾﴾ [آل عمران: ١٠٥]، ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا﴾ [الروم: ٣١، ٣٢].

واتە: هاوشێوە و شوێنکەوتەی بیرِوایان مەبن کە کاریان جیاکاری بوو لەپاش زانینی هەموو حەقەکان و رِێگەی دینداریيان پارچەپارچە و جیاواز دەکرد وەکوو گاوور و جوولەکەکان.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەربارەی ئەم ئایەتانە دەلێت: فأفاد ذلك بشيئين: **أحدهما:** تحريم الاختلاف في مثل هذا. **والثاني:** الاعتبار بمن كان قبلنا، والحذر من مشابهتهم[(١)].

واتە: دوو پەندی تێدایە بۆمان، یەکەم حەرامبوونی جیاکاری و دووەم پەند وەرگرتن لە کەسانی پێش خۆمان کە هاوشێوەیان نەبین.

**٤. جیاوازی نێوان موسوڵمانان مەبەست و ئاواتی دوورِوو و بێبرِوایانە:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ﴾ [البقرة: ١٢٠]، ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم﴾ [البقرة: ١٠٩]، ﴿إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا۟ بِهَا﴾ [آل عمران: ١٢٠].

واتە: دوژمنانی دین لە گاوور و جوولەکە رِازی نابن تاوەکوو شوێنکەوتەی ئەوان نەبن، بۆیە زۆریان پاشگەزبوونەوەتان لە ئیمان و بێبرِوابوون ئاواتیانە، وەکوو ئیرەیی و حەسوودییەکی ناخی خۆیان، تاوەکوو خاوەن و هەڵگری حەق و ئایینێکی دروست نەبن، وە هەرکاتێك خۆشییەك رِووتان تێبکات ئەوان دڵگران دەبن و بە ناخۆشییەکانتان خۆشحاڵ دەبن.

ئەمانە و لەگەڵ بوونە هۆکاری ئەو هەموو زیانانەی لەسەر تاکی ئیماندار و کۆمەڵ دەبێت، هەر لە بەرکەوتنی هەرِەشەی خوایی و رِوورِەشبوونی دوارِۆژ و نامۆبوونی لە دیندا و بێبەشبوونی لە شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ و ئاوی حەوزەکەی و وەرنەگرتنی تەوبە و کار و کردەوەکانی، لەگەڵ کردنەوەی رِێگەی زاڵبوونی شەیتان بەسەریدا و دەرچوونی لە دونیا و کۆتاییهاتنی لەسەر شێوەی نەفامی پێش ئیسلام.

---

(١) "اقتضاء الصراط المستقيم" لابن تيمية (١/ ١٤٥).

وە زیانی لەسەر کۆمەڵگەی موسوڵمانان زۆرە، هەر لە وەستانی کۆشش و جیهاد لە پێناوی دیندا و بگرە زاڵبوونی دوژمنان بەسەر موسوڵماناندا، وە هۆکاری شکستی و دواکەوتن و دروستبوونی بەرەیەکی پڕ لە دووبەرەکایەتی و دژایەتییە، لەگەڵ نەمانی هیچ برایەتی و یەکڕیزییەك بۆ ئیمانداران، وە ژێردەستەیی بوون و بێدەسەڵاتییەکی زۆر بە لەدەستدانی هەموو بەهایەکی دینی و دونیایی بۆ موسوڵمانان.

**هۆکارەکانی جیاوازی نێوان موسوڵمانان بۆ ئەمانە دەگەڕێتەوە[(١)]:**

یەکەم: هۆکارە ناوخۆییەکان.

**١. نەزانین (الجهل):** نەزانین بەسەر دین و مەبەستەکانیدا (مقاصد الشريعة)، بە هۆکاری بێئاگایی لە ڕێگە و شێوازی شارەزابوونی دین، لە زانستە شەرعییەکان (العلوم الشرعية) و زمان و ئاشنابوون بەسەر ناوەڕۆکی دارشتنی زمانی عەرەبی (اللغة العربية وعلومها)، بەشێکی زۆر لە نەزانینیش دەگەڕێتەوە بۆ کارنەکردن بە هەموو چمکەکانی دین.

**٢. شوێن نەکەوتنی قورئان و سوننەت و داهێنانی ڕێگەی گومڕایی (الإبتداع وعدم الإتباع).**

**٣. پێشخستنی ڕا و بیروبۆچوونەکان بەسەر فەرموودەی خوا و پێغەمبەردا ﷺ:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ [الحجرات: ١].

واتە: ئەی ئیمانداران لە ئاستی قورئان و سوننەتدا پێش مەکەون.

**٤. دەمەقاڵێ و قسەکاری لە دیندا بە پەنابردنە بەر گۆڕینی واتا و مەبەستە حەقەکانی دەقەکان:**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦ﴾ [آل عمران: ٧].

واتە: ئەوانەی کە دڵیان پڕە لە گومڕایی شوێنکەوتەی دەقە مانا هاوشێوەکانن بۆ دووبەرەکایەتی نانەوە و ترازاندنی مەبەستەکان.

---

(١) "موقف الصحابة من الفرقة والفرق" لدكتورة أسماء بنت سليمان السويلم ص١٨٨ – ٣٠٠.

**٥. ترازاندن و بەجێهێشتنی ڕێگە ڕاستەکە بەشێوەی زیادەڕەوی و کەمڕەوی تیایدا (الافراط والتفريط):**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾﴾ [المَائِدَة: ٧٧].

واتە: ئەی ئەهلی کیتاب لە گاوور و جوولەکەکان، زیادەڕەوی مەکەن لە ئایینەکەتاندا و شوێنکەوتەی حەز و ئارەزووەکانی ئەو کەسانە مەبن کە لەمەوپێش گومڕابوون و خەڵکێکی زۆریشیان گومڕا کرد.

**٦. دەمارگیری مەزهەبی و شوێنکەوتەی ناوداران و چینایەتی دروستکردن:**

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** فَكُلُّ مَنْ نَصَّبَ شَخْصًا كَائِنًا مَنْ كَانَ فَوَالَى وَعَادَى عَلَى مُوَافَقَتِهِ فِي الْقَوْلِ وَالْفِعْلِ فَهُوَ ﴿ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا ﴾ الْآيَةَ[1].

واتە: ئەوەی کەسێك دابنێت، گەر هەرکەسێك بێت و پشتیوانی و دژایەتی لەسەر کار و گوفتاری ئەو دابنێت؛ ئەوە لەو کەسانەیە کە دووبەرەکایەتی و جیاوازی لە دیندا دەنێنەوە و پارچەپارچەی دەکەن.

**٧. شوێنکەوتنی حەز و ئارەزووەکان (اتباع الهوى):**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ [صٓ: ٢٦]، ﴿أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴿٨٧﴾﴾ [البَقَرَة: ٨٧]، ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ﴾ [النَّجْم: ٢٣].

هەرسێ ئایەتەکە ڕێگری دەکات لە شوێنکەوتنی حەز و ئارەزووەکان و نەکردنە پێوەر بۆ کار و هەڵسەنگاندنی شتەکان.

**٨. شوێنکەوتە و لاسایی و هاوشێوەکاری لە چۆنیەتی کار و شێوازی بێبڕوایان و گومڕایان (التشبه بأهل الكتاب والكفار):**

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٠/٨).

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ﴾ [آل عمران: ١٠٥].

واتە: هاوشێوەی ئەوانە مەبن کە جیاوازی و دووبەرەکایەتییان دروستکرد لە دیندا لەپاش شارەزایی و ئاشنابوون بەسەر ڕاستییەکاندا.

۩ قال رسول الله ﷺ: «...وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَرْكَبُنَّ سُنَّةَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ»[١].

واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە شوێنکەوتەی بەرنامەی پێشووانی خۆتان دەبن.

بۆ جیاکاری لە نێوان حەق و بەتاڵدا خوای پەروەردگار بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾﴾ [الجاثية: ١٨].

ئەی (محمد) ﷺ لەسەر بەرنامە و شەریعەتێکی ڕاست و دروست تۆمان داناوە، شوێنکەوتەی حەز و ئارەزووی نەزانەکان مەبە.

**٩. خۆشەویستی دەسەڵات و دونیا و دەرکەوتن و ناوداری (حب السلطة والمكانة):**

❁ قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَمَا تَفَرَّقُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ﴾ [الشورى: ١٤]. قَالَ أَبُو الْعَالِيَةِ: بَغْيًا عَلَى الدُّنْيَا وَطَلَبَ مُلْكِهَا وَسُلْطَانِهَا[٢].

واتە: دووبەرەکایەتی و جیاوازییەکان لەپاش ئاشنابوون بە حەقەکان دروست بوون، بە مەبەستی ستەمکردن لە یەك و بەدەستهێنانی پلە و ماڵ و دەسەڵاتی دونیایی.

شەهیدکردنی خەلیفە (عثمان بن عفان) ﵁ لەلایەن عێراقی و میسرییەکانەوە لەسەر دونیا بوو، وە شەڕ و دژایەتییەکانی خەوارج لەگەڵ خەلیفە (علي بن أبي طالب) ﵁ هەر لەسەر دەسەڵاتی بەسرە و کوفە و عێراق بوو[٣].

وە ئەو شـەڕانەی کە ڕوویـاندا لەدوای (معـاوية بن أبي سـفيان) ﵁ بە درێـژایی مـێژووی

(١) رواه الترمذي (٢١٨٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٧٠٢)، وأحمد في "المسند" (٢١٨٩٧)، وأبو يعلى في "مسنده" (١٤٤١)، والطبراني في "الكبير" (٣٢٩١)، والمروزي في "السنة" (٣٧)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٧٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٠٥)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٥٤٠٨).

(٢) "تفسير الطبري" (٥/ ٢٨٣).

(٣) "تأريخ الطبري" (٣/ ٢١)، و "العواصم من القواصم" لمحب الدين خطيب ص١١٦.

ئەمەوییەکان هەر لەسەر دەسەڵات بوو، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی لەسەر داوە و فەرموویەتی: «هَلاَكُ أُمَّتِي عَلَى يَدَيْ غِلْمَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ»[(١)]. تیاچوونی موسوڵمانان لەسەر دەستی چەند گەنجێکی قورەیش دەبێت.

وە سەردەمی عەبباسییەکان بۆ سەرخستنی بیروڕای (موعتەزیلە)کان و عوسمانییەکانیش بۆ بیروڕای قەومییەتگەری و ڕێبازی (تصوف) بووە.

ئەمانە هەرە هۆکارە ناوخۆییەکان بوون بۆ دروستبوون و سەرهەڵدانی جیاوازی و دووبەرەکایەتی جۆراوجۆری تر لەناو موسوڵماناندا.

## دووەم: هۆکارە دەرەکییەکان.

لەدوای فراوانبوونی سنووری ئیسلامی و هاتنەناوەوەی گەلانی جۆراوجۆری دونیا، وە مانەوەی پاشماوەی ئایین و بیروڕاکانیان؛ بووە هۆکاری دروستبوون و سەرهەڵدانی چەندەها بیروڕای تێکەڵ لە ئیسلام و ئایینە پێشووەکان، لە کۆتاییدا بوونە بیروڕا و مەزهەب و ڕێبازی جیاواز لە یاسا و شەریعەتی ئیسلام، وەکوو (شیعة) لە ناوچە فارسەکان و (تصوف) لە ناوچە تورکەکان و (القرامطة) لە میسر و مەغریب ... .

هەموو ئەمانە و چەندەها بیروڕا و عورف و پاشماوەکانی ڕابوردوو بوونە هۆکاری دروستبوونی فیرەق و تاقمە گومڕاکان، کە بەدوای خۆیدا چەندەها لق و پۆپی جیاجیای لێبووەوە.

لەلایەکی تریشەوە دووڕوو و دوژمنانی ئەم ئیسلامە لە ناوداران و عەقڵە دینییەکان و گەلانی پێشوو کە ئیسلام هیچ شتێکی لە دین و دەسەڵاتی بۆ نەهێشتبوونەوە؛ کەوتنە پیلان دانان بۆ تۆڵەکردنەوە و گەڕانەوەی پاشماوەی ئایینی ڕابوردووی خۆیان، بە هەر جۆرێك بێت لە تێکەڵکردن و دروستکردن و تاشینی ئایینێکی تری جیاواز بۆ گەڕانەوەی شارستانی خۆیان لەژێر ناونیشانی (مذهب وطريقة)ی تازەدا.

بەتایبەت یەهوودییەکان کە ڕقەبەرایەتی و دژایەتییەکی زۆری ئیسلامیان دەکرد، بە حوکمی ئەوەی تێکەڵ بوون لەگەڵ عەرەبەکاندا لەڕووی ناوچەوە و نزیکی زمان و بنەمای دینی و

---

(١) رواه البخاري (٣٦٠٥)، وأحمد في "المسند" (٨٣٠٤)، والبزار في "المسند" (٩٦٣٠).

بنەماڵەیی و چوونەوە سەر پێغەمبەر و کوڕانی (إبراهیم) ﷺ، دژایەتی جوولەکەکان بۆ موسوڵمانان بووە هۆکاری دوورخستنەوەیان لەلایەن پێغەمبەری ئیسلامەوە ﷺ لە مەدینەوە بۆ تەبووك، وە بۆ جاری دووەم دوورخستنەوەیان بۆ شام لەلایەن خەلیفە (عمر بن الخطاب)ەوە ﷺ.

هەر لە سەردەمی گەرماوگەرمی ئیسلامدا بوونە هۆی هەڵگیرساندنی ئاشووب و لێخوێندنی دەسەڵاتی خەلیفەی سێیەم (عثمان بن عفان) ﷺ بە سەرۆکایەتی (عبد الله بن سبأ) کە جوولەکەی یەمەن بوو موسوڵمان بووبوو، تاوەکوو بیروڕا کۆنە جوولەکەییەکەی بووە هۆکاری دروستبوونی شیعە و هەموو جۆرە فیرەقە جیاجیاکانی.

وە دروستبوونی خەوارج و هەڵگەڕانەوەیان لە خەلیفەی چوارەم (علي بن أبي طالب) ﷺ و پاشان کاریگەرییان لەسەر دروستبوونی فیرەقەکانی (القرامطة والمشبه المجسمة والفرق الباطنية)، بە هێنانەدی بیروڕای (الرجعة والبداء والمهدي والأسباط ...) و تێکەڵبوونی بە بیروباوەڕی فیرەقە ئیسلامییەکان.

لەلایەکی تریشەوە گاوورەکان بە بڵاوکردنەوەی بیروڕای (الإتحاد والحلول والرهبانية ...)، وە ئەو (الجدل الكلامي)یە لەسەر (الأقانيم والقدر ...) و بابەتەکانی (النبوة وحرية الإرادة وطبيعة المسيح ...)[1] و تەنانەت بە بوونی کەسی ناوداریان لە دەوڵەتی ئەمەوییەکاندا، وەکوو (يحيى الدمشقي) و باوکی لە سەردەمی (عبد الملك بن مروان)، بۆیە کاریگەری بیروڕای لەسەر دروستبوونی (المرجئة والقدرية) هەبوو.

وە ڕەوڕەوەی وەرگێڕانیش چمکێکی کاریگەر بووە لە هاتنەناوەوەی فەلسەفەی یۆنانی و ڕۆمانییەکان لە سەردەمی (مأمون)دا لە بابەتەکانی (الإلهيات والطبيعيات والمنطق والفلك ...) کە وەرچەرخانێکی ڕاستەوخۆی بەدوای خۆیدا هێنا و بووە هۆکاری دروستبوونی فیرەقە کەلامییەکانی وەك (المعتزلة والقدرية والجبرية والأشاعرة والماتريدية ...)، وە دروستبوونی (ابن سينا وفارابي وإخوان الصفا ...)، ئەوانەی بابەتەکانی ئایین و عیبادەتیان تێکەڵ کرد بە فەلسەفە و تەصەوفەوە و بیروڕای (وحدة الوجود)یان هێنایە دی، وە لەڕووی دەسەڵاتیشەوە زیاتر لە سەد ساڵ (معتزلة)کانیان دەسەڵاتیان بردە سەر و زانایانی ئەهلی سوننەیان پێ ڕاونا و سەرکوتیان کردن.

---

(١) "القضاء والقدر" لعبد الرحمن بن صالح المحمود ص١١١.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە گومڕایی لە بواری "قسەکردن لە بیروباوەڕی ئیسلامیدا (البدع الاعتقادية القولية)" پێش گومڕایی "کار و کرداری عیبادەتی (البدع العملية)" بوونی هەبووە و هاتووەتە ناو موسوڵمانانەوە.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: فَالْبِدَعُ الْكَثِيرَةُ الَّتِي حَصَلَتْ فِي الْمُتَأَخِّرِينَ مِنْ الْعُبَّادِ وَالزُّهَّادِ وَالْفُقَرَاءِ وَالصُّوفِيَّةِ لَمْ يَكُنْ عَامَّتُهَا فِي زَمَنِ التَّابِعِينَ وَتَابِعِيهِمْ بِخِلَافِ أَقْوَالِ أَهْلِ الْبِدَعِ الْقَوْلِيَّةِ فَإِنَّهَا ظَهَرَتْ فِي عَصْرِ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ[1].

واتە: فیرەقە فەلسەفییەکان لە کۆتایی سەردەمی هاوەڵاندا دروستبوون، بە قسەکردن لەسەر (الأسماء والأحكام، والأسماء والصفات ...)، بەڵام بیدعەکاری لە بواری عیبادەتدا لە (الزهد والورع والتصوف ...) لە کۆتایی سەردەمەکانی ئیسلامدا دروستبوون.

وە دەڵێت: وَلَا رَيْبَ أَنَّ الْبِدَعَ كَثُرَتْ فِي بَابِ الْعِبَادَةِ وَالْإِرَادَةِ أَعْظَمُ مِمَّا كَثُرَتْ فِي بَابِ الِاعْتِقَادِ وَالْقَوْلِ[2].

واتە: بۆیە ئەمڕۆ ئەوەندەی بیدعەی عیبادەت بەربڵاوە لەناو موسوڵماناندا ئەوەندە بابەتە فەلسەفییەکانی عەقیدە و بیروڕا بڵاو نییە، لەبەرئەوەی نیەت و ئیرادەکان هەموو کەس خاوەنیانن و ئاسانکارییە بۆ کارکردن لەسەری، بەڵام قسەکردن و وتوویژی (منطق) و فەلسەفی بۆ کەسی تایبەتمەندی خاوەن عەقڵ و بیروڕایە.

وە هەموو ئەم بیروڕا لادراو و گومڕایانە لە سنوورە تازەکانی دەوڵەتی ئیسلامی سەری هەڵدا، هەر لە عێراق و خوراسان و شام و دیمەشق ...، بەڵکوو ناوجەرگەی ئیسلام هەر لە (مەککە و مەدینە و حیجاز و یەمەن ...) پارێزراو و سەلامەت بوون لە سەرهەڵدانی ئەم گومڕاییانە.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: فَأَمَّا الْأَعْصَارُ الثَّلَاثَةُ الْمُفَضَّلَةُ فَلَمْ يَكُنْ فِيهَا بِالْمَدِينَةِ النَّبَوِيَّةِ بِدْعَةٌ ظَاهِرَةٌ أَلْبَتَّةَ ... فَإِنَّ الْأَمْصَارَ الْكِبَارَ الَّتِي سَكَنَهَا أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَخَرَجَ مِنْهَا الْعِلْمُ وَالْإِيمَانُ خَمْسَةٌ: الْحَرَمَانِ وَالْعِرَاقَانِ وَالشَّامُ؛ مِنْهَا خَرَجَ الْقُرْآنُ

---

(١) (٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٩/ ٢٧٤، ٢٧٥).

وَالْحَدِيثُ وَالْفِقْهُ وَالْعِبَادَةُ وَمَا يَتْبَعُ ذَلِكَ مِنْ أُمُورِ الْإِسْلَامِ. وَخَرَجَ مِنْ هَذِهِ الْأَمْصَارِ بِدَعُ أُصُولِيَّةٍ غَيْرِ الْمَدِينَةِ النَّبَوِيَّةِ. فَالْكُوفَةُ خَرَجَ مِنْهَا التَّشَيُّعُ وَالْإِرْجَاءُ وَانْتَشَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فِي غَيْرِهَا. وَالْبَصْرَةُ خَرَجَ مِنْهَا الْقَدَرُ وَالِاعْتِزَالُ وَالنُّسُكُ الْفَاسِدُ وَانْتَشَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فِي غَيْرِهَا. وَالشَّامُ كَانَ بِهَا النُّصُبُ وَالْقَدَرُ. وَأَمَّا التَّجَهُّمُ فَإِنَّمَا ظَهَرَ مِنْ نَاحِيَةِ خُرَاسَانَ وَهُوَ شَرُّ الْبِدَعِ[1].

**واتە: لە سەردەمی هەرسێ سەدەکەی ئیسلامدا لە شاری مەدینە بیدعە و گومڕاییەکی ئاشکرا نەبووە، بەڵکوو لەو پێنج شوێنەی کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ تیایدا بڵاوبوونەوە، وە دینیان تیادا ڕاگەیاند و سەرچاوەی قورئان و فەرموودە و فیقە و عیبادەت بوون، هەر لە مەککە و مەدینە و بەصرە و کوفە و شام، بێجگە لە مەدینە و مەککە باقی شوێنەکانی تر بیدعە گومڕاییە عەقیدەییەکان سەریان هەڵدا تیایاندا، لە کوفە فیرەقی شیعە و خەوارجەکان و مورجیئەکان دروستبوون، لە بەصرە قەدەرییەکان و موعتەزیلە و تصوف دروستبوون. "بە ڕێگەی دەریاوە لە هندستان و ڕۆژهەڵاتەوە بیروڕای دەهرییەکان و عیبادەت و گۆشەگیری بوزا و ڕەهبانەکان گەیشتە بەصرە و لەوێوە بڵاوبووەوە بە جیهانی ئیسلامیدا".**

**وە لە شامیش (ناصبة)کان دروستبوون، ئەوانەی کە قسەیان بە (علي بن أبي طالب) ﵁ دەوت و لە دژایەتیکردنی شیعەدا کەوتنە گومڕاییەوە، بەدەر لەوەی کە بابەتەکانی قەدەری بە شێوەیەکی فەلسەفی تیادا ورووژا، بە هۆکاری سەر سنووری گاوور و پاشماوەی فەلسەفییەکانی یۆنان و ڕۆمانەوە، وە لە گۆشەی خوراسان بەشی ڕۆژهەڵات و سەر سنووری زەرادەشتییەکان و هندۆسیەکان بیروڕای جەهمییەکان کە باوەڕنەبوونە بە ناو و سیفاتی خوا و عەقیدەی (الجبرية) لە کرداردا دروستبوو، وە هەر لەو شوێنەوە پاشماوەی ئەستێرەپەرستییەکان سەری هەڵدا بەناوی (منجم) و بورجەکانەوە.**

**(ابن تيمية)** ﵀ **دەڵێت:** ومعلوم أن عصر الصحابة وكبار التابعين لم يكن فيه من يعارض النصوص بالعقليات، فإن الخوارج والشيعة حدثوا في آخر خلافة علي، المرجئة والقدرية حدثوا في أواخر عصر الصحابة[2].

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٠/ ٣٠٠، ٣٠١).

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٥/ ٢٤٤).

**وە دەڵێت:** ثُمَّ لَمَّا كَانَ فِي آخِرِ عَصْرِ الصَّحَابَةِ، فِي إِمَارَةِ ابْنِ الزُّبَيْرِ وَعَبْدِ الْمَلِكِ، حَدَثَتْ بِدْعَةُ الْمُرْجِئَةِ وَالْقَدَرِيَّةِ. ثُمَّ لَمَّا كَانَ فِي أَوَّلِ عَصْرِ التَّابِعِينَ فِي أَوَاخِرِ الْخِلَافَةِ الْأُمَوِيَّةِ حَدَثَتْ بِدَعَةُ الْجَهْمِيَّةِ الْمُعَطِّلَةِ وَالْمُشَبِّهَةِ الْمُمَثِّلَةِ. وَلَمْ يَكُنْ عَلَى عَهْدِ الصَّحَابَةِ شَيْءٌ مِنْ ذَلِكَ[1].

واتە: ئاشکرایە لە سەردەمی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیاندا دژایەتیکردنی دەقەکانی قورئان و فەرمووده بە بیرکردنەوە عەقڵییەکان بوونی نەبووە، بۆیە خەوارج و شیعەکان لە کۆتایی سەردەمی خەلیفەی سێیەمدا دروستبوون، وە مورجیئە و قەدەرییەکان لە کۆتایی سەردەمی هاوەڵاندا دروستبوون، لە سەردەمی دەسەڵاتی (عبد الله بن الزبير وعبد الملك بن مروان)دا بیدعە و گومڕایی مورجیئە و قەدەرییەکان هاتەدی و لە کۆتایی سەردەمی شوێنکەوتواندا (التابعين) کە کۆتایی خەلافەتی ئەمەوییەکان دەکات بیدعە و گومڕایی جەهمییەکان و (المشبهة)کان دروستبوون، کە سیفاتەکانی خوا دەشوبهێنن بە سیفاتەکانی ئادەمیزادەوە، هیچێك لەمانە لە سەردەمی هاوەڵاندا بوونیان نەبوو.

**ئەو شوێنانەی کە سەرەتا ئەم تاقم و فیرەقانەی تیادا سەری هەڵدا و دروستبوون[2]:**

١. **لە کوفە:** شیعە و ڕافیزەکان و درۆ هەڵبەستن لە فەرموودەدا و مورجیئەکان.

٢. **لە بەصرە:** قەدەرییەکان و موعتەزیلە و تصوف.

٣. **لە خوراسان:** جەهمییەکان و باوەڕنەبوون بە سیفاتەکانی خوا (تعطيل) و شوبهاندنی سیفاتەکانی خوا بە دروستکراوەکانییەوە (التشبيه)، بە پێچەوانەی (تعطيل)ەوە، وە (تنجيم) باوەڕبوون بە بورج و هەڵهاتن و ئاوابوونی ئەستێرەکان بۆ زانینی غەیب، خوراسان واتە ڕۆژهەڵاتی ئیسلام کە بناغەی سەرهەڵدانی هەموو ڕووداوەکانە.

٤. **لە شام و سەرووی عێراق:** (الناصبة)کان کە ئەهلی سوننەی زیادەڕەون لە دژایەتیکردنیان بۆ (أهل البيت)، لەگەڵ بوونی قەدەرییەکانیش.

٥. **لە میسر:** لەگەڵ کوفەدا شوێنی سەرهەڵدان و دەرچوون بوو لە خەلیفەی سێیەم (عثمان بن عفان) ﷺ، تا بە ستەم شەهیدیان کرد.

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٦/ ٢٣١).

(٢) "دراسات في الأهواء والفرق والبدع" لدكتور ناصر بن عبد الكريم العقل (١/ ١٩٠).

ئەم شوێنانە سیما و سەرەتا و لانەی سەرهەڵدان و دروستبوونی ئەم فیرەقانە بوو، بەڵام ئەوە ناگەیەنێت کە هەموو ئەو ناوچانە تێوەگلابێتن لەو فیتنانەدا، بەڵکوو لەگەڵ ئەوەشدا لانەی زانایان و خواناسان و ناودارانی ئەهلی سوننەت و بەرنامە پاك بوون، کە سەرتاپای زانست و ژیانیان تەرخان کردبوو بۆ پاراستن و گەڕانەوەی بەرنامەی پاکی ئیسلام و کۆشش و جیهادکردن لەپێناوی خوادا، بەڵکوو شارەزاترین و زاناترین کەس بەسەر بەرنامەی حەق و بیروڕا گومڕاییەکانی ئەو فیرەقانەدا زانایان و ناودارانی ئەو ناوچەیەی بوون و بەرامبەریان دەوەستانەوە.

**قۆناغەکانی سەرهەڵدان و دروستبوونی فیرەق بە شێوەیەکی گشتی بەم شێوەیە بوو[(١)]:**

**قۆناغی یەکەم:** نیوە سەدەی یەکەمی ئیسلام:

لەم سەردەمەدا هەرچییەك دروستبووبێت لە ئاستی تاکەکەسیدا بووە و لە کار و کردەوەیەکی عیبادەتی و بابەتێکی سادەدا بووە، بنەماکانی دین پارێزراو بوون لە بابەتە عەقیدەییەکان و غەیبییەکاندا، ئەم کار و هەڵە و گومڕاییانەش لە ئاستی دووڕووەکاندا یاخود دیندارە نەزانەکاندا بووە.

وەك: تانە و ڕەخنە لە دەسەڵات و زیکری بە کۆمەڵ و شوێنکەوتەی پاشماوەی عیبادەتی پێغەمبەر ﷺ وەك ئەو دارەی بەیعەی عەقەبەی لەژێردا بەسترا و ئەشکەوتی حەڕڕا و کاری هاوەڵان ...، بەڵام بە هۆکاری بوونی کۆمەڵی موسوڵمانان و خەلیفە و زانایانی زۆر سەرکوت کراون و بوونیان نەماوە.

**نیوەی دووەمی سەدەی یەکەم:**

لەم سەردەمەدا دروستبوونی هەندێك لە بیروڕای فیرەقەکانی وەك شیعە و خەوارج بە هۆکاری ڕووداوەکانەوە بەرەوپێش چوو، وە لەگەڵێشیدا سەرەتای قسەکردن لە بابەتە غەیبی و ئیمانییەکان دروستبوو، لە بابەتی قەدەر و ئیماندا لەلایەن کەسانی دیار و ناوداریانەوە وەك (غيلان الدمشقي والمختار بن أبي عبيد، معبد الجهني ...)، وە گرنگیدان بە هەندێك شوێن بۆ مەبەستی سیاسی وەك ڕازاندنەوەی (بيت المقدس) و قوبەکردنەوە بەسەر بەردەکەیەوە لەلایەن (عبد الملك بن مروان)، بەڵام ئەم سەردەمەش بە هۆکاری بوونی هاوەڵان و زانایان و بەربڵاوی بەرنامەی

---

(١) "دراسات في الأهواء والفرق والبدع" لدكتور ناصر بن عبد الكريم العقل (١/ ١٦٦).

حەقی ئیسلام، لە چوارچێوەیەکی بچووکدا بیروڕا و کەسەکان دەردەکەوتن و بگرە لەلایەن دەسەڵاتەوە چاودێری دەکران تا دەگەیشتە ئاستی تەمێکردن و لەناوبردنیان، وەك (غيلان الدمشقي) کە سوور بوو لەسەر گومان دروستکردن لەسەر قەدەر، کوژرا و هەڵواسرا لە (دمشق).

**قۆناغی دووەم:** سەدەی دووەمی ئیسلام:

لەم سەردەمەدا بیروڕا و قسەکردنی فیرقەکان پێشکەوتنیان بەخۆیانەوە بینی و بگرە فیرەقی تازەتر لە بابەتی تازەتردا دروستبوو، وەك (الجبرية، الرافضة، المرجئة ومرجئة الفقهاء، والقدرية والمعتزلة ...).

کاریگەری زیاتری دەرەکی دەرکەوت بەسەر فیرقەکانەوە لە دینەکانی وەك یەهوودییەکان و گاوورەکان و (الصائبة) و (المجوسية) و ڕەهبانییەت و (طقوس)ی هندییەکان و فەلاسیفەکانی یۆنان و ڕۆمان.

بەرنامە و بابەتەکانی فیرەقەکان لەمانەدا خۆی دەبینییەوە:

١. **التعطيل:** لەکارخستنی ناو و سیفاتەکانی خوا.

٢. **التأويل:** واتا گۆڕینی مەبەستی ئایەتەکان.

٣. گرنگیدان بە (عەقڵ) و تێڕوانینەکانی فەلسەفە.

٤. **التشبيه:** بەشێوەکردنی سیفاتەکانی خوا.

٥. زیادەڕەوی لە دیندا، وە زیادەڕەوی لە کەس و ناودارەکاندا تا خستنەڕیزی خوا لە هەندێك سیفاتدا، یاخود خستنە ڕیزی پێغەمبەران.

٦. سەرهەڵدانی قسە و تانە لە هاوەڵان و ناودارە دیارەکانیان.

**قۆناغی سێیەم:** سەدەی سێیەمی ئیسلام:

لەم سەردەمەدا گەیشتنە ئاستی بەرنامەیی و (جدل) و قسەکردن و بنەما دانان بۆ بیر و ڕاوبۆچوونەکانیان و ترازانێکی بەرنامەیی بەخۆوە بینی تا گەیشتە ئاستی دەسەڵات، بە هۆکاری تێکچوونی باری سیاسی دەوڵەتەوە بووە هۆکاری دروستبوونی شوێنی تایبەت بۆ فیرەقەکان، وەك دروستکردنی گۆڕی (علي بن أبي طالب) لەلایەن شیعەکانەوە لە نەجەف و گۆڕی (حُسين) لە

کەربەلا و چەند گۆڕێکی تر لە شام و میسر و ئێران بۆ سەری (حُسین) و گۆڕی ناودارانی سۆفییەکان لە عێراق و ڕۆژهەڵات و شام ...، وە دەرکەوتنی (حلاج) و هاوشێوەکانی و بەرنامەی تازە بۆ پەیڕەوانی لە (وجد وکشف والسماع والذوق والعلم اللدني والحلول والفناء).

وە دروستبوونی دەسەڵاتی سنووردار بۆ بیروڕای شیعە تێکەڵ بە ئەستێرەپەرستی و پاشماوەی بتپەرستەکان، وەك (القرامطة)کان لە میسر و (الإسماعيلية والعبيدية)کان کە تیایاندا قەبر پەرستی و جۆرەکانی (شرك) و گومڕایی پەرەی سەند، وە موعتەزیلەکان گەیشتنە دەسەڵات لە سەردەمی (مأمون)دا.

بە هەمان شێوە زانایانی ئەهلی سوننەت لەم دوو سەدەیەشدا لە بەرهەڵستی و دژایەتی تەواودا بوون، بە نووسین و پەرچدانەوە و دژایەتیکردنی دەسەڵات و ناودارانیان، وەك (امام أحمد) رَحِمَهُ اللَّهُ و هاوشێوەکانی، بەتایبەت لە فەرموودەناسان (المحدثين).

**قۆناغی چوارەم:**

لەم سەردەمە بەدواوە بە تەواوی فیرەق و گومڕاییەکی زۆر باڵی کێشا بەسەر جیهانی ئیسلامیدا، هەر لە بەش بەش بوونی دەوڵەتی ئیسلامی و گۆڕانکاری فیرەقەکان لە سەرەتا و گرووپەوە بۆ سەرچاوە و مەزهەب و بنەمای جیاکەرەوەی تەواو لە بەرنامەی ئەهلی سوننەت، بە شێوەیەك لە دینی سەربەخۆ دەچوون، وەکوو شیعەکان لە خۆشەویستی و لایەنگری (أهل البيت)، وە چوونە ڕیزی ڕافیزەی تەواو لە (تکفیر)کردنی هەموو هاوەڵان و دانانی دوانزە ئیمام و زیاتر لەو ژمارەیە لە ئیمام و پێشەوای جیا جیای خۆیان و پێدانی تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەران لە (معصوم) و غەیب زانین و تەنانەت گۆڕانکاری شەریعەت بەناوی (نائب إمام الزمان، ولاية الفقيه، وعلم الباطن).

وە (تصوف)یش لایدا بۆ (تصوف)ێکی فەلسەفی لە (الاتحاد والحلول والفناء، وحدة الوجود ...) و (مذهب الکلامیة)کانیش بۆ چوونە ناو فەلسەفی تەواو و دەرچوون لە شەریعەت و لایەنگری و پلەوپایەدانی فەیلەسووفە ئەستێرە و بتپەرستەکانی یۆنان و ڕۆمان بەسەر پێغەمبەراندا، وەك (ابن سينا وفارابي وابن سبعين وابن عربي والسهروردي وابن الفارض ...).

وە گومڕابوونی زیاتری فیرەقە گومڕاکانی وەك (القدرية والجبرية والرافضة والخوارج ...) بە هۆکاری تێکەڵکردنێکی عەقڵانی و فەلسەفی ڕووت و دوورلە قورئان و فەرموودە، وە تەنانەت

ئەو فیرەقانەی وەك (الأشاعرة والماتريدية ...) کە بەناوی ئەهلی سوننەوە دروستبوون بۆ پەرچدانەوەی ئەو فیرەقانە، دەرئەنجام ئەمانیش بە دوور و نزیك و زۆر جار ناڕاستەوخۆ بە تەواوی کەوتنەوە ناو بنەما و یاساکانی عەقڵی فەلسەفەی فیرەقەکان، بە جۆرێکی تر نەیانتوانی پەیوەست بن بە قورئان و فەرموودەوە لەسەر شێوازی تێگەیشتنی هاوەڵان و شوێنکەوتووانی ئەو سێ سەدە پڕ خێر و دیندارە، هەتا بێت دوورکەوتنەوە دروستبوو لە دین و شاراوەیی و ونبوونی بەرنامەی حەقی قورئان و فەرموودە باڵی کێشا بەسەر جیهانی ئیسلامیدا، وە ئەو بەرنامە حەقە لە ئاستی زانایان و (مدرسة)ی ئەملاولادا بەناوی (دار الحديث) خۆی دەبینییەوە.

وە جیهان بووە جیهانی سەفەوییەکان و بووەیهییەکان و قەرامیتەکان و زەیدی و ئیسماعیلییەکان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئیسلام، تا لەدوای ئەمان پایتەختی ئیسلام بەرەو ئەورووپا لە (اسلام بول) خۆی بینییەوە لە دەستی تورکە عوسمانییەکاندا، بە بەرنامەی تێروتەسەلی تصوفی پڕ ڕەهبانییەتییەکەی پێشووی سەردەمی گاووری هیرەقلییەکاندا، بە کورتی چەندە پایتەخت لە مەدینە و دەستی قوڕەیشی ڕەسەندا دوورکەوتەوە بۆ (دیمەشق) لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا و (بغداد) لە سەردەمی عەبباسییەکاندا و لەوێوە بۆ تورکی (أعجمي) و (قسطنطينية)ی بە (اسلام بول) و پاشان بۆ (استنبول)ی ئەم سەردەمە؛ ئەوەندە دین غەریب بوو و خەڵکیش گومڕا بوون و لە ئەسڵ و ڕەسەنایەتی ئیسلام دوورکەوتنەوە.

### خاڵی گومڕایی فیرەقەکان[(١)]:

١. قسەوتن و تانەدان لە هاوەڵان بە جۆراوجۆر.
٢. وەرنەگرتنی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ و گومان دروستکردن لەسەری.
٣. تەفسیرکردنی قورئان بە شێوەی عەقڵی و دانانی ناونیشان بۆ وەرنەگرتنی وەکوو شێوازی دروستی خۆی، بەناوی (المجاز، ظني الدلالة، التأويل، التفسير الباطني ...).
٤. باوەڕنەبوون و پەیوەستنەبوون بە بابەتە غەیبییەکانەوە، وەك: (الأسماء والصفات، القدر، البرزخ، الجنة والنار ...). لەژێر ناونیشانی یاسا و قاعیدە عەقڵییە دیارەکان بە نادیارەکان.
٥. پەیوەستنەبوون بە عیبادەتەکانەوە بە شێوەی شەرعی خۆی.

---

(١) "دراسات في الأهواء والفرق والبدع" لدكتور ناصر بن عبد الكريم العقل (١/ ١٤٣ - ١٥٦).

٦. دەرچوون لە دەسەڵات و شۆڕشکردن و هەڵگەڕانەوە لێی، هەموو مەبەستەکانیش لە دەسەڵات دەسەڵاتی ئەهلی سوننەت بووە، ئەوانیش فێرەق بوون.
٧. زاڵبوونی حەز و ئارەزوو و دونیا ... بەسەر شەرع و بەڵگە و حەقدا.

**سیمای فیرەقەکان لە گومڕاییەکاندا**[(١)]:

ئاکار و سیما و شێوازێك کە هەریەك لەو فیرەقانە خۆی دەبینییەوە تیایدا بریتیبوون لەمانە:

١. **ڕافیزەکان**: درۆ و نەزانین لە ئاستێکی بێعەقڵیدا.
٢. **خەوارج**: توندوتیژی لە دیندا و ستەمکردن لە موسوڵمانان و حەڵاڵکردنی خوێنیان (یقتلون أهل الإسلام ویدعون أهل الأوثان).
٣. **الصوفية**: بوونی زۆرێکی بێشوماری بیدعەی عیبادەت لە خۆبادان و ڕەقس و گۆرانی و (شطحات) بەناوی (معرفة)وە.
٤. **المعتزلە**: بیروڕا و قسە و یاسای فەلسەفی عەقڵی کەسانی فەیلەسووف و (الجدل الكلامي) و بیرکردنەوەی دونیاییانەی پڕ حەز و ئارەزووەکان.
٥. **القدرية**: باوەڕنەبوون بە (القضاء والقدر) و دەسەڵاتی خوا و زیادەڕەوی لە مافیدا لە سەربەخۆیی ئادەمیزاد لە کارکردندا و چوونە ناو دونیاوە (المادية).
٦. **الجبرية**: پاڵدانەوە و ڕێ خۆشکردن بۆ دەرچوون لە شەرع و دین و لەکارخستنی و غەرقبوون لە شەهەوات و دونیادا.
٧. **المرجئة**: مانەوەی دین لە وشە و داڕشتنێکدا و نەمانی (الولاء والبراء) و نەمانی کارکردن بۆ دین لەپێناوی خوادا و تێکەڵبوونی شیرك و تەوحید و سوننەت و بیدعە و خواناس و تاوانبار لە بازنەی دیندا.
٨. **أهل الرأي**: داڕنینی بەڵگە لە قسەکان و دەرگای فێڵ و حیلە و ڕۆتینیاتی دینی و چوونە دونیای حەز و ئارەزووەکان.
٩. **فەیلەسووفەکان**: بریتیبوون لە ئەدیب و شاعیر و ئەهلی خەیاڵ و قسەی زل و کەسانی ئیمان لاواز و دەرچوو لە ئیمان و دین.

---

(١) "دراسات في الأهواء والفرق والبدع" لدكتور ناصر بن عبد الكريم العقل (١/ ١٤٥).

وە دەسەڵاتیش بە ستەم و قەومیەتگەری و لەکارخستنی یاسا جێبەجێکارەکانی ئیسلام، تا گەیشتە سەردەمی دەرچوون لە دین و جیاکەرەوەی لە دەسەڵات و یاسا و تەشریع و ڕەتدانەوەی دەقەکان و گومان دروستکردن و (الإباحية) بەناوی (العولمة) یاخود (العلمانية)، وە دروستکردنی پەیکەری ئازادی وەك نیشانەیەك بۆ ڕزگاربوون و دەرچوون لە دین بەناوی ئازادییەوە بەتایبەت بۆ ئافرەتان، لە هەموو شار و وڵاتێکی ئیسلامی نیشانەی پشتگیری و (الولاء) دروستبوو بۆ ئەو عەولەمەیەی کە لە ئەورووپا و ئەمریکادا هەیە.

بەم شێوازە مێژووی خاوبوونەوە و دەرچوون لە دین و گومڕایی لە ئاستی ئەو حەقەی کە ئیسلام پێیەتی جیهانی ئیسلامی بەخۆیەوە بینیویەتی تاوەکوو ئەم سەردەمە، لەبەرئەوە هیچ چارەسەرێك نییە بێجگە لە گەڕانەوە بۆ دینی پاکی ئیسلام و بەرنامە و مەنهەجی حەقی خۆی نەبێت، وەکوو ئیمام (مالك) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: لَنْ يُصْلِحَ آخِرَ هَذِهِ الْأُمَّةِ إِلَّا مَا أَصْلَحَ أَوَّلَهَا[1].

واتە: کۆتایی گەلی موسوڵمانان نایەنە ژێر باری ڕێکی و چاکبوونەوە بێجگە بەو شێوازە نەبێت کە سەرەتای ئەم ئوممەتەی پێ ڕێك و چاك و ئیسلاح بووە.

لەبەرئەوەی لە نەفامی و جاهیلیەتەوە هاتنە ناو ئیسلام و ئێستاش گەڕاونەتەوە بۆ سیما و شێوازەکانی نەفامی و لادان لە دین، ئەگەرچی دینی ئیسلام بەرپا و ڕوون و ئاشکراشە.



(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٧/ ٣٩٦)، و "إقتضاء الصراط المستقيم" لابن تيمية ص٢٤٣، و "الشفا" لقاضي عياض (٢/ ٨٨).

# ناوادارترین فیرەقەکانی قەدەر

## یەکەم: قەدەرییەکان
## القدرية

قەدەرییەکان ئەو کەسانەن کە زیادەڕەوییان کردووە لەسەر بوونی توانای ئادەمیزاد و بژاردەی تەواو بەدەستیەوە لەسەر جێبەجێکردنی فەرمانەکانی شەرع و هێنانەدییان و توانا و ئیرادەی کارکردنیان، تا کەوتوونەتە باوەڕنەبوون بە قەزاوقەدەر (تعظيم الشرع ونفي القدر).

قەدەرییەکان وەکوو مێژوو لە کۆتایی سەردەمی هاوەڵاندا دروستبوون، وە شوێن و لانەیان دوورە دەستی فەرموودەکانی پێغەمبەر و بوونی و هاوەڵان بوو، شوێن و لانەیان (بەصرە) بوو بە پلەی یەك و (دمشق) بوو بە پلەی دوو.

یەکەم کەسێك کە بزوێنەری ئەم قسە و باسە بوو لە قەدەردا و ناوزڕاوی لای زانایان بوو ناوی (معبد بن عبد الله بن عويم الجهمي) بوو، لە سەرەتاوە گوێبیستی فەرموودە بوو لە هەندێك لە هاوەڵانی وەك (ابن عباس وابن عمر ومعاوية وعمران بن حصين).

(ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: كان عنده سوء حظ من العلم[(١)].

واتە خاوەن زانستێکی کەم بوو لە دیندا.

وە بەشداری دانوستانەکەی نێوان خەلیفە (علي بن أبي طالب ومعاوية) رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا بوو.

ئیمامی (الذهبي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: صدوق في نفسه، ولكنه سن سنة سيئة، فكان أول من تكلم في القدر، ونهى الحسن الناس عن مجالسته، وقال: هو ضال مضل[(٢)].

واتە: لە سەرەتاوە پیاوێکی سەرراست بوو بۆ خۆی، بەڵام داهێنەری ڕێگەیەکی شەڕ بوو، وە یەکەم کەس بوو لە بابەتی قەدەردا قسەی لەسەر کرد، وە (الحسن البصري) رَحِمَهُ ٱللَّهُ ڕێگری دەکرد کە خەڵك لەگەڵی دابنیشێت و پێی دەوت گومڕا و گومڕاکارە.

---

(١) "بيان تلبيس الجهمية" لابن تيمية (٢/ ٢١٢).

(٢) "ميزان الاعتدال" للذهبي (٤/ ١٤١).

(ابن كثير) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: وَقَدْ كَانَتْ لِمَعْبَدٍ عِبَادَةٌ وَفِيهِ زَهَادَةٌ[1].

واتە: کەسێکی خاوەن عیبادەت و زاهد بوو.

لە سەردەمی (عبد الملك بن مروان)دا یەکێك بوو لەوانەی کە لەگەڵ (ابن الأشعث) دژی دەسەڵات دەرچوو، تاوەکوو (حجاج بن يوسف الثقفي) ساڵی (٨٠)ی هیجری کوشتی[2].

وە لە (دمشق)یش (غيلان بن مسلم الدمشقي) وەکوو ئیمامی (الذهبي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: غيلان القدري أبو مروان، صاحب مَعْبَد الْجُهَني ... قد أظهر الْقَدَرَ فِي خلافة عُمَر بْن عَبْد العزيز، فاستتابه عُمَر، فقال: لقد كنت ضالا فهدَيْتني، وقَالَ عُمَر: اللَّهُمَّ إن كان صادقًا، وإلا فاصلبه واقطع يدَيه ورِجْلَيه، ثم قَالَ: أَمِّنْ يا غَيْلان، فَأَمَّن عَلَى دُعائه، (فَلَمّا مات عمر جَاهر بمذهبه) ... ثم نفذتْ فيه دعوةُ الإِمَام الراشد عُمَر بْن عَبْد العزيز، فأُخِذ وقُطِّعَتْ أربَعَتُهُ وصُلِب بدمشق فِي القَدَر[3].

واتە: (غيلان) بە ئاشکرا قسە و گومانی لەسەر قەدەر دروست دەکرد، هاوەڵی (معبد) بوو لە سەردەمی خەلیفە (عمر بن عبد العزيز)دا رَحِمَهُ ٱللَّهُ، بەڵام خەلیفە بەڵگەکاری بەسەردا کرد و ئەویش وتی: ئەی خەلیفە گومڕا بووم هیدایەتت دام، خەلیفەش وتی: خوای گەورە ئەگەر ڕاست دەکات لێی وەربگری، وە ئەگەر نا هەڵیواسیت و هەرچوار پەلی ببڕیت، پاشان وتی: ئەی غیلان ئامین بکە لەسەر دوعاکەم، ئەویش ئامینی کرد ... بەڵام لە سەردەمی خەلیفە (هشام بن عبد الملك)دا قسەکردنی لەسەر قەدەر دەستپێکردەوە و بانگەوازی بۆ دەکرد و (هشام)یش گرتی و هەرچوار پەلی بڕییەوە و کوشتی و هەڵی واسی لەسەر دەرگای (دمشق).

لەم سەرەتایەدا هەم لەڕووی کەسایەتییەکان و هەم لەڕووی بیروڕاکاندا سنووردار بوون،

(١) "البداية والنهاية" لابن كثير (٩/ ٣٤).

(٢) "تهذيب التهذيب" لابن حجر (١٠/ ٢٢٥)، و "الفرق بين الفرق" لأبي منصور البغدادي ص٩، و "القضاء والقدر" لعبد الرحمن بن صالح المحمود ص١٦٢.

(٣) "تأريخ الإسلام" للذهبي (٧/ ٢٥٩)، و "ميزان الاعتدال" للذهبي (٣/ ٣٣٨)، و "وفيات الأعيان" لابن خلكان (١٠١، ١٢٠)، و "الأعلام" للزركلي (٥/ ٣٥٠)، ومناقشة الإمام الأوزاعي مع غيلان الدمشقي في عهد هشام في "أصول اعتقاد أهل السنة" للالكائي (٤/ ٧١٨).

لەبەر نامۆیی و تازە سەرهەڵدانی کەس و باسەکان، وە بوونی دەسەڵاتی ئیسلامی و هاوەڵان و زانایانی (تابعين) و بەربڵاوی قوتابخانەکانی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان و مانەوەی خەڵکی لەسەر (فطرة) و ناخی پاك و شارەزایی دینی، ئەمانە کاریگەری تەواوی هەبوو لەسەر شاردنەوە و شاراوەیی کەسەکان و بیروڕاکان لەسەری، هەروەك لەم گێڕانەوەیەدا سەرەتا و بوونیان دەردەخات:

۩ عَنْ يَحْيَى بْنِ يَعْمَرَ، قَالَ: كَانَ أَوَّلَ مَنْ قَالَ فِي الْقَدَرِ بِالْبَصْرَةِ مَعْبَدٌ الْجُهَنِيُّ، فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَحُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحِمْيَرِيُّ حَاجَّيْنِ -أَوْ مُعْتَمِرَيْنِ- فَقُلْنَا: لَوْ لَقِينَا أَحَدًا مَنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَسَأَلْنَاهُ عَمَّا يَقُولُ هَؤُلَاءِ فِي الْقَدَرِ، فَوُفِّقَ لَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ دَاخِلًا الْمَسْجِدَ، فَاكْتَنَفْتُهُ أَنَا وَصَاحِبِي أَحَدُنَا عَنْ يَمِينِهِ، وَالْآخَرُ عَنْ شِمَالِهِ، فَظَنَنْتُ أَنَّ صَاحِبِي سَيَكِلُ الْكَلَامَ إِلَيَّ، فَقُلْتُ: أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِنَّهُ قَدْ ظَهَرَ قِبَلَنَا نَاسٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ، وَيَتَقَفَّرُونَ الْعِلْمَ، وَذَكَرَ مِنْ شَأْنِهِمْ، وَأَنَّهُمْ يَزْعُمُونَ أَنْ لَا قَدَرَ، وَأَنَّ الْأَمْرَ أُنُفٌ، قَالَ: "فَإِذَا لَقِيتَ أُولَئِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنِّي بَرِيءٌ مِنْهُمْ، وَأَنَّهُمْ بُرَآءُ مِنِّي"، وَالَّذِي يَحْلِفُ بِهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ "لَوْ أَنَّ لِأَحَدِهِمْ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا، فَأَنْفَقَهُ مَا قَبِلَ اللهُ مِنْهُ حَتَّى يُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ"...»[(١)].

واتە: (يحيى بن يعمر) دەڵێت: کاتێك لە بەسرە یەکەم کەس (معبد الجهني) قسەی لەسەر قەدەر دەکرد، من و (حميد بن عبد الرحمن) بۆ حەج یا عومرە ڕێمان کەوتە مەدینە و وتمان گەر بگەیشتینایە بە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و پرسیارمان لێبکردایە دەربارەی ئەوانەی کە قسە لەسەر قەدەر دەکەن، ڕێکەوتی خوا وابوو لەناو مزگەوت گەیشتین بە (عبد الله بن عمر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، خۆم و هاوەڵەکەم ئەملاولامان لێگرت و وا هەستم کرد هاوەڵەکەم بڵێ تۆ قسە بکە، منیش وتم: باوکی (عبد الرحمن) لەلای ئێمە کەسانێك هەن قورئان دەخوێنن و خەریکی زانستی شەرعین ...، لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێن قەدەر هیچی لەسەر نەنووسیوین و خوا زانا نییە بەسەر کردارەکانماندا تاوەکوو نەیکەین، (عبد الله بن عمر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا زۆر دژایەتی ئەو قسەیەی کرد و

(١) رواه مسلم (٨)، وأبو داود (٤٦٩٥)، والترمذي (٢٦١٠)، والبيهقي في "الشعب" (١٧٧)، وفي "القضاء والقدر" (١٨١)، وابن بطة في "الإبانة" (٣/ ١٥٠)، والآجري في "الشريعة" (٢٠٦)، والبغوي في "شرح السنة" (٢)، والفريابي في "القدر" (٢١٠).

وتی: ئەگەر گەیشتی بەوانە هەواڵیان بدەرێ کە من بەریم لەوان و ئەوانیش لە من بەرین، بەو سوێندەی (عبد الله بن عمر) پێی دەیخوات گەر هەرکەسێك لەوانە بەقەدەر شاخی ئوحود ئاڵتوونی هەبێت و بیبەخشێتەوە لە پێناوی خوادا، خوا لێی وەرناگرێت تاوەکوو باوەڕی بە قەدەر نەبێت.

بەم شێوەیە سەرکوت کراون و ناو زڕاو بوون و بوونەتە هۆکاری بچووککردنەوە و ماندنیان، بەڵکوو زۆرجار ناچار بە درۆکردن بوون، وەکوو (أبو الزبير المكي) دەڵێت: «كُنْتُ أَنَا وَطَاوُسٌ نَطُوفُ بِالْبَيْتِ مَعَ طَاوُسٍ، فَذَكَرَ أَنَّ مَعْبَدًا الْجُهَنِيَّ تَكَلَّمَ فِي الْقَدَرِ وَكَانَ أَوَّلَ مَنْ تَكَلَّمَ فِي الْقَدَرِ، فَعَدَلْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ لَهُ طَاوُسٌ: أَنْتَ الْمُفْتَرِي عَلَى اللهِ، فَقَالَ: إِنَّهُ يَكْذِبُ عَلَيَّ، ...»[(١)].

واتە: لەگەڵ (طاوس) قوتابی (ابن عباس) تەوافمان دەکرد لە کەعبە، (طاوس) باسی (معبد الجهني) کرد کە یەکەم کەسە قسە لەسەر قەدەر دەکات، لەو کاتەدا ئەویش لە تەوافدا بوو، منیش کارێکم کرد کە لێی نزیکببینەوە، کاتێك نزیك بووینەوە (طاوس) پێی وت: تۆ درۆ دەکەیت بەرامبەر خوا (کە دەڵێیت خوا زانستی نییە بەسەر کردەوەی بەندەکانی تا کاتێك ئەنجامی دەدەن)، ئەویش وتی: ئەوە درۆیە بەدەمی منەوە دەیکەن.

وە لەلایەکی تریشەوە زانایانی بەسرە وەکوو (حسن البصري، ابن عون، يونس بن عبيد ...) بەردەوام دژایەتییان دەکردن و ڕێگرییان دەکرد لە تێکەڵبوون و دانیشتن لەگەڵیاندا و زۆرجار ئەوانیش بە درۆ بەناوی ئەمانەوە بەتایبەت (حسن البصري) قسەکانی خۆیان دەخستە پاڵیان بۆ ڕەواج و خۆشاردنەوەیان[(٢)].

**لەڕووی بیروڕاکانیانەوە لەسەر قەدەر، هەموو ئەو بیروڕا جیاوازانەی کە لەناو قەدەردا دروستبووە بە دەوری دوو بابەتدا دەسووڕێنەوە[(٣)]:**

**بابەتی یەکەم:** لە هەریەك لەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بە خواوە هەیە لە پلەوپایەکانی قەدەر کە چوارن (العلم، الكتابة، المشيئة، الخلق).

---

(١) رواه ابن بطة في "الإبانة" (١٦١١)، والآجري في "الشريعة" (٢١٨)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٣٢٢)، والفريابي في "القدر" (٢٦٤)، وقال محققه: إسناده صحيح.

(٢) "القضاء والقدر" لعبد الرحمن بن صالح المحمود ص١٨٤، وانظر "كتاب السنة" لعبد الله بن أحمد (٢/ ٤٣٠).

(٣) "القضاء والقدر" لعبد الرحمن بن صالح المحمود ص٣٠١.

**بابەتی دووەم:** ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بە ئادەمیزادەوە هەیە، هەر لە:

- ئایا ئادەمیزاد خاوەن ئیرادە و ویستە؟
- ئایا خاوەن توانایە لە کارکردندا؟
- ئایا خاوەن کردارە بەڕاستی لە کاردا؟

قەدەرییەکانی سەرەتا گومان و قسەیان دروستکرد لەسەر دوو بەشی یەکەم لە پایەکانی قەدەر کە (العلم، الکتابة)یە و گومانیان لەمەدا هەبوو و دەیانوت خوا نە کردارەکانی ئادەمیزادی نووسیوە، وە نە دەیشیزانێ تاوەکوو کارەکان ئەنجام دەدەن، ئەمانە پێیان دەوترا قەدەرییە زیادەڕەوەکان، یاخود قەدەرییەکانی سەرەتا (غلاة القدرية، القدرية الأولى)، ئەم بیروڕایە هەمان بیروڕای عەقیدەی جوولەکەکانە کە پێی دەوترێت (البداء)، واتە خوا نایزانێت تاوەکوو کارەکان دێتە دی، وە شیعەکانیش هەڵگری هەمان بیروڕان[١].

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَغُلَاةُ الْقَدَرِيَّةِ يُنْكِرُونَ عِلْمَهُ الْمُتَقَدِّمَ وَكِتَابَتَهُ السَّابِقَةَ ... وَهُوَ لَا يَعْلَمُ مَنْ يُطِيعُهُ مِمَّنْ يَعْصِيهِ بَلْ الْأَمْرُ أُنُفٌ ... وَكَانَ أَوَّلُ مَنْ ظَهَرَ عَنْهُ ذَلِكَ بِالْبَصْرَةِ مَعْبَدَ الجهني ... ثُمَّ كَثُرَ خَوْضُ النَّاسِ فِي الْقَدَرِ فَصَارَ جُمْهُورُهُمْ يُقِرُّ بِالْعِلْمِ الْمُتَقَدِّمِ وَالْكِتَابِ السَّابِقِ لَكِنْ يُنْكِرُونَ عُمُومَ مَشِيئَةِ اللَّهِ وَعُمُومَ خَلْقِهِ وَقُدْرَتِهِ ... فَلَزِمَهُمْ أَنْ يَقُولُوا: إنَّهُ قَدْ يَشَاءُ مَا لَا يَكُونُ وَيَكُونُ مَا لَا يَشَاءُ وَأَنْكَرُوا أَنْ يَكُونَ اللَّهُ تَعَالَى خَالِقًا لِأَفْعَالِ الْعِبَادِ أَوْ قَادِرًا عَلَيْهَا[٢].

واتە: قەدەرییە سەرەتاییەکان گومان و نکوولێیان لە دوو بەشی پایەکانی قەدەردا دروست دەکرد ئەویش (العلم والكتابة) بوو، پاشان ئەم بابەتە بەگوێرەی پەرەسەندنی قەدەرییەکان و فراوانبوونیان لەناو قەدەرییەکانی پاش ئەوان وون بوو و پاشەکشێیان لێکرد و دانیان پیادا نا لەبەر زۆر زەقی و هەڵەی قسە و گومانەکان کە لە عەقڵدا جێگەی نەدەبووەوە، وە قسە لەسەر دوو پایەکەی تری قەدەر دروستبوو، کە ئەویش ویست و ئیرادەی خوا و دروستکردن بوو لەسەر بوونەکان (المشيئة والخلق)، واتە هەموو بوونێك خوا ویستی لەسەرە و ئەو دروستی کردووە.

---

(١) "فرق معاصرة" لدكتور غالب بن علي عواجي (١/ ٤٤٥)، و "موسوعة الفرق المنتسبة للإسلام" لمجموعة من الباحثين بإشراف الشيخ علوي بن عبد القادر السقاف (٦/ ١٥١).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٤٥٠، ٤٥١).

(النووي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: وَقَدِ انْقَرَضَتِ الْقَدَرِيَّةُ الْقَائِلُونَ بِهَذَا الْقَوْلِ الشَّنِيعِ الْبَاطِلِ ... وَصَارَتِ الْقَدَرِيَّةُ فِي الْأَزْمَانِ الْمُتَأَخِّرَةِ تَعْتَقِدُ إِثْبَاتَ الْقَدَرِ وَلَكِنْ يَقُولُونَ الْخَيْرُ مِنَ اللهِ وَالشَّرُّ مِنْ غَيْرِهِ تَعَالَى اللهُ عَنْ قَوْلِهِمْ[(١)].

(القرطبي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: قَدِ انْقَرَضَ هَذَا الْمَذْهَبُ (أي: مذهب غلاة القدرية) وَالْقَدَرِيَّةُ الْيَوْمُ ... إِنَّمَا خَالَفُوا السَّلَفَ فِي زَعْمِهِمْ بِأَنَّ أَفْعَالَ الْعِبَادِ مَقْدُورَةٌ لَهُمْ وَوَاقِعَةٌ مِنْهُمْ عَلَى جِهَةِ الِاسْتِقْلَالِ وَهُوَ مَعَ كَوْنِهِ مَذْهَبًا بَاطِلًا أَخَفُّ مِنَ الْمَذْهَبِ الْأَوَّلِ[(٢)].

**واته: قەدەرییەکانی سەرەتا (غلاة القدرية) بیروڕایان بەسەرچوو، بەڵکوو قەدەرییەکان پاش ئەوان قسەیان لەسەر ئەوەیە کە ئادەمیزاد خۆی کردەوەی خۆی دروستدەکات و سەربەخۆیە و خوا دەسەڵاتی تیادا نییە، وە دەڵێن خێر خوا دروستی کردووە و شەڕ خوا دروستی نەکردووە، وەکوو پێشتر باسکرا کە (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: فَلَزِمَهُمْ أَنْ يَقُولُوا ... قسەکانیان وا دەگەیەنێت کە دەشێت خوا ویستی لەسەر کار و بوونێك هەبێت و نەیەتە دی، وە بوونێك ببێت و ویستی لەسەر نەبێت.**

**وە هۆکاری ناونانیشیان بە قەدەرییەکان وەکوو (ابن قتيبة) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت:** لِأَنَّهُمْ أَضَافُوا الْقَدَرَ إِلَى أَنْفُسِهِمْ، ... وَمُدَّعِي الشَّيْءَ لِنَفْسِهِ، أَوْلَى بِأَنْ يُنْسَبَ إِلَيْهِ، مِمَّنْ جَعَلَهُ لِغَيْرِهِ[(٣)]. **لەبەرئەوەی قەدەر و تواناکان دەدەنە پاڵ خۆیان، وە خۆدانە پاڵ شتێکیش خاوەنەکەی لەپێشترە ئەو نازناوەی لێبنرێت.**

**پاش قەدەرییە سەرەتاکان بەگوێرەی تێپەڕبوونی کات (معتزلة)کان هەڵگری ئەم بیروڕایە بوون و پەرەیان پێدا، بەڵام لە بابەتی دووەم و سێیەمی پایەکانی قەدەر و کار و کردەوەکانی ئادەمیزاد کە خاوەن ئیرادە و توانا و دروستکردنی ڕاست و دروستی خۆیەتی و هیچ دەسەڵاتێك بێجگە لە خۆی بوونی نییە تیایدا.**

---

(١) "شرح النووي على مسلم" (١/ ١٥٤).

(٢) "فتح الباري" لابن حجر (١/ ١١٩).

(٣) "تأويل مختلف الحديث" لابن قتيبة ص١٣٧.

هەڵگری بیروڕای قەدەر لە قۆناغی دووەمدا لە شاری بەسرە ئەمانە بوون: (واصل بن عطاء وعمرو بن عبيد وأبو هذيل العلاف ومعمر بن عباد السلمي والنظام والجاحظ وأبو علي الجبائي وأبو هشام الجبائي)، وە لە بەغدادیش ئەمانە بوون: (أحمد بن أبي دؤاد وأبو الحسين الخياط وأبو القاسم البلخي وبشر بن معتمر ...)[(١)].

ئیتر بەگوێرەی مێژوو شۆڕبوونەوەی بیروڕاکان فراوان دەبوون، بابەتی تریان بەخۆوە دەبینی، تا گەیشتە ئەو ئاستەی قەزا و قەدەر بەو تێڕوانینانە بووە یەکێك لە پێنج پایەکانی دین لای (معتزلة)کان کە ئەمانەن:

١. **التوحيد:** مەبەستیان پێی باوەڕنەبوونە بە سیفاتەکانی خوا.
٢. **العدل:** لە قەدەردا باوەڕنەبوونە بە (الخلق والمشيئة) بۆ خوا، وە ئادەمیزاد خاوەنی ئەو دوو سیفەتەیە.
٣. **الوعد والوعيد:** هەڕەشەکانی قورئان دەبێت وەکوو خۆی بێتە دی بەسەر ئەو کەسەدا کە دەکەوێتە ناوی وەك (کفر وفسوق وشرك ...)، بە پێچەوانەی ئەهلی سوننەتەوە کە دەڵێن: (في مشيئة الله، إن شاء عذبه، وإن شاء غفر له)، ئەگەرچی کەسی تاوانبار بەر هەڕەشەکان دەکەوێت، بەڵام گەر خوا ویستی لێبێت سزای دەدات، یاخود دەیبەخشێت، بەڵام ئەوان دەڵێن نابێت لەدوای هەڕەشەکانەوە ویستی خوای تێدابێت.
٤. **المنزلة بين منزلتين:** هەرکەسێك تاوان بکات و تەوبە نەکات ئەوا حوکمەکەی لە نێوان ئیمان و کوفردایە، نە موسوڵمانە و نە کافرە لە دونیادا، بەڵام لە دوارِۆژدا لە ڕیزی کافراندایە و لە دۆزەخدایە بە بەردەوامی.
٥. **الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر:** لەژێر ئەم ناونیشانەدا دەرچوون لە دەسەڵات و شۆڕشکردن پێویستە گەر پێچەوانەی بنەماکانی (معتزلة) بن، واتە دەرچوون لە دەسەڵاتەکانی ئەهلی سوننەت.

ئەمانە و لەگەڵ (خلق القرآن) و چەندەها شتی تر بەرنامەی (المعتزلة القدرية)کان بوو.

کەواتە ناونیشانی (معتزلة) کۆکەرەوەی هەموو جۆرە بیرورا دەرچووەکان بوو لە ئەهلی سوننەت، بەشێك لەوانە قەدەرییەکان بوو، بەڵام لە هەموو سەردەمێکدا بەش بەش و پارچە پارچە

(١) "القضاء والقدر" لعبد الرحمن بن صالح المحمود ص١٩١.

دەبوون تا ئاستی ئەوەی (الشهرستاني) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت گەیشتوونەتە دوانزە فیرقەی جیا جیا[(١)]، بەڵکوو (البغدادي) رَحِمَهُ اللَّهُ گەیاندوویەتییە هەژدە و نۆزدە فیرقە[(٢)].

### گومڕایی بیروڕای قەدەرییەکان لە قەدەردا لەم خاڵانەدا کۆدەبێتەوە:

١. لە پایەکانی قەدەردا بڕوایان بە دوو پایەی نییە، کە ئەویش (الخلق والمشيئة)یە.

دەڵێن: کردارەکانی ئادەمیزاد خوا دروستی نەکردووە، بەڵکوو ئادەمیزاد خۆی دروستی دەکات[(٣)].

قازی ناوداری موعتەزیلەکان (عبد الجبار الهمذاني) لە ساڵی (٤١٥)ی کۆچی مردووە و کاتی خۆی ئەشعەری بووە، پاشان چووەتە سەر بیروڕای موعتەزیلەکان و کۆتا زانای گەورەی موعتەزیلەکان و قازی دەوڵەتیان بووە و نووسینێکی زۆری لەو بیروڕایەدا هەیە، وەك "الأصول الخمسة" و "المغني" ...[(٤)].

دەڵێت: اتفق أهل العدل على أن أفعال العباد من تصرفهم، وقيامهم، وقعودهم حادثة من جهتهم، وأن الله أقدرهم على ذلك، ولا فاعل لها، ولا محدث سواهم، وأن من قال: إن الله خالقها ومحدثها فقد عظم خطؤه[(٥)].

واتە: کۆدەنگی (أهل العدل) "واتە (معتزلة)کان، کە بەناوی یەکێك لە بنەماکانی دینەوە ناوی خۆیان ناوە، لەگەڵ ئەوەشدا بەس (عدل) و دادپەروەری نییە کە (مخلوق) دەسەڵاتدار کەیت و (خالق) بێدەسەڵات کەیت"، دەڵێت کۆدەنگی ئەوان لەسەر ئەوەیە کە هەرچی کار و کرداری ئادەمیزاد هەیە لە هەستان و دانیشتن هەمووی لەلایەن خۆیانەوەیە و خوا بەتوانای کردوون بەسەریدا و خوا خۆی نەیکردووە و دروستی نەکردووە، ئەوەیشی بلێت خوا دروستکار و هێنەرەدییانە ئەوا هەڵەی گەورەی کردووە.

---

(١) "الملل والنحل" للشهرستاني (١/ ٤٦).

(٢) "الفرق بين الفرق" لأبي منصور البغدادي ص١١٤.

(٣) "الإيمان بالقضاء والقدر" لمحمد بن إبراهيم الحمد ص٢٦٢.

(٤) "الإيمان بالقضاء والقدر" لمحمد بن إبراهيم الحمد ص٢٦٦.

(٥) "المغني في أبواب التوحيد والعدل" لعبد الجبار الهمذاني (٢/ ٢٤٠)، و "الإيمان بالقضاء والقدر" لمحمد بن إبراهيم الحمد ص٢٦٦.

**دەربارەی تواناکانی ئادەمیزادیش دەڵێت:** يجوز أن يُفْني فعل الله الذي هو القدرة بفناء الحياة بأن يقتل نفسه، ويجوز أن يبطل فعل الغير للسكون بتحريك المحل[1].

**واته: ئادەمی دەتوانێت کۆتایی و نەبوونی بەسەر کاری خوادا بهێنێت لەکاتێکدا کە خوا ئەو ویستەی لەسەری نییە، وەك توانا و ژیانی ئادەمیزاد، وەك خۆکوشتن، واتە خوا دەیەوێت ئەو کەسە بژێت، بەڵام ئەو کۆتایی بە ژیانی خۆی دێنێت، کەواتە ویستی کەسەکە زاڵ بوو بەسەر ویستی خوادا، وە دەتوانێت کرداری بێجگە لە خۆی (واتە کرداری خوا و ئادەمیزاد) بەتاڵ بکاتەوە کە مەبەست تیایدا دریژەپێدانیەتی، وەك وەستاو و نەجوولاو بخاتە جووڵە و کار.**

**بەم شێوەیە یاخیبوونێکی بێ شومار و سەرکەشی دەدەنە پاڵ ئادەمیزاد و دەیکەنە خالق و سیفاتەکانی خوای پێدەبەخشن** ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ﴾.

**ئەم قەدەریانە ناونراون بە ئاگرپەرست و مەجووسییەکانی ئەم ئوممەتە، وەکوو ئیمامی (الطحاوي)** رَحِمَهُ اللهُ **دەڵێت:** وَقَدْ وَرَدَ فِي ذَمِّ الْقَدَرِيَّةِ أَحَادِيثُ فِي السُّنَنِ مِنْهَا: ... «**الْقَدَرِيَّةُ مَجُوسُ هَذِهِ الْأُمَّةِ**، ..» ... وَالصَّحِيحُ أَنَّهَا مَوْقُوفَةٌ، ... وَلَكِنَّ شَبَهَهُمْ لِلْمَجُوسِ ظَاهِرٌ، بَلْ قَوْلُهُمْ أَرْدَأُ مِنْ قَوْلِ الْمَجُوسِ، فَإِنَّ الْمَجُوسَ اعْتَقَدُوا وُجُودَ خَالِقَيْنِ، وَالْقَدَرِيَّةَ اعْتَقَدُوا خَالِقِينَ[2].

**واته: وەکوو ڕیوایەت زۆر هەن لە زەمکردن و بەخراپ باسکردنی قەدەرییەکان، وە زانایان بۆچوونی جیاجیایان هەیە لەسەری، بەڵام ئەوەی تەواو بێت ئەوەیە کە قسەی هاوەڵانە و فەرموودە نییە، بەڵام هاوشێوەکردنیان بە ئاگرپەرستەکانەوە (مەجووسییەکان) ئاشکرایە و بەڵکوو قسەیان خراپترە لە قسەی مەجووسییەکان، لەبەرئەوەی مەجووسییەکان باوەڕیان بە بوونی دوو خالق هەیە (واتە ئەگەر ببێت)، بەڵام قەدەرییەکان باوەڕیان بە دوو خالقی تەواو هەیە، واتە خوایەك کە تۆی دروستکردووە و تۆش کە کردەوەکانی خۆت خۆت دروستکار و داهێنەریانیت.**

**کێشەی ئەمان ئەوەیە کە جیاوازی ناکەنە نێوان (خلق وفعل)، واتە خوای تۆ کە "دروستی کردوویت و هۆکارەکانی هێنانەدی و پێویستییەکانی کارکردنیشی بۆ دروستکردوویت"، بەڵام**

---

(١) "المغني في أبواب التوحيد والعدل" لعبد الجبار الهمذاني (٨/ ٢٨٣)، و "الإيمان بالقضاء والقدر" لمحمد بن إبراهيم الحمد ص٢٦٧.

(٢) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٥٤٢.

"هەستان بە کارکردنەکە" خۆتی، واتە خوا (خالق)ە و تۆ (فاعل)یت، وەکوو ئامێرێك و دەزگایەکی شت دروستکردن کە تۆ دروستت کردووە، وە کاتێك ئامێر و دەزگاکە دەکەوێتە کار و شت و مەك و بەرهەمەکان دروستدەکات، تۆ دەڵێیت ئەم دەزگایە ئەم بەرهەمەی دروستکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا تۆ دروستت کردووە و کارەکەش لە ئامێرەکەوەیە.

بوونی ئەم بیروبۆچوونانەیان لە واقعدا لە ئاستی کەسانی تایبەت و خۆیان بووە و سەرقاڵ بوون بەم بابەتانەوە، گەر نا لە ئاستی خەڵکی گشتیدا ئەم باسانە بوونی نەبووە و خەڵك لەسەر (فطرة) و (واقع)ەکانی ژیانە کە دوور و نزیك لەسەر حەقەکەن ئەگەر بە نیوە و ناچڵیش بێت.

هەر لە ژیانی ڕۆژانەشدا ئەم قسانە بووەنەتە گاڵتەجاڕی خەڵکانی سادە، بۆیە گەورەیی بۆ ئەو خوایەیە کە عاقڵ بە عەقڵەکەی سەرگەردانە و نەزان بە نەزانینەکەی سەلامەت و لەسەر حەقە.

(أَرْطَاةُ بْنُ الْمُنْذِرِ) دەڵێت: سَمِعْتُ أَنَّهُ يُقَالُ: مَا فَتَّشْتُ قَدَرِيًّا إِلَّا وَجَدْتُهُ مَنْظُومًا بِحُمْقِهِ[(١)].

واتە: من وام دەبیست کە لەناو خەڵکیدا باو بوو دەیان وت: دیقەتی هەر قەدەرییەك بدەیت کەم عەقڵی بە نێوچەوانیدا دیارە و ئابلۆوقەی داوە.

**قسەی ئەم پیاوە لەم دوو ڕووداوەدا کە بە ڕاستی ڕوویداوە دەردەکەوێت:**

**یەکەم:** رَوَى عَمْرُو بْنُ الْهَيْثَمِ قَالَ: خَرَجْنَا فِي سَفِينَةٍ، وَصَحِبَنَا فِيهَا قَدَرِيٌّ وَمَجُوسِيٌّ، فَقَالَ الْقَدَرِيُّ لِلْمَجُوسِيِّ: أَسْلِمْ، قَالَ الْمَجُوسِيُّ: حَتَّى يُرِيدُ اللهُ، فَقَالَ الْقَدَرِيُّ: إِنَّ اللهَ يُرِيدُ، وَلَكِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يُرِيدُ! قَالَ الْمَجُوسِيُّ: أَرَادَ اللهُ وَأَرَادَ الشَّيْطَانُ، فَكَانَ مَا أَرَادَ الشَّيْطَانُ! هَذَا شَيْطَانٌ قَوِيٌّ!! وَفِي رِوَايَةٍ أَنَّهُ قَالَ: فَأَنَا مَعَ أَقْوَاهُمَا!![(٢)].

واتە: (عەمری کوڕی هیشام) دەڵێت: لە بەلەمێکدا بووین دوو کەسمان لەگەڵدا بوو (قەدەرییەك و مەجووسییەك)، قەدەرییەکە بە مەجووسییەکەی وت: موسوڵمان بە، مەجووسییەکەش وتی: هەرکاتێك خوا ویستی لەسەر بوو موسوڵمان دەبم، قەدەرییەکەش وتی: خوا ویستی لەسەرە بەڵام شەیتان ویستی لەسەر نییە، مەجووسییەکەش وتی: ویستی خوا و ویستی شەیتان؟! کەواتە با

---

(١) "القدر" للفريابي ص٢٠٠، و"القضاء والقدر" للبيهقي (٥٢٥) عن عطاء.

(٢) أخرجه ابن بطة في "الإبانة" (١٩١٣)، والآجري في "الشريعة" (٥٦٠)، والفريابي في "القدر" (٣٥٩)، وانظر "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٢٢٧.

ویستی شەیتان بێت، ئەو بەهێزە و منیش لەگەڵ بەهێزەکەیاندام. واتە چۆن دەبێت ویست و ئیرادەیەك هەبێت لە ئاستی ویست و ئیرادەی خوادا لە توانادا؟!

مەجووسییەکە بە (فطرة)ی خۆی زانی کە چۆن شەیتان توانا و ویستی زاڵ دەبێت بەسەر ویست و توانای خوادا یان لە ئاستیدا دەبێت؟! بەڵکوو خوا ویستی لەسەرە و خۆی ویستی نییە.

**دووەم:** وَقَفَ أَعْرَابِيٌّ عَلَى حَلْقَةٍ فِيهَا عَمْرُو بْنُ عُبَيْدٍ، فَقَالَ: يَا هَؤُلَاءِ إِنَّ نَاقَتِي سُرِقَتْ فَادْعُوا اللهَّ أَنْ يَرُدَّهَا عَلَيَّ، فَقَالَ عَمْرُو بْنُ عُبَيْدٍ: اللَّهُمَّ إِنَّكَ لَمْ تُرِدْ أَنْ تُسْرَقَ نَاقَتُهُ فَسُرِقَتْ، فَارْدُدْهَا عَلَيْهِ! فَقَالَ الْأَعْرَابِيُّ: لَا حَاجَةَ لِي فِي دُعَائِكَ! قَالَ: وَلِمَ؟ قَالَ: أَخَافُ -كَمَا أَرَادَ أَنْ لَا تُسْرَقَ فَسُرِقَتْ- أَنْ يُرِيدَ رَدَّهَا فَلَا تُرَدُّ!![1].

واتە: کابرایەکی لادێیی هاتە مەجلیسی دەرسی (عمرو بن عبيد) سەردەستەی (معتزلة)کان، وایزانی (أهل العلم)ن، وتی: ئەی خەڵکینە من حوشترەکەم دزراوە دوعای خێرم بۆ بکەن بۆم بگەڕێتەوە، مامۆستاکەیان (عمرو) دەستی هەڵبڕی و وتی: خوایە تۆ نەتویست حوشترەکەی بدزرێت و دزرا، خوایە بۆی بگێڕەرەوە، لادێییەکە وتی: پێویستم بە دوعای تۆ نییە، (عمرو) وتی بۆ؟ لادێییەکە وتی: ئەترسم وەکوو چۆن نەیویست بدزرێت و دزرا ئاوا بیەوێت بۆم بگێڕێتەوە و نەگەڕێتەوە (واتە نەتوانێت بیگێڕێتەوە). ئەم لادێییە بە (فطرة) و ژیانی خۆی زانی ئەم کەسە لەسەر گومڕاییە و قسەکەی هەڵەیە.

کەواتە ئەم بیروڕایانە لە بازنەی داخراوی خۆیان و مەجلیسەکانیاندا هەبوو، کاریگەری لەسەر خەڵکی گشتی نەبووە، (عمرو بن عبيد)ی مامۆستایان هیچ وەڵامێکی نەبوو بۆ لادێییەکە.

هەروەك دەگێڕنەوە ڕۆژێك خەڵکێکی زۆر لە دەوری ئیمامی (الرازي)دا بوون، پیرێژنێك پرسیاری کرد ئەم کەسە کێیە دەورتان داوە؟ قوتابییەکی وتی: هذا شيخنا الرازي الذي يملك ألف دليل على وجود الله، فضحكت وقالت: تعس والله وخسر، أفي الله شك؟! إذاً: عنده ألف شك ...[2].

---

(١) أخرجه ابن بطة في "الإبانة" (١٩١٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٣٧٦)، وانظر "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٢٢٧.

(٢) "شرح العقيدة التدمرية" لناصر العقل (٣/١٩)، و"شرح العقيدة الطحاوية" لناصر العقل (٤/٦).

واته: ئەوە مامۆستاکەمانە کە هەزار بەڵگەی هەیە لەسەر بوونی خوا، پیرەژنەکەش وتی: ئەی تیاچێت و زەرەرۆمەند بێت، ئەوە لە بوونی خوادا گومان هەیە تا بەڵگەی بوێت؟ کەواتە هەزار گومانی هەبووە.

بەم شێوەیە قسە و بیرورِاکانیان پێچەوانەی عەقڵ و (فطرة) و (واقع) و تێگەیشتنی ناو ژیانی ئاسایی بووە، بەدەر لە گومرِایی و لادان و سەرلێشێواوی لە تێگەیشتنی دەقەکانی قورئان و فەرموودە (صحیح)ەکان.

٢. جیانەکردنەوەیان لە نێوان ویست و ئیرادەی خوایی و خۆشەویستی و پێرِازیبوونی (الإرادة والمشيئة والمحبة والرضا).

(ابن أبي العز) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: مَنْشَأُ الضَّلَالِ: مِنَ التَّسْوِيَةِ بَيْنَ الْمَشِيئَةِ وَالْإِرَادَةِ، وَبَيْنَ الْمَحَبَّةِ وَالرِّضَا، فَسَوَّى بَيْنَهُمَا الْجَبْرِيَّةُ وَالْقَدَرِيَّةُ، ثُمَّ اخْتَلَفُوا، فَقَالَتِ الْجَبْرِيَّةُ: الْكَوْنُ كُلُّهُ بِقَضَائِهِ وَقَدَرِهِ، فَيَكُونُ مَحْبُوبًا مَرْضِيًّا، وَقَالَتِ الْقَدَرِيَّةُ النُّفَاةُ: لَيْسَتِ الْمَعَاصِي مَحْبُوبَةً لِلَّهِ وَلَا مَرْضِيَّةً لَهُ، فَلَيْسَتْ مُقَدَّرَةً وَلَا مَقْضِيَّةً، فَهِيَ خَارِجَةٌ عَنْ مَشِيئَتِهِ وَخَلْقِهِ[(١)].

واته: بنەمای گومرِاییەکان لەوەوە سەری هەڵدا کە واتای ویست و ئیرادە و پێخۆشبوون و رِازیبوون دەبێت هەمووی یەك واتای هەبێت لایان، ئەوەی ویستی لەسەرە دەبێت پێشی خۆشبێت و پێشی رِازیبێت، واتە ئەوەی لە بووندا هەبێت خوا ویستی لەسەرە، وە کاتێکیش خوا ویست و ئیرادەی لە بوونی ئەو شتەدا هەبێت کەواتە دەبێت پێی خۆشبێت و پێشی رِازیبێت.

ئەمە تێگەیشتنی (الجبرية والقدرية)کانە لەسەری، بەڵام لە ئەنجامی کارەکاندا رِای جیاوازیان هەیە، **(الجبرية)کان دەڵێن:** هەموو بوون بە دانان و قەدەری خوا بووە، کەواتە دەبێت هەمووشی شوێنی رِازیبوون و پێخۆشبوونی خوا بێت، بەڵام **(القدرية)کان دەڵێن:** نەخێر، بەڵکوو تاوان و کارە خراپەکان خوا پێی خۆش نییە و رِازی نییە لەسەریان، کەواتە دەبێت خوا قەدەری وای نەبێت و ویستیشی لەسەر نییە، وە ئەویش دروستی نەکردوون و لە دەرەوەی ویست و ئیرادە و دروستکردنی خواییدان، کەواتە (مخلوق) خۆی دروستیان دەکات و ئیرادەی لەسەریانە.

(١) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٢٢٨.

(**القاضي عبد الجبار الهمذاني**) **دەڵێت**: وذلك متى أراد الشيء أحبه ومتى أحبه أراده ... فثبت ... أن كل من جازت عليه الإرادة جازت عليه المحبة، وأنه تعالى إذا صح كونه مريداً فيجب كونه محباً، وكل ما صح أن يريده صح أن يحبه ...[1].

**واته: هەرکاتێك ئیرادەی لەسەر شتێك هەبوو ئەوە خۆشی دەوێت، وە هەرکاتێك خۆشی ویست ئەوە ئیرادەی لەسەرە.**

**وە بۆ تاوان و خراپەکانیش دەڵێت**: إنه تعالى لا يريد القبائح ولا يشاؤها، بل يكرهها ويسخطها[2].

**واته: خوای گەورە بە هیچ شێوەیەك خراپەکانی ناوێت و ویستیشی لەسەر نییە، بەڵکوو رِقی لێی بوو دەیبوغزێنێت.**

**کەواتە بە هیچ شێوەیەك تاوان و خراپەکان خوا نە دروستیکردوون و نە ویستیشی لەسەر بوونیانە.**

**کەواتە ئەنجامی قسەکەیان ئەوەیە**: بأنه يقع في ملك الله ما لا يريد ولا يشاء[3]. **دەبێت لە موڵك و دەسەڵاتی خوادا بوون و کارێك هەبێت کە خوا ویست و ئیرادەی لەسەر نەبێت و بەڵکوو ئەویش دروستی نەکردوون، ئەم ئەنجامە بۆخۆی ناتەواوی و بێدەسەڵاتی خوا دەردەخات لە خوایەتی خۆیدا بەسەر دروستکراوەکانیدا** ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ﴾.

**هۆکاری ئەم گومڕاییانەی قەدەرییەکان لە بابەتی قەدەردا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیفەتانەی کە فیرەقە گومڕاکان تێیکەوتوون، ئەویش زیادەڕەوی و کەمڕەوییە (الإفراط والتفريط) لە باوەڕپێبوون و باوەڕپێنەبووندا (النفي والإثبات) لە هەموو بابەتە دینییەکاندا بەتایبەت غەیبییەکان.**

**بۆ نموونە: موعتەزیلە و قەدەرییەکان لە (النفي)دا واتە بێگەردکردنی خوا لەوەی کە لە (مخلوقات) ناچێت لە سیفەتەکانیدا باوەڕیان بە سیفاتەکانی خوا نەما، ئەوەندە زیادەڕەوییان کرد لە**

(١) "المغني" لقاضي عبد الجبار الهمذاني (٦/ ٥١).

(٢) "شرح الأصول الخمسة" لقاضي عبد الجبار الهمذاني ص٤٦٠، و "وسطية أهل السنة بين الفرق" لمحمد با كريم محمد با عبد الله ص٣٨٤.

(٣) "وسطية أهل السنة بين الفرق" لمحمد با كريم محمد با عبد الله ص٣٨٧.

لێکنەچوونی سیفاتەکانی بە هیچ سیفاتێکەوە، کە بۆخۆی زیادەڕەویکردنە لە بەشی یەکەمی ئەم ئایەتەدا و نەیانتووانی باوەڕبێنن بە بەشی دووەمی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ [الشورى : ١١]. هیچ شتێك هاوشێوە و لێکچووی سیفاتەکانی خوا نییە و بیسەر و بینەریشە، واتە (ليس كمثله شيء) زیادەڕەوییان تێدا کردووە و نەیانتووانی لە (الإثبات)دا باوەڕ بێنن بە (وهو السميع البصير)، وەك چۆن لە بەرامبەریشدا (مشبهة ومجسمة)کان لە زیادەڕەوی لە (الإثبات)دا کەوتنە شوبهاندنەوە و نەیانتووانی لە (النفي)دا کە (ليس كمثله شيء)ە پارێزراو بن.

قەدەرییەکانیش زیادەڕەوییان کرد لە (نفي) و بێگەردکردنی خوادا لە شەڕ و خراپە و تاوانەکان تا کەوتنە ئەوەی خوا ئەوانەی دروست نەکردووە و ویست و ئیرادەیشی لەسەر بوونیان نییە و خوایان بێدەسەڵات کرد لە ئاست و بوون و ئیرادەیاندا (نعوذ بالله من قولهم)، وە لە ئەنجامدا ئادەمیزادیان کردە (خالق) و بوون و خاوەن ویست و ئیرادە لەسەریان، سەرئەنجام (مخلوق)یان کردە (خالق).

هەروەك زیادەڕەوییان کرد لە بەشی دووەمی ئەم فەرموودەیەدا: «وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ، وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ»[(١)]، هەموو خێرەکان بە هەردوو دەستی تۆیە، وە شەڕ لە تۆوە نییە، بەڵام ئەوان وتیان مەخلوقات کارەکان دەکەنە شەڕ، گەر نا تۆ بە شەڕ دروستت نەکردووە.

یاخود لە ئایەتەکانی ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾﴾ [البقرة : ٢٠٥]، ﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ﴾ [الزمر : ٧]. زیادەڕەوییان کرد تا کەوتنە باوەڕنەبوون بە قەدەری خوا لەسەر بوونی ئەو کارانە و هێنانەدییان لەلایەن خواوە.

هەروەك چۆن لە حوکمەکاندا (الأحكام) لە زیادەڕەویکردن لە نەبوونی تاوان لەگەڵ ئیماندا ئەمان و خەوارجەکانیش کەوتنە (تكفير وتفسيق)کردنی ئیمانداران، وە لە بەرامبەریشدا (مرجئة)کان لە زیادەڕەویکردن لە (الإثبات) واتە بوونی ئیمان لای ئیماندار و مانەوەی ئیمان بۆی لەگەڵ هەبوونی تاوان لە ئادەمیزاددا کەوتنە ناو دەرکردنی (عمل) و کردار لە ئیماندا و وتیان

---

(١) رواه مسلم (٧٧١)، وأبو داود (٧٦٠)، والترمذي (٣٤٢٢)، والنسائي في "الكبرى" (٩٧٣)، وابن حبان في "صحيحه" (١٧٧٣)، والدارمي في "سننه" (١٢٧٤)، والدارقطني في "السنن" (١١٣٧)، والبزار في "المسند" (٥٣٦)، وأبو يعلى في "مسنده" (٥٧٤)، والبيهقي في "الشعب" (٢٨٦٤)، والبغوي في "شرح السنة" (٥٧٢).

ئیمان بەس (معرفة) و زانینە بەسەر خوادا و دان پیادانانە پێی، ئەگەر خاوەنەکەشی خاوەنی هیچ کار و کردارێکیش نەبێت ئەوا لە ئیمان ناچێتە دەرەوە.

**بیروبۆچوونی (المعتزلة والقدرية)كان بە گشتی:**

١. **لە (توحيد الأسماء والصفات)دا:** باوەڕنەبوون بە شێوەیەکی گشتی بە سیفاتەکانی خوا.

٢. **لە پێناسەی (الظلم)دا بۆ خوا:** دەڵێن: ڕێی لێ ناگیرێت، بەڵام خوا ناتوانێت بیکات (الظلم ممكن لكن لايقدر عليه).

٣. **لە کرداردا (مشبهة الأفعال معطلة الصفات):** کردارەکانی (خالق) هاوشێوە دەکەن بە کردارەکانی (مخلوقات)ەوە.

ئەوەی لە (مخلوقات)دا باش بێت ئەوا بۆ خواش باشە، وە ئەوەی خراپ بێت بۆ خواش نەگونجاوە، پێوەرەکە تێگەیشتن و زانینی ناو ئادەمیزادە و لە سەروو ئەوەوە هیچ (معرفە)یەکی تر بۆ خوا نییە.

٤. **لە (الحكمة والتعديل)دا:** ڕەچاوکردنی هۆکارەکان و بوونی دانایی لە (تشریع)ی خوا و کرداری خوادا، پێوانەکانیان جۆری حیکمەتەکانی ناو ئادەمیزادە بەشێوەیەك: تعود إلى العباد لنفعهم والإحسان إليهم. دەبێت هەموو حیکمەت و ڕەچاوکردنەکانی یاساکانی خوا سوودمەندی ئادەمیزادی تێدا بێت، شەریعەت و یاسایەکیان بە عەقڵی خۆیان بۆ خوا دانا کە دەبێت بەگوێرەی ئەوە کار بکات.

٥. **لە قەزا و قەدەردا:** بیروڕایان وایە کە: لا قدر، وأن الأمر أنف، فمن شاء هدى نفسه، ومن شاء أضلها ... مردود إلى مشيئة العبد أثناء العمل. قەدەر و نووسین لەسەر ئادەمیزاد بوونی نییە تا خۆی کارەکان دەکات، وە ئادەمیزاد هەموو هۆکارەکان لای خۆیەتی، دەتوانێت خۆی هیدایەت بدات یاخود خۆی گومڕا بکات، واتە خۆی کردەوەی خۆی دروست دەکات و خوا دەسەڵاتی لە بوونیدا نییە.

٦. **لە (تشریع)دا:** پێداگری تەواو دەکەن لەسەر جێبەجێکردنی شەرعی خوا لە (الأمر والنهي)دا، لەبەرئەوەی باوەڕیان وایە کە ئادەمیزاد خۆی هێنەرەدی کردارەکانیەتی.

بەڵام لە لایەنی (التوحید)دا نەیانتوانی باوەڕ بە قەدەر بێنن، بۆیە باوەڕیان بە قەدەری شەرعی هەبوو بەڵام باوەڕیان بە قەدەری کەونی نەبوو، یا بە پێناسەیەکی تر نەیانتوانی کۆکەرەوەی نێوان (الشرع والعدل) بن لە یەك کاتدا.

**٧. لە پێناسەی قورئاندا دەڵێن وەکوو هەموو دروستکراوەکانە و (مخلوق)ە:** هەمان قسەی موشریکەکان کە دەیانوت: ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ ٢٥﴾ [المدثر : ٢٥]. ئەمە لە قسەی ئادەمیزاد دەچێت و قسەی ئادەمیزادیش (مخلوق)ە، هەردووڵا یەك ئەنجام دروست دەکات ئەویش نەمانی قورئانە وەکوو فەرموودە و بەرنامەی خوایی.

لە ئاستی فەرموودەشدا دابەشیان کردووە بەسەر (الآحاد والمتواتر)دا، کار بە (الآحاد) ناکەن گەر لە (بوخاری و موسلیم)یشدا بێت، وە (المتواتر)یش گەر نەگونجێت لەگەڵ بنەماکانیاندا ئەوا ئەویش بەر لێشاوی پەراوێزکردنیان دەکەوێت، هەموو ئەمانە بۆ خۆرزگارکردنە لە فەرموودەکان[1].

**٨. بیروڕایان بە گشتی دەربارەی خوا ئەوانەی لە بازنەی (معتزلة)دا کۆدەبنەوە دەڵێن:** هیچ شتێك بوونی نییە لە سەرەوە، نە (عرش) نە بینیی خوا نە سیفاتی ...، بەڵکوو: ما فوقه إلا العدم المحض والنفي الصرف[2]. بەڵکوو لە مێشك و بیری خۆتدا داینێ کە بوونێك هەیە و ناوی خوایە، داڕنراوە لە سیفات و شوێن و بینین و بەڕێوەبردن و دروستکردن ...، بێبڕوا و عەلمانی و موحیدەکانی ئەم سەردەمەش بیروڕایان سەبارەت بە خوا هەر بەو شێوەیە.

**٩. لە پێناسەی دادپەروەری بۆ خوا (العدل)دا:** دەڵێن: لە دادپەروەری خوا ئەوەیە کە کردەوەی (الملائکة والجن والإنس)ی نە دروستی کردبێت، وە نە نەبوونیشی بەسەردا هێنابێت،لەبەرئەوەی گەر خوا دروستی کردبێت یاخود ڕێگری و نەبوونی بەسەردا هێنابێت؛ ئەوکات خاوەنەکەی بۆچی پاداشت و سزای لەسەر وەرگرێت؟ (فهذا توحيدهم وذاك عدلهم)، (أثبتوا له حمداً بلا ملك)، سوپاس و ستاییشی بۆ دەکرێت بەبێ موڵك و دەسەڵات، وە هەروەها بۆ خوا ئیرادە و ویست و ڕازیبوون یەك واتای هەیە (الإرادة والمشيئة تستلزم المحبة والرضا).

---

(١) ينظر "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي (١/ ٣٤٠).

(٢) "شفاء العليل" لابن القيم ص٣.

١٠. هەموو بیروڕاكانیان كۆدەبێتەوە لە ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ﴾ [الشورى : ١١]، ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰۚ﴾ [النحل : ٦٠].دا، واتە لە (النفي)دا، بۆ پاك و بێگەردكردنی پەروەردگار لە هەموو سیفات و كردار و جۆری تێگەیشتن و پێناسەیەكی نەشیاو بۆ خوا، بەڵام بە هۆكاری زیادەڕەوییان تیایدا و بەكارهێنانی عەقڵ و پەیوەست نەبوون بە قورئان و فەرموودەوە كەوتنە ئەودیو فەرمانەكانی ئیسلامەوە بەبێ ئەوەی بەخۆیان بزانن، وە لە دۆستەوە بوونە دوژمنی دین و بەرنامەی حەقی ئیسلام.

ئەمانە و زۆرتر لەمانە بیروڕای گومڕای موعتەزیلە و قەدەرییەكانە كە هیچ متمانەیەك نییە لە هیچ شتێكی دینیدا گومڕا نەبووبێتن.

  

# ناوادارترین فیرەقەکانی قەدەر

## دووەم: جـەبـەرییـەکـان

## الـجبريـة

جەبەرییەکان نازناوێکە بۆ ئەو کەس و فیرەقانەی کە زیادەڕەوییان کردووە لە باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر و دەسەلأتی خوا، تا کەوتوونەتە باوەڕنەبوون بە جێبەجێکردنی شەرع و نەبوونی توانا لە کار و کردەوەدا (تعظيم القدر ونفي الشرع).

**بیروڕایان:** نفي الفعل حقيقة عن العبد وإضافته إلى الرب تعالى[١]، وَأَنَّ فِعْلَ الْعَبْدِ بِمَنْزِلَةِ طُولِهِ وَلَوْنِهِ[٢]. باوەڕیان وایە کە بە هیچ شێوەیەك ئادەمیزاد خاوەن توانا و ئیرادەیەك نییە لە هێنانەدی کار و کردەوەکانیدا، بەڵکوو بەس توانا و ئیرادەی خوا بوونی هەیە لە (واقع)دا، وە تواناکانی ئادەمیزاد وەکوو ڕەنگ و بالأ و شیوەیانە کە هیچ دەسەلأتێکی تیایاندا نییە.

جەبەرییەکان نازناوە بۆ هەموو ئەو فیرەقانەی کە بە دوور و نزیك خاوەنی ئەم بیروڕایەن، ناودارترینیان جەهمییەکانە (الجهمية) کە شوێنکەوتەی (الجهم بن صفوان)ن و ئەویش مامۆستاکەی (الجعد بن درهم)ە، دەڵێن ئەویش لە (طالوت)ی خوشکەزای (لبيد بن أعصم)ەوە وەریگرتووە، وە (لبيد)یش لە (أعصم)ەوە وەریگرتووە، وە (أعصم)یش ئەو کەسە جوولەکەیەیە کە سیحرەکەی کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ[٣].

وەکوو مێژوو سەرەتای ئەم فیرەقانە یا جوولەکە بوون یان گاوور یان مەجووسی، وەك دەرکەوت کە بنەمای ئەم بیروڕایە یەهوودییەکانە، هەروەك بنەمای ڕافیزەی شیعەکان کە (عبد الله بن سبأ)ی جوولەکەی یەمەن بوو، وە بنەمای قەدەرییەکان وەکوو ئیمامی (الأوزاعي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: أَوَّلُ مَنْ نَطَقَ بِالْقَدَرِ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ يُقَالُ لَهُ: سَوْسَنُ، وَكَانَ نَصْرَانِيًّا فَأَسْلَمَ، ثُمَّ تَنَصَّرَ، فَأَخَذَ عَنْهُ مَعْبَدٌ الْجُهَنِيُّ، وَأَخَذَ غَيْلَانُ عَنْ مَعْبَدٍ[٤].

---

(١) "الملل والنحل" للشهرستاني (١/ ٨٥).

(٢) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٥٢٤.

(٣) "بيان تلبيس الجهمية" لابن تيمية (٦/ ٣١٥).

(٤) أخرجه ابن بطة في "الإبانة" (١٩٥٤)، والآجري في "الشريعة" (٥٥٥)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٣٩٨)، والفريابي في "القدر" (٣٤٨).

وە بیروڕای قەدەرییەکان کە دەڵێن: (خێر خوا دروستی کردووە و شەڕیش بێجگە لە خوا دروستی دەکات و دەیەوێت کە ئادەمیزاد و شەیتانە)؛ هەمان بیروڕای مەجووسییەکانە کە باوەڕیان بە خوای خێر و شەڕ هەیە.

گەر بەدواداچوونێك بکەین دەبینین سەری گومڕاکان ژیاننامە و باسی دوو کەسە، ئەوانیش: (جهم وجعد)ن، ئەم دوو ناوە لەناو زانایان و چینی خواناساندا ناو و باسی ژیاننامە و پلەوپایەی زانستی و خواپەرستییان ونە و نییە و ناودار نین، وەکوو ئیمامی (ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَكَانَ جَهْمٌ فِيمَا بَلَغَنَا لَا يُعْرَفُ بِفِقْهٍ وَلَا وَرَعٍ وَلَا صَلَاحٍ[1].

واتە: جەهم یەکێك نییە لەوانەی ناسراو بێت بە شارەزا لە شەرع، وە بە خاوەن تەقوا و پیاوساڵحیش نەناسراوە.

وەکوو ئیمامی (ابن مبارك) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت:

عَجِبْتُ لِشَيْطَانٍ أَتَى النَّاسَ دَاعِيًا     إِلَى النَّارِ وَانْشَقَّ اسْمُهُ مِنْ جَهَنَّمِ[2]

واتە: سەرسامم کە شەیتانێك بە ئاشکرا بانگەوازی خەڵك دەکات بۆ ئاگر، ناویشی لە جەهەننەمەوە داڕێژراوە.

ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە وەکوو سزایەکی خوایی هەموویان بە شێوەیەکی گشتی کوژراوی هۆکاری گومڕاییەکانیان بوون، وەکوو (جهم بن صفوان) لە ساڵی (٢٨٨)ی هیجری بە دەستی (سلمة بن أحوز) کوژرا کە ئەمیری خوراسان بوو[3]، وە (جعد بن درهم) لە ساڵی (١١٨)ی هیجری بە دەستی (خالد القسري) کە ئەمیری عێراق بوو کوژرا، لە جەژنی قوربان‌دا وتی: خەڵکان قوربانییەکانتان بکەن خوا لێتان قبووڵ بکات، (جعد بن درهم) دەڵێت خوا (إبراهيم) عَلَيْهِ السَّلَامُ ی نەکردووەتە خەلیلی خۆی و (موسى) عَلَيْهِ السَّلَامُ خوا قسەی لەگەڵ نەکردووە ... منیش دەیکەمە قوربانی، لەسەر مێمبەرەکەی دابەزی و سەری بڕی[4].

---

(١) "الفتاوى الكبرى" لابن تيمية (٦/ ٣٦١).

(٢) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٨/ ٤١١)، و"الصواعق المرسلة" لابن القيم (٤/ ٣٩٨).

(٣) "الأعلام" للزركلي (٢/ ١٣٨)، و"شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي (١/ ٢٧٣).

(٤) "الأعلام" للزركلي (٢/ ١٤١)، "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢/ ٣٥٤)، "الصواعق المرسلة" لابن القيم (٤/ ٣٩٩).

(جهم بن صفوان) لەگەڵ (السمنية)كاندا كە باوەڕیان بەس بە بوونە دیارەكان بوو (المادية)، وتوویژی كرد تا پێیان وت: ئایا ئەوەی تۆ دەیپەرستیت بینیوتە یاخود تامت كردووە یا بۆنت كردووە و دەستت لێداوە یا بیستووتە؟ وتی: نەخێر، وتیان كەواتە شتێكی نەبوو (معدوم) دەپەرستیت، لەپاش ئەم وتوویژ و قسەكردنە لەگەڵیان: تَرَكَ الصَّلَاةَ أَرْبَعِينَ يَوْمًا عَلَى وَجْهِ الشَّكِّ، فَقَالَ: لَا أُصَلِّي لِمَنْ لَا أَعْرِفُ، ثُمَّ اشْتَقَّ هَذَا الْكَلَامَ[1]، ثُمَّ لَمَّا خَلَا قَلْبُهُ مِنْ مَعْبُودٍ يُؤَلِّهُهُ، نَقَشَ الشَّيْطَانُ اعْتِقَادًا نَحَتَهُ فِكْرُهُ، فَقَالَ: إِنَّهُ الْوُجُودُ الْمُطْلَقُ!! وَنَفَى جَمِيعَ الصِّفَاتِ، وَاتَّصَلَ بِالْجَعْدِ[2]. ئەم پیاوە كە ناوی (جهم)ە چل ڕۆژ نوێژی نەكرد و تەركی كرد و كەوتە گومانەوە و وتی: نوێژ ناكەم بۆ یەكێك كە نەیناسم، پاشان بەدوای ئەم قسەیەیدا ڕۆیشت و بەرەو شیكردنەوە و بیركردنەوەی برد، تا كاتێك دڵی بەتاڵ بوو لە خواپەرستی، شەیتان بیروڕایەكی لە عەقڵێدا بۆ داتاشی و بۆی دارِشت و پێی وت: خوا بوونێكی گشتییە (الوجود المطلق)، وەكوو هەوا ....، لە هەموو شوێنێكە و هیچ سیفاتێكی نییە، ئەویش لەم خاڵەوە گەڕایەوە و كەوتە سەرەتای بیركردنەوە لە خوا تا بەو شێوەیە كەوتە پێناسەی و وتی: شوێن و سیفات و بینین ... ئەمانەی هیچ نییە و بوونێكی ڕەهایە.

## بیروڕای (الجهمية)كان بەشێوەیەكی گشتی لە هەموو بوارە دینییەكاندا[3]:

١. لە (توحيد الأسماء والصفات)دا: باوەڕیان بە هیچ ناو و سیفاتێكی خوا نییە و دەڵێن ناوەكانی خوا هەموویان (مجاز)ن، واتە مەبەستی تری لە پشتەوە هەیە نەك ناوەكە بێت، وە سیفاتەكانیش بەو شێوازەی كە لە دەقەكاندا باسكراوە دەبێتە هۆكاری شوبهاندن و شێوەكاری بۆ خوا بە (جسم) و لاشەی (مخلوقات)ەوە، بۆیە نابێت خاوەنی ئەو سیفاتانە بێت تاوەكوو لە (مخلوقات) نەچێت.

---

(١) "خلق أفعال العباد" للبخاري ص٣٠، و "الإبانة" لابن بطة (٢٧٨)، و "شرح أصول اعتقاد" للالكائي (٦٣٠)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ٥٤).

(٢) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٥٢٣.

(٣) "موسوعة الفرق المنتسبة للإسلام" (٦/ ٤٢١ – ٤٤٢)، و "جامع الرسائل" لابن تيمية (١/ ٣٠ – ٥٠)، و "الصواعق المرسلة" لابن القيم، و "مقالات الإسلاميين" للأشعري، و "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي (١/ ١٤٠، ١٤٤، ٥٤١)، ولابن جبرين (٤٧/ ٦)، و "فرق معاصرة" لدكتور غالب بن علي عواجي (٣/ ١١٤٨).

**٢. لە قەزا و قەدەردا: جەبرییەکانن،** بەڵکوو بنەمایانە و دەڵێن: هیچ کارێك لە دەسەڵاتی ئادەمیزاددا نییە و هەموو کردارەکانی خوا پێی دەکات و کردەوەکانی بەشێوەی (مجاز) نازناوێك دەخرێتە پاڵی، گەر نا هیچ بڕاردە و ئیرادەیەك بوونی نییە لای ئادەمیزاد، وەکوو پەڕێك وایە لە هەوادا.

**٣. باوەڕنەبوون** و دژایەتیکردنی زۆری بابەتە غەیبییەکان، وەکوو: (الصراط، الميزان، رؤية الله، عذاب القبر، القول بفناء الجنة والنار ...)، ئەمانە هیچیان بوونیان نییە.

**٤. باوەڕیان بە قورئان نییە** کە (كلام الحقيقي) قسەی ڕاست و دروستی خوا بێت و (جبريل) ﷺ لە خواوە بیستبێتی و ئەویش گەیاندبێتی بە پێغەمبەر ﷺ، بەڵکوو دەڵێن دروستکراوە (مخلوق) و لە زات و وجوودی خۆیەوە نەبووە و نەبیستراوە، بەڵکوو لە دەرەوەی خۆی بیستراوە و گەیشتووە بە (محمد) ﷺ، بۆیە خاوەنی قسەی (قرآن كلام الله مخلوق)ن.

**٥. لە پێناسەی ئیماندا دەڵێن:** الإيمان هو المعرفة بالله. واتە: ئیمان تەنها ناسینی خوایە بە دڵ و بەس، دانپێدانان و کردەوە (الإقرار والعمل)ی تێدا نییە.

**٦. باوەڕیان بەوەیە** کە خوای پەروەردگار لە هەموو شوێنێکە، لەسەر عەرش و ڕووگەی سەرەوە نییە، ئەمانە و چەندەها بیروڕای گومڕاییان لە چوارچێوەی ئەم بابەتانەدا کە هەمووی بە کۆکراوەیی دەرچوونە لە دین و دابڕانە لە ناوەڕۆك و سەرچاوەی دین، بۆیە زانایان پێیان دەڵێن: فَإِبْلِيسُ مَعَ كُفْرِهِ كَانَ أَعْرَفَ بِرَبِّهِ مِنَ الْجَهْمِيَّةِ[١].

ئەم بیروڕای جەهمیانە بە شێوەیەکی گشتی بڵاوبووەتەوە بەسەر هەموو فیرەقەکاندا بە شێوەیەکی دوور و نزیك لەخۆیان گرتووە، هەر لە: (المرجئة والأشاعرة والماتريدية والقدرية والشيعة والخوارج والتصوف)، بەتایبەت (متأخرين)ی ئەو فیرەقانە بە شێوەیەکی گشتی هەموو ئەهلی بیدعە و گومڕاکان لە بەرەیەکن و ئەهلی سوننە و جەماعەت پەیوەست بە (منهج السلف الصالح) لە بەرەیەکی ترن.

وەکوو ئیمام (أحمد) رَحِمَهُ اللَّهُ دەربارەیان دەڵێت: مختلفون في الكتاب، مخالفون للكتاب، مجمعون على مفارقة الكتاب[٢]. واتە هەموو فیرەقەکان ڕای جیاوازیان هەیە لە وەرگرتن و

(١) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي (١/ ١٩٢). (٢) "الرد على الجهمية والزنادقة" للإمام أحمد ص٥٦.

تێگەیشتنی قورئان، وە هەموویا پێچەوانەی ڕاست و دروستی قورئانن، وە هەموویان لەوەدا کۆدەنگ و یەکڕیزن کە پێچەوانەی قورئان بن بە پێشخستنی "عەقڵ و ڕاوبۆچوون و خەیاڵ و خەو ..." بەسەر قورئان و فەرموودەدا.

**٧. لە (الإرادة والمشيئة والمحبة والرضا)دا بۆ خوا: یەك واتایان هەیە** و هەرچییەك لە بوونەوەردا هەیە لە بوون و کردار هەمووی ویست و ئیرادەی خوای لەسەرە و پێی خۆشە و پێشی ڕازییە.

**٨. لە (الحكمة والتعليل)دا: دانایی و هۆکار لە کاری خوادا نییە بێجگە لە ویست و** ئیرادەی گشتی نەبێت (المشيئة المطلقة)، بەگوێرەی ئەم بیروڕایە تیاچوونی گەلان و خەڵکی لەلایەن خواوە هۆکاری تاوان و لادانەکانیان نەبووە لە فەرمانی خوا، وە بەخشینی هیدایەت و نیعمەتەکانی خواش هۆکاری ئیمان و کاری چاکە نەبووە، کەواتە گەر پێچەوانەش بێتەوە دروستە و دەشێت هەموو خواناسان و ئەولیاکان و پێغەمبەران سزا بدات، وە کافران و دووڕووان و تاوانباران ببەخشێت و بیانخاتە بەهەشتەوە و ئاسوودەیان بکات.

بۆیە هیچ واتا و مەبەستێك لەم وشانەدا (علم وعدل ورحمة وحكمة وخبير ...) بۆ خوا نەمایەوە بێجگە لە ویست و ئیرادەی ڕەهای خوا نەبێت (المشيئة المطلقة)، لە کۆتاییدا ئەنجامی ئەم قسانە ئەوەیە کە: يبغضون الله إِلَى خلقه ويقطعون عَلَيْهِم طَرِيق محبته والتودد إِلَيْهِ بِطَاعَتِهِ ... وَأَن الله سُبْحَانَهُ لَا تَنْفَع مَعَه طَاعَة ... وَأَن العَبْد لَيْسَ على ثِقَة وَلَا أَمن من مكره[١]. بەم بیروڕایانە خوا دەبوغزێنن لەلای (مخلوقات) و بەندەکانی و ڕێگەی عیبادەتی لەسەر دادەخەن و هیچ دڵنیاییەك ناهێڵنەوە بۆ بەندەکانی کە چۆن مامەڵە لەگەڵ خوای خۆیاندا بکەن، چاکە بکەن یاخود خراپە؟! لەبەرئەوەی دەشێت هەموو چاکەکان کۆتاییان گومڕایی و دۆزەخ بێت، وە هەموو تاوان و گومڕاییەك کۆتاییان بەهەشت بێت.

**٩. داواکارییە شەرعییەکان هەموویان داواکارییەکن کە جێبەجێکردنیان لە تواناداا نییە** و (تكليف ما لايطاق)ە، لەبەرئەوەی هیچ بژاردە و دەسەڵاتێك لە دەستی ئادەمیزاددا نییە، بەڵکوو هەمووی پێدەکرێت، کەواتە لە بووندا تاوان نییە و تاوانباریش بوونی نییە، وە ئەگەر تاوانیش

(١) "الفوائد" لابن القيم ص١٥٩.

**بکرێت ئەوا دەڵێت: ئەگەر فەرمانیم شکاندبێت ئەوا ئیرادەیم جێبەجێکردووە، وەکوو شاعیریان دەڵێت:**

أَصْبَحْتُ مُنْفَعِلاً لِمَا يَخْتَارُهُ          مِنّي فَفِعْلِي كُلُّهُ طَاعَاتُ(1)

**واتە: هەرچی بکەم لە خێر و شەڕ لە بژاردەی ئەو دەرناچێت، بۆیە هەموو کردارەکانم گوێڕایەڵی ئەوە.**

**ئەمانە لە ئەنجامدا باوەڕیان بە قەدەر هێنا و شەرعیان لەکارخست، وەکوو موشریکەکان دەیانوت:** ﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ﴾ [الأنعام: ١٤٨]. **واتە ئەگەر خوا ویستی لێبوایە خۆمان و باو و باپیرانمان شەریکمان بۆ بڕیار نەدەدا و هیچ شتێکمان حەرام نەدەکرد.**

**بە کورتی لە بواری قەزا و قەدەردا جەبەرییەکان دوو بەشن:** الجبرية الخالصة وهي الجهمية الخالصة، قالوا بأن الإنسان مجبور على أفعاله، ... وجبرية جزئية وهم جبرية الأشاعرة(2).

**جەبەرییەی تەواو: ئەوانەن کە دەڵێن ئادەمیزاد خاوەن کار نییە و بەزۆر کارەکانی پێدەکرێت، وە جەبەرییەی ناتەواو: کە بیروڕای ئەشعەرییەکان و ماتۆریدییەکانە، بەڵام ئەنجامی هەردوو بیروڕاکە هەر پێداگرییە لەسەر نەبوونی هیچ بژاردە و ئیرادەیەك بۆ ئادەمیزاد.**

**لێرەدا مەبەستمان لە جەبەرییەکان جەهمییەکانە، کە (الجهم)ی پێشەنگیان دەڵێت:** أنه لا فعل لأحد في الحقيقة إلا لله وحده، وأنه هو الفاعل، وأن الناس إنما تنسب إليهم أفعالهم على سبيل المجاز، كما يقال: تحركت الشجرة، ودار الفلك، وزالت الشمس، وإنما فعل ذلك بالشجرة والفلك والشمس سبحانه إلا أنه خلق للإنسان قوة كان بها الفعل ، وخلق له إرادة

---

(١) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٢٥٧، و "المنتقى من منهاج الاعتدال" للذهبي ص١٢٣، و "الرد على القائلين بوحدة الوجود" للملا القاري ص١٢٣، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٢٥٧)، و "شفاء العليل" لابن القيم ص٤.

(٢) "الملل والنحل" للشهرستاني (١/ ٨٥)، و "شرح العقيدة الطحاوية" لناصر العقل (٨/ ١١٠)، و "شرح العقيدة الطحاوية" لعبد الرحيم السلمي (٣/ ٩).

للفعل واختيارًا له منفردًا بذلك، كما خلق له طولاً كان به طويلاً، ولونًا كان به متلونًا[١].

واتە: لە ڕاستیدا هیچ کەسێك خاوەنی کردار نییە بێجگە لە خوا، بە تەنیا ئەو خاوەنی کارەکانە، وە کردارەکان بە شێوەی (مجاز) دەخرێنە پاڵ ئادەمیزاد، وەك دەڵێن درەختەکە دەجووڵێت و ئەستێرەکان دەسووڕێنەوە و خۆر لایدا لە ناوەڕاستی ئاسمان، ئەوەی بە درەخت و ئەستێرە و خۆری کرد بەس خوای پەروەردگار بوو، بەڵام بۆ ئادەمیزاد هەر ئەوەی جیایە کە هێزێکی بۆ دروستکردووە تا کارەکە ئەنجام بدات، وە ئیرادەیەکی پێدا کە کارەکە بکات، وە بژاردەیەکی لەو کاتەدا پێبەخشی بەتایبەت ئەو کارە ئەنجام بدات، هەروەك درێژییەکی پێدا کە پێی درێژ بێت، وە ڕەنگێکی پێدا کە بەو شێوەیە ڕەنگدار بێت.

بەم شێوەیە جەبەرییەکان باوەڕیان بە بوونی هیچ ئیرادە و توانا و کارێك نییە کە ئادەمیزاد خاوەنی بێت، ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە بیروڕای (مرجئة)کان دروست بێت کە بڵێن: کردار و کار گەر لە توانای ئادەمیزاددا نەبێت ئەوا لە ئیمانیشدا نییە، بەڵکوو ئیمان تەنها ناسینی خوایە بە دڵ، وە کردار لە ئیماندا نییە و هەرچییەك بکات بەو هۆکارەوە لە ئیسلام دەرناچێت، لە کۆتاییشدا ئیمان یەك ئاستە و ئیمانی (جبريل و محمد و هاوەڵانی ...) لەگەڵ هەموو کەس هیچ جیاوازی و پلەوپایەیەکی نییە و هەمووی ناسین و (معرفة)یەکی خواییە و بەس، وە یەك پارچەیە و بەش بەش نابێت، گەر وەریگرت ئەوە هەمووی وەرگرتووە و هیچ شتێکیش کاری تێناکات و زیاد و کەم و لاواز و بەهێز نابێت، ئەمانە بیروڕای مورجیئەکانە لە ئەنجامی قسەکانی جەهمییەکانەوە دروست بوو.

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: الْبِدَعُ تَكُونُ فِي أَوَّلِهَا شِبْرًا ثُمَّ تَكْثُرُ فِي الِاتِّبَاعِ حَتَّى تَصِيرَ أَذْرُعًا وَأَمْيَالًا وَفَرَاسِخَ[٢].

واتە: بیدعە لە سەرەتاوە بستێکە، وردە وردە زیاد دەبێت تا دەبێتە چەندەها هەنگاو و میل و فەرسەخی جیاجیا.

(عبد الله بن مبارك) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «إِنَّا لَنَحْكِي كَلَامَ الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى، وَلَا نَسْتَطِيعُ أَنْ

(١) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز (١/ ٥٤١)، و "بيان تلبيس الجهمية" لابن تيمية (٢/ ٥٨٥)، و "مقالات الإسلاميين" للأشعري (١/ ٣٣٨)، و "القضاء والقدر" لعبد الرحمن صالح المحمود ص٣٠٣.

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٨/ ٤٢٥).

نَحْكِيَ كَلَامَ الْجَهْمِيَّةِ»[١].

**واتە: ئێمە دەتوانین قسەی جولەکە و گاوور بگێڕینەوە، بەڵام ناتوانین قسەی جەهمییەکان بگێڕینەوە.**

## - حوکمی بیروڕای جەهمییەکان:

**لەسەر بیدعە و گومڕایی زۆری قسەی جەهمییەکان؛ زانایان لە حوکمدان بەسەریاندا ڕای جیاوازیان هەیە، تا دەگاتە ئەو ئاستەی هەندێکیان لە حەفتاو دوو فیرقەکەی ناو ئیسلام دەریان دەکەن.**

**(ابن تيمية)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** وكلام السلف والأئمة في ذم الجهمية أعظم وأكثر من أن يذكر هنا، حتى كان غير واحد من الأئمة يخرجهم عن عداد الأمة، وقال يوسف بن أسباط وعبد الله ابن المبارك: أصولي الثنتين وسبعين فرقة أربع: الخوارج والشيعة، والمرجئة والقدرية، فقيل لابن المبارك: فالجهمية: فأجاب بأن أولئك ليسوا من أمة محمد صلى الله عليه وسلم[٢].

**واتە: قسەی زانایانی پێشین لەسەر بەخراپ باسکردنی جەهمییەکان زۆر لەوە زیاترە لێرەدا باسی بکەیت، تا گەیشتووەتە ئەو ئاستەی کە لە حەفتاو دوو فیرقەکەی ناو ئیسلام دەریان کردوون، وەك (یوسف بن أسباط وابن مبارك) وتوویانە: بنەمای حەفتاو دوو فیرقەکە چوارن: خەوارج و شیعە و مورجیئە و قەدەرییەکان، وە بە (عبد الله بن مبارك)یان وت ئەی جەهمییەکان؟ وتی: ئەوانە لە ئوممەتی (محمد) ﷺ نین.**

**بەڵام لە واقعدا وەك (ابن القيم)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** بخلاف الرفض والتجهم فإن مبدأهما من قوم منافقين مكذبين لما جاء به الرسول مبغضين له لكن التبس أمر كثير منهم على كثير من المسلمين الذين ليسوا بمنافقين ولا زنادقة فدخلوا في أشياء من الأقوال والأفعال التي ابتدعها الزنادقة والمنافقون ولبسوا الحق بالباطل وفي المسلمين سماعون للمنافقين[٣].

---

(١) رواه البخاري في "خلق أفعال العباد" ص٣٠، وابن خزيمة في "التوحيد" (٢/ ٥٨٥)، وابن بطة في "الإبانة" (٦٩٤)، والآجري في "الشريعة" (٥٧٩)، وأبو بكر بن الخلال في "السنة" (١٦٨٤).

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٧/ ١١٠).

(٣) "الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية والمعطلة" لابن القيم (٤/ ١٤٠٤).

**واتە: فیرەقەکانی خەوارج و مورجیئە و قەدەرییەکان خەڵکانێك بە نەزانین بناغەی بیدعەکانیان دانا و مەبەستیان گوێڕایەڵی خوا بوو، مەبەستیان فەرمان شکاندنی پێغەمبەر ﷺ نەبوو، بەڵام کەوتنە ناو تاوان و پێچەوانەی سوننەتەوە، بە پێچەوانەی ڕافیزە و جەهمییەکان کە ئەمانە بناغەدانەریان کەسانی بێ ئیمان و دووڕوو بووە، بۆ دژایەتی و بە درۆخستنەوەی پێغەمبەرەکەی بووە، بەڵام حاڵیان شاراوە بووە لەلای زۆری مووسوڵمانان، بەو هۆکارەوە کەوتوونەتە ناو قسە و کرداری ئەوانەوە، بەبێ ئەوەی دووڕوو و دەرچوو لە دین بووبێتن.**

**وە لەناو جەهمییەکانیشدا پۆلێنن، وەکوو (ابن القیم)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** وَكَثِيرٍ مِنَ الْجَهْمِيَّةِ الَّذِينَ لَيْسُوا غُلَاةً فِي التَّجَهُّمِ، وَأَمَّا غَالِيَّةُ الْجَهْمِيَّةِ فَكَغُلَاةِ الرَّافِضَةِ، لَيْسَ لِلطَّائِفَتَيْنِ فِي الْإِسْلَامِ نَصِيبٌ[١]. **واتە زۆربەی جەهمییەکان زیادەڕەوەکانیان (غلاة) نین، بەڵام زیادەڕەوەکان (غلاة) لە ڕافیزە و جەهمییەکان هیچ بەشێکیان لە ئیسلامدا نەماوە.**

**قسەی دروست و ئاشکرا لە حوکمدان بەسەریاندا (ابن تیمیة)** رَحِمَهُ اللَّهُ **بە کورتی کۆیکردووەتەوە و دەڵێت:** وَالْعُلَمَاءُ قَدْ تَنَازَعُوا فِي تَكْفِيرِ أَهْلِ الْبِدَعِ وَالْأَهْوَاءِ وَتَخْلِيدِهِمْ فِي النَّارِ، وَمَا مِنْ الْأَئِمَّةِ إلَّا مَنْ حُكِيَ عَنْهُ فِي ذَلِكَ قَوْلَانِ: ... وَالتَّحْقِيقُ فِي هَذَا: أَنَّ الْقَوْلَ قَدْ يَكُونُ كُفْرًا كَمَقَالَاتِ الْجَهْمِيَّة الَّذِينَ قَالُوا: إنَّ اللهَّ لَا يَتَكَلَّمُ وَلَا يَرَى فِي الْآخِرَةِ؛ وَلَكِنْ قَدْ يَخْفَى عَلَى بَعْضِ النَّاسِ أَنَّهُ كُفْرٌ فَيُطْلِقُ الْقَوْلَ بِتَكْفِيرِ الْقَائِلِ؛ كَمَا قَالَ السَّلَفُ مَنْ قَالَ: الْقُرْآنُ مَخْلُوقٌ فَهُوَ كَافِرٌ وَمَنْ قَالَ: إنَّ اللهَّ لَا يُرَى فِي الْآخِرَةِ فَهُوَ كَافِرٌ، وَلَا يَكْفُرُ الشَّخْصُ الْمُعَيَّنُ حَتَّى تَقُومَ عَلَيْهِ الْحُجَّةُ[٢].

**وە دەڵێت:** وَإِذَا عُرِفَ هَذَا فَتَكْفِيرُ "الْمُعَيَّنِ" مِنْ هَؤُلَاءِ الْجُهَّالِ وَأَمْثَالِهِمْ -بِحَيْثُ يُحْكَمُ عَلَيْهِ بِأَنَّهُ مِنْ الْكُفَّارِ- لَا يَجُوزُ الْإِقْدَامُ عَلَيْهِ إلَّا بَعْدَ أَنْ تَقُومَ عَلَى أَحَدِهِمْ الْحُجَّةُ الرِّسَالِيَةُ، الَّتِي يَتَبَيَّنُ بِهَا أَنَّهُمْ مُخَالِفُونَ لِلرُّسُلِ، وَإِنْ كَانَتْ هَذِهِ الْمَقَالَةُ لَا رَيْبَ أَنَّهَا كُفْرٌ، ... مَعَ أَنَّ بَعْضَ هَذِهِ

---

(١) "مدارج السالكين" لابن القيم (١/ ٣٦٩).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٧/ ٦١٩).

الْبِدْعَةِ أَشَدُّ مِنْ بَعْضٍ، وَبَعْضُ الْمُبْتَدِعَةِ يَكُونُ فِيهِ مِنْ الْإِيمَانِ مَا لَيْسَ فِي بَعْضٍ، فَلَيْسَ لِأَحَدِ أَنْ يُكَفِّرَ أَحَدًا مِنْ الْمُسْلِمِينَ وَإِنْ أَخْطَأَ وَغَلِطَ حَتَّى تُقَامَ عَلَيْهِ الْحُجَّةُ وَتُبَيَّنَ لَهُ الْمَحَجَّةُ. وَمَنْ ثَبَتَ إيمَانُهُ بِيَقِينِ لَمْ يَزُلْ ذَلِكَ عَنْهُ بِالشَّكِّ؛ بَلْ لَا يَزُولُ إلَّا بَعْدَ إقَامَةِ الْحُجَّةِ وَإِزَالَةِ الشُّبْهَةِ. وَهَذَا الْجَوَابُ لَا يَحْتَمِلُ أَكْثَرَ مِنْ هَذَا[1].

واتە: زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر تەکفیرکردنی بیدعەکاران، هیچ ئیمامێك نییە لەم بوارەدا ئیلا خاوەنی دوو ڕایە، ڕای ووردەکار و دروستیش لەم بارەیەوە ئەوەیە: دەشێت هەندێك بیروڕا هەبێت بۆخۆی بێبڕوایی و کوفر بێت، وەکوو جەهمییەکان کە دەڵێن خوا قسە ناکات و نابینرێت، ئەم قسانە لای هەندێك شاراوەیە کە کوفرە، بەڵام کوفر لە بەرامبەر ئەم قسانەدا بەشێوەی گشتی باس دەکرێت و دەخرێتە پاڵیان، وەکوو پێشینی ساڵح وتوویانە: ئەوەی بڵێت قورئان (مخلوق)ە ئەوە کافرە، ئەوەی بڵێت خوا لە دوارۆژدا نابینرێت کافرە. بەڵام کەسی دیاریکراو کافر ناکرێت هەتاوەکوو هەموو شتێکیان لەسەر ڕوون نەکرێتەوە. لەپاش ئەم ڕوونکردنەوانە زانیمان کەسی ناوبراو (تکفیر) ناکرێت، وە نابێت ئەم ڕێگەیە بگیرێتە بەر بێجگە لەو کاتە نەبێت کە هەموو شتێکیان لەسەر ڕوونکرابێتەوە و ئاگادار کرابێتنەوە لەسەری. ئەگەرچی هەندێك بیدعە گومڕاترە لە هەندێك، وە هەندێك بیدعەکار ئیماندارترە لە هەندێکی تر، بۆیە نابێت یەك کەس لە موسوڵمانان حوکم بدرێت بەسەریدا گەر هەڵە و ناتەواوییەکی کردبێت، تاوەکوو ئاشنا دەبێت بەسەر بابەت و حوکمە دینییەکەیدا. بۆیە هەرکەسێك بە دڵنیایی و یەقینەوە هاتە ناو ئیسلامەوە و ئیماندار بوو ئەوا بە گومان ئیمانەکەی لێ ناسەندرێتەوە، بەڵکوو ئیمانەکەی لاناچێت هەتا دوای بەڵگەکاری و لابردنی گومانەکان و (اقامة الحجة) لەسەری نەکرێت، ئەم بابەتە لەمە زیاتر وەڵام هەڵناگرێت.

  

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٢/ ٥٠٠، ٥٠١).

# ناوادارترین فیرەقەکانی قەدەر

## سێیەم: ئەشـعـەرییـەکـان
## الأشـعـريـة

لە سەدەی دووەمی کۆچییەوە بەتایبەت لە نێوان ساڵەکانی (٢١٨)ی کۆچی سەردەمی خەلافەتی (المعتصم بالله)ی عەباسییەکان تا ناوەڕاستی نیوەی سەدەی سێیەم، گۆڕانکارییەکی پڕ لە ڕووداوی سیاسی لە ئارادابوو لە دروستبوونی دەوڵەتی (القرامطة)کان لە مەغریب و (الفاطمية)کان لە میسرِ و (بووەیهییەکان) لە ڕۆژهەلآت و لاوازبوونی دەسەلآتی عەباسییەکان ...، وە لەلایەکی تریشەوە کۆتایی سەدەی (معتزلة)کان و لاوازبوونی بیروڕایان بە هۆکاری ئەو هەموو ستەم و زوڵمەی لە زانایانی ئەهلی سوننەیان کرد، وە وەڵامدانەوەی زانایانی ناوداری ئەهلی سوننە و بەرامبەرکێ کردنیان لە چەندەها کۆڕی گەورەی دیوانی خەلافەت و شکاندنی کەسایەتی ناوداریان بە ڕێگەی (مناقشة) و وتوویژی زانستی، وە لەگەڵ ئەمەشدا ڕووشاندن و شکاندنی شکۆی بنەما و بیر و هزریان بە ڕێگەی (أحمد بن حنبل وعبد العزيز الكناني) و زانایانی فەرموودە و نووسینەکانی زانایان لە پووچەڵکردنەوەی بیر و بنەماکانیان، هەر لە (البربهاري وابن خزيمة والطحاوي والمروزي والطبري ...)، بووە هۆکاری تەواو لاوازبوون و پووکاندنەوەی بیروڕاکانیان، وە لەلای خەڵکی گشتیش بێزاری لە ڕابوردووی تاڵیان و کۆتایی بێبەرەکەت و پاشماوەی پڕ لە ئەندێشەیان بووە هۆکاری هەرەس هێنانیان.

لەم بارودۆخ و کەشەدا کەسێکی ناوداری پەروەردەی چل ساڵەی دەستی (معتزلة)کان بەناوی (أبو الحسن علي بن اسماعيل الأشعري) کە دەگاتەوە سەر بنەماڵەی هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەری خوا ﷺ (أبو موسى الأشعري) رضي الله عنه، کە لەدایکبووی (٢٦٠)ی کۆچی شاری بەسرەیە لە (معتزلة)کان هەڵدەگەڕێتەوە و بەرپەرچی بیروڕاکانیان دەداتەوە و ئەبێتە پاڵپشتێکی گەورەی تر بۆ ئەهلی سوننەت و سەرخستنیان، بەم گەشبینییەوە لێیان دەڕوانی، وەك (السبكي) لە باسیدا دەڵێت: شَيخنَا وقدوتنا إِلَى الله تَعَالَى الشَّيْخ أَبُو الْحسن الأشعري الْبَصْرِيّ، شيخ طَرِيقَة أهل السّنة وَالْجَمَاعَة وَإِمَام الْمُتَكَلِّمين وناصر سنة سيد الْمُرْسلين والذاب عَن الدّين والساعي في حفظ

عقائد المُسلمين[١].

واته: مامۆستا و پێشەوامان بۆلای خوا (أبو الحسن الأشعري)، گەورە و مامۆستای ڕێگەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و پێشەوای فەلسەفە و (أهل الكلام) و سەرخەری سوننەتی سەرداری پێغەمبەران و بەرگریکار لە دین و کۆششکاری پاراستنی عەقیدە و بیرباوەڕی موسوڵمانان.

وە (ابن عساكر)یش لە وەسف و بەرگریکردن لە (الأشعري) و بەرپەرچدانەوەی ڕەخنەلێگرانی وەك (أبو علي الأهوازي وابن الجوزي وابن حزم والمقبلي ...) نووسینێکی بەناوی "تبيين كذب المفتري" نووسیوە بە واتای ڕوونکردنەوە لەسەر درۆ هەڵبەستراوەکان.

باوکی (أبو الحسن الأشعري) پیاوێکی زانای فەرموودە و ئەهلی سوننەت و جەماعەت بووە، هەر لە سەردەمی منداڵی (أبو الحسن)ەوە وەفات دەکات و پێشوەختە وەسیەت دەکات کە ئەو منداڵەی ببەنە لای زانای فەرموودە (زكريا بن يحيى الساجي)[٢]، بەڵام بە هۆکاری شووکردنی دایکییەوە بە (أبو علي محمد بن عبد الوهاب الجبائي) ناوداری (معتزلة)کان دەکەوێتە ژێر پەروەردەکردنی بەرنامەی (معتزلة)کانەوە و بەمەش چل ساڵ مامۆستای (أبو الحسن) دەبێت و لەناو بیروڕای (معتزلة)کاندا دەبێت، پاشان لێیان هەڵدەگەڕێتەوە و کۆمەڵێك نووسراویان لەسەر دەنووسێت وەکوو سەرهەڵدانەوەی نهێنییە گومڕاییەکانی (معتزلة)، وەکوو کتێبی "اللمع في الرد على أهل الزيغ والبدع" و "الإبانة عن أصول الديانة" و "كتاب تفسير القرآن" و "مقالات الإسلاميين" و "اختلاف المصلين" و "كشف الأسرار" ... .

هۆکاری هەڵگەڕانەوەکەشی دەگەڕێننەوە بۆ زۆر شت، لەوانە وتووێژی زۆر لە نێوان خۆی و (أبو علي الجبائي) مامۆستای و دەستنەکەوتنی وەڵامی دڵنیاکار لەسەر زۆر شت کە بیروڕای (معتزلة)کانی لەسەر بەرندە، وەك (ابن خلكان) لە کتێبی "الوفيات"دا[٣] باسی دەکات.

وە لەلایەکی تریشەوە هاتوچۆکردنی بۆلای زانای ئەهلی سوننەت (أبو اسحاق المروزي الشافعي) و خوێندنی فیقهی مەزهەبی شافعی و فەرموودە وەکوو بنەمایەکی بۆماوەیی باوکی کە

(١) "طبقات الشافعية الكبرى" للسبكي (٣/ ٣٤٧).

(٢) "تبيين كذب المفتري" لابن عساكر ص٣٥.

(٣) "الوفيات" لابن خلكان (٤/ ٢٦٧).

ئەهلی سوننەت بووە، وە لەلایەکی تریشەوە کزبوونی هێز و هزری فیکری (معتزلة)کان لەپاش (محنة) و ناخۆشییەکانی بەسەرهاتی (أحمد بن حنبل) پێشەنگی ئەهلی سوننەت و بەرهەڵستکاری (معتزلة)کان، وە هاتنی خەلیفە (متوكل) کە (معتزلة)کانی پشتگوێ خست و لە دەسەڵات دووری خستنەوە و پشتیوانی ئەهلی سوننەتی کرد، وە لەلایەکی تریشەوە خەوبینینی (أبو الحسن الأشعري) بە پێغەمبەری ئیسلامەوە ﷺ وەکوو دەگێڕنەوە لەسەری[1].

ئەمانە و کاری تر دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە وەك (ابن عساكر) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: قَامَ على مَذَاهِب الْمُعْتَزلَة أَرْبَعِينَ سنة وَكَانَ لَهُم إِمَامًا ثمَّ غَابَ عَن النَّاس فِي بَيته خَمْسَة عشر يَوْمًا فَبعد ذَلِك خرج إِلَى الْجَامِع فَصَعدَ الْمِنْبَر وَقَالَ معاشر النَّاس إِنِّي إِنَّمَا تغيبت عَنْكُم فِي هَذِهِ الْمدَّة لِأَنِّي نظرت فتكافأت عِنْدِي الْأَدِلَّة وَلم يتَرَجَّح عِنْدِي حق على بَاطِل وَلَا بَاطِل على حق فاستهديت اللهَّ تبَارك وَتَعَالَى فهداني إِلَى اعْتِقَاد مَا أودعته فِي كتبي هَذِهِ وانخلعت من جَمِيع مَا كنت أعتقده كَمَا انخلعت من ثوبي هَذَا وانخلع من ثوب كَانَ عَلَيْهِ وَرمى بِهِ وَدفع الْكتب إِلَى النَّاس فَمِنْهَا كتاب اللمع ... كشف الْأَسْرَار وهتك الأستار وَغَيرهمَا فَلَمَّا قَرَأَ تِلْكَ الْكتب أهل الحَدِيث وَالْفِقْه من أهل السّنة وَالْجَمَاعَة أخذُوا بِمَا فِيهَا وانتحلوه واعتقدوا تقدمه واتخذوه إِمَامًا[2].

واتە: پاش چل ساڵ مانەوەی لەسەر بیروڕای (معتزلة)کان، پانزە ڕۆژ لە ماڵەوە خۆی ون دەکات بۆ پێداچوونەوەی خۆی و پاشان لە ڕۆژی هەینی دوای نوێژی هەینی دەچێتە سەر مینبەرەکەی مزگەوتی گەورەی شاری بەسرە و دەڵێت: خەڵکینە من ئەم ماوەیە لێتان ون بووم بۆ پێداچوونەوە، لە ئەنجامدا نەگەیشتمە هیچ ئەنجامێك لە بیروڕای (معتزلة)دا کە حەقی تەواوم دەسکەوێت بەسەر بەتاڵدا، وە بەتاڵی تەواویش دەرکەوێت بەسەر حەقدا، بۆیە داوای هیدایەتم کرد لە خوا و گەیشتمە دەرئەنجامی ئەم نووسینانەی لەم کتێبانەدا هەیە، وە من وازم لە بیروڕای (معتزلة)کان هێناوە و لەخۆم داڕنیوە وەکوو چۆن ئەم پۆشاکە لەخۆم دادەڕنم، جلەکەی لەبەر خۆی داکەند و هەڵی دایە ئەولاوە، وە ئەو کتێبانەی کە نووسیبووی لە بەرپەرچدانەوەی (معتزلة)کان هەمووی دایە دەست خەڵکی، لەو کتێبانەش: "اللمع" و "كشف الأسرار" ...،

(١) "موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لعبد الرحمن بن صالح المحمود (١/ ٣٣٤، ٣٣٩).

(٢) "تبيين كذب المفتري" لابن عساكر ص٣٩.

کاتێك زانایانی فەرمووده و (فقه) خوێندیانەوە کردیانە مامۆستا و پێشەنگی خۆیان و بیروڕا و نووسینەکانیان لەخۆ گرت.

بەم شێوەیە (أبو الحسن الأشعري) قۆناغی یەکەمی ژیانی بڕی و مایەوە قۆناغەکانی دوای ئەوە کە ئایا یەك قۆناغە یان زیاتر؟ بۆچوونی زانایان بۆ ئەم بابەتە دوو بۆچوونە[١]:

**بۆچوونی یەکەم:** (أبو الحسن الأشعري) رَحِمَهُ اللهُ لەدوای قۆناغی یەکەمی (معتزلة)ی، یەك قۆناغی تری بەخۆیەوە بینیوە، ئەویش قۆناغی ئەشعەرییەکانە (الأشعرية) و نەگەیشتووەتە ئاستی هەڵگرتنی بەرنامەی ئەهلی سوننەت.

لەم قۆناغەدا شوێنکەوتەی (عبد الله بن سعيد بن كلاب)ە کە خاوەنی بیروڕای جیاوازە لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا لە بواری (صفات وكلام وأفعال) و چەند بەشێکی تری عەقیدەدا کە بە نزیکترین کەس دادەنرێت لە ئەهلی سوننەتەوە لە زۆر بواردا، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: فَإِن أَبَا الْحسن الْأَشْعَرِيّ إِنَّمَا اقْتدى بطريقة أبي مُحَمَّد بن كلاب وَابْن كلاب كَانَ أقرب إِلَى السّلف زَمنا وَطَرِيقَة[٢].

واتە: (أبو الحسن الأشعري) شوێنکەوتەی (ابن كلاب)ە، وە ئەویش نزیکترین کەسە لە بەرنامەی پێشووە ساڵحەکانەوە لە هاوەڵان و شوێنکەوتووانی بە کات و تەمەنی و بەرنامە و بۆچوونی.

لەم قۆناغەدا (الأشعري) خاوەن بۆچوون و بەرنامەیەکی جیاوازە لە هەندێك شتدا لەگەڵ (ابن كلاب)، وەکوو نێوەندگیرێك لە نێوان بەرنامەی (معتزلة) و ئەهلی سوننەتدا، بۆیە بەم قۆناغەی دەوترێت (الأشعرية)، ئەمەش بەگوێرەی ئەوەی کە دایڕشتووە لە کتێبەکانیدا بەتایبەت "اللمع" نەك "الإبانة"، لەبەرئەوەی بڕیاردان لەسەر قۆناغەکانی ژیانی لەسەر نووسینەکانی دەبێت کە کامیان لە سەرەتاوە بووە و کامیان لە کۆتایی تەمەنیدا بووە، وەکوو ئاستی پێگەیشتن لە بیروڕاکاندا و گەیشتنی کۆتا بیروڕای سەربەخۆی خۆی، کەواتە بەم بۆچوونە (الأشعري) گەیشتووەتە قۆناغی سەربەخۆی خۆی کە پێی دەوترێت ئەشعەرییەکان (الأشعرية) و نەیتوانیوە لەم

(١) "موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لعبد الرحمن بن صالح المحمود (١/ ٣٢٦، ٣٦٨).

(٢) "الإستقامة" لابن تيمية (١/ ١٠٥).

قۆناغەدا بگاتە بەرنامەی ئەهلی سوننەت، بە هۆکاری کاریگەری مانەوەی بیروڕای (معتزلة)کان لەسەری و وەرگرتنی بیروڕای (ابن کلاب) و تێکەڵکردنی پێی، وەك ئیمامی (الشهرستاني) کە خۆی ئەشعەرییە ئاماژەی پێدەکات و دەڵێت: ذهب شيخنا الكلابي عبد الله بن سعيد... [١].

واتە: ئەوەش بیروڕای مامۆستامانە (عبد الله بن سعيد ابن کلاب).

(ابن کلاب) هاوسەردەمی ئیمام (أحمد بن حنبل) بووە رَحِمَهُ اللَّهُ و بە هۆکاری بیروڕا لادەرەکانی لە ئەهلی سوننەت ئیمام (أحمد) فەرمانی داوە بە (هجر) و بێزاندن و دوورکەوتنەوەی، وەك (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: وَكَانَ أَحْمَد يُحَذِّرُ عَنْ ابْنُ كِلَاب وَأَتْبَاعِهِ[٢]، وَالْإِمَامُ أَحْمَد بْنُ حَنْبَلٍ وَغَيْرُهُ مِنْ أَئِمَّةِ السُّنَّةِ كَانُوا يُحَذِّرُونِ عَنْ هَذَا الْأَصْلِ الَّذِي أَحْدَثَهُ ابْنُ كُلَّابٍ وَيُحَذِّرُونَ عَنْ أَصْحَابِهِ[٣].

واتە: ئیمام (أحمد) ئاگاداری قوتابییەکان و شوێنکەوتووانی کردووەتەوە کە تێکەڵاوی و نزیك نەبنەوە لە (ابن کلاب)، وە بێجگە لە ئیمام (أحمد) زۆری زانایانی ئەهلی سوننەت ئاگاداری خەڵکیان کردووەتەوە لە تێکەڵ نەبوونی (ابن کلاب) و هاوەڵانی.

وە تەنانەت (ابن کلاب) لە بابەتەکانی (القدر والأسماء والأحكام) نزیکتر بوو لە ئەهلی سوننەتەوە تاوەکوو ئەشعەرییەکان[٤]، وە لە زۆر شوێندا لە "مجموع الفتاوى"ی (ابن تيمية)دا ئاماژە بۆ نزیکی (ابن کلاب) دەکات لە ئەهلی سوننەتەوە، بەو هۆکارەوە (أبو الحسن الأشعري) لەبەر نزیکی و پەیوەستبوونی بە سەردەمی (سلف الصالح)ەوە لە بیروڕاکانی نزیك بووەتەوە.

**بۆچوونی دووەم:** (أبو الحسن الأشعري) رَحِمَهُ اللَّهُ لەپاش قۆناغی (معتزلة)ی دوو قۆناغی تری بەخۆیەوە بینیوە و بڕیوە، قۆناغی (الأشعرية) بە شوێنکەوتەی (ابن کلاب) و پاش ئەوەش قۆناغی کۆتایی کە ویستی هەڵگرتنی بەرنامەی ئەهلی سوننەتی بووە بە پێشەوایەتی ئیمام (أحمد بن حنبل) رَحِمَهُ اللَّهُ و چوونە سەر ڕێبازی ئەو و شوێنکەوتووانی، ئەمەش بە هۆکاری نووسینی کۆتا

(١) "نهاية الأقدام" للشهرستاني ص٣٠٣.

(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٢/ ٦).

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٢/ ٣٦٨).

(٤) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ١٠٣)، (٤/ ١٢، ١٤٧).

**کتێبی بەناوی "الإبانة عن أصول الديانة" لە کۆتایی تەمەنیدا، وەك لە پێشەکییەکەیدا دەڵێت:**
قولنا الذي نقول به، وديانتنا التي ندين بها، التمسك بكتاب الله ربنا عز وجل، وبسنة نبينا محمد صلى الله عليه وسلم، وما روى عن السادة الصحابة والتابعين وأئمة الحديث، ونحن بذلك معتصمون، وبما كان يقول به أبو عبد الله أحمد بن محمد بن حنبل - نضر الله وجهه ورفع درجته وأجزل مثوبته - قائلون، ولما خالف قوله مخالفون؛ لأنه الإمام الفاضل، والرئيس الكامل، الذي أبان الله به الحق، ودفع به الضلال، وأوضح به المنهاج، وقمع به بدع المبتدعين، وزيع الزائغين، وشك الشاكين، فرحمة الله عليه من إمام مقدم، وجليل معظم، وكبير مفهم[(١)].

**واتە: قسەی ئێمە و دینمان کە لەسەری بین و باوەڕمان پێی بێت، ئەوەیە کە پەیوەست بین بە قورئانەوە و سوننەتی پێغەمبەرەکەی و ئەو فەرموودانەی هاوەڵان و شوێنکەوتووان و زانایانی فەرموودە بۆمانی دەگێڕنەوە، پشت و پەنای ئێمەن، وە شوێنکەوتەی وتەکانی ئیمام (أحمد بن حنبل)ین، خوای گەورە ڕوو گەشاوە و پلەبەرزی بکات و پاداشتی بداتەوە، وە دژایەتی ئەوانە دەکەین کە پێچەوانەی ئەون، لەبەر پلەی پڕ ڕێزی پێشەوایەتی ئیمام (أحمد) و تەواوی سەرکردەیی ئەو حەقەیە کە خوا بە هۆکارییەوە ڕوونی کردووەتەوە و گومڕایی پێ نەهێشتووە، وە بیدعەکارانی پێ لەناوبردووە و گومان و گومڕایی گومڕایان و لادەرانی پێ ڕەواندووەتەوە، بەزەیی خوا بڕژێت بەسەر پێشەوای پێشەنگ و بەڕێز و بەقەدر و گەورە و تێگەیشتوو ئیمام (أحمد).**

**ئەم قۆناغی کۆتاییەشی کە بانگەوازی بۆ بەرنامەی ئەهلی سوننەت دەکات، زانایان لەسەر ئەوە بڕیار دەدەن کە ئەمە کۆتا قۆناغی (أبو الحسن الأشعري)ە، کە لەم کۆتا قۆناغەشیدا کتێبی "الإبانة عن أصول الديانة"ی نووسیوە، لەو زانایانەشی کە دەڵێن "الإبانة" کۆتا کتێبیەتی و بەگوێرەی نووسینەکەشی بڕیاری لەسەر دەدرێت کە ئەو سێ قۆناغەی بڕیوە، ئەمانەن[(٢)]:**

١. **الشيخ الإسلام ابن تيمية** رَحِمَهُ اللَّهُ.
٢. **ابن كثير** رَحِمَهُ اللَّهُ.
٣. **ابن القيم الجوزية** رَحِمَهُ اللَّهُ.

---

(١) "الإبانة عن أصول الديانة" لأبي الحسن الأشعري ص٢٠، ٢١.

(٢) "موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لعبد الرحمن بن صالح المحمود (١/ ٣٤٥).

٤. ابن العماد الحنبلي رَحِمَهُ ٱللَّهُ.
٥. أبو علي الفارس رَحِمَهُ ٱللَّهُ.
٦. محب الدين الخطيب رَحِمَهُ ٱللَّهُ.

بەڵام کتێبی "الإبانة"شی هێشتا کۆمەڵێك بابەت لەخۆدەگرێت کە شوێنی ڕەخنەی زانایانی ئەهلی سوننەتە، لەوانە: (كلام الله أزليًا، ومن فني كلامه لحقته الآفات وجرى عليه السكوت، ولا يجعل الإرادة من صفات الأفعال، إن الله لم يزل راضيًا عمن يعلم أنه يموت مؤمنًا وإن كان أكثر عمره كافرًا، ...). کە دەڵێت قسەی خوا ئەزەلییە و دەبێت بەردەوام قسەی هەبێت، گەر نا ناتەواوی و بێدەنگی دێت بەسەریدا (ئەم جۆرە باس و خواسانە لەسەر فەرموودەی خوا لای ئەهلی سوننەت گوماناوین)، وە دەڵێت: خوا ویستی وایە ئەگەر ڕازی بێت لە یەکێك ئەوا لە سەردەمی بێبڕواییەکەشیدا هەر لێی ڕازییە.

ئەمانە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە زۆر بە کورتی هەندێك بابەت دادەڕێژێت کە بۆخۆی حەق و بەتاڵ لەخۆدەگرێت، وە بەدەر لەوەش کە لە "الإبانة"شدا هیچ ئاماژەیەك بەوە ناکات کە بەرییە لە (ابن كلاب) و بۆچوونەکانی، وە زانایانیش بەو هۆکارەوە لەم قۆناغەشیدا ڕەخنەی توند لە (أبو الحسن الأشعري) دەگرن لەسەر بەرنامەی ئەهلی سوننەت.

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەروەردە نەبوون و پەیوەست نەبوونەی بە زانایان و قوتابخانەکانی ئەهلی سوننەتەوە، بەتایبەت هەر لە سەرەتای تەمەنییەوە و دوورە دەستی لێیانەوە.

لەلایەکی تریشەوە سەرەتای بەدەستهێنانی زانستی لەلای بیدعەکاران و گومڕایانی فیرەقە ئیسلامییەکان بووە، کە ئەمە دەبێتە هۆکاری شێواندنی (فطرة) و تێکدانی باری زانستی و تەمەن بەفیڕۆدانێکی زۆر لەسەری، وە دوورکەوتنەوەشی لە زانستە شەرعییەکان و لە کۆتاییشدا نەتوانینی وەرگرتنی ڕێڕەوی ئەو زانستانە شەرعییانەی ئەهلی سوننەت وەکوو خۆی ئەگەر ویستیشی لەسەر بێت.

هەروەك (ابن بطة العكبري) لە (عَمْرَو بْنَ قَيْسٍ الْمُلاَئِيّ)یەوە دەیگێڕێتەوە کە وتوویەتی: «إِذَا رَأَيْتَ الشَّابَّ أَوَّلَ مَا يَنْشَأُ مَعَ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ فَارْجُهُ، وَإِذَا رَأَيْتَهُ مَعَ أَهْلِ الْبِدَعِ، فَايْئَسْ مِنْهُ،

فَإِنَّ الشَّابَّ عَلَى أَوَّلِ نُشُوئِهِ»[(١)].

**واتە: ئەگەر هەر گەنجێك سەرەتا لەسەر بەرنامەی ئەهلی سوننەت گەورە بوو ئەوا هەموو ئاواتێکت پێی بێت، وە ئەگەر لەسەر بەرنامەی بیدعەکاران گەورە بوو ئەوا بێ ئومێد بە لێی. لەبەرئەوەی هەموو گەنجێك لەسەر بنەمای گەنجییەتییەکەی دروست دەبێت.**

**وەکوو (ابن العربي المالكي) بە ئیمامی (الغزالي) مامۆستای دەڵێت:** شَيْخُنَا أَبُو حَامِدٍ دَخَلَ فِي بَطْنِ الْفَلَاسِفَةِ ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ مِنْهُمْ فَمَا قَدَرَ[(٢)].

**واتە: مامۆستاکەمان چووە ناو سکی فەلسەفەوە و پاشان ویستی لێی بێتە دەرەوە بەڵام نەیتوانی.**

**کەواتە ئەوە کاریگەرییەکی گەورەی سەر (أبو الحسن الأشعري) بووە، وە سەردەمەکەشی یارمەتیدەر نەبووە بۆ چوونە سەر بەرنامەی ئەهلی سوننەت، وەك (ابن تيمية) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت:** وَكَانَ قَدْ دَرَسَ الْكَلَامَ عَلَى أَبِي عَلِيٍّ الْجُبَّائِيِّ أَرْبَعِينَ سَنَةً، وَكَانَ ذَكِيًّا، ثُمَّ إِنَّهُ رَجَعَ عَنْهُمْ، وَصَنَّفَ فِي الرَّدِّ عَلَيْهِمْ، وَنَصَرَ فِي الصِّفَاتِ طَرِيقَةَ ابْنِ كُلَّابٍ، لِأَنَّهَا أَقْرَبُ إِلَى الْحَقِّ وَالسُّنَّةِ مِنْ قَوْلِهِمْ، وَلَمْ يَعْرِفْ غَيْرَهَا، فَإِنَّهُ لَمْ يَكُنْ خَبِيرًا بِالسُّنَّةِ وَالْحَدِيثِ، وَأَقْوَالِ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَغَيْرِهِمْ، وَتَفْسِيرِ السَّلَفِ لِلْقُرْآنِ. وَالْعِلْمُ بِالسُّنَّةِ الْمَحْضَةِ إِنَّمَا يُسْتَفَادُ مِنْ هَذَا، وَلِهَذَا يَذْكُرُ فِي الْمَقَالَاتِ مَقَالَةَ الْمُعْتَزِلَةِ مُفَصَّلَةً ... وَيَذْكُرُ مَقَالَةَ ابْنِ كُلَّابٍ عَنْ خِبْرَةٍ بِهَا وَنَظَرٍ فِي كُتُبِهِ، ... فَإِذَا جَاءَ إِلَى مَقَالَةِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْحَدِيثِ ذَكَرَ أَمْرًا مُجْمَلًا، يَلْقَى أَكْثَرَهُ عَنْ زَكَرِيَّا بْنِ يَحْيَى السَّاجِيِّ[(٣)].

**واتە: (أبو الحسن) لە سەردەمی (علي الجبائي) موعتەزیلەدا چل ساڵ دەرسی خوێندووە و زیرەکیش بووە، پاشان هەڵگەڕاوەتەوە لێیان، وە نووسینی هەیە لەسەریان و لە بارەی سیفاتەکانی خواە بیروڕای (ابن كلاب) سەردەخات، لەبەرئەوەی ئەو لەو سەردەمەدا لە هەموو کەس زیاتر نزیکتر بووە لە حەق و سوننەتەوە، وە لەو زیاتر کەسی تری نەناسیوە، لەگەڵ ئەوەشدا شارەزایی نەبووە بەسەر سوننەت و فەرموودە و قسەی هاوەڵان و شوێنکەوتووانییەوە، وە ئاشنا نەبووە بەسەر**

(١) رواه ابن بطة في "الإبانة" (١/ ٢٠٥) برقم (٤٤).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ٦٦).

(٣) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٥/ ٢٧٧، ٢٧٨).

شێوازی تەفسیری قورئاندا بە شێوازی هاوەڵان و ناسینی تەواوی سوننەت وەکوو خۆی، لەبەرئەوە ئەگەر سەیر بکەین لە کتێبی "الإبانة"دا کاتێك بیروڕای (معتزلة)کان باس دەکات بە شێوەیەکی زۆر وورد باسیان دەکات، وە کاتێك بیروڕای (ابن کلاب) باس دەکات ووردەکاری خوێندنەوەی تەواوی هەیە لەسەریان، بەڵام کاتێك بیروڕای ئەهلی سوننەت باس دەکات زۆر بە کورتی باسیان دەکات و بە گشتیش لە مامۆستاکەی (الساجي) هەمووی وەرگرتووە و ئاگای لە سەرچاوەی تر نییە.

**وە دەڵێت:** وأبو الحسن الأشعري لما رجع عن مذهب المعتزلة سلك طريقة ابن كلاب، ومال إلى أهل السنة والحديث، وانتسب إلى الإمام أحمد، كما قد ذكر ذلك في كتبه كلها، كـ: الإبانة والموجز والمقالات وغيرها، وكان مختلطاً بأهل السنة والحديث كاختلاط المتكلم بهم[١].

**واتە:** (أبو الحسن الأشعري) کاتێك وازی لە (معتزلة) هێنا ڕێگەی (ابن کلاب)ی گرتووەتە بەر و بەلای بەرنامەی ئەهلی سوننەتدا خۆی نزیك دەکردەوە و خۆی بە شوێنکەوتەی ئیمام (أحمد بن حنبل) دەزانی، وەکوو خۆی باسی کردووە لە کتێبەکانیدا وەك: "الإبانة" و "الموجز" و "مقالات الإسلاميين" ...، بەڵام نووسینەکانی تێکەڵە بە (أهل الكلام) و ئەهلی سوننەت و فەرموودە، وەکوو عەقلانییەکی فەلسەفەیی تێکەڵ بە بەرنامەی ئەهلی سوننەت.

کەواتە (ابن تيمية) هەموو قسەکانی ئەشعەری بە یەك ئاست دانانێت لە وەرگرتندا و بە یەك پێوەر بە نزیکی نازانێت لە ئەهلی سوننەتەوە، بەڵکوو هەموو بابەتەکان ئاستی تایبەتی خۆیان هەیە لە پێکاندن و دوور و نزیکی لە حەقەوە، لەبەر ڕەچاوکردنی واقعی ئاست و ژیانی ئەشعەری و گۆڕانکارییەکانی سەری.

کەواتە کەسایەتی تایبەتی (أبو الحسن الأشعري) رَحِمَهُ اللَّهُ وەکوو نووسینەکانی بەتایبەت "الإبانة" پلەوپایە و تایبەتمەندییەکی خۆی هەیە لەڕووی پێکاندن و لایەنگری بۆ ئەهلی سوننەت و بەرنامەکەی، بەڵام مەزهەبی ئەشعەری و ئەشعەرییەکانی دوای خۆی جیاوازییەکی زۆریان هەیە لەگەڵ (أبو الحسن الأشعري) ئیمامی مەزهەبەکە و بگرە بە تەواوی ڕێگەی ئەویان ون کردووە و نکوولیشی لێ دەکەن، بۆیە دەبێت لە حکومداندا جیاوازی بکرێت لە نێوانیاندا، وە ئەو گۆڕانکارییەی نێوان ئیمامی مەزهەبەکە و شوێنکەوتووانیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆکارانە:

---

(١) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٢/ ١٦).

١. بەگوێرەی نووسینەکان قسە دەدرێتە پاڵ خاوەنەکانی، وە بەتایبەت (أبو الحسن) کە نووسینەکانی پێش "الإبانە"ی زۆرن و جیاوازن لە نووسینەکانی کۆتایی تەمەنی، وە ئەو نووسینانەش پێشتر بڵاوبوونەتەوە و شەرح و شیتەڵکردنەوەیان لەسەر کراون و وتراونەتەوە لەلایەن زانایان و وا بڵاوکراونەتەوە کە ئەوانە کۆتا قسەی حەقن لەسەر ئەو بابەتانە.

وە ئەگەر ئەو زانا و ئیمامەش پاشگەز بووبێتەوە لەسەر بیروڕا پێشووەکانی، ئەوەندە شاراوە و لاواز دەرکەوتووە بە حوکمی بوونی لە کۆتایی تەمەنیدا و بڵاونەبوونەوەی؛ دەبێتە هۆکاری ئەوەی وەرنەگیرێت و بگرە نکوولێشی لێ دەکرێت لەلایەن لایەنگرانییەوە، وە بەتایبەت تێگەیشتنی مەبەستی ووردی ئیمامەکە لەسەر سەرەتای قسەی بۆ بابەتەکە و کۆتا ووردەکاری و شیکردنەوەی لەسەری.

هەروەك ئەمە بەسەر ئیمامی (الجويني) و (الرازي)دا هاتووە، کە (الجويني) لە کۆتایی تەمەنیدا لە کتێبی "النظامية" پاشگەز دەبێتەوە لە هەموو بیروڕا ئەشعەرییەکانی، بەڵام لەبەر نووسینی زۆری پێشووی لەو بارەیەوە؛ دان نانرێت بەسەر ئەو کتێبەیدا و بگرە گومانیش دەخرێتە سەری.

وە پەشیمان بوونەوەی (الرازي) لە کۆتایی تەمەنی و وەسیەتکردن لەسەر نزیك نەبوونەوە لە فەلسەفە و (علم الكلام)، کە ئەمە هەر باسیش ناکرێت.

وە هەروەها ئیمامی (الغزالي) کە وەفات دەکات و "صحيح البخاري" لەسەر سنگیەتی.

٢. هۆکارێکی تری جیاوازی نێوان (أبو الحسن الأشعري) و مەزهەبەکەی: هاتنی ئەو زانا و ناودارانە بوو کە خۆیان بە شوێنکەوتە و هەڵگری بەرنامەکەی (أبو الحسن الأشعري) دەزانی، بە شێوەیەك بەناوی خزمەت و پەرەپێدانیەوە گۆڕانکارییان تیادا دروستکرد، کە بەتەواوی ترازاندیان لە ڕێڕەوی خۆی و بگرە ئەوەی کە ئەو دژایەتی دەکرد کردیانە مەزهەبی ئەو.

وەك الشَّيْخ (حافظ الحكمي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: فَكَلَامُهُ يَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ مُخَالِفٌ لِلْمُنْتَسِبِينَ إِلَيْهِ مِنَ الْمُتَكَلِّمِينَ فِي مَسْأَلَةِ الْقُرْآنِ، كَمَا هُوَ مُخَالِفٌ لَهُمْ فِي إِثْبَاتِهِ الاسْتِوَاءَ وَالنُّزُولَ وَالرُّؤْيَةَ وَالْوَجْهَ وَالْيَدَيْنِ وَالْغَضَبَ وَالرِّضَا وَغَيْرَ ذَلِكَ، وَقَدْ صَرَّحَ فِي مَقَالَاتِهِ بِأَنَّهُ قَائِلٌ بِمَا قَالَ الْإِمَامُ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ وَأَئِمَّةُ الْحَدِيثِ، ... وَبِالْجُمْلَةِ فَبَيْنَهُ وَبَيْنَ الْمُنْتَسِبِينَ إِلَيْهِ بَوْنٌ بَعِيدٌ، بَلْ هُوَ بَرِيءٌ مِنْهُمْ وَهُمْ

مِنْهُ بُرَآءُ وَالْمَوْعِدُ اللهُ وَكَفَى بِاللهِ حَسِيبًا[١].

واته: قسەکانی (أبو الحسن) بەڵگەیە لەسەر جیاوازی قسەی شوێنکەوتووانی لە (متکلمین)ی مەزهەبەکەی لەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بە خواوە هەیە، وەك: خوا لەسەر عەرشە و دابەزینی بۆ ئاسمانی دونیا و بینینی و باوەڕبوون بە بوونی ڕوو (وجه) و هەردوو دەست و تووڕەبوون و ڕازیبوون و بابەتەکانی تر، زۆر بە ئاشکرا لە نووسینەکانی وتوویەتی باوەڕم بەوانە هەیە کە ئیمام (أحمد) و زانایانی فەرمووده باسیان کردووە، بە کورتی لە نێوان خۆی و شوێنکەوتووانیدا جیاوازییەکی زۆر دوور هەیە کە (أبو الحسن) بەرییە لەوان و ئەوانیش بەرین لەم، وە شوێنی بەیەك گەیشتنەوەش لای خوایە.

بەڵام ئەوەش هەیە کە پەناگەلێك شوێنکەوتووانی پەنایان پێبردبێت نووسینەکانی پێش "الإبانة"یەتی، کە بۆخۆی کەشێکی لەبار بووە بۆ پەرەپێدانی بە ڕوانگەی فەلسەفیدا، وەکوو پەنابردنی بۆ (التأويل) لە بابەتەکانی (الصفات الفعلية، الرضا والغضب ومعنى الإدراك والرؤية، الكسب في القدر والإستطاعة مع الفعل فقط، القدرة غير المؤثرة، وجواز تكليف ما لايطاق ونفي التعليل والقول بالتحسين والتقبيح العقليين الشرعي فقط، وتفسيره للإيمان بالتصديق بالله في كتابه "اللمع")[٢].

بۆیە یەك نووسینی کۆتایی لە بەرامبەر دەیەها نووسینی ڕابوردوودا هەر دەبێتە پەنا و هۆکاری ئاڵۆزی زانستی.

٣. هۆکارێکی تری جیاوازی نێوان ئەشعەری و مەزهەبەکەی: لادانەکان لە سەرەتاوە بچووك بوون، پاشان گەورە بوون و لە چوارچێوەیەکی سنووردارادا بوون بە هۆکاری لەخۆگرتن و تیادامانەوەی بیروڕای (معتزلة)کان، بە شێوەیەك توانای لەخۆگرتنی زیادە لە لادان و خڕکردنەوەی بۆچوونە هەڵەکان لەخۆبگرێت، بەدەر لە خۆبەدەستەوەدان بە هەندێك لە بەڵگە عەقڵییەکان و شۆڕبوونەوە بۆ یاسا فەلسەفییەکان و دەستەوەستان لە ئاستی هەڵەکانیان و لە کۆتاییدا پەنابردنە بەر بنەما هەڵەکانیان، هەروەك لە سەرەتای هەڵگەڕانەوەی (أبو الحسن الأشعري) خۆیدا لە (معتزلة)کان بۆ ڕەتدانەوەیان ئەمەی بەسەردا هاتووە کە وەك (ابن عساكر)

(١) "معارج القبول بشرح سلم الوصول" لحافظ الحكمي (١/ ٣٧٨)، وعلق عليه محب الدين الخطيب بما يؤيده لمؤلف.

(٢) "موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لعبد الرحمن بن صالح المحمود (١/ ٣٦٩ - ٣٩٠).

لێیەوە دەیگێڕێتەوە کە دەڵێت: أَنِّي أَظْهَرْتُ بِدعَة أَنْقُضُ بهَا كُفرهِم[١]، واتە: هەندێك بیروڕای بیدعەم بەکارهێناوە بۆ بەرپەرچدانەوەی بێبڕواییەکانیان، بۆ ئەوەی بزانن کە: أَنَّ لِأَهلِ الْسُّنَّةِ نَاصِرًا[٢]. ئەهلی سوننەت سەرخەرێکیان هەیە.

٤. هۆکارێکی تر بۆ ئەو جیاوازییەی لە نێوان ئەشعەری و مەزهەبەکەیدا هەیە بوونی بنەمای لەرزۆکی مەزهەبی ئەشعەرییە کە چەند ڕەنگ و قۆناغێك بەخۆیەوە دەبینێت و هیچ ڕێگە و بنەمایەکی ڕوون و ئاشکرا و دامەزراوی نییە بۆ ڕۆیشتن لەسەری و مامەڵکردن لەگەڵ بەرامبەرەکانیدا، جارێك (تأويل) دەبینیت و جارێك (تفويض) و جارێك (فەلسەفە و عەقلانیەت) و جارێك دوودڵی و دڵەڕاوکێ لە بنەمای داڕشتنی باسەکاندا و هاتوچۆ و جووڵەیەکی بەردەوام لە نێوان بەرنامەی ئەهلی سوننەت و (معتزلة)کان لەلایەك و پەنا بردن بۆ (ابن كلاب) و ...، وە لەلایەکی تریشەوە (تقليد) و شوێنکەوتەی کوێرانەی ناودارانی مەزهەب و پاشان لە کۆتاییدا بە ناچاری پەیوەستبوون بە دەرئەنجامەکانی ئەو بیروڕا و بۆچوونانە کە زۆر جار بەتاڵ و لادان بوون.

وە لەلایەکی تریشەوە نامۆیەتی ئەشعەری لای ئەهلی سوننەت و وەرنەگرتنیان و دان نەنانیان بە یەکێك لە هەڵگرانی بەرنامەی (السلف الصالح) لای زانایانی ئەم بەرنامەیە هۆکارێکی ترە بۆ دوورکەوتنەوە و هەستکردن بە جیاوازی تەواویان لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا، کە هۆکارێکی دەروونی دووری زانستییان بۆ دروستبووە بە واقعی حاڵیان.

هەروەك لە وتووێژێکی نێوان (أبو الحسن الأشعري) خۆی و زانای ئەهلی سوننەت ئیمامی (حسن بن علي البربهاري)دا دەردەکەوێت: لما دخل الأشعري إلى بغداد جاء إلى البربهاري فجعل يقول: رددت عل الجبائي وعلى أَبِي هاشم ونقضت عليهم وعلى اليهود والنصارى والمجوس وقلت لهم وقالوا وأكثر الكلام فِي ذَلِكَ فلما سكت قَالَ البربهاري: ما أدري مما قُلْتُ قليلا ولا كثيرا ولا نعرف إلا ما قاله أَبُو عَبْدِ اللهَّ أحمد بن حنبل قَالَ: فخرج من عنده وصنف كتاب "الإبانة" فلم يقبله مِنْهُ ولم يظهر ببغداد إلى أن خرج منها[٣].

---

(١) "تبيين كذب المفتري" لابن عساكر ص٩٧. (٢) "تبيين كذب المفتري" لابن عساكر ص١١٧.

(٣) "طبقات الحنابلة" لابن أبي يعلى (٢/ ١٨)، "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١١/ ٣٩٥)، "المقصد الأرشد" لابن مفلح (١/ ٣٢٩).

واته: کاتێك (أبو الحسن الأشعري) لە بەسرەوە هاتە بەغداد، چووە لای زانای ئەهلی سوننەت ئیمامی (البربهاري)، کەوتە باسی بەرپەرچدانەوەی خۆی بۆ مامۆستاکەی (علي الجبائي) و (أبو هشام)ی کوڕی، لەگەڵ جۆری ڕەتدانەوەی عەقڵی بۆ جوولەکە و گاوور و مەجووسییەکان، دەیوت: وام وت و وایان وت، زۆرێك لەم باسانەی بۆ کرد تاوەکوو بێدەنگ بوو، ئیمامی (البربهاري) رَحِمَهُ ٱللَّهُ لە کۆتاییدا وتی: ئەوەی وتت نازانم چییە کەم تا زۆری (واتە بەرنامە و جۆر و کاری ئەهلی سوننەت بەو جۆرە نییە)، ئێمە هیچێك لەوانە نازانین بێجگە لەوەی کە ئیمام (أحمد) وتوویەتی، پاش ئەمە هەستا و ڕۆیشت و پاش ئەوە کتێبی "الإبانة"ی نووسی و هات پێیدا و ئەویش لێی وەرنەگرت، لەپاش ئەم دوو دانیشتنە لەگەڵیدا لە بەغداد (أبو الحسن الأشعري) دەرنەکەوت تاوەکوو بەغدادی بەجێهێشت.

ئەمانە بە گشتی هۆکارەکانی دوورکەوتنەوەی مەزهەبی ئەشعەری بوو لە ئەهلی سوننەت، وە ئەو دوورکەوتنەوانەش لەسەر دەستی کەسانی ناوداریان دروست بوو، کە زیاتر ئەوان بەناوبانگ بوون و ناودار بوون بە بیروڕاکان تاوەکوو ئەشعەری خۆی، لەو زانایانەشی کە لەسەر دەستیان گۆڕانکاری تەواویان بەسەر مەزهەبی ئەشعەریدا هێنا ئەمانە بوون[(١)]:

١. **أبو الحسن الطبري: قوتابی تایبەتی ئەشعەری خۆی.**
٢. **أبو بكر الباقلاني: بە ئەشعەری دووەم ناودەبرێت.**
٣. **محمد بن حسن الفورك: ناسراو بە (ابن فورك).**
٤. **عبد القهار البغدادي.**
٥. **أبو المعالي الجويني.**
٦. **أبو حامد الغزالي.**
٧. **الشهرستاني.**
٨. **فخر الدين الرازي.**

ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەسەر مەزهەبی ئەشعەریدا هات بە هۆکاری ناوداران و شوێنکەوتووانییەوە؛ دەگەڕێتەوە بۆ سەر بابەتە بنەما و بنچینە بەرنامەییەکانی پێچەوانەی ئەهلی سوننەت، لەبەرئەوە ئەم گـۆڕانکارییە بەرچاوانەیان بەخـۆوە بینیوە و مەزهەبی ئەشعەری پێکهاتووە

(١) "موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لعبد الرحمن بن صالح المحمود (١/ ٤٥٠، ٥٩٠).

لەم گۆڕانکارییە مەنهەجییانە[١]:

١. نزیکبوونەوەی تەواو لـە ڕێبازی بەرنامە عەقڵییەکانی (معتزلة)کان و (أهل الكلام).

٢. چوونە ناوەوەی تەسەوفێکی فەلسەفی و لکاندنی بە مەزهەبی ئەشعەرییەوە، بەتایبەت لەسەر دەستی (أبو حامد الغزالي)، وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: أَبُو حَامِدٍ يَمِيلُ إِلَى الْفَلْسَفَةِ لَكِنَّهُ أَظْهَرَهَا فِي قَالَبِ التَّصَوُّفِ وَالْعِبَارَاتِ الْإِسْلَامِيَّةِ[٢]. واتە (غەزالی) بەلای فەلسەفەدا دەڕۆی، بەڵام لە قاڵبی تەسەوف و داڕشتنە ئیسلامییەکاندا دەری دەبڕی.

٣. چوونە ناو جیهانی فەلسەفە و بنەما داڕێژی بۆ مەزهەبی ئەشعەری لەسەر یاسا فەلسەفییەکان و کردنە بەشێك لەوان، بەتایبەت لەسەر دەستی (فخر الدين الرازي).

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: فإن كثير من متأخري أصحاب الأشعري خرجوا عن قوله إلى قول المعتزلة أو الجهمية أو الفلاسفة[٣].

واتە: زۆری شوێنکەوتووانی ئەم دواییەی مەزهەبی ئەشعەری لە قسەکانی ئەشعەری دەرچوون بۆ قسەکانی (معتزلة) و (جهمية) و فەلسەفییەکان.

### بیروباوەڕ و عەقیدەی (أبو الحسن الأشعري) خۆی، بەگوێرەی نووسینەکانی[٤]:

١. لە (التوحيد)دا: (توحيد الربوبية) و سەلماندنی بوونی خوایە بە بەڵگەی دروستبوونی ئادەمیزاد، وە بە بەڵگەی (دليل التمانع)، بەڵام (توحيد الألوهية) باسی نییە بێجگە لەوە نەبێت کە بەتوانا و دروستکارە.

لە (توحيد الأسماء والصفات)دا: لـە (الأسماء)دا باوەڕی بە هەموو ئەو ناوانە هەیە کە خوا بۆخۆی باسکردووە لە قورئاندا.

وە لـە (صفات)دا باوەڕی بە (صفات المعاني) هەیە کە حەوتن: (العلم، الحياة، القدرة، السمع، البصر، الكلام، الإرادة).

---

(١) "موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لعبد الرحمن بن صالح المحمود (١/ ٤٥٠).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ١٦٤).

(٣) "شرح العقيدة الأصفهانية" لابن تيمية ص١٢٧.

(٤) "موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لعبد الرحمن بن صالح المحمود (١/ ٣٧٤).

وە باوەڕی بە (صفات الفعلية) هەیە کە پەیوەندی بە ویست و ئیرادەی خواوەیە، نەك خوا خۆی ئەنجامدەر و خاوەنی کردنی ئەو سیفەتانە بێت، وەکوو: (الكلام، الاستواء، النزول، المجيء، الضحك، الغضب، الرضا، المحبة، التعجب ...).

بەڵام لە (الصفات الإختيارية)کاندا دەچێتەوە سەر (معتزلة)کان بە بەڵگەی ئەوەی کە زاتی خوا شوێنی دروستکردن و ڕووداوەکان نییە (إن الله لا تحله الحوادث)، وە لە (صفات الفعلية)کانیشدا (تأويل) و واتا گۆڕی بۆ دەکات و دەڵێت: سیفەتەکان ئەزەلین و لەگەڵ خوادا هەر بوون، بەڵام: (لايتجدد له فيها حال كما يشاء). ئەو سیفەتانە بەردەوام نین بە کارکردن لەگەڵ خوادا، واتە خوا بە بەردەوامی ئەم کارانە ناکات، یاخود دەڵێن سیفاتەکانی خوا سیفاتێکی جیاوازن لە خوا، وەك (الاستواء) کە سیفاتێك نییە پەیوەست بێت بە خواوە، بەڵکوو: (فعل فعلاً في العرش سماه استواء). کارێکی لە عەرشدا کردووە و ناوی ناوە (استواء)، ئەمانەش بۆخۆی باوەڕنەبوونە بە سیفاتەکان بەشێوەیەکی تر.

بۆیە بۆ (كلام الله) دەڵێت: (وأنه ليس بحرف ولا أصوات)، قورئان (مخلوق) نییە، بەڵام خواش خاوەنی قسە نییە بە حەرف و دەنگ، واتە قسەی نەفسییە (الكلام النفسي) و لە زاتی خۆیدایەتی، وەکوو (ابن كلاب) وا دەڵێت.

وە هەروەها باوەڕی بە (النزول، والمجيء والرضا والغضب والرؤية والوجه واليدين ...) هەیە، بەڵام هەموو ئەمانەی بە شێوەی (تأويل) و واتادارشتنی تازە باسی کردووە بۆ جیاکردنەوەی لە (معتزلة)کان، بەڵام بەهەرحاڵ لەلایەکەوە باوەڕپێبوون و باسکردنی و لەلایەکی تریشەوە تەسلیم نەبوون و وەرنەگرتنی وەکوو خۆی، ئەهلی سوننەتێکی تێکەڵ بە بەرنامەیەکی نامۆ و شێواوی دژ بە خۆی.

٢. **لە قەزا و قەدەردا:** قسەکانی ئەشعەری لەم بوارەدا زۆر دوور و درێژ و پەل و پۆ لێبووەوەیە، کە لە کۆتاییدا بە (نظرية الكسب) کۆتایی دێت، بەوەی کە ئادەمیزاد خاوەنی توانا و ئیرادەیەکە کە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر کردارەکانی نییە، ئەمەش بۆخۆی بیروڕای (الجبرية)کانە کە دەڵێن ئادەمیزاد خاوەنی هیچ بژاردە و ئیرادەی سەربەخۆی خۆی نییە و بەزۆر کارەکانی پێ دەکرێت، بەڵام بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ.

٣. **لە (الإستطاعة)دا:** توانای کارکردن بۆ کارەکانی ئادەمیزاد تەنها لەکاتی کارەکاندا

بوونی هەیە، پێشوەختەی کارەکان ئادەمیزاد خاوەنی هیچ توانا و ئیرادەیەك نییە بۆ ئەنجامدانی کارەکان، ئەمەش بیروڕای (الجبرية)کانە.

**٤. لە (تكليف ما لايطاق)دا:** ئیمامی ئەشعەری باوەڕی بە بوونی داواکارییەك هەیە کە لە توانای ئادەمیزاددا نەبێت، ئەمەش تەواوکاری بیروڕای جەبەرییەکانە، وەکوو داوای ئیمانی لە (أبو لهب) کردووە و دەشزانێت کە ناتوانێت ئیمان بێنێت.

**٥. لە (التعليل والحكمة)دا:** باوەڕی بە هۆکار و دانایی لە کارەکانی خوادا نییە، بەڵکوو هەموو (الأمر والنهي)یەکانی (مطلق المشيئة)یە، واتە تەنها ویستی ڕەها و گشتی خوایە.

**٦. لە (التحسين والتقبيح)دا:** چاك و خراپ بە عەقڵ دەرکی پێ ناکرێت و داواکاری شەرعیش دانابەزێتە سەری تاوەکوو بوونی داواکاری شەرعی خوای لەسەر نەبێت، ئەمەش نیوەی قسەکەی سەرەتایان هەڵەیە، بەڵکوو بە عەقڵ دەرك دەکرێت بە چاك و خراپ.

**٧. لە (الإيمان)دا:** باوەڕیان بەوەیە کە ئیمان بریتییە لە (قول وعمل ويزيد وينقص) قسە و کردار، وە ئیمان زیاد و کەم دەکات لای ئیماندار، بەڵام لە کتێبی "اللمع"دا پێناسەی ئیمان تەنها بە (تصديق) دەکات، (قول وعمل) لەناو ئیماندا دانانێت[1].

**٨. لە (الشفاعة وعذاب القبر والحوض والصراط والإمامة والصحابة)دا:** لە هەموو ئەمانەدا قسەکانی قسەی ئەهلی سوننەتە[2].

بە شێوەیەکی گشتی و بەگوێرەی نووسراوەکانی، ئەمانە بیروڕای (أبو الحسن الأشعري) رَحِمَهُ اللَّهُ خودی خۆین و جیاواز لە مەزهەبەکەی، وە بیروڕای مەزهەبەکەشی لەدوای ئەم بابەتەیە.

## بیروباوەڕی مەزهەبی ئەشعەرییەکان:

بیروڕای مەزهەبی ئەشعەری مەبەست بەو تێپەڕبوونانەیە کە لەدوای (أبو الحسن الأشعري)یەوە بەخۆیەوە بینیوە، وە ئەو تێپەڕبوونانەش هەتا شۆڕبووبێتەوە بۆ خوارەوە لادان و ترازاندن لە بیروڕاکانی خودی ئەشعەری خۆی زیاتر بووە و دوورکەوتنەوەی زۆرتری بەخۆیەوە

(١) "أصول الدين" للبغدادي ص٢٤٨، و "الملل والنحل" للشهرستاني (١/ ١٠١)، و "نهاية الأقدام" للشهرستاني ص٤٧٢.

(٢) بۆ ئەم هەشت خاڵە و سەرچاوەکانی لە کتێبی: "موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لعبد الرحمن بن صالح المحمود (١/ ٣٧١– ٣٩٠ – ٤٤٧).

بینیوە لـە بەرنامەی ئەهلی سوننەت.

وەك (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: ابْنُ كُلَّاب إمَامُ الْأَشْعَرِيَّةِ ... وَأَقْرَبُ إلَى السَّلَفِ مِنْ الْأَشْعَرِيِّ نَفْسِهِ، وَالْأَشْعَرِيُّ أَقْرَبُ إلَى السَّلَفِ مِنْ الْقَاضِي أَبِي بَكْرٍ الْبَاقِلَانِي. وَالْقَاضِي أَبُو بَكْرٍ وَأَمْثَالُهُ أَقْرَبُ إلَى السَّلَفِ مِنْ أَبِي الْمَعَالِي وَأَتْبَاعِهِ[١]، فَمُتَأَخِرُّو مُتَكَلِّمَةِ الإِثْبَاتِ الَّذِينَ خَلَطُوا الْكَلَامَ بِالْفَلْسَفَةِ كَالرَّازِيِّ وَالْآمِدِيِّ وَنَحْوِهِمَا هُمْ دُونَ أَبِي الْمَعَالِي الْجُوَيْنِيِّ وَأَمْثَالِهِ[٢].

واتە: (ابن كلاب) لـە ئەشعەری نزیکترە لـە سوننەتەوە، وە ئەشعەریش خۆی نزیکترە لـە سوننەتەوە تاوەکوو (الباقلاني) و شوێنکەوتووانی، وە ئەمانیش نزیکترن لـە سوننەتەوە تاوەکوو (الجويني) و شوێنکەوتووانی، وە ئیمامی (الجويني)ش نزیکترە لـە سوننەتەوە تاوەکوو ئیمامی (الرازي والآمدي) و شوێنکەوتووانی، بەم شێوەیە تا نزیك ببنەوە لـە سەردەمی (سلف الصالح)ەوە نزیکتر دەبنەوە لـە بەرنامە و بیروباوەڕیان.

**بە شێوەیەکی گشتی ئەم قۆناغانەی مەزهەبی ئەشعەری لە بیروڕادا بەم شێوەیەن:**

١. **لە (توحيد)دا:** توحيد الربوبية فقط: أما التوحيد فلا يشيرون إليه في كتبهم[٣].

والتوحيد ... يشمل ثلاثة أمور:

أ. أن الله واحد في ذاته لا قسيم له.

ب. وأنه واحد في صفاته لا شبيه له.

ت. وأنه واحد في أفعاله لا شريك له.

وأشهرها عندهم وأقواها دلالة على التوحد النوع الثالث، وبه يفسرون معنى "لا إله إلا الله". والألوهية عندهم هي القدرة على الاختراع والخلق، فمعنى لا إله إلا الله لا خالق إلا الله[٤].

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٢/ ٢٠٢، ٢٠٣). (٢) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٣/ ٢٩٣).

(٣) "موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لعبد الرحمن بن صالح المحمود (١/ ٦١٨).

(٤) "موسوعة الفرق المتنسبة للإسلام" (١/ ٢٥٠)، وانظر: "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٩٨)، "منهج أهل السنة والجماعة" لخالد عبد اللطيف (١/ ٣٠٧)، "أصول الدين" للبغدادي ص١٢٣، "الملل والنحل" للشهرستاني (١/ ١٠٠).

واتە: تەنها (توحيد الربوبية) باسی هەیە لایان، (توحيد الألوهية) لای ئەوان بەس ئەوەیە کە هاوبەش و هاوشێوەی نییە لە کرداردا، وە واتای بەوە دێت کە خاوەن توانا و دروستکردنە و هیچ دروستکارێك نییە بێجگە لە خوا نەبێت، کە ئەمە بۆخۆی (توحيد الربوبية)ە، هەموو (توحيد) لای ئەوان ئەوەیە کە خودی خوا خۆی دابەشبوونی بەسەردا نایەت، وە لە سیفاتدا هاوشێوەی نییە، وە لە کرداردا هاوبەشی نییە.

ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە ئەشعەرییەکان لە (توحيد الألوهية)دا پڕ لە (شرك وبدعة) بن و لانەی (تصوف) بن بە هەموو جۆرەکانیەوە، وە ئەو شوێنەی ئەشعەری تیادا بەربڵاوە هەر لە پێشەوا دینییەکانەوە نوقمی بوارەکانی بیدعە و هاوبەش بڕیاردان بن.

**٢. لە (توحيد الأسماء والصفات)دا: لە (الأسماء)دا واتە ناوەکانی خوا:** یەکێکە لە بنەماکانی ئەشعەرییەکان کە باوەڕیان پێی هەیە و گرنگی پێدەدەن، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵبوونی ئەشعەرییەکان بە (تصوف)ەوە، وە ئەهلی (تصوف)یش زۆر گرنگی دەدەن بە ناوەکانی خوا، لەبەرئەوەی بەرنامەیان وایە کە لەژێر ناوەکانی خوادا نهێنییەکی زۆر هەیە کە خاوەن (علم الباطن) پێی دەزانن.

ئەوەی جیایان بکاتەوە لە بەرنامەی (سلف الصالح) لەو بوارەدا ئەوەیە کە هەندێك ناو دادەنێن بۆ خوا کە دەقی قورئان و فەرموودەی لەسەر نییە، وەکوو: (القديم، الذات، الموجود ...)، وە بابەتی (هل الإسم هو المسمى) ئایا ناو ناوبراوە ... لەگەل (تأويل)ی زۆر بۆ ئەو ناوانەی کە دەبنە سیفات، بەتایبەت (الصفات الخبرية) وەکوو: (النور، الصمد ...)[1]، کە یەکەم کەس لە زانا ئەشعەرییەکاندا ئیمامی (الجويني)یە کە باوەڕ پێنەهێنانی داهێنا بەو سیفەتانە: أَوَّلُ مَنْ نَفْيَ الصِّفَاتِ الْخَبَرِيَّةِ أَبُو الْمَعَالِي الجُوَيْنِي[2].

**لە (توحيد الصفات)دا:** کۆدەنگن لەسەر باوەڕبوون پێی، لەوانە حەوت سیفاتە مەعنەوییەکان: (الصفات المعاني: العلم، الحياة، القدرة، السمع، البصر، الكلام، الإرادة). ئەم سیفەتانە عەقڵ بەڵگەیە لەسەری لای ئەشعەرییەکان.

---

(١) بۆ ئەم بابەتە لە: "موسوعة الفرق المتنسبة للإسلام" (١/ ٢٩٠)، و "موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لعبد الرحمن بن صالح المحمود (٣/ ٣٩).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ٥٠٨).

وە هەندێك سیفات هەیە کۆدەنگن لە بڕیارنەدانی بۆ خوا، ئەویش: (الصفات الإختيارية)یە بە بەڵگەی (نفي حلول الحوادث) کە نابێت دروستکراو و کاری تازە لە زاتی خوادا بوونی هەبێت، گەرنا دەبێتە خاوەنی سیفاتی (مخلوق)[١]، ئەمە یەکێکە لە بنەمای بیروڕاکانی (معتزلة) کە ئەشعەرییەکان چوونەتەوە سەریان[٢].

بەرنامەی ئەشعەرییەکان لە (توحيد الأسماء والصفات)دا و یاسا و بنەماکانیان کۆدەبێتەوە لەسەر (التفصيل في النفي مع الإجمال في الإثبات) لە ناو و سیفاتەکانی خوادا بە شێوازێکی دوور و درێژ پێداگری دەکەن لەسەر دیاریکردنی ئەو ناو و سیفاتانەی کە بە عەقڵ شاییستە نییە بۆ خوا، بەڵام لەگەڵ کورت و کوێری بڕیاردان لەسەر ئەو شتانەی شاییستەیە بۆ خوا و دەبێت بوونی ببێت و خاوەنی بێت، ئەمەش بۆخۆی ڕێگەی (الحاد)ە لە ناو و سیفاتەکانی خوادا، ئەوەندە بڕیاری نەبوون دەدەیت لە سیفاتەکاندا بۆ خوا تا دەکەویتە باوەڕنەبوونی تەواو (تعطيل) لە سیفاتەکاندا و ئەمەش لەکارخستنی سیفاتەکانە.

وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: فَإِنَّهُمْ يَصِفُونَهُ بِالصِّفَاتِ السَّلْبِيَّةِ عَلَى وَجْهِ التَّفْصِيلِ وَلَا يُثْبِتُونَ إِلَّا وُجُودًا مُطْلَقًا لَا حَقِيقَةَ لَهُ عِنْدَ التَّحْصِيلِ[٣].

واتە: هەموو وەسفەکانی خوایان لەسەر نەبوونی ئەو سیفەتانەیە کە بە عەقڵ خوا بێگەرد دەکەن پێی، بەڵام لە ئەنجامدا هیچ شتێك نامێنێتەوە لە بوونێکی ڕەها نەبێت بۆ خوا و لە ڕاستیشدا بوونی نییە.

ئەمە پێچەوانەی ئەهلی سوننەتە کە بەرنامەیان: (التفصيل في الإثبات مع الإجمال في النفي) واتە بە شێوەیەکی دوور و درێژ بڕیاری سیفاتە جێگیر و بووەکان دەدرێت بۆ خوا، وە بە شێوەی کورتبڕی بڕیاری نەبوونی سیفاتەکان دەدرێت بۆ خوا.

بەڵگەکانی قورئان و فەرموودە لە بابەتەکانی (صفات الله تعالى)دا ئەشعەرییەکان بە (متشابه)ی دادەنێن لە جۆری بەڵگەکانی دیندا، وە لەلایەکی تریشەوە بڕیاردان لەسەر بوونی سیفاتەکان بۆ خوا بە پێچەوانەی بەڵگە عەقڵییەکانی دادەنێن[٤]. بۆیە بۆ هەموو تەفسیر و

---

(١) "النفي في باب صفات الله" للأرزق سعيداني ص٦٢٩.
(٢) "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٢/ ١٠).
(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٧).
(٤) "نقض التأسيس" (٣/ ٧)، و"موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لعبد الرحمن بن صالح المحمود (٣/ ٣٢٩).

شیکارەکانیان لە کۆتاییدا دەکەونە ناو (تأويل وتفويض)ەوە کە هەردووکیان: كلاهما متقاربان في النتيجة وهي القطع بنفي ما يدل عليه ظاهرها من الصفة اللائقة بالله تعالى[١]. نزیکن لە یەك ئەنجامەوە، ئەویش باوەڕنەبوونە بەو سیفاتانەی کە شایستەن بۆ خوا لە قورئان و سوننەتدا.

٣. بیروڕایان دەربارەی فەرموودەی خوا (كلام الله) قسەکردنی نەفسی و ناخییە (كلام نفسي)، کە بۆخۆی باوەڕیان بە قسەی حەقیقی خوا نییە کە (جبریل) بیستوویەتی بە حەرف و دەنگەوە لە خوا و گەیاندبێتی بە پێغەمبەرەکەی، ئەمەش نیوەی بیروڕای (معتزلة)کانە کە باوەڕیان بە قسەکردنێك نییە بۆ خوا بە حەرف و دەنگەوە بێت و (جبریل) بیستبێتی[٢].

٤. ئەشعەرییەکان باوەڕیان بە بیروڕای بینینی خوا هەیە لە دوارۆژدا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا باوەڕیان بەوە نییە کە خوا لەسەر عەرشە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ۝٥﴾ [طه : ٥]. بەڵکوو دەڵێن لە هەموو شوێنێکە، ئەمەش هەمان بیروڕای (معتزلة)کانە کە دەڵێن: خوا لەناو بوون و دەرەوەی بووندا نییە[٣].

٥. بیروڕای ئەشعەرییەکان لە ئیماندا: مالوا فيه إلى مذاهب المرجئة[٤]: بەلای بیروڕای مورجیئەکاندا دەشکێتەوە، دەڵێن: (أنه التصديق) تەنها باوەڕبوونە بە خوا بە دڵ و وتنە بە دەم.

هەندێکیان دەڵێن: بەس (المعرفة)یە، بەس بە دڵ بزانێت کە خوا هەیە، بەبێ وتنی بە زمان.

کەواتە (لايدخل العمل في مسمى الإيمان) کردار لەناو ئیماندا نییە، بەڵام دەڵێن کردار واجبە و بە نەکردنی تاوانبار دەبیت، وە دەڵێن ئیمان زیاد و کەم دەکات بە کرداری چاك و خراپ.

بەڵام لەگەڵ ئەم بیروڕایانەدا پەیوەست نین بە دەرئەنجام و بیروبۆچوونەکانی (الجهمية والمرجئة)وە، وە جیاوازییەکی کەم تا زۆر دەبینرێت لە نێوان ئەشعەرییەکان و مورجیئە و جەهمییەکاندا، بەڵام لە دارشتن و قسەکاندا لەیەکەوە نزیکن.

٦. لە بنەماکانی ئەشعەرییەکان بە گشتی بۆ تێڕوانینی بابەتە غەیبییەکان وەکوو (ناو و سیفات و قەزا و قەدەر ...) لەسەر بنەمای عەقڵ و وتوویژە کەلامییەکانە (العقل والجدل الكلام والنظر)،

---

(١) (٢) (٣) "موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لعبد الرحمن بن صالح المحمود (٢/ ٦٩٥).

(٤) "موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لعبد الرحمن بن صالح المحمود (١/ ٦١٨).

هەروەك لە ناو و سیفاتەکاندا بەدەرکەوت. دەڵێن: أَن الدَّلَائِل النقلية ظنية وَأَن الْعَقْلِيَّة قَطْعِيَّة وَالظَّن لَا يُعَارض الْقطع[1].

واتە: بەڵگەکانی قورئان و فەرموودە گوماناوین و بەڵگە عەقڵییەکان یەکلاکەرەوەیە و گومانیش پێچەوانەی یەکلاکەرەوەکانی پێناکرێت، واتە عەقڵ لەپێش بەڵگەکانی قورئان و فەرموودەوەیە.

٧. فەرموودەکانی (خبر الآحاد) لە دیندا: لا يفيد اليقين، فلا يحتج به في العقائد[2]. ئەو جۆرە فەرموودانە دڵنیایی نادات بەدەستەوە و نابێتە بەڵگە لە بیروڕا و عەقیدەدا.

٨. بەڵام لە بابەتەکانی (الإمامة) و پلەوپایەی خەلیفە ڕاشیدینەکان و زیندووبوونەوە و دوارۆژ و بەهەشت و جەهەننەم و شەفاعەت و تکاکارییەکانی ڕۆژی دوایی ... لەسەر بنەماکانی ئەهلی سوننەتن و تا ڕادەیەکی زۆر لانادەن لە دەقەکان، لەگەڵ ئاگاداربوونیان لە (تأويل) کردنیان لە ووردەکارییەکاندا.

٩. بیروڕایان لە قەزا و قەدەردا: نظيرة الكسب، وإنكار التعليل، والحكمة، والقول بالتحسين والتقبيح الشرعي فقط، وتكليف ما لا يطاق، ...[3].

باوەڕیان بە یاسای (کسب) هەیە کە دەڵێن ئادەمیزاد خاوەن ئیرادە و توانایەکە هیچ کاریگەرییەکی نییە لە کاردا، کە ئەمە یەکێکە لەو قسانەی پێی دەوترێت (شطحات) و مانای نییە و بووەتە پەند و گاڵتەی ناو زانایان، ویستوویانە نێوەندگیری بکەن لە نێوان بیروڕای (القدرية والجبرية)کاندا، بەڵام لە کۆتاییدا کەوتوونەتە ناو بیروڕای (الجبرية والجهمية)کانەوە، وە بە هۆکاری ئەمەوە کەوتوونەتە پەیوەستبووەکانی ئەو قسەیەوە لە (نفي التعليل والحكمة والتحسين والتقبيح وتكليف مالا يطاق ...)، ئەمانە خاڵی دیاری بیروڕای مەزهەبی ئەشعەرییەکانە.

## ئایا بە ئەشعەرییەکان دەوترێت ئەهلی سوننەت؟

ئەشعەرییەکان لەبەرئەوەی ئەو تێکەڵ و چەند جۆرە بەخۆوەبینینەیان تیا دەردەکەوێت؛ حوکمدان بەسەریاندا لەلایەن زانایانەوە کە ئایا لە بازنەی ئەهلی سوننەتدان یان نا، لە چەند ڕا و

---

(١) "معالم أصول الدين" للرازي ص٢٥.

(٢) (٣) "موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لعبد الرحمن بن صالح المحمود (١/٦١٨).

بۆچوونێکیان پێك دێت[١]:

**١. هەندێکیان دەڵێن ئەشعەرییەکان ئەهلی سوننەت نین: لەوانە ئیمامی (أبو نصر السجزي) کە پێیان دەڵێت:** ثم بلي أهل السنة بعد هؤلاء بقوم يدعون أنهم من أهل الاتباع. وضررهم أكثر من ضرر المعتزلة وغيرهم، وهم: أبو محمد بن كلاب، ... وأبو الحسن الأشعري[٢].

**واتە: ئەهلی سوننەت لەپاش (معتزلة)کان تووشی کەسانێك بوون کە دەیانوت شوێنکەوتەی قورئان و فەرموودەین، بەڵام زیانیان لە (معتزلة)کان زیاتر بوو، وەکوو (ابن كلاب وأبو الحسن الأشعري).**

**یەکێکی تر لەو زانایانە (مُحَمَّد ابْن خُوَاز مِنْدَادُ الْمَالِكِيّ)یە کە دەڵێت:** كُلُّ مُتَكَلِّمٍ فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْأَهْوَاءِ وَالْبِدَعِ أَشْعَرِيًّا كَانَ أَوْ غَيْرَ أَشْعَرِيٍّ وَلَا تُقْبَلُ لَهُ شَهَادَةٌ فِي الْإِسْلَامِ وَيُهْجَرُ وَيُؤَدَّبُ عَلَى بِدْعَتِهِ[٣].

**واتە: هەموو قسەکەرێك لە دیندا بە عەقڵ، جا ئەشعەری بێت و جگە لە ئەشعەری بێت شایەتییان لێ وەرناگیرێت و دەبێت تەمێ بکرێن.**

**وە لە زانایانی ئەم دواییەش: الشيخ ابن سمحان والشيخ عبد الله أبو بطين**[٤].

**٢. ئەشعەرییەکان لە ئەهلی سوننەتن: لەوانە ئیمامی (السفاريني) کە دەڵێت:** أَهْلُ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ ثَلَاثُ فِرَقٍ: الْأَثَرِيَّةُ وَإِمَامُهُمْ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ، وَالْأَشْعَرِيَّةُ وَإِمَامُهُمْ أَبُو الْحَسَنِ الْأَشْعَرِيُّ، وَالْمَاتُرِيدِيَّةُ وَإِمَامُهُمْ أَبُو مَنْصُورٍ الْمَاتُرِيدِيُّ[٥].

**واتە: ئەهلی سوننەت سێ بەشن: شوێنکەوتووانی فەرموودە و هاوەڵان و تابعین، کە**

(١) "وسطية أهل السنة بين الفرق" لمحمد با كريم محمد با عبد الله ص٧٦ - ٨٩.

(٢) "رسالة السجزي إلى أهل زبيد في الرد على من أنكر الحرف والصوت" لأبي نصر السجزي ص٢٢٢.

(٣) "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبد البر (٢/ ٩٤٢) برقم (١٨٠٠).

(٤) "وسطية أهل السنة بين الفرق" لمحمد با كريم محمد با عبد الله ص٨٠.

(٥) "لوامع الأنوار البهية" للسفاريني (١/ ٧٣).

پێشەواکەیان (أحمد بن حنبل)ە رَحِمَهُ اللَّهُ، وە ئەشعەرییەکان کە پێشەواکەیان (أبو الحسن الأشعري)یە رَحِمَهُ اللَّهُ، وە ماتۆریدییەکان کە پێشەواکەیان (أبو منصور الماتريدي)یە.

**٣. ئەشعەرییەکان ئەهلی سوننەتن لەو بابەتە عەقیدەییانەدا کە هاوڕان لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا:** لەو زانایانەش الشَّيْخ (عبد العزيز بن عبد الله بن باز)ە رَحِمَهُ اللَّهُ کە دەڵێت: فالمتأول لبعض الصفات كالأشاعرة لا يخرج بذلك عن جماعة المسلمين ولا عن جماعة أهل السنة في غير الصفات ولكنه لا يدخل في جماعة أهل السنة عند ذكر إثباتهم للصفات وإنكارهم للتأويل ... كما أنه لا مانع أن يقال: إن الأشاعرة ليسوا من أهل السنة في باب الأسماء والصفات وإن كانوا منهم في الأبواب الأخرى حتى يعلم الناظر في مذهبهم أنهم قد أخطأوا في تأويل بعض الصفات ... تحقيقا للحق وإنكارا للباطل وإنزالا لكل من أهل السنة والأشاعرة في منزلته التي هو عليها[١].

**واتە: هەڵەکردن لە هەندێك سیفاتدا وەکوو ئەشعەرییەکان دەریان ناکات لە کۆمەڵی موسوڵمانان و ئەهلی سوننەت، لەو شتانەی کە پێکاویانە بێجگە لە سیفاتەکانی خوا، بەڵام لە باسی سیفاتدا کاتێك ناپێیکن پێیان ناوترێت ئەهلی سوننەت و ناچنە ناویان، ... ڕێگریش نییە لەوەی کە بوترێت ئەشعەرییەکان ئەهلی سوننەت نین لە ناو و سیفاتەکانی خوادا، ئەگەرچی ئەهلی سوننەتن لەوانەی کە پێکاویانە، تاوەکوو بینەر بزانێت کە مەزهەبەکەیان لایداوە لە باسی هەندێك لە سیفاتەکانی خوادا، بۆ دەرکەوتنی حەق و پێچەوانەیەتی بەتاڵ و دانانی ئەهلی سوننەت و ئەشعەرییەکان هەریەك لەوانە لە پلەوپایەی خۆیان کە هەیانە.**

**وە** الشَّيْخ **(صالح الفوزان) هەمان بۆچوونی (ابن باز)ی هەیە دەربارەی ئەشعەرییەکان**[٢].

**وە زاراوەی سوننەتیش وەك (ابن تيمية)** رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت:** وَلَفْظُ "السُّنَّةِ" فِي كَلَامِ السَّلَفِ يَتَنَاوَلُ السُّنَّةَ فِي الْعِبَادَاتِ وَفِي الِاعْتِقَادَاتِ[٣].

---

(١) "تنبيهات هامة على ما كتبه الشيخ محمد علي الصابوني في صفات الله عز وجل" لابن باز ص٣٧.

(٢) "البيان لأخطاء بعض الكتاب" لصالح الفوزان ص٢٨.

(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٨/ ١٧٨).

واتە: وشەی سوننەت لە قسەی شوێنکەوتوواندا (عیبادات و عەقیدە) دەگرێتەوە.

وە ئەشعەرییەکانیش لە بواری عیباداتدا لەسەر بەرنامەی ئەهلی سوننەتن لە شوێنکەوتەی ئیمامەکانی ئەهلی سوننەت و بەڵگەکان، وە تەنانەت (أبو الحسن الأشعري) لەسەر مەزهەبی (الشافعي) بوو لە (فقه)دا لەسەر دەستی مامۆستاکەی (زكريا بن يحيى الساجي)، وە هاتوچۆی دەرسەکانی (أبو اسحاق المروزي الشافعي) دەکرد، کە ئەمەش دەکرێتە هۆکارێك لە هۆکارەکانی پاشگەزبوونەوەی لە (معتزلة)، بەتایبەت هەڵوێستەکانی ئیمامی (شافعي) لە دژایەتیکردنی (أهل الكلام)[1].

وە (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ ئەشعەرییەکان بە ئەهلی باوەڕبوو بە سیفاتەکانی خوا دەداتە قەڵەم، وە جیاوازییان دەکات لە نێوان پێشووەکانیان و ئەوانەی ئەم دواییەیان و دەڵێت: وأن الأشعرية أقرب إلى السلف والأئمة وأهل الحديث ... فإن كثير من متأخري أصحاب الأشعري خرجوا عن قوله إلى قول المعتزلة أو الجهمية أو الفلاسفة[2].

واتە: ئەشعەرییەکان نزیکترن لە پێشینی ساڵحان و ئیمامەکان و فەرمووودەناسان ... وە زۆری ئەشعەرییەکانی دوای ئەوان لە بیروڕاکانی (أبو الحسن الأشعري) دەرچوون بۆ قسەی موعتەزیلە و جەهمیە و فەلاسیفەکان.

ئەم ڕایەی سێیەم لەسەر ئەشعەرییەکان لە هەموو ڕاکانی تر بەهێزترە لەڕووی زانستی و حەقبێژی و لەخۆگرتنی (الإنصاف والعدل).

کۆتا بڕیاری دروستیش ئەم ڕایەیە، بەڵام بەشێوەی پەیوەستبوون بڕیار لەسەر ئەشعەرییەکان بدرێت کە ئەهلی سوننەتن یان نا؟ ئەوا نە بوترێت ئەهلی سوننەتن وە نە بوترێت ئەهلی سوننەت نین، بەڵکوو بوترێت ئەشعەرییەکان لەو بابەتەدا ئەهلی سوننەتن و لەو بابەتەدا ئەهلی سوننەت نین، بۆ نموونە ئەهلی سوننەتن لە عیباداتدا، لەگەڵ هەندێك بۆچوونیان لەسەر هەندێك لە سیفاتەکانی خوادا، وە ئەهلی سوننەت نین لە ئیمان و قەدەر و (الصفات الإختياري) ...دا[3].

---

(١) "موقف ابن تيمية من الأشاعرة" لعبد الرحمن بن صالح المحمود (١/ ٣٣٨).

(٢) "شرح العقيدة الأصفهانية" لابن تيمية ص١٢٧.

(٣) "وسطية أهل السنة بين الفرق" لمحمد با كريم محمد با عبد الله ص٨٩.

لەبەرئەوەی ئەشعەرییەکان نەیانتوانیوە هەڵگری تەواوی بەرنامەی ئەهلی سوننەت بن، وە ناونیشانی (أهل السنة) نادرێت بەسەر کەسدا تاوەکوو هەموو بنەما و سیفاتەکانی ئەهلی سوننەتی لەخۆ نەگرتبێت و بەرائەتی تەواوی تیادا نەبێت لە هەموو بیروڕای فیرەقە گومڕاکان، بۆئەوەی کەس پێی سەرلێشێواو نەبێت و چاوبەس نەکرێت.

  

# بەرنامەی حەقی ئەهلی سوننەت

## منهج أهل السنة

بەرنامە و بیروڕای ئەهلی سوننەت تاکە بەرنامەی حەق و لەخۆگری هەموو بوارەکانی دین بووە بە درێژایی مێژوو لە بەرامبەر فیرەقە گومڕاکاندا و توانیویەتی بەهاکانی خۆی بپارێزێت و خۆڕاگر بێت لە نێوەندگیری لە نێوان زیادەڕەوی و کەمڕەوی و پەیوەستبوون بە دەقەکانی قورئان و فەرموودەوە بە هاوشێوە و پێهەڵگری هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان کە پێیان دەوترێت (السلف الصالح) و خۆپاراستن لە هەموو حەز و ئارەزوو و کاریگەرییەکی عەقڵی و ڕووداوەکان و بیدعەکارییەکان، وە بۆ زیاتر ئاشنابوون بەسەر حەقدا و چاوڕۆشنبوون بەسەر گومڕاییەکاندا، بە پێویستی دەزانین بەرنامە و بیروڕای ئەهلی سوننەت بە شێوەیەکی گشتی و بابەتی قەدەر کە باسەکەمانە بە شێوەی خاڵ بخەینە ڕوو:

**١. لە باوەڕبووندا (الإيمان):** ئەهلی سوننەت باوەڕیان بە سێ بەشەکەی (توحید) هەیە کە لە قورئاندا باسکراوە و لە سوننەتیشدا شیکردنەوەی لەسەر کراوە بە کردار و قسە:

توحيد الربوبية: کە پێی دەوترێت (توحيد العلم والمعرفة والاعتقاد)، ئەمە بوارێکی عەقیدەییە و زانینە بەوەی کە (ﷲ) عَزَّوَجَلَّ بە تەنیا دروستکار و خاوەن و بەڕێوەبەری هەموو بوونەوەرێکە و باڵادەستە بەسەریاندا، بە ژیان و مردن و ڕۆزی و هەڵسووڕێنەریان، بەبێ هیچ هاوبەش و یارمەتیدەر و هاوشێوەیەکی تر، ئەم جۆرە باوەڕە چەسپاوە لە ناخی ئادەمیزاددا و عەقڵیش بەڵگەکارە لەسەری، وەکوو (ابن العثيمين) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: ولم يعلم أن أحدًا من الخلق أنكر ربوبية الله سبحانه، إلا أن يكون مكابرًا غير معتقد بما يقول[1]. واتە کەسێك نییە نکوولّی لێ بکات بێجگە لە خۆبەزلزانێکی بێبڕوا نەبێت بەوەی کە دەیلێت.

وە بەم جۆرە (توحيد الربوبية) و باوەڕبوونە بە خوا کەس نایەتە ناو بازنەی ئیسلامەوە، تاوەکوو پەیوەست نەبێت بە جۆری دوای ئەمەوە کە (توحيد الألوهية)ە.

---

(١) "نبذة في العقيدة الإسلامية" لمحمد بن صالح العثيمين ص٢٢، وانظر: "الوجيز في عقيدة السلف الصالح" لعبد الله بن عبد الحميد الأثري ص٤٩.

توحيد الألوهية: كە پێی دەوترێت (توحيد الإرادي الطلبـي العملي، توحيد العبادة)، ئەمەیان باوەڕبوونە بەوەی كە (اللَّهُ) عَزَّوَجَلَّ خوای ڕاست و دروستی بوونەوەرەكانە و شایستەی پەرستنە و هاوبەش و شەریكی بۆ دانانرێت لە هیچ جۆرێك لە جۆرەكانی پەرستنی ڕووكەش و ناوەڕۆكی ئادەمیزاددا.

ئەمە هۆكاری دروستبوونی ئادەمیزاد و جنەكانە، وەكوو خوای گەورە تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ دەفەرمویت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦﴾ [الذاريات: ٥٦].

وە هۆكاری ناردنی پێغەمبەران و بانگەوازییەكەیانە، وە پەیوەستبوون و باوەڕبوون بەم جۆرەیان هۆكارە بۆ هاتنە ناو ئیسلام و موسوڵمانبوونی، وە پەرستنەكانیش لەم (توحيد)ەدا بە دڵ و زمان و كردارە، وە گومڕاییەكانی ئەم (توحيد)ەش لە شوبهاندنی دروستكراوەكانە بە خوایانەوە (تشبيه المخلوق بالخالق).

توحيد الأسماء والصفات: كە پێی دەوترێت (توحيد العلم والمعرفة)، ئەمەیان باوەڕبوونە بە هەموو ئەو ناو و سیفاتانەی كە خوا لە قورئاندا بۆ خۆی باسی كردووە و پێغەمبەرەكەی ﷺ لە فەرموودەكانیدا باسی كردووە، بەو شێوەیەی كە شیاوە بۆ پەروەردگار، بەبێ لادان لێی بە ڕێگەی تحريف ولا تعطيل ولا تكييف ولا تمثيل(١)، بە گۆڕانكاری، یاخود لەكارخستن و لە واتاخستن، یاخود چۆنیەتی بۆدروستكردنی، یاخود هاوشێوەكاری بۆی، هەموو ئەم ڕێگایانە لەم بوارەدا گومڕایین.

بەڵكوو ناو و سیفاتەكانی خوا بەشدارن لە داڕشتن و باسكردندا لەگەڵ ناو و سیفاتەكانی ئادەمیزاددا، بەڵام لە چۆنیەتیدا جیاوازن، هەریەكەو شیاوە بە خۆیەوە گەر (خالق) بێت یاخود (مخلوق)، گەرنا بە پێچەوانەوە دەبێتە (إلحاد) و بێبڕوایی و گومڕایی لەم (توحيد)ەدا، وەكوو خوای گەورە تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ دەفەرمویت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَـٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ۝١٨٠﴾ [الأعراف: ١٨٠].

---

(١) "نبذة في العقيدة الإسلامية" لمحمد بن صالح العثيمين ص٢٧، وانظر: "الوجيز في عقيدة السلف الصالح" لعبد الله بن عبد الحميد الأثري ص٥٥.

**لەم جۆرە تەوحیدەدا دوو کۆمەڵ گومڕا بوون:**

أ. **المعطلة:** ئەوانەن کە باوەڕیان بە ناو و سیفاتەکانی خوا نییە و لەکاری دەخەن، وەکوو: المعتزلة والقدرية والجهمية والشيعة، وە بەشێك لە ئەشعەری و ماتۆریدییەکانی ئەم دواییەیان (المتأخرين).

ب. **المشبهة:** ئەوانەن کە هاوشێوەکاری بۆ ناو و سیفاتەکانی خوا دەکەن لە (المشبه والمجسمة ...)، کە هەموو گومڕاییەکانی ئەم بابەتەش دەگەڕێتەوە بۆ شوبهاندنی خوا بە دروستکراوەکانییەوە (تشبيه الخالق بالمخلوق).

بوونی ئەم سێ جۆرە تەوحیدە وەکوو خۆی دەبێتە هۆکاری دروستبوون و هێنانەدی عەقیدە و بیروڕایەکی پاك و کار و عیبادەت و بەندایەتییەکی بێگەرد و ناسین و ئاشنابوون بە وەسف و باسی خوا بە شێوەیەکی ڕاست و دروست.

**٢. لە باوەڕبوون بە بابەتە غەیبییەکانی وەك (الملائكة والرسل والكتب واليوم الآخر والقضاء والقدر، والجنة والنار ...):** ئەهلی سوننەت باوەڕی پێیەتی بەو شێوە و باسەی کە لە قورئان و سوننەتدا هاتووە، بەبێ پێوەر و پێوانەکردنی بە عەقڵ و تێگەیشتنەکان.

**٣. پێناسەی (الإيمان):** بریتییە لە باوەڕبوون بە دڵ و دان پێدانان بە زمان و کارکردن بە ئەندامەکانی لاشە.

ئیمان پلەوپایەیە و هەریەکەی لە ئاستێکدایە و گەورە و بچووکی هەیە و زیاد دەکات بە چاکە و خواپەرستی و کەم دەکات بە تاوان و بێبڕوایی تاوەکوو نامێنێت، وە بێبڕواییش چەندەها جۆرە[1].

**٤. لە (الأسماء والأحكام)دا:** ئەهلی سوننەت باوەڕیان وایە کە: الأعمال جزء من مسمى الإيمان[2]. کردارەکان بەشێکن لەوانەی پێیان دەوترێت ئیمان، وە لە تاوانە گەورەکانیش کەس پێی دەرناچێت لە ئیمان جگە لە (الشرك والكفر بالله) نەبێت.

---

(١) "مجمل مسائل الإيمان العلمية" لمجموعة من طلبة الشيخ الألباني رحمه الله ص١٤.

(٢) "وسطية أهل السنة بين الفرق" لمحمد با كريم محمد با عبد الله ص٣٤٦.

**خاوەنی تاوانە گەورەکان ئەگەر تەوبەیان نەکرد:** مؤمن بإيمانه، فاسق بكبيرته[١]. **بە بوونی ئیمانی ئیماندارە، وە بە تاوانەکانی تاوانبارە و لە ڕۆژی دواییدا لەژێر ویست و ئیرادەی خوادایە بە سزادان یا لێخۆشبوون.**

**ئەهلی سوننەت وەکوو (خەوارج و موعتەزیلە)کان نین بڵێن ئیمان یەك بەشە و پارچە پارچە نابێت و بە ڕۆیشتنی بەشێکی هەمووی دەڕوات و بە مانەوەیشی هەمووی دەمێنێتەوە، وە کەسی تاوانکاری گەورە (الکبائر) لای ئەوان بێبڕوایە ئەگەر تەوبە نەکات و (معتزلة)کان دەڵێن لە نێوان ئیمان و بێبڕوابیدایە، وە هەردوولایان دەڵێن لە ڕۆژی دواییشدا بە هەتاهەتایی لە دۆزەخدایە.**

**وەکوو (مرجئة)کانیش نین بڵێن کردار لەناو ئیماندا نییە و ئیمانداریش بە هیچ شتێك لە ئیمان ناچێتە دەرەوە.**

**٥. لە موژدە و هەڕەشەکاندا (وعد ووعيد): ئەهلی سوننەت بیروباوەڕیان وایە خوای پەروەردگار موژدە و لێخۆشبوونەکان (وعد) دەهێنێتە دی، وەکوو خوای گەورە** تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ **دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ٣١﴾ [الرعد: ٣١].

**وە هەڕەشەکانیش بۆ کەسێك کە نەمردبێت لەسەر بێبڕوایی و شرك:** داخل تحت المشيئة؛ إن شاء الله غفر له وإن شاء عذبه. وأنه إن عذبه لا يخلده في النار كالكفار[٢]. **لەژێر ویستی خوادایە، ئەگەر ویستی لێبێت لێی خۆشدەبێت، وە ئەگەر نا سزای دەدات، بەڵام بە هەتا هەتایی لە دۆزەخدا نابێت وەکوو بێبڕواکان.**

**ئەهلی سوننەت وەکوو (معتزلة)کان نین بڵێن (وعد) و پاداشتەکان:** إيجابهم ذلك على الله سبحانه بطريق الاستحقاق والعوض[٣]. **واجبە لەلای خوا بە شێوەی حەق و ماف و پاداشت بۆ عەبدەکانی.**

**هیچ شتێکی (مخلوقات) حەق نییە بەسەر خواوە، مەگەر خۆی ئەو حەقەی لای خۆیەوە**

(١) "وسطية أهل السنة بين الفرق" لمحمد با كريم محمد با عبد الله ص٣٤٦.

(٢) "وسطية أهل السنة بين الفرق" لمحمد با كريم محمد با عبد الله ص٣٥٧.

(٣) "وسطية أهل السنة بين الفرق" لمحمد با كريم محمد با عبد الله ص٣٥٦.

دانابێت بۆیان، وە پاداشتەکانیش لە ئاستی کارەکاندا نییە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «لَنْ يُدْخِلَ أَحَدًا عَمَلُهُ الجَنَّةَ، قَالُوا: وَلاَ أَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: لاَ، وَلاَ أَنَا، إِلَّا أَنْ يَتَغَمَّدَنِي اللهُ بِفَضْلٍ وَرَحْمَةٍ، ...»[1]. کەس بە کردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشتەوە، وتیان تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: منیش، مەگەر خوای گەورە نوقمم بکات لە بەزەیی و پلەوپایەی خۆی.

ئەهلی سوننەت وەکوو (خەوارج) و (معتزلة)کانیش نین بڵێن دەبێت هەڕەشەکانیش وەکوو موژدەکان بێنە دی، ئەوەی کە هەڕەشەی لێکردووە بیخاتە جەهەننەم دەبێت بیخات، یاخود نەیەتە دەرەوە لە جەهەننەم ئەوا هەتا هەتایە نەیەتە دەرەوە، یاخود لێی خۆشنەبێت نابێت لێی خۆشبێت، بەڵکوو هەڕەشەکان (وعید) لەژێر ویستی خوادان، دەشێت بێتە دی و دەشێت نەیەتە دی و عەفوویان بکات.

٦. **هەڵوێستیان دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەر (الصحابة)** ﵃: ئەهلی سوننەت خۆشەویستییان بۆ هەموو هاوەڵان هەیە، نە پلەی (معصومية)یان دەدرێتێ وەکوو پێغەمبەران ﭺ، وە نە وەکوو کەسی ئاسایی و سادە تەماشا دەکرێن تاوەکوو قابیلی هەموو گومان و هەڵەیەك بن، بەڵکوو (عادل) و دادوەر و خاوەن کردەوەی گەورە و ئیمانی بەهێز و پلەوپایەی بەرزن لای خوا و وەسفەکانی قورئان و فەرموودە شایەتحاڵیانە.

ئەهلی سوننەت وەکوو (معتزلة) و (خەوارج) و (شیعة)کان نین حوکمی (کفر وفسق) بدەن بەسەریاندا بە هۆکاری ئەو (اجتهاد) و هەڵە ئادەمیزادییەی کە هەیانبووە، لەپاڵ هەموو ئەو جیهاد و کردارەیان کە وەکوو شاخەکان وایە لە ئاستی چەند بەردەڵۆکێکدا.

وە نە وەکوو (شیعة)کانیشن کە خۆشەویستی و لایەنگرییان بۆ هەندێکیان هەبێت و باقییەکەی تریشیان کافر بکەن.

وە نە وەك (ناصبة)کانیش وان کە قسە بە (آل وبيت) بڵێن.

---

(١) رواه البخاري (٥٦٧٣)، ومسلم (٢٨١٦)، وابن ماجه (٤٢٠١)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٤٨)، وأحمد في "المسند" (٧٢٠٣)، والدارمي في "سننه" (٢٧٧٥)، والبزار في "المسند" (٣١٢١)، وأبو يعلى في "مسنده" (١٧٧٥)، والطبراني في "الكبير" (٤٩٣)، والطيالسي في "مسنده" (٢٤٤١)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٥٨٤٠)، والبيهقي في "الشعب" (٩٦٧٤)، وابن بطة في "الإبانة" (١٠٥١)، والبغوي في "شرح السنة" (٤١٩٤).

بەڵکوو هاوەڵان زانایان و ئەولیاکانی خوان و ئەو شایەتانەن کە ئەم دینەیان لەسەر شانیان گەیاندووە و قورئان وادەی ڕازیبوون و پلەوپایەیان دەنەخشێنێت و پێغەمبەر ﷺ لێیان ڕازی بووە، بەتایبەت لە خەلیفە و ناودارەکانیان.

٧. **بیروڕا و بەرنامەی ئەهلی سوننەت لە قەدەردا:** باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر یەکێکە لە بنەماکانی ئیمان و پایەیەکە لە شەش پایەکانی، وە ئیمان بە قەزا و قەدەر دانامەزرێت تاوەکوو باوەڕ بە چوار پایەکەی نەکرێت، ئەوانیش بریتین لە:

أ. **العلم.**

ب. **الكتابة.**

ت. **المشيئة.**

ث. **الخلق.**

وە دانان و دارِشتنەکانی خوا بۆ ئادەمیزاد پێنج بەشە:

أ. **التقدير العام.**

ب. **التقدير البشري.**

ت. **التقدير العمري.**

ث. **التقدير السنوي.**

ج. **التقدير اليومي.**

وە فەرمان و ئیرادەی خوا بۆ بوونەوەرەکان دوو جۆرە:

أ. **الإرادة الكونية:** مرادف للمشيئة.

ب. **الإرادة الشرعية:** تتضمن بمحبة الله ورضاه.

کەواتە جیاوازی هەیە لە نێوان (الإرادة والمشيئة والمحبة والرضا).

ئادەمیزاد خاوەن ویست و ئیرادەیە و لە چوارچێوەی ویست و ئیرادەی گشتی خوادایە، وە ئەو ئیرادە و پێخۆشبوونانەی خواش دوو جۆرن:

أ. **المراد لنفسه.**

ب. **المراد لغيره.**

گرتنەبەری هۆکارەکانیش کاریگەری هەیە لەسەر دروستکراوەکان بە ویست و قەدەری خوا، بەڵام نابێت ئاوڕدانەوەی دڵی لەسەر بێت بەوەی کە بە تەنیا هۆکارەکان کاریگەرن (الأخذ بالأسباب والكفر به).

وە بە هیچ شێوەیەك قەدەر ناکرێتە بەڵگە و پاساو بۆ کاری هەڵە و تاوانەکانی ئادەمیزاد.

خوای گەورە توانا و کاریگەری بەخشیوە بە ئادەمیزاد لەگەڵ کارەکاندا، وە پێش کارەکانیش توانا هەر بوونی هەیە (قبل الفعل ومعه).

خوای گەورە ستەم لە ئادەمیزاد ناکات و هەموو کارەکانی پڕە لە دانایی و هۆکار و مەبەست (الحكمة والعلة والغاية) لە هێنانەدی کردارەکاندا، بۆیە پێویستە ئەگەر بەندە چاکەی کرد و ڕێگەی باشەی گرتە بەر سوپاس و ستاییشی خوای لەسەر بکات، وە ئەگەر ڕێگەی خراپەی گرتە بەر و ناخۆشییەکان هات بەسەریدا لۆمەی خۆی بکات و هەوڵی گۆڕانکاری بدات و بزانێت کە بە هۆکاری کردەوەکانیەوەیەتی، بۆیە واجبە ئیمان بە قەدەرەکانی خوا بێنیت لە خێر و شەڕ و پێی ڕازیبیت.

قسەکردن لەسەر قەدەر بە عەقڵ و تێڕوانینەکان حەرامە و هەڵەیە، لەبەرئەوەی نهێنییەکانی خوایە لە دروستکراوەکانیدا (سر الله في خلقه)، بۆیە جیاوازی هەیە لە نێوان ئەوەی کە بە ئێمەی دەکات، کە دەرکی پێ ناکەین و نازانین چیمان پێدەکات، لەگەڵ ئەوەی کە داوامان لێدەکات (ما أريد بنا وما أريد منا)، بەڵام ئەوەی کە لە ئێمەی دەوێت ئاشکرایە فەرمانەکانی قورئان و فەرموودەیە و سەرقاڵبوون و کارکردنە پێی.

ئادەمیزاد لە هەندێك ڕووەوە بێدەسەڵاتە (مسير) لە ڕووداوەکان، وەکوو ژیان و مردن و ڕۆزی و جووڵەی دڵ و هەندێك لە ئەندامەکانی لاشەی، وە لە ڕوویەکی ترەوە خاوەن عەقڵ و ئیرادە و کاری سەربەخۆی خۆیەتی (مخير) و لێی ناسەنرێتەوە، وە هەر ئەوانەیشە پێی دەوترێت داواکاری شەرعی بۆ کارەکان (تكليف).

ئەوەی لەسەری نووسراوە پەیوەندی بە (علم) و زانستی خواوە هەیە بۆی، کە دەبێت خوا بزانێت چییە و چۆنە و وردەکاری و کۆتاییەکەی چۆن دەبێت، ئەمەش نابێتە هۆکاری لێسەندنەوەی ئیرادە و بژاردەی، بەڵکوو (علم الله كاشف لا مكره) عیلمی خوای پەروەردگار ئاشکراکارە و بەزۆرپێکار نییە.

خوا بێگەردە لە شەڕ و شەڕی (محض)ی دروستنەکردووە، بەڵکوو شەڕ لە (مخلوقات)دا هەیە و ڕێژەییە، وە تاوانیش بە زۆرەملێکردن ناکرێت (لا يعصي الله قسرًا)، بەڵکوو تاوان و شەڕ ئیزنی خوای لەسەرە لەبەر بوونی هەندێك حیکمەت و ووردەکاری.

وە لە ئاستی قەدەرەکانیشدا ئیماندار دەبێت ئارامگرتن یاخود ڕازیبوون پێی یاخود سوپاسگوزاری (الصبر، الرضا، الشكر) بەکاربێنێت، کە ئەمە هەریەکەیان پلەیەکی ئیمانییە لە قەدەردا.

وە قەدەر چارەسەر دەکرێت بە گرتنەبەری قەدەری تر (القضاء المقدر يعالج بالقضاء المقدر).

ئەهلی سوننەت باوەڕیان بە قەدەر هەیە و جێبەجێکاری شەرعیشن لە یەك کاتدا، هیچ دژایەتی و لەکارخستنێك لە نێوانیاندا نییە، بەڵکوو تەواوکاری یەکن بە تێڕوانینیان لە هەموو کارێکدا.

بە پێچەوانەی قەدەرییەکان کە بە تێڕوانینی شەرعەوە باوەڕیان بە قەدەر نەما، وە بەپێچەوانەی جەبرییەکانیشەوە کە بە تێڕوانینیان بۆ قەدەر باوەڕیان بە شەرع نەما.

وە وەکوو بێبڕوایان و تاوانبارانیش نین کە دەڵێن شەرع دژایەتی قەدەر دەکات و پێچەوانەی یەکن و بەو هۆکارەشەوە باوەڕیان بە هیچیان نییە[1].

ئەمە بە شێوەیەکی کورت و ئاماژە بۆکراو و گشتی بیروڕای ئەهلی سوننەتە بەتایبەت لە قەزا و قەدەردا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

تم بحمد الله

  

---

(١) بۆ گشت ئەم بابەتانە بڕوانە: "دراسات في الأهواء والفرق" لناصر العقل (١/ ١٢٥ – ١٣٤)، و "معالم الطريق إلى الله" لأبي فيصل البدراني ص٥٠ – ٦٠، و "وسطية أهل السنة بين الفرق" لمحمد با كريم محمد با عبد الله ص٣٦١ – ٣٨٧.

# ناوەڕۆك

بـــابـەت | لاپـەڕە

پێشەکی ........................................................ ٧

**بەندی یەکەم: بەشی یەکەم:** ........................................................ ٢١

١. پێناسەی قەزا و قەدەر و جیاوازی نێوانیان ........................................ ٢١

٢. بەڵگەکانی باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر (أدلة الإيمان بالقضاء والقدر) ................ ٢٤

أ. بەڵگەکانی قورئان (القرآن) ........................................................ ٢٤

ب. بەڵگەکانی فەرموودە (الأحاديث) .................................................. ٢٥

ت. وتەی هاوەڵان و زانایان (أقوال الصحابة والعلماء) ................................... ٢٧

ث. کۆدەنگی زانایان (الإجماع) ........................................................ ٢٩

ج. بەڵگەی (الفطرة والعقل والحس) .................................................... ٣٠

٣. پلەوپایەی قەدەر لە ئیماندا (مرتبة القدر في الإيمان) ................................ ٣٢

٤. پایەکانی قەدەر (أركان القدر) ....................................................... ٣٥

٥. بەشەکانی دارشتنی قەدەر (أقسام التقدير) ............................................ ٥٢

٦. جۆرەکانی ویست و ئیرادەی خوایی (أنواع الإرادة الربانية) ............................. ٥٧

یەکەم: قەدەرە کەونییەکان (الإرادة الكونية) ............................................ ٥٧

دووەم: قەدەرە شەرعییەکان (الإرادة الشرعية) ........................................... ٦٠

**بەندی یەکەم: بەشی دووەم:** .......................................................... ٦٩

بابەتە هەستیارەکانی قەدەر ................................................................ ٦٩

**بابەتی یەکەم:** کرداری ئادەمیزاد (أفعال العباد) ........................................ ٦٩

١. ئەو دەقانەی باس لە بێدەسەڵاتی ئادەمیزاد دەکات (مسیر) ..................... ٧٤

٢. ئەو دەقانەی باس لە بژاردەی ئادەمیزاد دەکات (الإختیار) ..................... ٩٣

**بابەتی دووەم:** بێگەردی پەروەردگار لە ستەم (تنزيه الله عن الظلم) ..................... ١٠٧

١. تێڕوانینی فیرەقەکان: جەبەرییەکان (الجبرية) ................................ ١١٨

٢. تێڕوانینی فیرەقەکان: قەدەرییەکان (القدرية) ................................ ١٢٧

**بابەتی سێیەم:** دانایی و هۆکارەکان لە کارەکانی پەروەردگاردا
(الحكمة والتعليل في أفعال الله تعالى) .................................. ١٣٣

١. بیروڕای فیرەقەکان: جەبەری و جەهمییەکان (نفاة الحكمة والتعليل) ........... ١٤٥

٢. بیروڕای فیرەقەکان: قەدەری و موعتەزیلەکان (مثبتوا الحكمة والتعليل) ....... ١٥٥

**بابەتی چوارەم:** بە چاك و خراپ زانین لە پێزانینی عەقڵەوە
(التحسين والتقبيح العقليين) .......................................... ١٥٩

١. ڕای موعتەزیلەکان ......................................................... ١٦٠

٢. ڕای ئەشعەرییەکان ......................................................... ١٦٢

**بابەتی پێنجەم:** بوونی توانا و داواکارییەك کە لە سنووری جێبەجێکردندا نەبێت
(الاستطاعة والتكليف بما لايطاق) ...................................... ١٧٢

- پەیوەندی نێوان ئیرادەی ئادەمیزاد و قەدەری کەونی
(العلاقة بين إرادة الإنسان والقدر الكوني) ................................ ١٧٣

- ئایا داواکارییەك کە لە سنووری جێبەجێکردندا نەبێت بوونی هەیە؟
(تكليف ما لايطاق) .......................................................... ١٨٨

- ڕای فیرەقەکان لەسەر (تكليف ما لايطاق) ........................................ ١٩٤
یەکەم: (الجبرية والجهمية ...)کان ........................................ ١٩٤
دووەم: (المعتزلة والقدرية ...)کان ........................................ ٢٠٦
سێیەم: (الأشاعرة ...)کان ........................................ ٢١٥
- بەرنامەی ئەهلی سوننەت لە (الاستطاعة والتكليف بما لايطاق)دا ............ ٢٢٦
- جیاوازییەکانی نێوان قەدەری شەرعی و قەدەری کەونی ........................ ٢٣٥
- کۆکراوەی بابەتەکە ........................................ ٢٣٨
**بابەتی شەشەم:** ڕێمووني و گومڕاییکردن (الهداية والضلال) ........................ ٢٤٩
پلەکانی ڕێمووني (مراتب الهداية) ........................................ ٢٥٥
**پلەی یەکەم:** ڕێمووني گشتی (الهداية العامة) ........................................ ٢٥٦
**پلەی دووەم:** ڕێمووني بانگەوازی و ڕوونکاری (هداية الإرشاد والدعوة) ... ٢٥٨
**پلەی سێیەم:** ڕێمووني و هیدایەت خستنە دڵ (هداية التوفيق والإلهام) ...... ٢٦٣
- بژاردەی ڕێگەی خێر و پاداشتەکان ........................................ ٢٦٨
- بژاردەی ڕێگەی شەڕ و سزاکانی ........................................ ٢٧١
- چۆنیەتی پەیوەندییەکانی نێوان توانای خوا و توانای بەندەکانی
(كيفية الصلة بين قدرة الله وقدرة العباد) ........................................ ٢٨٠
**پلەی چوارەم:** ڕێمووني بۆ ڕێگەی بەهەشت و دۆزەخ ........................ ٢٨٧
هۆکارەکانی هیدایەت (أسباب الهداية) ........................................ ٢٩٠
**هۆکاری یەکەم:** هۆکارە گشتییەکان (الأسباب العامة) ........................ ٢٩٠
**هۆکاری دووەم:** هۆکارە تایبەتییەکان (الأسباب الخاصة) ........................ ٢٩٩
هۆکارەکانی گومڕایی (أسباب الضلال) ........................................ ٣٠٤

هۆكاری یەكەم: بەكارنەهێنانی پێبەخشراوەكان ........................ ٣٠٥
هۆكاری دووەم: بێبڕوایی (الكفر) ................................ ٣٠٧
• جۆرەكانی بێبڕوایی (أنواع الكفر) ............................ ٣٠٨
هۆكاری سێیەم: هاوبەش بڕیاردان (الشرك) ............................... ٣١٤
هۆكاری چوارەم: شوێنكەوتەی حەز و ئارەزووەكان (اتباع الهوی) ................ ٣١٦
هۆكاری پێنجەم: خۆ بەگەورەزانین (التكبر) .............................. ٣٢٠
هۆكاری شەشەم: ستەم كردن (الظلم) .................................... ٣٢٢
بابەتی حەوتەم: كار و هۆكارەكانی (الأسباب والمسببات) ........................ ٣٢٦
گرنگترین نهێنییەكانی ناو هۆكارەكان ................................. ٣٢٩
١. هۆكارەكان سەربەخۆ نین بە خۆیان (الأسباب لیست مستقلة بذاتها) .......... ٣٢٩
٢. مەرج نییە بە بوونی هۆكارەكان و نەبوونی ڕێگرییەكان كارەكان بێنە دی ..... ٣٣٠
٣. گرتنەبەری هۆكارەكان و پەیوەستنەبوونی دڵ پێیانەوە
(الأخذ بالأسباب والكفر به) ............................................ ٣٣٥
٤. بەرەنگاركردنی قەدەر بە قەدەر (منازعة الأقدار بالأقدار) ...................... ٣٤٥
بەندی دووەم: بەشی یەكەم: .................................................. ٣٥٥
ڕازیبوون بە قەدەر و حوكمەكەی ............................................ ٣٥٥
دادپەروەری خوایی لە لێپرسینەوەدا .......................................... ٣٧١
پرسیار و وەڵام لە بابەتە قەدەرییەكاندا ....................................... ٣٧٦
بەرهەمەكانی باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر ....................................... ٤١٢
بەندی دووەم: بەشی دووەم: ................................................... ٤٢٧
سەرەتای دروستبوونی بیروڕا لە قەدەردا و هۆكارەكانی .............................. ٤٢٧

